

جەستن مەکارسی
ئەسعەد ئەرسەلان
جەمالەددین تاشکیران
عومەر توران

# یاخیبوونی ئەرمەنەکان لە ڤان

وەرگێڕانی
ئەحمەد سەیید عەلی بەرزنجی

# یاخیبوونی ئەرمەنەکان

# لە ڤان

## *The Armenian Rebellion at Van*


جستن مەکارسی

ئەسعەد ئەرسەلان

جەمالەددین تاشکیران

عومەر توران



وەرگێڕانی

ئەحمەد سەیید عەلی بەرزنجی

٢٠١٢

❖ ئەم کتێبە لە لایەن ((تۆڕی نێودەوڵەتی بۆ وەرگێڕان))ەوە ئەنجام دراوە، بە سەرپەرشتی ((وەلید مەرعی))

❖ ئەمە وەرگێڕانی دەقە ئینگلیزیەکەیەتی بۆ عەرەبی و لەویشەوە کراوەتە کوردی.

دەقە عەرەبییەکەی لە لایەن (((الدار العربیه للعلوم ناشرون))ەوە لە بەیروت - لوبنان ساڵی ۲۰۱۰ چاپ و بڵاوکراوەتەوە

- ناوی کتێب: یاخیبوونی ئەرمەنەکان لە ڤان
- نووسەر: کۆمەڵێک نووسەر
- وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: ئەحمەد سەعید عەلی بەرزنجی
- بابەت: مێژوویی
- پیتچنین: ئەحمەد سەعید عەلی بەرزنجی
- هەڵەبڕی: ئەحمەد مەحمود ڕەشید
- دیزاینی ناوەڕۆک: زانا کەمال
- بەرگ: ئارام عەلی
- تیراژ: ٥٠٠
- زنجیرە: ٤٢٤
- چاپخانە: ڕوون
- چاپ: چاپی یەکەم
- ژمارەی پۆلێن: ١٥١٠٩٤٧٥٦/٣٦٤ —م ٩٦٢
- ژمارەی سپاردن: (١٦٨٤) ساڵی (٢٠١٣) لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکانی پێ دراوە

# ناوەخن

# پاشکۆکان

## ● نەخشەکان

# پێشکەشە بە

ئەگەر ئەو کۆمەکە ماددیەی زۆری بازرگانی و زۆری پیشەسازی ئەستەموول و زۆری دەریاوانی ئەستەموول و مەرمەڕیس و ئیجە و سپی ناوەڕاست و دەریای ڕەش و زۆری ئالوگۆڕی کەلوپەلی ئەستەموول نەبوونایە، ئەوا ئەم لێکۆڵینەوەیە نەدەهاتە دی، نووسەرەکانی جوانترین سوپاس و پێزانینیان ئاراستە دەکەن، بۆ بەشداریکردنی بەنرخیان و باوەڕی تەواویان بە گەڵکی ئەم کارە.

دیسان نووسەرەکانی ئەم کتێبە دەیانەوێ سوپاسی گشت بەڕێوەبەران و کارمەندانی ناوەندی ئارشیفی Askeri tarih ve stratejik etut baskanligi هەروا ناوەندی ئارشیفی نیشتیمانی بەریتانی و ناوەندی ئارشیفی نیشتمانی ئامەریکایی و ناوەندی ئەنجوومەنی وەزیران بۆ ئارشیف و کتێبخانەی (هیوتن) لە زانکۆی (هارڤارد) و بەشی خواستنی نێوان کتێبخانەکان لە کتێبخانەی زانکۆی (لویز فیل) و کتێبخانەی ئاکادیمیای مێژووی ترک turk tarih kurumu وە کتێبخانەی کۆنگرێس و کتێبخانەی بەریتانی ... بکەن.

هەروا سوپاس بۆ هەرکەسێ کە دەستی هاریکاری درێژکردبێ بۆ ئەنجامدانی ئەم کتێبە، لەوانە (فیگن گاملی درە) و (مەلیح بیرک) و (ریتا هیتینگەر) و (لی کیلینگ) و (گایتلین مەکارسی) و (کارۆلین مەکارسی). هەروا (حوسنی داغ) کە ئەرکی چاکی کێشا بۆ ڕێکخستن و هێنانەکایەی لێکۆڵینەوەکە، چونکە ئەگەر تەقەللای ئەو نەبووایە، بە سوپاسەوە، ئەوا پرۆژەکە تەنیا وەك چەمکێ دەمایەوە. جگە لەمەش (بیرسین کاراجا)ش کارێکی بەنرخی بۆ ڕەخساندین لە وەرگێڕاندا لە زمانی ئەرمەنیەوە، سوپاسی گشتیان دەکەین بۆ ئەو بەشداریە بەرچاوو بە نرخەیان.

دانەردکان

# بەشی یەکەم

## ڤان لەژێر باری کاولبووندا

لە ٢٤ی تەمموزی ساڵی ١٩١٩، دوو ئامریکایی، کاپتن (ئیموری.هـ. نایلز) و ( ئارسەر .ئی. سازرلاند) بەسواری ئەسپ گەیشتنە ناو شاری (ڤان)، ئەم دووانە، لە کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانیەوە تاکە بیانی بوون کە سەر لەم شارە بدەن، ئەو ناوچانەی پیاتێپەڕبوون، لە گەڵێ ڕووەوە وشك و برینگ، هەتا سووسەی نادەمیەکیشی لێوە نەدەهات. نووسیبوویان: (ناوچەکە بریتیە لە شاخی ڕووتەن و داروپەردو).*

ئەم دووانە شارەکەیان وادەخەملاند کە پێنج هەزار کەسێکی تێدابێ، کۆی دانیشتوانی هەرێمەکەش خۆی بدا لەسەد هەزارێك کەمتر.

بەدەر لەو ئەرمەنانەی خۆیان دەدا لە حەوت سەد کەسێك خەڵکی

---

* دەستنووسەکانی ویلاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا ٠١٨٤/٠٢١/١٧٥ ڕاپۆرتەکەی (نایلز و سازرلاند) هەر بە عەمدی دەمودوی ئەوانەی شاردۆتەوە کە حەزیان بە بڵاوکردنەوەی قسەکانیان نەکردووە، (گاستن وەکارسی) لیژنە ئامریکاییەکان بۆ ئەنەدۆڵو ڕاپۆرتی (نایلزو سازرلاند) لە ئەنکارا: ٥ - ٩ ئەیلول سەپتامبەر ١٩٩٠ ل: ٥٣ - ١٨٠٩ تەنیا دانەیەك کە ماوە لە پاشماوەکانی لیژنەی (هاربرد)ی ئامریکایی، ڕاپۆرتەکەشی پڕە لە هەڵەی زمانەوانی و یەك بابەتی لە زاراوەکاندا، بۆ نموونە وشەی moslem . Musulman تێکەڵ کراوە. جگە لەمە ئەو قسە دەماودەمیانەی کە (نایلز و سازرلاند) لە خەڵکی وەریان گرتووە و نووسیویاننەتەوە و ونبوون و لەوانە فەوتێنرابن.

شارەکە گشتیان لەو پەنابەرە موسوڵمانانە بوون کە کاتی جەنگ هەڵاتبوون و دیسان پاشی ئەوەی لەشکری عوسمانی شارەکەی گرتەوە، گەڕابوونەوە ناوی. خۆ بەپێی دەمودوی ئەوانەی مابوون، (نایڵز و سازرلاند) هاتبوونە سەر ئەوەی کە نیوەی پەنابەرەکان تیاچووبوون و نۆ لەسەر دەی شارەکە و زۆربەی زۆری گوندەکانی دەڤەرەکەش کاولببوون.

شاری ڤان هیچ قوتابخانە و جموجۆڵێکی بازرگانی تێدا نەبوو (دوکانەکانی شارەکە چۆڵوهۆڵبوون)، بەڵام فەرمانداره‌کەی، کە بە دڵی ئەم دوو ئامریکاییە بوو، توانیبووی کارێکی وابکات کە هەردوو نەخۆشخانە مەدەنی و عەسکەریەکە و تاقە هەتیو خانەکەش بەردەوام لەکاردابن، خەڵکەکە چونکە ژمارەیان کەم ببۆوە، لاکەی سکیان نەدەهات و ئەو دانەوێڵە کەمەی حوکمەت دابەشی دەکرد بەشی دەکردن، سەرەتا ئەمانە نەبووە و نەدارابوون، بەڵام زۆری نەبرد نەمەتدەیان چاند و بەرهەم هاورد کە بەشی زستانەکەیان بکات.

ئەرمەنەکان کە بەر لە جەنگەکە چارەکێکی خەڵکی شارەکە بوون، باریان کردبوو، تەنیا ئەم حەوت سەد کەسەیان مابۆوە، سەربازەکان دەیانپاراستن و لە تۆڵەکردنەوەی موسوڵمانەکانیان دوردەخستنەوە. خەڵکی شارەکە بۆ ئامریکاییەکانیان دەگێرایەوە کە چۆن ئەرمەنەکان هەموو شتێکیان وێران دەکرد و ئەشکەنجەی موسوڵمانەکانیان دەداو دەستدرێژیان دەکردنە سەریان و دەیانکوشتن.

سەرەتا (نایلز و سازرلاند) بڕوایان بەو قسانە نەدەکرد، چونکە لەوەتەی چاویان کردبۆوە وەك هەر ئامریکایی و ئەوروپاییەکی تر هەر پەلامار و دەستدرێژی ترکەکانیان بیستبوو، بەڵام زۆری نەبرد ڕایان گۆڕی:

یەکەمجار بڕوامان بەو بەندوباوانە نەبوو، بەڵام دوایی هاتینە سەر ئەوەی بڕوا بکەین، چونکە قسەوباسەکان وەك یەك بوون و بەبەڵگەشەوە

بوون، هەر بۆ نموونە لە شاری (پەتلیس و ڤان) تەنیا ئەو گەڕەکانەی کە وەك خۆیان مابوونەوە، گەڕەکی ئەرمەنەکان بوون، ئەمەش ڕوون و ئاشکرا دیاربوو، وەك کڵێسا و ئەو نووسین و ناوانەی سەر دیوار و درگەی ماڵەکان، بەڵام گەڕەکی موسوڵمانەکان سەرانسەر وێران و کاول کرابوون، ئەو گوندانەی ئەرمەننشین بوون وەك خۆیان مابوونەوە بەڵام هی موسوڵمانەکان خاپوور کرابوون.

موسوڵمانەکان لە خانوو و گوندی ئەرەمەنەکاندا دەژیان، چونکە خانوو وگوندەکانی خۆیان بە پێوە نەمابوون و بەکەڵکی ئەوە نەمابوون تیایدا بژین، جگە لە سێیەکی ئەو گوندانەی کە بەر لە جەنگەکە بنیات نرابوون، هەرچی چەندەش پەنابەرەکان لە ساڵ زیاتر بوو کە خەریکی بنیاتنانەوەی ئەوەبوون کە وێران کرابوو، بەر لەوەی (نایلز و سازرلاند) بگەنە ئەو ناوە.

بەر لەجەنگی یەکەمی جیهانی و شۆڕشی ئەرمەنەکان بەرووی عوسمانیاندا، شاری ڤان بەوەناسرابوو کە شارێکە پڕ لە دار و درەخت و باخ و باخات و میوەی ئەوتۆ کە شارەکەی لەو زەویە وشك و بێ ناوانەی دەوروبەری جیادەکردەوە، بازاڕ و دوکانەکانی شاریان کردبووە ناوەندێکی بازرگانی بۆ گشت دەڤەری خوارووی رۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵ، ڤان شارێکبوو هەر لە ئەزەلەوە پڕبوو لە ژیان و جموجۆڵی بەشەر و لە مزگەوت و کڵێسای ئەوتۆ کە نموونەی جوانی و دەستڕەنگینی بیناسازی و هونەری رازاندنەوە بوون، بەڵام وا ئێستە ئەم شارە بۆتە دارووپەردو و کەلاوە.

ئەرمەنەکانی شاری ڤان، بەپشتی رووسەکان و متمانەیان، دژ بە دەوڵەتی عوسمانی وەستانەوە و شۆڕشیان کرد، ئەو رووسانەی ئەوەندەی پێ نەچوو لێیانهەڵگەڕانەوە، ئەرمەنەکان بە یارمەتی رووسەکان موسوڵمانەکانیان لە هەرێمەکە وەدەرنا، بەڵام زۆری نەبرد شتەکان ئاوەژوبوونەوە، ئەرمەنەکان دەرکران و بەیەکجاری هەڵاتن و ئەو

موسوڵمانانەی کە مابوون گەڕانەوە، بەڵام ناتوانرێ هیچ کام لەم دوو لایەنە لە شەڕەکەدا بە براوە دابنرێ. چونکە زیاد لە نیوەی دانیشتوانی ئەرمەن لە شاری (ڤان)دا تیاچوون، ئەمە بەرامبەر دوو لەسەر سێی موسوڵمانەکان بەلای کەمەوە، کە کوژران.

کۆماری ترکی تازە دامەزراو، لەسەر ئەو داروپەردووە، بنیاتنانەوەی شاری لەلا مەحاڵبوو، جا لەلای خوارووی رۆژهەڵاتەوە شارێکی تازەی سەرلەنوێ بنیاتنایەوە. ئەمەش بووە لەناوچوونی شاری (ڤان)ی سەردەمی عوسمانی.

# بەشی دووەم

# شار و هەرێمی (( ڤان ))

ڤان لە دیدی دانیشتوانیەوە شارێکی جوانە، وا لە نێزیک گەورەترین دەریاچەیەکی ئەنەدۆڵدا، کێو و دوندی سەرکەشی وا دەوری داوە کە بەدرێژایی ساڵ بەفری ها پێوە، جا بەو چاوەندازەو دەریاچەکەی لای خواریشیەوە، جوانترین دیمەنێکی هەیە، لەوانەیە بەلای ئەوانەی هەر بە دیمەنی دارودرەختەوە راهاتوون، دەوروبەری ڤان کەمێك ساردبێ، سەوزاییەکەی بریتیە لە دەوەنی لاپاڵ و داوێنی گردەکان و بەروبوومی ناو کێڵگەکان ودرەختی گوێ جۆگە ئاوەکان. لە هەندی شوێنی شارەکەدا شەقامەکان سێبەری درەخت و ئەو باخچانەی ئەودیو دیوارە بەرزەکان دەیانگرێتەوە، رووکاری ڤان بەسەر دنیادا دەریاچە و شاخەکانی دەوروبەریەتی، بەو جوانی و دلگیرییەیانەوە.

ئەوساکە شاری ڤان بە دوو کیلۆمەتر لە رۆژهەڵاتی دەریاچەکەوەبوو، بەڵام گەرەکی قەڵا، ئەوەی بە (شاری ڤان) دەناسرا، بە پانتایی کیلۆمەترێك لە پاینی بەردەڵانیەکەوەبووە کە بە ٢٠٠ مەترێ لە دەشتاییەکە بەرزترە، ئەم بەرزاییە لە کۆنەوە گەرەکەکەی کردبووە قەڵایەك بۆ پاراستن و مەڵبەندێکیش بۆ فەرمانداری.

خەندەقێکی پڕ لە ئاو و دیوارێکی ئەستووری پتەویش بە دەوریاندا، ئەم شارە کۆنە چوار درگەی سەرەکی هەبوو: درگەی تەورێز، درگەی قەسر،

درگـەی نـاڤین و درگـەی قـەراغ ئاوەکـە، لـە دەرەوەی درگـەی تـەوریز بـە ڕۆژەڵاتدا زەویەکە بەرگی بەرزبۆتەوە و قۆقزیەکی بەردینی پێکهێناوە.

لـە سـاڵی ١٥٣٤ پـاش داگیرکردنـی دەڤەرەکـە، سـوڵتان سـلێمانی قـانوونی ڕاستەوخۆ لەسەر ئـەم قۆقزییـە ڕەقەنـە قـەڵای ڤـانی بنیـات نـا ( بـە زمـانی ترکـی - قـەڵای نـاوەوە - دەگەیـەنێ) ئەمـەش بـەڕووکاری بـاکووری شـارە کۆنەکەدا.

لە سەدەی نۆزدەشدا ئەم قەڵایە وەك شوێنێ بەکاردەهات بۆ خۆپاراستن و دامەزراندنی تۆپخانەی سوپا لێیەوە.




نەخشەی ژمارە ١ - ٢

هەرێمی ڤان

هەروەك هەر شارێكی دی لە ڕۆژهەڵاتی ناڤیندا، شارە كۆنەكەی بە خاتوو شەقامەكانیەوە وەك شارێكی سوننەتی دەینواند، لە خشتی كاڵ (قوڕ) و دار خانووەكان دروستكرابوون، شەقامەكان تەنگ و پێچاوپێچ و تاریك، هەندێ وایان مەزندە دەكرد كە شارە كۆنەكە پێنج هەزار ماڵێك دەبێ، بێگومان ئەمەش زێدەڕۆییە چونكە سەرچاوەكانی حوكمەت تەنیا باس لە ٥٤٠٠ خێزان دەكەن كە لەسەرانسەری دەڤەری ڤاندابوون، ئەمە بە هەموو شاری ڤانیشیەوەیە (كە زۆر لە شارە كۆنەكە گەورەترە) جگە لە ناوچە گوندنشینەكانی دەوروبەری.[١]

بێگومان خانووكانی شارە كۆنەكەش دوو نهۆم بوون، بەپاڵ مزگەوت و كڵێسا و بازارو ودوكانەوە. ئەم دوكان و بازارانەش شوێنی حەوانە و كاركردن و هەڵگرتنی كەلوپەل بوون، ڕاستە بازاڕی وەهای تێدابوو كە هەندێكیان چەند سەدەیەكی بەسەردا ڕابوردبوو، خەڵكی ڤان شارەزای گشت پەناوپەسێرێكی شارە كۆنەكەیان بوون.

ئەوەی خرابووە سەر ئەو بەشە كۆنەی شارەكە و لێی زیادكرابوو، دەوڵەت كردبووی، وەك ئاماژەیەك بۆ ئەوەی كە ئەو بەشە ناوەندی ئابووری و ئیداری گشت شار و هەرێمەكەیە، مەڵبەندی دەوڵەت و فەرمانداری هەرێمەكە لەلای خوارووی ڕۆژهەڵاتەوە بە پاڵ دەرگەی قەسرەوە بوو، مەڵبەندی پۆلیس و دەرەك (پۆلیسی نیمچە عەسكەری لە لادێكاندا) و دادگە و بەندیخانەی ناوەندی سەربازگە و هەردوو بەڕێوەبەرایەتی تەندروستی و كشتوكاڵ لە تەك گومرگ و پۆستە و تەلەگراف و بانكی عوسمانی و نووسینگەی ئایینی گشتی و سەرۆكاریەتی توتن، جگە لەچەند قوتابخانەیەك كە دەوڵەت بەڕێوەیدەبردن و بیناكانی زۆربەیان تازەبوون، لە سەردەمی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمدا كرابوون.[٢]

لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا، شارەكە بە شێوەیەكی بەرچاو

فراوانبوو و چووە ئەودیو دیوارەکانی قەلاوە. ئەم بەشە تازەیە بە (گاردن) ناودەبرا، دیسان بە سێ کیلۆمەتر بەلای رۆژهەلات و خوارووی شارە کۆنەکەدا پەلی کێشابوو ئەم بەشە سێ ئەوەندەی بەشە ئەسڵیەکەی خۆیی پانتایی گرتبۆوە، کەچی ئەگەر ڤان بەشارێکی گەورە دانێین، هەڵەیە.

بەلام لە دەرەوەی شارە کۆنەکە، چاو ئەندازەکە زیاتر پانوپۆڕ و بەرفەرەحبوو، چونکە ئەو ئاگرەی کە لە ساڵی ۱۸۷٦دا بەربۆوە، ئەو قاتوقڕی وبرسێتییەی ساڵانی ۱۸۷۸ - ۱۸۸۰دەڤەرەکەی گرتەوە، وای لە خەلکی کرد کە ماڵەکانیان لە یەکتر دورەوەخەن، بە پێچەوانەی ئەوەی لە رۆژهەلاتی ئاڤیندا باوە، ئەمەش بۆ بەربەستکردنی تەشەنەکردنی ئاگر و تا بشتوانن دانەویلەش بۆ خۆیان بکەن.[٢]

لە هەردوو گەرەکی موسوڵمانەکان و مەسیحیەکاندا، لە بەشی تازەی شارەکەدا خانوەکان دوور لە یەکتر لەناوەراستی باخوباخاتی فراوانی وادا دروستدەکران کە دیواری بەرزی شەش پێیی دەوری گرتبوون، دانیشتوانەکانی زۆربەی پێداویستییەکانی خۆیانیان تێدا دەڕواند، بەتایبەت ترێ و میوەجاتی فرە چەشنە، ئەمەش ئەو ناوەی کردبووە جێیەکی دلگیر و شیاو بۆ نیشتەجێبوون، بەشێوەیە کە فەرمانداری هەرێمەکە و لێپرسراوانی تری دەوڵەت بڕیاریاندا بچنە ئەو بەشەی (گاردن)دوە. جگە لەوەی کە کونسوڵخانە و دامەزراوە میسیۆنێرەیە بیانیەکان و قوتابخانە تازەکانو نەخۆشخانەی میسیۆنێرە ئامریکایی و سەربازی و نووسینگەی تەلەگراف و بانکی کشتوکاڵ و ژمارەیە مزگەوت و کلێسا لەو ناوچەیە گیرسابوونەوە، هەرچەندە هەندێ گەرەك لە موسوڵمانان و مەسیح تێکەڵ بوون بەلام مەسیحیەکان لە بەشی رۆژهەلاتی (گاردن)دا زۆرینەبوون لە رۆژاوایشیدا موسوڵمانەکان زۆرینەبوون.[٣]




**نەخشەی ژمارە ٢-٢**

**شاری ڤان**

## دانیشتوانی شارەکە

دانیشتوانی شاری ڤان پێکهاتبوون لە (ترک و کوردی موسوڵمان و ئەرمەن و نەستووری مەسیحی و بەشێکی کەمیش لە یەهوودی و هی تر). کاتیخۆی (ئەولیا چەلەبی) لەساڵی ١٦٥٥دا سەردانی ڤانی کردووە، باس لە دووانزە گەڕەکی ئەو شارە دەکات کە سیانیان ئەرمەن بوون. (نۆرهان کیلیچ)یش لەسەدەی حەڤدەدا دانیشتووانی شارەکەی بە نێزیکەی ٣٥ بۆ ٤٥ هەزار کەس مەزندەکردووە، ئەرمەن ٢٠٪، باقی تریان موسوڵمان بوون.

ئەو کات ئەرمەنەکان نوێنەرایەتی گشت مەسیحیەکانیان دەکرد، هەر ئەو کاتە نیوەی موسوڵمانەکان بریتیبوون لە سەرباز و کارمەند و فەرمانبەرەکانی دەوڵەت و لێپرسراوانی دەستەی ئەوقافی ئیسلامی.[٥]

لە دوا ساڵەکانی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستدا سەرژمێریەکی ورد و راست بۆ دانیشتوانی شارەکە نەبوو، عوسمانیەکان تۆماری تەواوی دانیشتوانەکەی شاریان لای خۆیان هێشتوەتەوە، بەڵام ئەوەش پشت بەسەرجەم دانیشتوانی قەزاکە دەبەستێ کە شارەکە و دەوروبەری دەگرێتەوە، لەنێو ملیۆنەها بەڵگەنامە و دیکۆمینتا ئەم تۆمارانەش دۆزراونەوە بەڵام تا ئێستە لێیان نەکۆڵراوەتەوە و لە ئارشیفی عوسمانیدا کەوتوون.

دەڵێن گوایە ژمارەی دانیشتوانی قەزاکە لە ساڵی ١٩١٢ خۆی داوە لە ٧٩,٧٣٦ کەس، لەوانە ٤٥,١٩٩یان موسوڵمان بوون و ٣٣,٧٨٩ ئەرمەن بوون، جگە لە ٨٢٨ کەس سەر بەئاینەکانی دی، سەڵتەنەی عوسمانی، وەك هەر دەوڵەتێکی هاوشێوەی خۆی، تۆمارکردنی ئافرەت و مێینە و مناڵی بواردووە و پشتگوێی خستووە، جا بۆیە پێدەچێت ئەو ژمارانەی خرانە روو خەملاندنەکەی ژمارەی دانیشتوانی قەزاکە و لادێکانی تێکدابێ و بە راژەی

چواریەك بە هەڵەیدا بردبێ.[٦]

زیاتر لەمەش، تۆمارەکان ئەو سەرباز و ئیداریانەی نەگرتۆتەوە کە سەر بە قەزایەکی تربوون بەڵام بە شێوەیەکی کاتی لەوێ دانیشتوون، ئیتر بەم پێیە (فیتال کوینییە) لە ١٨٩٠ دانیشتوانی ڤانی بە کەمتر ژمارمیەك خەملاندووە:

١٦،٠٠٠ هەزار موسڵمان، ١٣،٥٠٠ ئەرمەن و ٥٠٠ یەهوودی، کە ئەمەش بە گشتی دەکاتە ٣٠،٠٠٠ هەزار کەس .[٧]

لەگەڵ ئەوەی کە ژمارەی ئەوانەی بەشێوەیەکی هەمیشەیی لە (ڤان)دابوون لە ١٨٨٠ وە هەتا جەنگی یەکەمی جیهانی گۆڕانێکی ئەوتۆیان بەسەردا نەهاتووە، بەڵام ژمارەی بەرچاوی دانیشتووانی شارەکە بە فیعلی بەپێی باروزرووف دەرەکی ئاڵوگۆڕێکی زۆری بە خۆوە دیوە، موسوڵمانان و ئەرمەنیش لەکاتەکانی قاتوقڕی و نەبوونیدا، یا لەکاتی پشێویەکاندا بۆ ئارامی و نان و خۆراك دادەبارینە ناو شارەکەوە.

## هەرێمی ((ڤان))

### • ئاووهەوا

لەوانەیە تەنیا هۆکارێك کە وامان لێبکات بڵێین ئاووهەوای ڤان بۆ تەندروستی باش و لەبارە، ئەو تایبەتمەندیەی رۆژهەڵاتی ئاڤین بێت لە شاخەکانی قەفقاس یان بیابانی عارەب.

هاوین لە ڤاندا زۆر گەرم نییە، بەلانی کەمەوە بەپێی پێوانەکان لە رۆژهەڵاتی ئاڤیندا، گەرمی لە مانگی تەممووزدا دەگاتە ئەوپەڕی لەگەڵ پلەی ٢٢ ی سەدی (٧٢ پلەی فەهرەنهایتی) بەڵام دەشێ بشگاتە ٣٨ی سەدی (١٠٠ پلەی فەهرەنهایتی)، لە زستاندا ئەوە باسناکرێ، لە شوێناندا کە ساردترین مانگە لە ڤان، پلەی گەرما دەچێتە ٤- سەدی (٢٥ پلەی فەهرەنهایتی) بەڵام

جاروبار دەگاتە ٢٩٠ سەدی (-٢٠ پلەی فەهرەنهایتی).[8]

ئا بەم شێوەیە پلەکانی گەرما لە زیاتر لە سێیەکی رۆژهەکانی ساڵدا دادەبەزێت بۆ ژێر سفر (جێی باسە کە ئەم ژمارانە تایبەتن بە شاری ڤان کە ئاووهەوایەکی فێنك و مامناوەندی ھا پێوە، ئەوەش بەھۆی نێزیکی لە دەریاچەی ڤانەوە، بەڵام بەشی زۆری ناوچەکانی هەرێمەکە، بەتایبەت بەرزاییەکانی، بەگشتی ئاووهەوایەکی سارد و سەختتریان ھا پێوە، بۆ نموونە لە شاری (هەکاری ) لە دەڤەری خوارۆو و شاخاویشە، پلەکانی گەرمای ئەوێ هەمیشە بە چوار پلە کەمترە لەوەی شاری ڤان لە زستاندا.

تێکڕای بارانبارینیش لە ڤان (٣٨٠ ملم)ە بەڵام لە چلەی هاویندا بە دەگمەن ئەگەر بباریَ (بەپاڵ تێکرای ٢ ملم لە ئاب)دا.[9] لە ماوەیەك کە چوار یەکی ساڵە زۆربەی بارین کە بەفرە دەبارێ. لە زستاندا خانووەکان لە ڕێی داڵانی داخراوەوە بە ژێر دیواری بەرزدا پەیوەندی بە یەکەوە دەکەن، جا سەردانی برادەرێك وەك ئەوە وایە کە بە تونێلێکدا گوزەرکەیت. ئەو دەربەندانەی ناو شاخەکان کە هەرێمەکان دەگەیەنن بە یەك، لە زستاندا دەبەسترێن و بەهۆیەوە ڕێگەی بازرگانی و پەیوەندیکردنیش دەگیرێ.[10]

## ● موسوڵمانەکان

بە پێچەوانەی ئەوەی چاوەروان دەکرا، بەپێی ئەسڵی ئیتنی و ڕەگەزەکەیان زەحمەتە موسوڵمانەکانی ڤان جیاکرێنەوە، چونکە سیستمی عوسمانی لە تۆمارکردنی دانیشتواندا، کە باشترین و سەرچاوەیەکە بۆ زانیاری دەربارەی دانیشتوان، هاووڵاتیانی عوسمانی لەسەر ئەساسی ئاینی تۆمار دەکرد نەك بەپێی ئینتیمای قەومی یان زمان، لەوەش دەچێ کە ئەوروپاییەکان ڕۆژێ لە ڕۆژان نەیانزانیوە ترکێ لە کوردێ جیاکەنەوە، زوربەی کەرەت سیفەتی (ترکی)یان داوەتە پاڵ ئەوانەی نیشتەجێن و

(كـوردی)ش بـۆ عەشـایرەكان، ئـیتر بـەبێ گوێدانـە ئـەو زمانـەی قسـەیان پێكردووە. ئەمە وەك گشت لایەك لە رۆژەلاتی ئاڤیندا، هەتا ئەم دواییەش.

بە پلەی یەكەم تاكە ناسنامە تاكە ئاینی بووە، ئینجا دەوری ئینتیمای شوێن و عەشرەت و خانەوادە دەهات، ئەگەر لە ناسنامەی كوردێ نێر بوایە یا مێ - بپرسـرایە، ئـەوا حەتمـەن دوای بیركردنـەوە لـە سـەخافەتی ئـەو پرسـیارە، دەیگـوت (موسـوڵمانم)" ئینجـا دەگەوتـە ناوهێنـانی عەشـرەت و گوندەكەی.




**نەخشەی ژمارە ٣-٢**

**رۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵی عوسمانی**

لە رووی زمانەوە زوربەی دانیشتوانی ڤان بە کوردی دەدوێن، هەرچەندە ژمارەیەکی زۆری ئەم کوردانە و کەمتریان لە شارەکانی تردا لە رووی کۆمەلایەتییەوە ناوێتەی کۆمەڵی مەدەنی عوسمانی بوون.

**خشتەی ١-٢ سەرژمێریەکانی حوکمەت دەربارەی هەرێمی ڤان لە ساڵی ١٨٩٧-١٨٩٨**

| ناوی قەزاکان | گوندەکان | خێزان | مزگەوت | قوتابخانە | تەکیە و خانەقا | دێر و کلێسا | دوکان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ڤان | ٦٧ ناحیە | ٥٤١٧ | ٣٢ | ١٠ | ١٥ | ١٥ | ١٦٣٦ |
| نەرجیك/ گەرەك | ٥٣ گوند | ١٦٦٦ | ٥ | ٢ | - | ٣٠ | ٦ |
| حەقاسوور/ گەرەك | ٤٨ گوند | ١٨٣٠ | ٩ | ٢ | - | ٢٠ | ٥ |
| تیمار/ گەرەك | ٧٠ گوند | ٢٥٨٠ | ٥ | ٢ | ١ | ٢٥ | ٣ |
| نیرکیش | ١٢٢ گوند | ٣٦١٢ | - | - | - | - | ١٢٣ |
| گیڤاش | ٦٦ گوند | ٢٨٩٠ | - | ٣ | - | - | ١١ |
| مۆکس | ٦٥ گوند | ١٧٩٧ | - | ٥ | - | - | ١٢ |
| جاتاك | ٨٣ گوند | ١٦٢٣ | - | - | - | - | ٨٣ |
| بارگیری | ١٠٤ گوند | ١٢٨٥ | ٢ | - | - | - | ٦ |
| ئەدیلکیفاز | ٦٢ گوند | ١٩٣٤ | ٨ | - | - | - | ٧٥ |
| کارجیکان | ٧٠ گوند | ١٨٦٠ | - | - | - | - | ٨ |
| کۆی گشتی | ٨١١ | ٢٦٤٩٤ | ١٦ | ٢٥ | ١٦ | ١١٠ | ١٩٦٨ |

(van: matbaa - ١٣١٥van vilayeti, salnamesi, :سەرچاوە
٢٠٧)p ١,١٣١٥

**خشتەی ژمارە ٢ - ٢ دانیشتوانی هەرێمی ڤان**

| ئایین | ژمارەی دانیشتوان | رێژە |
|---|---|---|
| موسوڵمان | ٣١٣٣٢٢ | ٦١,٤٦ |
| یۆنانی | ١ | کەمتر لە ٠,٠٠١ |
| ئەرمەن | ١٣٠٥٠٠ | ٢٥,٦٠ |
| گلدانی و نەستووری | ٦٢٤٠٠ | ١٢,٢٤ |
| یەهوودی | ١٧٩٨ | ٠,٠٣٥ |
| ئایینەکانی دی | ١٧٧٦ | ٠,٠٣٦ |
| کۆی گشتی | ٥٠٩٧٩٧ | |

سەرچاوە: (نیویورک - Newyork university press, ١٩٨٣ muslims and minorities,pp ١١٠ - ١١)

ئەم سەرژمێریانە پشت بە تۆماری عوسمانیەکان دەبەستێ، کە بەهۆی سەرژمێریکردنەوە چاکراون و وردبین نین، بەتایبەت لە رووی ژمێرەی ئافرەت و منداڵەوە، بەڵام ئەوەی ناودەبرێ بە سەرژمێری بەترەریکی ئەرمەنی کە دەگوترێ گوایە لە تۆمارەکانی بەترەریکی ئەرمەنی لە قوستەنتەنیەوە وەرگیراوە، ئەوە ساختەیە. بەڵام هەندێ سەرژمێری ئەسڵ دۆزراوەتەوە کە لە لایەن بەترەریك (ئیشمیا دزین)ەوە فەرمانـدرابوو کە بکرێ. سەبارەت بە ١٩١٣ - ١٩١٤ ئەو سەرژمێریانە ئیشارە بەوە دەدەن کە ١١٠,٨٩٧ ئەرمەن لە ڤان هەبوون (رایموند. هـ. کیفۆرکیان و بول بی بابودجیان:

Du genoeide. Paris: editions d`art et d`Histore 1992 p60

وای مەزندە دەکەن کە ئەو ژمارە زۆررانەی کە لە خشتەکەدا هاتوون سەبارەت بە ئەرمەنەکان وردتر و راستترن، چونکە لەسەرژمێریەکی راستەقینەوە دەستکەوتوون نەك لە گۆترە و خەملاندنەوە).

بە کوردی و ترکی قسان دەکەن، بەگشتیش رۆشنبیریەکی عوسمانیانەیان وەرگرتووە کە ترك و کورد و خەڵکی بۆسنە و ئەلبان و چەرکەسیەکان و دەیان کۆمەڵە ئیتنی دی دەگرێتەخۆ. لە شاری ڤاندا شەش خانەوادەی گەورەی ترك دەچنەوە سەر عەشرەتی ترکەکانی سەرەتا کە بەر لە سەدان ساڵ هاتوونە شارەکە، جا ئەمانە خۆیان بە ترك دادەنێن. لە لادێکاندا موسوڵمانە فەلا و جوتیارەکان بە کوردی دەدوان و سەر بە عەشرەتی خۆیان بوون، ئەوروپاییەکان بە زۆری ئەمانەیان بە (ترکی ڤان) دەدایە قەڵەم، گوایە لە نەوەی ئەو ترکانەن کە گوتمان وەیان پشتاوپشت لەو کاربەدەستە عوسمانیانەی ناوچەکەوەن، هەندێ کەرەت ئەوروپاییەکان بە کوردە (بە عوسمانی بووەکان)یان دەگوت (ترك).

توێژاڵی زۆری فەرمانبەر و لێپرسراوانی عوسمانی لەو سەربازانە پێکهاتبوون کە بە ترکی دەدوان، لە ئەنەدۆڵ و بەشی ئەوروپای وڵاتی عوسمانیەوە هاتبوون، بەڵام سەرکردە و لێپرسراوەکانی دەوڵەت ئەوە لە بنەچە و بنەماڵی جیاجیاوە هاتبوون کە سەرجەم ئەمانە بە ترکی قسەیان دەکرد وەك زمانی دایك، لەوانەیە باووباپیرانیان بە زمانەکانی ئەوروپایی و رۆژهەڵاتی ناڤین کاتیخۆی دوابن.

کوردەکانی ڤان سەر بە عەشرەتی جیاجیابوون، جا بە زەحمەت لەم بارەیەوە جیادەکرانەوە، گەورەترین یەکیەتی عەشایریەکیان بە (حەیدەران – حەیدەرانلی) دەناسرا کە بریتیبوو لەو هۆزانەی کە لە بانە فرەوانەکانی خواروی ئەرزرۆم و باکووری هەرێمی ڤان تا دەگاتە ئێران – لە بایەزید - لەسەرەوە و – باتنووس - لە رۆژاوا تا دەگاتە ئێران، گەلێ جار کێشە و

دوژمنایەتییەکی بەردەوام لەنێوان عەشرەتی (حەیدەران) و دوو عەشرەتی کوردی تردا (سیکان) لە رۆژاواو (شیڤلی) لە باشوور، پەیدادەبوو، عەشرەتی شیڤیلی کەسەر بە گەورەترین یەکیەتیەکی عەشایەری بوو لە پلەی دووەمدا لە ڤان کە (شوکاك)یان پێدەگوت، ئەم عەشرەتە لە نێوان (بارگیری) و شاری ڤاندابوو، عەشیرەتی (شیکیڤتی) مەزنترین عەشرەتی بوو سەر بە شوکاکەکان و بەهێزیش بوون، زەویەکانیان لە خوارووی رۆژهەڵاتی هەرێمی ڤانەوە سنووری بڕیبوو چووبووە ناو ئێرانەوە، جا بەپێی راپۆرتی دەوڵەت و کونسلگەریەکان هەردوو عەشرەتی حەیدەران و شوکاك بەهۆی زۆری ژمارەیانەوە زۆرترین کێشە و تەنگژەیان دەنایەوە، هەروا ئەم دووانە لەناو یەکیشدا زوو زوو دووبەرەکیان تێدەکەوت و دەستیان دەچوو بە خوێنی یەکتردا.

تیرە و هۆزە رەوەندەکانی ڤان وەك (هەرکی و ئەتماتیکا) و هەندێ وردە عەشرەتی تر، زۆر کەمبوون، بەڵام تیرە و هۆزە نیمچە ڕەوەندەکانی وەك (گۆیان، میران) زستانیان لە گوندەکانیانا دەبردە سەر و هاوینیش لە دەوارەکانیاندا لە هەوار.

چەند عەشرەتێك تێکەڵ بە یەك ببوون، عەشرەتی جەلالی ببووە دوو بەش، رەوەند و نیشتەجێ، هەندێ بەشی (شوکاك و هەرتوشی) نیشتەنی بوون و بەشی تریشیان نیمچە رەوەند، هەتا هەندێ عەشرەتی رەوەند وەك هەرکی لقی عەشرەتی نیشتەنی تری ناویتە ببوو.[١٣]

شێوەی ژیانی ئەم عەشایرانە دەستی دایە گۆڕان، هەندێ وەك (هەسەنان) کە زوربەیان نیمچە رەوەند بوون بەڵام لە ١٨٩٠ەوە کەوتنە ژیانێکی نیشتەنیەوە و دامەزران، بەم شێوەیە عەشرەتەکانی باکوور بە گشتی ئەم گۆڕانە گرتنیەوە.

سەرەڕای ئەمەش پاڵەپەستۆی دەوڵەتی عوسمانیش کە دەیکردە سەریان

بالەولاوە بوەستێ، ئەمە لە ئەنجامی چەسپاندنی وردەوردەی دەسەڵاتی خۆی بۆسەر ئەمانە و هەڵگرتنی سیستمی عەشایرییەوە بوو، بۆیە دەبینین زۆر عەشایری گەورە هێز و تواناو دەستەڵاتی خۆیان لەدەستدا، ئەمەش بووە هۆی بەرزبوونەوەی پارسەنگ و هەیبەتی عەشرەتە بچووك و ناوەندەکان کە لەژێر رکێفی ئەو یەکێتیەی پێشوو هاتنەدەر، جا چونکە عەشایر هەر بە سروشتی خۆیان مایل بەشەڕ و ئاژاوە و کوشتارن، ئەوا ئەم گۆڕان و پەرەسەندنەی کە لەناویاندا بەرپابوو لە رووی سیستمی مەدەنیەوە دیاردەیەکی ئەرێنی نەبوو بە لایانەوە.

هەر عەشرەتێکی کورد ملکەچی سەرۆکەکەیان بوون، هەمیشەش سەرۆکایەتی پشتاوپشت نەبووە و هەرگیزیش بە کوڕە گەورەی سەرۆك نەبڕراوە، لەسەرەتاکانی سەدەی نۆزدەوە، دەستەڵاتی سەرۆکەکان بەشێوەیەکی بەرچاو نەما، هەتا سوڵتان (مەحموودی دووەم) دەستی نەدایە چەسپاندنی دەستەڵاتی دەوڵەت لە خوارووی رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵدا، هەر سەرۆك عەشرەتێ بە (میر) یا (ئەمیر) بە ترکی ناودەبرا، ناوچەیەکی فرەوانی لەژێردەستدابوو، ئەم سەرۆکانە لە خوارووی رۆژهەڵاتدا دەستەڵاتی خۆیانیان لەناو یەکدا بەشکردبوو، جا هەر کە دەوڵەت سەرلەنوێ کەوتە خۆی و دەستەڵاتی سەپاند و کۆتایی بە سەردەمی (میرنشینان) هێنا، کەچی لەملاوە دەستەڵاتێکی گچکەتر قوتبۆوە، هی سەرۆك و سەرۆکی هۆز و تیرە بچووکە ناوخۆییەکان، ئەمەش بەلای (شێخەکانەوە) هیچ جیاوازییەکی ئەوتۆی نەبوو لەوانەی پێشوو.

شێخەکان سەرۆك و رابەرانی دەروێشایەتی و خانەقاکانی (سۆفیەکان)یان دەکرد، ئەمانە ژمارەیەکی زۆریان لە موریدو هەواداران لەناو عەشرەت و هۆزە جیاجیاکاندا کردبووە خۆیان و لە دەوریان گردببوونەوە، کەلێجار ببوونە هۆی پەیدابوونی (عەشرەتی تێکەڵ)وە سەرۆکایەتیان

دەکردن و رێنمایی و ئیرشادی ئایینیان دەکردن، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە پێگە و هەیبەتیان لەسەر بنەمایەکی ئایینیەوە بوو نەك لە بنەمای هەیکەلێکی عەشایری و تیرەگەرێتی.

جێی باسە کە دیارترین و بەناوێ ترینیان دوو سەرکردەی شێخایەتی بوون: (شێخانی شەمدینان) و(شێخانی بارزان) کە بەرێبازەکانیانەوە گەیشتنە ناو و ناوبانگ و دەستەلات.[14]

نەخشەی ٢-٤ کە لە سەرچاوە بەریتانیەکانی ئەم دواییەوە دەستکەوتووە، گەورەترین و بەناوێترین ئەو عەشرەتانە، بێ لەوانیتر، پیشاندەدات. [15] ناوچە دیاریکراوەکانی هەر عەشرەتێ یا یەکێتیەکی عەشایری تیایدا هەر ئەوە نییە کە ئیشارەی پێ دراوە، چونکە زۆر کەرەت گوندی عەشرەتێ بە پاڵ گوندی عەشرەتێکی تری جیا لەوانەوە بووە، هەروا رەوەندی ئەم عەشرەت بۆ ئاو و لەوەڕی زستانە و هاوینە چونەتە ناوخاکی ئەوی ترەوە کە لە نەخشەکەدا دیاریکراوە، بۆ نموونە عەشرەتی هەرکی بە کۆمەڵی بچووك بچووك بە ئاژەڵ و مەڕومالآتیانەوە لە بەشی خوارووی هەرێمەکەدا ئەمسەر و ئەوسەریان دەکرد، لەبەرامبەردا سەرکردە بەهێزەکانیش بەردەوام زەوییوزارەکانیان فرەوان دەکرد، هەرچەندە بە مردنی خۆیان ئەو هەڵپە و تەقەللایانەیان بەبادەچوو.

سەدان تیرە و هۆزی سەربەخۆ هەن لەناو ئەم عەشرەتانەدا کە لە نەخشەیەکی بچووکی ئاوهادا مەحاڵە ناویان بهێنرێن و دیارخرێن.[16]




**نەخشەی ٤-٢**

**هۆزە كوردەكان**




نەخشەی ٥-٢

کڵێسای ئەرمەن لە ڤان

## • ئەرمەنەکان

هەروەك موسڵمانەکان، ئەرمەنەکانیش لەلادێدا بە پلەی یەکەم خەریکی جووت و فەلاحەتبوون تا پێی بژین، لەبەرامبەر ئەمەدا، ئەرمەنی دانیشتووی شارەکان گەلێ بنەماڵەی دەوڵەمەند و بووەیان تێدابوو کە پلەوپایەی باشیان گرتبوە دەست: پیاوانی کارا و کارمەند لە بانکەکان و شارەزا لە بازاری دراودا، بازرگان، پزیشك و دانساز، پارێزەر، کاربەدەستی دەوڵەت، وەرگێر لە کونسوڵخانەکان، دەسترەنگین و خاوەنی سنعات، کرێکار و وەستای شارەزا، کاهین و پیاوانی ئایینی، مامۆستا و رۆژنامەوان.[١٧]

چاودێرەکانی ئەم دواییانە گشتیان تێبینی ئەوەیان دەکرد کە ئەرمەنەکان دەستیان بەسەر بازرگانی هەرێمەکەدا گرتووە، لە کاتێکدا کە زوربەیان لە شاری ڤاندا دەوڵەمەند و دەسترۆیشتوو بوون، یان تێکرا لە هەموو موسوڵمانانی شارەکە بووەتر بوون.

بەپێی ساڵنامەی ئەرزرۆمی ساڵی ١٨٧٦ قەشەی دورگەی (لیم) کە لە باکووری رۆژهەڵاتی دەریاچەی ڤانەوە کاسۆلیکۆسی دوورگەی (ئەختمار). ئەم دووانە لەژێر ناوی هاگوپ سەرۆکایەتی کۆمەڵی (گریگۆری) شاری ڤانیان دەکرد، بەترەریکی پێشوو (مالاشیا نۆرمانیان) دەنووسێ گوایە چوار دەستەڵاتی کڵێسایی حوکمی کڵێسای گریگۆریان دەکرد لە هەرێمەکەدا:

ئەبرەشیەی دوورگەی لیم و(کتۆتز)ی گچکە کەناوچەکە گشت وشکایی سەرەکی دەگرتەوە (ناحیەی تیمار). وە کاتۆلیکۆسی (ئەگتمار – ئەختمار)ی بەربلاو کە حوکمی ناوچەی باشوور و باشووری رۆژاوای ڤانی دەکرد، جگە لە باشووری رۆژهەڵاتی هەرێمی (بەتلیس)، وە ئەبرەشیەی (ئەگیك - ئەلیك، بشکالە) کە رۆژهەڵاتی ناوچەی باشووری دەگرتەوە، ئەوەی دواییان ئەبرەشیەی ڤان بوو کە باقی ئەو ناوچانەی دەگرتەوە لە هەرێمەکە کە

لەوانی تر مابوونەوە.[٧]

ئەفرادەکانی کلێسای کاتۆلیکی و ئەرمەن و پرۆتەستانت کە چووبوونە پاڵ یەکدی، لەناو هەرێمەکەدا کەمایەتیەکیان پێکهێنابوو.

هەرلەوکاتەشدا مسیۆنێرە کاتۆلیك و پرۆتەستانتەکان (کە زوربەیان ئامریکایی بوون) توانیبوویان گەلێ ئەرمەنی رۆژاوای ئەنەدۆڵ لە مەزهەبەکەی خۆیان وەرگێڕن. بەڵام ئەوانەی ڤان هەر سەر بە کلێسای گریگۆری بوون وەلە شارەکەدا تەنیا کەمەکێك لە ئەرمەنی پرۆتەستانت هەبوون کە لەلایەن مسیۆنێرە ئاوخۆیی و بیانیەکانەوە خزمەت دەکران.

دامەزراندنی هەندێ ئەرمەن لە پلەوپایەی دەوڵەتدا، بەشێکبوو لەو سیاسەتی فرە بابەتیەی حوکم کە سوڵتان (عەبدولحەمیدی دووەم) پەیڕەوی دەکرد و ئەوانەی دوای ئەویش بەدویدا هاتن تەواویان کرد، بەڵام ئەفرادەکانی کەمایەتیەکانی تر دەیانتوانی لە پلەوپایەکانیاندا بەرز ببنەوە، کەچی هەرگیز نەدەگەیشتنە پلەی بەرزی دەوڵەت لە ئەستەموول (وەك ئەوەی دەبوونە وەزیری دەرەوە بەڵام نەدەبوونە سەرۆکی وەزیران).

لە ڤاندا دامەزراندن لە وەزارەتەکانەوە ئەنجام دەدرا، هەر بەو پێیە کە لە ئەستەموول بەڕێوەدەچوو، هەرچەندە کێشەو بار و زرووف ئێرە و ئەوێ لەیەك جیاوازبوون.

لە ڤانیش وەك هەرێمە هاوشێوەکانی وەك ( ئەرزرۆم و پەتلیس)، دەوڵەت هەوڵی دەدا بۆ دانانی مەسیحیەکان لە پلەی رەسمی وادا تا بۆ کەمایەتییەکانی دەرخات کە ئەوانیش سەر بەسیستمی عوسمانین و جیاوازیان ناگرێ، وەتا مامەڵەیەکی یەکسان لەلایەن دەوڵەتەوە بیانگرێتەوە و لەناو دەستەڵاتیشدا هەمە جەشنەییەك لە تاکەکانی ئەو کەمایەتیانە هەبێ و لە حوکما بەشداربن.

ئەم هەنگاوەش بۆ ئەوەبوو تا شۆڕشگێرە نیشتیمانیەکان بێدەنگ بکەن،

بەڵام ئەوانیش هەمان ڕێگەیان دەگرتەبەر و درێغیان نەدەكرد لە قایلكردنی ئەرمەنەكان تا پەشیمانیان بكەنەوە بۆ ئەوەی ئەو پلەوپایانەی دەوڵەت نەگرنە دەست.

لە (پاشكۆی دووەم)دا لیستێ بەناوی ئەو ئەرمەنانە هاتووە كە لەناو دەوڵەتی عوسمانیدا خزمەتیان كردووە، ئەمەش هەر وەك لە ساڵنامە جۆربەجۆرەكانی هەرێمایەتی ڤانـدا هاتووە. زوربەیان لە پلە و وەزیفەی داراییدا كارمەند بوونە، خەزنەدار لە هەرێمەكان

### خشتەی ژمارە ٣ - ٢ كڵێسای ئەرمەن لە ڤان: سەرژمێریە خەمڵێنراوەكانی ئەرمەنەكان

| نوسقوف | سەرۆكایەتی كڵێسا | شوێنی دەستەڵاتی | ئەندامانی كڵێسای ئەرمەن | ئەبرەشیەكان | كڵێساكان | كاتۆلیك | پرۆتەستانت |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| بەترەەرپكی قوستەنتەنیە: ڤان<br>لیم و كتوتز<br>ئەلباك (بشكالە) | سەرۆكی نوسقوفەكان<br>سەرۆكی دەیر<br>سەرۆكی دەیر | قەزای ڤان ومەحمودیە و سارای و نیدكیش و ئەدیلكیڤاز<br>ناحیەی تیمار<br>سناك هەكاری | ١٠٠,٠٠٠<br>١١,٠٠٠<br>١٠,٠٠٠ | ١٠٨<br>٢٥<br>٣٠ | ١٣٠<br>٢٣<br>٢٣ | ٥٠٠<br>-<br>- | ٢٠٠<br>- |
| كاتۆلیكۆسی (ئەختمار)<br>هیزان | كاتۆلیكۆسی<br>نوسقوف | قەزاكانی ، گیڤاش جاتاك و كارجیكان<br>قەزای هیزان | ٧٠,٠٠٠<br>٢٥,٠٠٠ | ١٣٠<br>٦٤ | ٢٠٣<br>٦٩ | -<br>- | -<br>- |

سەرچاوە: EDITION ٢TEREMIG POLADIAN, (LONDON: MOWBRAY . ١٩٠٥)PP ٢٠٦ -٢٠٨
لەلایەن: MOLACHIA ORMANIAN ,THE CHURCH OF ARMENIA نووسراوە.

و ئەنجوومەنەکانی بەڕێوەبردندا، لەوانەیە ئەمە راستی باری دارایی و ئابووری ئەوانەی رەنگدابێتەوە لە هەرێمەکەیاندا.

دیسان ئەرمەنەکان پلەی بەرزی لێپرسراویان لە ئەنجوومەنی تۆمارکردنی زەویوزاردا گرتبووە دەست، کە ئەمە بوارێکی گەلێ بەبایەخبوو، سەرەڕای ئەوەش کەسەر بە چینی بازرگانەکان بوون ئەندامیشی بوون لە دەستەی بەڕێوەبردنی شاری ڤان و وەك دادوەر لە دادگەکانی ناوچەکاندا و لە ئەنجوومەنی قەزاییدا خزمەتیان دەکرد، لە دواییەکانی سەدەی نۆزدەدا کەوتنە ئەوەی پلەی جێگری فەرماندار یان یارمەتیدەری فەرمانداریان بدرێتێ، کە ئەمانە پلەی بەرزن و خاوەنەکانیان بەشێکی چاکیان لە دەستەڵات و دەستڕۆیشتوییدا هەبووە، هەروا ناوەکانیشیان لە لیستی پۆلیس و ئەفسەرو دەرەجەداردا کەوتەڕوو، لە ساڵی ١٩٠٨ (نازاریت تشار و خدجیان) پشکنەری پۆلیسی ڤان بوو، وەك لە دوایشدا دەردەکەوێ ئەوانەی ئەم جۆرە شوێنانەیان دەگرت، تووشی مەترسی گەورە گەورە دەبوونەوە، بەتایبەت لە پۆلیسی و کاری بەڕێوەبردندا، چونکە ئەمانە لەلایەن شۆڕشگێڕانی ئەرمەنەوە رووبەڕووی هەڕەشەی کوشتن دەبوونەوە، ئەوان وایان دادەنا کە هەرکەس بەشداربێ لەکاری دەوڵەتدا تاوانبار و ناپاکە.

## ● نەستووریەکان

نەستووریەکان کە ئەمڕۆ بە ئاشووریەکان دەناسرێن، لە ناوچەیەکی شاخاوی خوارووی ڤان نیشتەجێبوون و هەروا لە نزماییەکانی رۆژاوای دەریاچەی (ورمێ) لە ئێران.

نەستووریەکانی ناو عوسمانیەکان زۆرتریان لە شاری (تیاری)دا جێگیربوون، ئەم شارە بە دووری ۸۰ میل وا لە خوارووی ڤانەوە، وە لە شاری (کۆجنیس)یش نێزیك بە جۆلەمێرگ کە بارەگەی سەرەکی بەترەریکی نەستووری هالێ، بەڵام ئەوانەی لە ناوچە شاخاوییەکاندابوون بە (عەشایرە نەستووریەکان) دەناسران، بە ترکی (عشیرێت)ە.

ئەمانە شێوە سەربەخۆییەکی خۆیان هەبوو، بەڵام کە عوسمانیەکان لە ناوەراستی سەدەی نۆزدەدا کەوتنە چەسپاندن و فراوانکردنی دەستەڵاتەکەیان، ناوچە شاخاوییەکانی ئەوانیشی گرتەوە، هەندێکیشیان سەر بە هۆز و عەشرەتە کوردەکان بوون.

نەستووریەکان رەوەند نەبوون بەڵام چەند عەشرەتێکبوون هەر کام سەرۆکی تایبەتی خۆیی هەبوو (بە ترکی – مەلەك یان پێدەگوت)، لە راستیشدا دەستەڵاتی باڵا لەنێو ئەم نەستوورانەدا لە دەستی بەترەریکەکەیاندابوو (مار شەمعون) کە سەرکردەیەکی کڵێسایی و عیلمانی بوو لە عەینی کاتدا، جا ئەم پلەوپایەیە لەناو بنەماڵەکەی (مار شەمعون)دا پشتاوپشت بۆیان مابۆوە، بەترەریك خۆی رەبەنبوو ( هاوسەرگیری نەدەکرد) بۆیە جێگەکەی دەدرایە خزمێکی نێزیکی، ئیتر گیروگرفت و مشتومڕ کە لەسەر ئەو پایەیە بهاتبا کایەوە، شتێکی سەیر نەبوو.[١٩]

بە پێچەوانەی ئەرمەنەکانەوە، ئەم نەستووریانە بە دەگمەن لووتیان دەژەنیە پیشەسازی و بازرگانی هەرێمی ڤانەوە، عەشرەتەکانیان لە ناوچە

شاخاویەکاندا دەمانەوە، بەڵام ئەوانەی ئێران و هەندێکیان کە لە عەشرەت و هۆز بەدەربوون لە سەڵتەنەی عوسمانیدا، بۆ کارکردن یا سوالکردن دەچوونە رووسیا.[20] هەشیانبوو لە هونەری بیناسازیدا باشبووبوونە وەستای چاك و خانوو و کۆشکی قەشەنگیان بۆ سەرۆك و سەردارە کوردەکان لە خوارووی رۆژهەڵاتدا دروستدەکرد.

ژیانی ئەم نەستووریانە بە توندی بە کوردەکانەوە بەسترابوو، چونکە لە گشت لاوە کورد دەوریاندابوون، لە هاوبەندی و دوژمنایەتیاندا هەمیشە تەرەفداری کوردەکان بوون و شانبەشانیان دەکەوتنە شەڕەوە، بەر لە جەنگی یەکەمی جیهانی، ئەو کوشتارەی (شێخ عوبەیدوڵلا بەدرخان) لە ١٨٤٧ لێی کردن، گەورەترین نەهامەتی وکارەساتێك بوو بەسەر ئەمانەدا هات، بووە هۆی کزبوونی هێزیان لە بەرامبەر هۆزە کوردەکاندا. بەڵام بەریتانیا بۆیان بووە پشتوپەنایەکی ئەوروپایی، سەرۆکی ئوسقوفەکانی (کانتربری) نێرراو مسیۆنێری تایبەت بە خۆنیانی ناردە ناویان و توانیان ژمارەیەك لەوانە بکەنە پرۆتەستانت، ئەمە رێك وەك ئەو نێررا و مسیۆنێرە ئامریکاییانەی ناو نەستووریەکانی ئێران کردیان.[21]

## ● یەهوودەکان

بە گوێرەی سەرژمێریە رەسمیەکانی عوسمانی، یەهوودەکانی ناو هەرێمەکە لە ساڵی ١٩١٢ نێزیکەی ١٤٠٠ کەس بوون. زوربەی ئەمانە دانیشتووی گوند و لادێ دوورە دەستەکان بوون و بە وردی لە سەرژمێریکردنیاندا نەچووبوونە بنج و بنەوانیان، بۆیە خەمڵاندنی ژمارەکەیان راست دەرنەچووبوو. (کوینیە) ژمارەیانی بە پێنج هەزارێك دادەنان.[22] کە ئەمە لە راستیەوە نێزیکترە و جێی بڕوایە.

## ● ئامریکاییەکان.

لەساڵی ١٨٧٠دا بـۆ یەکـەمجار نێردراوەکـانی (ئەنجوومـەنی ئامریکـایی نێردراوەکـان) سـەردانی شـاری ڤانیـان کـرد، لـە ١٨٧٢دا ناوەنـدێکی ئـەم نێردراوانـە لەشارەکەدا کرایـەوە، دکتـۆر (جـۆرج .ك.ڕینـۆڵد) کاروبـاری ئـەو ناوەندەی دەبرد بەڕێوە. سەرەتا لەبەشە کۆنەکەی شـارەکە خانوویـەکیان بـە کرێ گرت، دوایی لە ڤـانی تـازە (گاردن) کۆمەڵگەیـەکی گـەورەیان کـردەوە و لەسـاڵی ١٨٧٥ یەکـەم قوتابخانەیـەکی تایبـەت بـەو نێردراوانـەیان بـۆ کـوڕان کردەوە، بە دوایدا لە ١٨٨١ قوتابخانەیەکی سـەرەتایی و دواناوەندیـەکیان هـەر لە گاردن بۆ کوڕان کردەوە.

بەڵام خاتوو (ڕینـۆڵدز) لـە ١٨٧٩ قوتابخانەیـەکی سـەرەتایی بـۆ کچـان لـە ڤانی کۆندا دامەزران، چـەند پـۆلێکی دواناوەندیشی بـە پاڵیـەوە وەك پاشکۆ تێـدا بـوو، خـۆ کـە سـاڵ بـوو بـە ١٩١٠ چـەند قوتابخانەیـەکی سـەرەتایی و دواناوەندی کوڕان و کچان بە بەشی ناوخۆییشیـەوە لـەکارداوون، ئەمانـە ٩٥٣ قوتابی کوڕ و کچیان گرتبووە خۆ (٤٣٣ کوڕ و ٥٢٠ کـچ) کـە گشـتیان ئەرمـەن بوون. لە ١٨٩٦ ئـەم میسیۆنێرانە کـە لـە شـاری ڤـان دەسـتیان بـە کارەکانیـان کـرد، لـە بـواری کۆمـەك و فریاکەوتنـدا، بەشـێوەیەکی سـنووردار هاوکـاری پزیشـکی و داوودەرمانیـان پێشـکەش دەکـرد دوای ئەمـە پـەرەی سـەند بـۆ بنیاتنـانی نەخۆشـخانەیەکی گشـتی و ئەنجامـدانی نەشـتەرگەری تێیـدا، بەتایبەت پاش هاتنی دکتۆر (کلانس ئۆسش)[٢٢] لەساڵی ١٩٠٠دا.

ئامریکاییەکان خوێنـدن و فێرکردنێکـی سـەردەمیانەی زۆر چاکیان بـۆ مەسیحیەکانی ڤان دەستەبەر دەکرد، هەر وەك لە زۆر جێی تـری سـەڵتەنەی عوسمانیدا کردبوویان. ئەو نێردراو و مسیۆنێرانە بە نیـەتی ئـەوە هاتبوونـە ڤانەوە کە ئەرمەنەکان بکەنە خۆیان و دووریانخەنەوە لـە کڵێسـای گریگـۆری

و بیانخەنە سەر مەزهەبی پرۆتەستانتی.

بەڵام هەر زوو دەرکیان بەوە کرد کە ئەمە کارێکی مەحاڵە، جا بەومنده وازیانهێنا کە قوتابخانە و چالاکیەکانی تریان دەشێ ببنە هۆکار بۆ گۆڕانێکی مەعنەوی لەناو ئەم ئەرمەنانەدا و کڵێساکەشیان وا لێدەکات کە پشت وبە زۆرێك لە بیروباوەڕی پرۆتەستانتی ببەستێ.[24] (رادەی ڕاستی تیۆری یەکەم نەزانراو بوو، بەڵام ئەوە دەرکەوت کە تیۆریەکەی تر ڕێگەیەکی باش بوو بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان) هەرچۆنێك بێ ئەرك و کارەکانی ئەو نێردراوانە جێی پێزانینبوو، ئەویش بەو کەڵك و سوودە ماددیانەی ئەو سەردەمە کە پتر بوون لە کەڵك و سوودە رۆحیەکانی.

## • ئەوروپاییەکان

بە پێچەوانەی شارەکانی رۆژاوای ئەنەدۆڵ و ئەورووپای عوسمانیەوە، شاری ڤان نەبووە بنکە و بارەگەی زۆرێك لە ئەوروپاییەکان، جگە لە رووسەکان کە زۆریان هەر ئەرمەتی باشووری قەفقاس بوون، ئەو ئەوروپاییانەی لە ڤان بوون کارمەندی کونسولگەریەکان بوون یان نێردرا و مسیۆنێر، جا بە سایەی شوێنی ستراتیژی شاری ڤانەوە بیووە جێگەی ژمارەیەك لە کونسولگەریە بیانیەکان، ئێرانی، رووسی، بەریتانی، ئیتاڵی و فرانسایی.[25] ئاڵمانە پرۆتستانتەکان و فرانساییە کاتۆلیکەکان (دۆمێنیکەکان) نێردراوەیەکی تایبەتیان بۆ مەسیحیەکانی ناو ڤان ڕێکخستبوو، هەرچی بەریتانیەکانیش بوو ئەوە نێردراوەیەکیان بۆ نەستووریەکانی باشووری هەرێمەکە ناردبوو، بەڵام چونکە ئەم نێردراوانە نەیانتوانی خەڵکەکە بکەنە خۆیان و لەمەدا سەرکەوتوو نەبوون، ئەوا دەشێت ئاوزەندکرێن بە رێکخراوی خزمەتگوزاری، زانستیان بۆ مەسیحیەکان فەراهەم دەکرد و فریاگوزاری و خزمەتگوزاری پزیشکی و تەندروستی بۆ مەسیحی و

موسـوڵمانان بـە يەكسانی، دۆمينيكـەكان قوتابخانەيـەكيان بـۆ ئەرمەنـەكان كردبـۆوە، لـە سـاڵی ١٨٩٥ نێـردراوە ئينجيليـە ئاڵمانـەكان لـە دامـەزراوەی (كۆمەڵەی ئاڵمانی يەكگرتوو Deutschs Hilfsbund)ەوە گەيشتنە شاری ڤـان تـا كۆمـەك و هاوكـاری پێشكەش بـە مەسـيحيە هـەژارەكانی ئـەو شـارە بكەن، بە هاتنی ١٩١٠ هەر ئەمانە رۆژانە خۆراك و جلوبـەرگيان بـۆ زيـاتر لـە ٥٠٠ هەژار و نەدارا دەستەبەركرد و دابەشيان كرد بەسەرياندا، تا كەمێ بـەر لـە جـەنگی يەكـەمی جيهـانی هـەوڵ و تەقـەللاكانيان لەتـەك نێـردراوە ئامريكاييەكانـدا يەكخسـت بـۆ كـاری كۆمـەك و يارمەتيـدان، ئاڵمانـەكان قوتابخانەيـەكی كـوڕان و يـەكێكی كچـانيان كـردەوە، يـانزە مامۆسـتا و ٢٢٨ قوتابيان لە خۆگرتبوو.[٣٦]

## ● كشتوكاڵ و ئاژەڵداری

دەوڵەتی عوسمانی لە هەرێمی ڤانـدا خـەريكی سـەرژمێريكردنێك بـوو لـە بـواری كشـتوكاڵدا، بـەڵام ئەنجامـەكانی تـەنيا هـەر خەملا نـدنێكبوون و هيچی تر، چونكە ژمـارەی ئەوانـەی كارەكـەيان ئـەنجام دەدا كـەمبوون و پيـا رانەدەگەيشتن كە ئەو هەموو مەڕومالاَت و كێڵگە و باخاتانە سەرژمێريكەن، هەروا زانياری تەواويش دەربارەی ئەوانە لەلايەن خاوەنەكانيانـەوە نـەدەدرا، چونكە سەرانە لەسەر هەرئاژەڵێك لـە خاوەنەكـەی دەسـەندرا، ئەمـە وای لـە فەلا و ئاژەڵدارەكان كرد كـە مالاَتـەكانيان بشارنەوە و درۆ لەگـەڵ (بـاجگر و قۆڵچی و فەرمانبەرانی باج و دەرامەتی دەوڵەتدا بكەن)[*]

---

[*] * قۆڵچی: ئەو كەسـەی لەلايـەن دەوڵەتـەوە دادەنـرا بـۆ كۆكردنـەوە و سـەندنی بـاج لـە ئاژەڵدار و فەلاحـەكان، يـان لەسـەر ڕێگـەكانی هاتنـە نـاو شـارەكانەوە باجيـان لـەو بـار و كاروانـە بەروبوومانـە دەسـەند كـە بـۆ فرۆشـتن لادێييـەكان دەيانهێنـان بـۆ شـار. "وەرگێڕ"

لە راستیشدا ئەو جۆرە سەرژمێریە کارێکی مەترسیداربوو، بۆیە ئەوانەی سەرژمێری مالاتی عەشرەتە کوردەکانیان دەکرد، دەبوو سەرباز یاوەریان بێ تا بیانپارێزن، هەرچۆنێکبێ خەملاندنە رەسمیەکان تا رادەیە زانیاری ئەوتۆمان دەدەنێ تا بزانرێ لە ڤاندا بەلانی کەمەوە چەندە بەرهەم دەهێنرا، چونکە زانینێکی وردی راستەقینەی ئەوە مەحالە.

گەنم بەرهەمێکی سەرەکی هەرێمەکە بوو، دوای ئەم جۆ بە پلەی دووەم، ئینجا جاودار بە پلەی پانزەهەم، بەلام دانەوێلەکانی تر بە برێکی کەم بەرهەم دەهێنران، سەرەرای ئەمەش لە ڤان بەزۆری گەنم بەرهەم نەدەهێنرا، بەشی هەر تاکێك لەم هەرێمەدا سێیەکی بەشی هەر تاکێك بوو لە هەرێمەکانی ئەرزرۆم و ئەنکارا.[٢٧]

ئەمەش بۆ کەمی زەوی لەبار دەگەرێتەوە کە بۆ چاندنی دانەوێلە بشێ، بۆیە سالانە گەنم و جۆ و ئارد لە هەرێمەکانی ترەوە هاوردە دەکران. کەمی باران و هەندێ کەرەت وشکەسالی وای لە جوتیارەکان کردبوو کە ئاو لە رووبارەکانەوە هەلگرن بۆ ئاودانی هەندێ میوە هاتی: کالەك، شووتی، ترێ، سێو ، ڤەیسی، هەرمێ، گێلاس (بە ترکی ڤشنە) و بەهێ.[٢٨]

جا بەوپێیەی کە ئاودانیش بە شێوەی سەرەتایی و دواکەوتووەکەی ئەنجام دەدرا، ئەوا ئیمکانیەتی بەرهەمهێنان سنووردا بوو، بۆ نموونە: بەشی هەرتاکێك لە ترێ یەك لە سەر بیست بوو، بە بەراورد لەگەل هەرێمی (ئایدن) لە رۆژاوای ئەنەدۆڵ کەلەوێ ئاووهەواکەی باشتر و لەبارترە، بەلام لەبارەی سرکە و شەرابکردنەوە لەو ترێیە، ڤان وا لە سەرەوەی لیستی ئەوانەی ئەو بەرهەمە دەکەن و ئاستی باشی هەرتاکێك لەو بەرهەمە زیاترە.[٢٩]

کێلگە ناوخۆییەکان بەشێکی کەم لە سەوزەواتیان بەرهەم دەهێنا، ئەمەش ببوە هۆی بەدخۆراکیەك لە سیستمی خۆراکی خەلکەکە، بۆیە

ئەوەی بەرهەمیش دەهێنرا زیاتر ئەو بابەتانەبوون کە بۆ ماوەیکی زۆر دەهێڵدرانەوە و خراپ نەدەبوون، وەك: پیاز، نیسك، فاسۆلیای سەوز، پاقلە (بە ترکی بکلا) و بامێ، گوێز بەرهەمێکی ئاساسی بوو بۆ خواردنو بەکاربردنی ناوخۆ و بگرە ناردنە دەرەوەیشی. بەشێکی کەمیش لەبایام و بستەش بەرهەم دەهات، تۆوکەتانیش لەو بەروبوومانە بوون کە دەنێردرایە دەرەوە بۆ (ڕۆن گرتن لێی) و هەروەها تووتنیش.[٢٠]

سروشتی هەڵکەوتووی شاخاوی دەڤەرەکە وای کردووە کە ئەو ئاژەڵانەی وان لەو ناوە دیاریکراوبن: کەمەکێك وشتر (ئەگەر ببێ)، بزنێکی زۆر، ئاژەڵی بەرزە بەزۆری کەر و نێستر، گا و گامێش بۆ کێڵان بەکار دەهێنران بەپاڵ کەر و نێسترەوە (جاروبارێش ئەسپ). بەخێوکردنی مەڕ (کە لە ڕووی ژمارەوە یەکەمە) و بزن (بە پلەی دوو) بۆ خوری و مووەکەیان تا هەناردە بکرێن و سەرەڕای گۆشت و شیر و چەوریەکەیان، بە پێچەوانەی باکووری دەڤەری (ئەرزڕۆم)ەوە کە بەناوێیە بە بەرهەمهێنانی گۆشتی مانگا، بۆ هەر تاکێك ژمارەی مانگا لە دەڤەری ڤان یەکسانە بە ژمارەی مانگاکانی گشت ناوچەکانی تری ئەنەدۆڵ.[٢١]

لەچاو ناوچەکانی تری ئەنەدۆڵدا ئەسپ لەناو ئەماندا هێند باوی نەبوو، ئەوەیش هەبوو زۆربەی هی عەشایرە کوردەکان بوو، بۆ هاتوچۆ بەکاریان دەهێنا وەیان زۆریان دەکردن و بە ڕەوگ دەیانفرۆشتن.

باقی دانیشتوانی ڤان بە کەر یان بە پێ هاتوچۆیان دەکرد، بەنرخترین هەناردەکردنێکیش کە هەرێمەکە بازرگانی پێوە دەکرد خوری و موو، پێستە و ئەو کەلوپەلانەی لێیان دروستدەکران، هەروا ئاژەڵی زیندووش.

لە ڕووی کشتوکاڵەوە بە گشتی هەرێمەکە نەدارا و دەستکورت بوو، هەتا لە ساڵانی خۆشی و فەرحانیدا، هەر هێندەی دەدا کە بەشی خواردنی خۆیان بکات، (خۆ بژێوی بە ئیستیلاحی تازە) بەڵام هەرگیز لێی پاشکەوت

نەدەخرا بۆ تەنگانەی قاتوقڕی و گرانی کە ماوەی دەخایاند، سەختترینیان ئەو گرانیە بوو کە لە نێوان ١٨٧٨ - ٨٠ درێژەی کێشا. بەڵام ڤان لە خۆیدا بەردەوام بەرەو ڕووی سوکە گرانی و قاتوقڕی دەبۆوە، دەوڵەتیش ئەوەی بۆی دەکرا لە کۆمەك و یارمەتیدانی خەڵکە نەبووە برسیەکە دریغی نەدەکرد (لەناچارکردنی پارەدار و دەوڵەمەندەکان تا لە دانەوێڵەکانیان بەشێ بدەن، سزادانی ئەوانەش کە گرانفرۆشیان دەکرد و.... هتد) بەڵام هەر لەو کاتەدا دەوڵەت ئەو دەستەڵاتەی نەبوو تا دەرەقەتی ئەو تاوان و سەرپێچیانە بێت و سزایان بدات، بەتایبەت لە دەرەوەی شارەکان و دەوروبەریان.[٣٢]

جگە لە گرانی و قات و قڕیەکەی ١٨٧٨ - ٨٠ هیچ کامێکی تر لەو تەنگژانە نەبوونە هۆی پەرێشانکردن و برسیکردنی دانیشتوانی شارەکان، ئەمە جیا لە گوندنشینەکان کە زۆربەی کەرەت قوڕبەسەریەکە بەرۆکی ئەوانی دەگرتەوە.[٣٣]

موسوڵمان و مەسیحیەکان لەو کاتانەدا وەك یەك گیرۆدە بوون، بە دەستنەبوونی و برسێتیەوە، بەڵام ئەرمەنەکان بەشێکی زۆر لە یارمەتی و کۆمەکیە دەرەکیەکانیان پێدەگەیی، زوربەی کەرەت ئەو کۆمەکانەی ئامریکا و بەریتانیا تایبەت بوو بۆ ئەرمەن و نەستووریەکان، بەڵام کۆمەك و یارمەتیە کەمەکانی دەوڵەت بۆ هەمووان بوو.[٣٤] ئیتر ئا ئەم واقیعە وایکردبوو کە نێزیکبوونەوەی موسوڵمانەکان لە مەسیحیەکانی ناوخۆ و دەرەوە کارێکی مەحاڵبێ.

جارێك، نێردراوە ئامریکاییەکان کۆمەکیان دەدایە خێزانە ئەرمەنەکان، پاشان زانیان هەندێ لەو خێزانانە بوونەتە کاتۆلیك و چوونەتە پاڵ کڵێسای کاتۆلیکی ئەرمەن، نێردراوەکان چوونە لای کونسوڵی بەریتانیا کە سەرپەرشتی دابەشکردنی یارمەتیەکانی دەکرد و داوایان لێکرد ئەو پارەیان

بۆ بگێڕێتەوە کە دراوە بە کاتۆلیکەکان، پێیان لەسەر ئەوە دادەگرت کە ئەو و یارمەتی و کۆمەکانە تەنیا بۆ ئەرمەنە گریگۆری و پرۆتستانتەکانە نەک کەسی دی، بەڵام کونسۆڵ داواکەی ڕەتکردنەوە.[٢٥]

بە درێژایی مێژوو هێرش و پەلامارەکانی شیعەکانی ئێران، ئاوبەناو کە دەهات باری ئابووری و کشتوکاڵی تێکدەدا و دوای دەخست، هەر بەم چەشنەش شاڵاو وپەلاماری عوسمانیان بۆسەر ئێران، کەچی ئەم پەلامار و داگیرکاریانە لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەدا نەدەبوونە هۆی کێشەی زیاتر، بەڵکو نەبوونی ئاسایشی ناوخۆ لە هەرێمەکەدا بەلای جوتیارانەوە بەڵاو کارەساتی گەورەبوو، بەتایبەت بە سایەی ئەو شەڕ و شۆڕانەی نێوان عەشایرە کوردەکان و پەلاماردانیان بۆسەر یەکتر.

## ● فێرکردن

بە زەبری خوێندەواری و فێرکردنەکەوە بوو کە توێژاڵی ئەرمەن توانیبویان لە ڕووی ئابووریەوە باڵادەستبن،[٢٦] هەر کە دەستیان دایە ناردنی منداڵەکانیان بۆ قوتابخانە تازەکان کە دەکرانەوە لە شارەکەدا، ئیتر لەو هەلەی ڕەخسابوو بۆیان بەباشی سوودمەندبوون و وبگرە پێش موسوڵمانەکان کەوتن (هەردوو خشتەی ٤ - ٢ ، ٥ - ٢).

هەتا سەرەتای سەدەی بیستیش قوتابخانەی موسوڵمانەکان هەر لەسەر بنەمایەکی ئایینی تەقلیدی بوو و بەڕێوەدەچوو، بەجۆرێ قوتابیانی سەرەتایی قورئانیان پێ لەبەردەکردن و فێری نوێژ و ڕەوشتی باش و نووسین دەبوون، ئیتر ئاو بێنە و دەست بشۆ، خۆ ئەوەی تۆزێك شانسدار بوایە دەگەیشتە دواناوەندیە ئیسلامیەکان و لەوێ خوێندنەوە و نووسینێکی باش فێردەبوو، بەڵام توخنی هیچ دەرسێکی بیرکاری و زانستە پێشکەوتووەکان نەدەکەوت، لەولاشەوە قوتابخانەی ئەرمەنەکان لە

هەلومەرجێکی باڵاتر و وباشتردا بوو.[37]

کە بەراوردی ژمارەی قوتابیە موسوڵمانەکان بەوانەی ئەرمەنەکان دەکرێ، بەبێ دوودڵی دەردەکەوێ کام کۆمەڵیان لە بواری فێرکردندا لە پێشەوە بووە، لە هەر ۲۵۰ ئەرمەنی ناو هەرێمەکە یەکێکیان گەیشتبووە دواناوەندی، بەڵام لەناو موسوڵمانەکاندا ئەم رێژەیە لە یەك بۆ ۱۵۰۰ تێنەپەڕیبوو، جا گەنجە ئەرمەنەکان کە دەگەیشتنە دواناوەندی زیاتر لە پێش دەبوون.

بەڵام ئەوەی دەشێ بگوترێ کە هیچ کام لەم دوو لایەنە لە ئاستێکدا نەبوون کە پەسەنکرێن. بە بەراورد لەگەڵ ئەم سەردەمەدا دەردەکەوێ کە رێژەکە لە کۆماری ترکیادا لەساڵی ۲۰۰۰ گەیشتۆتە یەك بۆ ۱۳.[38]

جێی باسە ئەم ژمارانەی باس لە رێژەی خوێندن دەکەن لە قوتابخانە ئەرمەنەکاندا بەدەرن لەوانەی کە ئامریکایی و نێردراوەکان کردبوویاننەوە. ئەو فێرکردنە تازەیەی کە قوتابخانە ئامریکایی و نێردراوەکان دەستەبەریان کردبوو تەنیا بۆ ئەرمەنەکان بوو، لە ۱۸۷۲ ۷۳ و ساڵی دواتریش نێردراوە ئامریکاییەکان قوتابخانەیەکی سەرەتایی و یەکێکی دواناوەندیان کردەوە، دەستیشیان دایە دامەزراندنی دواناوەندییەك بۆ کچان، کە ۱۸۹۸یش هات دواناوەندیەکەی کوڕان هەشتا قوتابی تێدابوو بەرامبەر نەوەت لە کچاندا، سەرەتاییەکەشی چل و یەك قوتابی.[39]

بەڵام باقی تایفەکانی تر، خۆیان خەرجی قوتابخانەکانیان دابین دەکرد، بە گوێرەی خەملاندنەکەی (کۆینیە) ئەو دوو قوتابخانە کلدانیەی لە (کیفاز)دا بوون لە ساڵی ۱۹۰۰ پەنجا قوتابیان تێدابوو، شەست قوتابیش لە دوو قوتابخانەی یەهوودیدا، یەکیان لە (بشکالە) و ئەویدی لە (دیزا).[40]

هەرچەندە حوکمەت دەسترۆیشتووش نەبوو و تواناکانی سنووردار بوون، بەڵام لە کۆتایی سەدەی نۆزدەدا، دەستی دایە کارکردن بۆ بەرزکردنەوە

ئاستی خوێندن، ڕاپۆرتەکان ئیشارە بەوە دەدەن کە لە ١٨٧٦دوە ٢٧ قوتابخانەی تازە لە هەرێمەکەدا بنیاتنرا، لەمانە پانزەیان قوتابخانەی سەرەتایی نوێبوون، لە ساڵانی ئایندەشدا ڕەوتی بنیاتنانی قوتابخانە خێراتر بوو، لە ١٨٩٠ - ١٩٠٠ نۆزدە قوتابخانە کرانەوە، دواناوەندییەکان لە شارەکانی ڤان، کیڤاش، ئیدریمیت، ئیرکیش، ئەدیلکیفاس، ئیلباک، گیڤار و جۆلە مێرگ.[41]

لە ساڵانی ١٨٧١ - ٩٨ ژمارەی قوتابخانەکانی دەوڵەت (ئیسلامی) دوو ئەوەندەی لێهات و گەیشتە ١٢٥ قوتابخانە.[42] ئەمەش دەستەکەوتێکی چاک بوو، بەڵام ئەم ژمارەیە تەنیا ئەوەی دەگەیاند کە هەر ٢٢٠٠ موسڵمانێک یەک قوتابخانەیان هەبووە (قوتابخانە ئیسلامیە تەقلیدیەکان لە تەک تازەکاندا یەکتریان تەواو دەکرد: لەساڵی ١٩٠٠ ژمارەی قوتابیانی ناو مزگەوتەکان — فەقێ - لە هەرێمەکەدا ١٠٥ قوتابی بوون).[43]

لە ئاستی پراکتیزەکردنیشدا قوتابخانەکانی دەوڵەت لە هەرێمی ڤان تەنیا موسوڵمانانی وەردەگرت، کەچی لە هەرێمەکانی تردا مەسیحیشیان تێدا هەبوو، بەڵام ئەرمەنەکان دەچوونە قوتابخانە تایبەتەکانی خۆیان. مێژوو نووسەکانی ئەم دواییەش ئاماژە بەوە دەدەن کە هەرکام لە موسڵمانان و ئەرمەنەکان دەرکیان بە کەڵک و بایەخی زانست کردبوو، جا هەردوولا لە بواری فێربووندا پێشبڕکێیان بوو، بەتایبەت لەکاتی شۆڕشەکەی ١٩٠٨.[44] هەموان هەوڵ و کۆششیان چڕ کردبۆوە، هەرچەندە ئەرمەنەکان لە رووی ئابووریەوە باشتربوون، بۆیە ئەم کێبڕکێیەیان ببوە هۆی سەرنجی ئامریکاییەکان و بەپێی بۆچوونی تایبەتی خۆیان وایان لێکدەدایەوە کە: (کۆمەڵێ ڕێکخراوی ئەرمەنی کاردەکەن بۆ چەسپاندنی کارەکانیان، بەڵام بەداخەوە، زۆر لەم کارانەیان کاریگەریەکی خراپ و دژ بە ئایین جێدەهێڵێ، کە دەشێ ڕەوشتی خەڵکی تێکدا، حوکمەتیش هاتۆتە ناوەوە، لەوانەیە

بخوازێ کە دەست بەسەر بوارەکەدا بگرێ و قوتابخانەکان بکاتە هۆیەک بۆ برەودان بەبواری موسوڵمانێتی).[45]

حوکمەتە هەرێمەکەی ڤان لە ساڵی ١٨٨٩ - ٩٠ چاپخانەیەکی دامەزراند، سەرەتا چاپخانەیەکی سادە بوو، کارەکانی بە چاپێکی (حەجەری - دەستنووسی) ئەنجام دەدا، نەک بە شێوەی پیتچنی، ڕۆژنامەیەکی ڕەسمیشی لە ڤان دەردەکرد بە زمانی ترکی. دوای دە ساڵ گۆڕانکارییەکی ئەوتۆی تێدا نەکرا،[46] لەبەرامبەردا ئەرمەنەکانی ڤان لە ڕووی چاپ و بواری ئەدەبیدا گەلێ چالاک بوون، لە ١٨٥٥ - ٥٦ و ١٨٥٨ - ٦٤ گۆڤاری (هەڵۆی ڤان)یان دەردەکرد، بەدویدا بڵاوکراوەی تر، زۆری نەخایاند لە ١٩١٤دا لەشارەکەدا دوو ڕۆژنامەی ئەرمەنی هەفتانە دەردەچوون: (Ashkhatank - کار) کە حیزبی (تاشناق) دەری دەکرد، (Van - Tosp)

## خشتەی ٤ - ٢ قوتابخانەکانی ڤان لە ساڵی ١٨٧١ - ٧٢

| قەزاو دەفەر و ناحیە و گوندەکان* | قوتابخانەی سەرەتایی مەسیحی | قوتابخانەی سەرەتایی موسوڵمانەکان | دواناوەندی موسوڵمانەکان |
|---|---|---|---|
| قەزای ڤان | ٦ | ٣٠ | ٦ |
| قەزای کیڤاز | - | - | - |
| قەزای جۆلەمێرگ | - | ٣ | ٣ |
| قەزای ئەلباک (بشکالە) | ٢ | ١ | ١ |
| قەزای مەحموودی | - | - | ٢ |
| قەزای ئیرکیش | ٣ | ٣ | ٧ |
| قەزای ئەدیلکیفاس | ٥ | ٢ | - |

| | | | |
|---|---|---|---|
| قەزای موکس | ٣ | ١٥ | ٢ |
| قەزای گیڤاش | ٢ | ٧ | - |
| قەزای جاتاك | ١ | ١ | ٤ |
| ناحیەی نەباگا | - | - | - |
| ناحیەی شەمدینان | - | ٤ | ٨ |
| ناحیەی هۆمارۆ | - | - | ١ |
| ناحیەی گۆرامار | - | - | - |
| ناحیەی بەیت شەباب | - | - | - |
| ناحیەی کال | - | ١ | ٢ |
| ناحیەی هوشاب | - | - | ١ |
| ناحیەی بارگیری | - | - | ١ |
| ناحیەی کارجیکان | - | - | |
| ناحیەی کاستان | - | - | ١ |
| ناحیەی نوردوس | - | - | - |
| کۆی گشتی | ٢١ | ٦٧ | ٣٨ |

* (ولایە) پێك دێت لە هەرێم (Sancak) کە ئەو قەزایە دەگرێتەوە و ئەویش دابەشدەبێ بە (ناحیە)کان و ئەمانیش بە (گوند)ەکان.

سەرچاوە: Salname-I vilayet-I Erzurum, Hicri ١٢٨٨ Senesi (Erzurum: vilayet-matbaasi, ١٢٨٩) p ٨-١٤)

ئەم سەرژمێریانە زۆر کۆنن، ئەوکاتەی زانیاریەکان لەسەڵتەنەی عوسمانیدا کەمبوون، بۆیە ئەم ژمارانە تەنیا بۆ نیشاندانێکی (تقریبی) ڕێژەیی ئەو قوتابخانە و بینایانە بەکاردێن.

جێی باسە ئەم سەرژمێریە قوتابخانەی پەهوودەکان ناگرێتەوە، تەنیا ئەوانەیە کە ڕەسمی بوون و لە لیستەکاندا تۆمارکراون.

**خشتەی ٥ - ٢ قوتابخانە دواناوەندییەکانی ئەرمەن و موسوڵمانەکان لە هەرێمی ڤان**

| ساڵ | دواناوەندی موسوڵمان | قوتابی موسوڵمان | دواناوەندی ئەرمەن | قوتابی ئەرمەن | دواناوەندی ئامریکایی | قوتابی ئەرمەن |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١٨٨٨ | ٥ | ٢١١ | - | - | - | - |
| ١٨٩٧ - ١٨٩٨ | ٨ | ٢٠٧ | - | - | - | - |
| ١٨٩٨ - ١٨٩٩ | ٨ | ١٥٧ | ٧ | ٧٨٠ | - | - |
| ١٨٩٩ - ١٩٠٠ | ٨ | ٢٠٥ | - | - | ١ | ٣٩٠ |
| ١٩٠٠ - ١٩٠١ | ٨ | ٢١٢ | ٧ | ٩٧٠ | ١ | ٣٩٠ |
| ١٩٠١ - ١٩٠٢ | ٨ | ٢٠١ | ٩ | ١٠٧٠ | ١ | ٣٩٠ |
| ١٩٠٣ - ١٩٠٤ | ٨ | ٢٠١ | ٩ | ١٠٧٠ | ١ | ٣٩٠ |

**سەرچاوە: ساڵنامە شاهانە عوسمانیەکان، هەرێمیەکان و فێرکردنەکان.**

Salname-I devlet-I aliyye-I osmaniyye (Istanbul matbaa amire.1306) p.210

جێی باسە ئەو ساڵانەی لە خشتەکەدان و لە سەرژمێریەکانی تردان کە پەیوەندن بە خوێندن و فێرکردنەوە، ئەو ساڵانەیە کە زانیاریەکانی تێدا بڵاوکراونەتەوە، لەوانەیە ئیشارەش بەساڵانی پێشوو بدەن، بەڵام بێگومان ئەم زانیاریانە وردە وردە کۆکراونەتەوە و خەمڵێنراون. جا نەبوونی زانیاریەکان لە خشتەکەدا (وەك ساڵی ١٨٩٩ - ١٩٠٠) مانای ئەوە نییە کە نەبوون بەڵکو لەسەرچاوە رەسمیەکەوە زانیاریەکە نەهاتووە.

(ڤان تۆسپ) کە حیزبی (ئەرمیناکا)ی لیبراڵ دەری دەکرد، لەپاش شۆرشی ١٩٠٨یش تاشناقەکان چەند نامیلکەیەکی سیاسیان بڵاوکردەوە.[٤٧]

ڤان دەمێکبوو ببوە نێوەندی رۆشنبیری ئەرمەنی،[٤٨] (ئەناهید تێر میناسیان) وای بۆ دەچێ و لێکیدەداتەوە کە لە٧٠٪ی ئەرمەنەکانی ناو شارەکە و ٣٠٪ ئەرمەنی ناو لادێکان خوێندەوار بوون،[٤٩] لە راستیدا ئەم ژمارەیە زێدەرۆیی ها تێدا، بەتایبەت هی لادێکان، بەڵام دەلیل بۆ ئاستی بەرزی خوێندەواری لەناوچەکەدا ئەوەیە کە بۆچوون و لێکدانەوەی تر لەم چەشنە لەناوچەکەدا نیە تا بەراورد کرێ لەگەڵ ئاستی خوێندەواری موسوڵمانەکانی ڤاندا، بەڵام بێگومان رێژەکە لای ئەم بەشە (موسوڵمانەکان) زیاتر لە نزمیدا بووە.

لە شارەکەدا کتێبخانە گشتییەکان زۆر بڵاونەبوون، جگە لە کتێبخانەی (مزگەوتی گەورە) کە سیمایەکی ئاینی لە خۆی گرتبوو، ئیدی تەنیا یەك کتێبخانەی دی هەبوو کە کتێبخانەی (ئیسکەندەر پاشا) بوو، تەنیا ٤٣ کتێبی لەخۆ گرتبوو، بەڵام کتێبخانەی (شێخ) لە (ئەلباك) سێ سەد کتێبی تێدا بووە.[٥٠] واش مەزندە دەکرا کە کتێبخانە جۆراوجۆرەکان هەرکام کتێبخانەی خۆیان بووبێ بۆ قوتابییەکانیان.

ئاشکرێ بایەخێکی ئەوتۆ نەدرێتە کاریگەری ئەو جیاوازیانەی بواری پەروەردە و فێرکردن کە لەنێوان ئەرمەنەکان و موسوڵمانەکاندا هەستی

پێدەگرا، ئەو دەلاقەیەی نێوان ئەم دوو لایەنە لەسەر ئاستی بەدەستهێنانی زانست و پلەی خوێندن لەدەڤەرەکانی رۆژاوا و باکووری سەڵتەنەکەدا گەلێ فراوانتر بوو، لەوێکانی جیاوازیەکە هەرچەند زۆربوو بەڵام لەچاو شارەکانی تری هەرێمەکە ئەهوەنتربوو.

ئەرمەنەکان رۆشنبیرتر و شارەزاتربوون لە نووسین و خوێندنەوەدا، بەڵام لە لادێکاندا ئاستی هەردوولا لێکنزیکبوو، تا ئەم دواییەش قوتابخانە لە لادێکاندا بۆ ئەرمەنەکان نەکرابۆوە، بۆیە تا پێش ١٩١٤ کاریگەریەکەی دەرنەدەکەوت. بەڵام لە هەرێمی ڤان زوربەی ئەرمەن و زیاتریش لە موسوڵمانەکان نەخوێندەواربوون.

## ● بایەخی ڤان لەرووی بازرگانیەوە

بەپێی ساڵنامەی هەرێمی ئەرزرۆم بۆ ١٨٧١ - ٧٢ خەڵکی شاری ڤان و دەوروبەری جۆرە ڤیرێکیان بۆ بیناسازی بەکاردەهێنا کە لە تەختاییەکەی سەر قەڵای ڤان دەریاندەهێنا، هەروا جۆرە سۆدەیەك کە لە دەریاچەکان دەریاندەهێناو وشکیان دەکردەوە، پێیان دەگوت (بیریك)، وەك سابوون بەکاریاندەهێنا.

لە ڤان هەندێ کانزای بەکەڵك هەبوو: زیو بەکەمی، قورقوشم لە جاتاك، ئۆکسیدی ئاسن لە گیڤاش، خوێ لە نێزیك ڤان، خەڵوز لە (ئەکجاری) لەگوێ رووباری (کاراسو) و لە (بشکاله) و بۆرەك دیسان لە بشکاله. لە هەندێ ناوچەشدا دەباشیرێکی چاکیشیان دەردەهێنا، بۆ بەرهەمهێنانی نەوت و پوختەکردنی. دەوڵەت لە گوندی (گورزوت)ی قەزای (بارگیری) کار ئاسانیەکی باشی کردبوو، هەرلە ڤان هەندێ کانی بچوك بچوکی تێدابوو بەڵام بەهۆی دەوروەدەستی و سەختی کاری دەرهێنانەکانیان، لە رووی ئابووریەوە بەکاربردنیان هێند ئاسان نەبوو، قازانج سەری مایەی

دەخوارد. لە دۆڵی (زیلان) کانیاوی گۆگرد هەبوو، لە (بیسان)یش کانیاوی کاربۆناتی ئاسن، بەڵام ڤان قەتاوقەت جێیەکی مولایم نەبوو بۆ دامەزراندنی (گەراو) و گەرماوی تەندروستی لە بواری نەخۆشیەکانی پێست یا گەشتوگوزار.

ئەو پلانانەی بەمەبەستی بەکاربردنی کانزای وەك زەرنیخی زەرد کە لە قەزای (جۆلەمێرگ) دۆزرابۆوە، جگە لە دەرەنجامێکی کز و کەمبایەخ نەبێ هیچیکەی لێ حاسڵ نەبوو، دەوڵەت ژمارەی ئەو کانزایانەی کە پێیوابوو لەو هەرێمەدا بوونیان هەیە بە ٦٧ جۆر خەمڵاندبوونی کە زۆریان بەکارنەدەبران.[٥١]

لەسەرەتادا وا دەردەکەوت کە ڤان بۆ پیشەسازی دار و تەختە لەبار نەبێ، کەچی کەرەستەکانی ئەو پیشەیەشی تێدا دەستدەکەوت، دانیشتوانی قەزای (گیڤاش) و ناحیەی (کارجیکان) کەڵکێکی باشیان لە رواندنی درەختی سنەوبەر و عەرعەر دەدیەوە بەهۆی تەختەکانیانەوە، جگە لە داری درەختی تر بۆ فرۆتن.[٥٢]

لەناو دەریاچەی ڤان بازاری کەشتی و کەڵەك بۆ پەرینەوە و گواستنەوە گەرمبوو، لە هەرێمەکەدا پانایی هەندێ رووبار رێی ئەوەی دەدا کە بۆ گواستنەوە و هاتوچۆ بەکار بێت، بەڵام ئەمەش تا رادەیەك بوو، وەك دوو رووبار لە رۆژاوای (جاتاك) و رووباری (بەندیماهی) کە لە دەشتاییەکانەوە دەرژایە دەریاچەی ڤان، رووباری (کوتوور) کە لە ناحیەی (ئیلباك)ەوە دێت و دەرژێتە (خۆی) لە ئێران. بەڵام رووباری (زێی گەورە) دەرژایە دیجلەوە. بەگشتی گواستنەوە لە رووبارەکانی ناو هەریمەکەدا زۆر کز بوو.

دەڵێن گوایە یەك لەو کانیاوە کبریتیانەی ناو دۆڵی زیلان لە قەزای (ئیرکیش) بۆ چارەسەری ئاڵوشی و رۆماتیزم و بیرۆ بەکاویەکە.[٥٣]

## ● پیشەسازی

بە سایەی شوێنی شارەکەوە کە لەسەر یەك لە دەریاچە گەورەکانی نەنەدۆڵ و نێزیکیش لە سنووری ئێرانەوە، هەر لە دێر زەمانەوە بۆتە جێی دوو جۆر پیشە: بنیاتنانی کەشتی و دروستکردنی بەلەم، چەخماخسازی ( دروست کردنی چەك و فیشەك داگرتنەوە) . لەسەدەکانی شانزە و حەڤدەدا، ڤان ببووە سەربازگەیەك بۆ لەشکری عوسمانی لە دەڤەرەکەدا.

چەکی هەمە جۆر لە شاردا دروست دەکرا، وەك: شمشێر، تفەنگ، گرێکارانی بیناسازی رواڵەتێکی سەربازیان گرتبووەخۆ، یان هەرنەبێ بە سوپاوە پەیوەستبوون چونکە زیاتر بە بینا و دامەزراوەکانی سوپاوە خەریکبوون و خانووبەرەی نەوانیان دروستدەکرد.[٥]

لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەدا، رواڵەتە پیشەیەکەی ڤان گۆڕا، چونکە ئێران نیدی ئەو مەترسیە سەربازیەی نەما، سەربازگەکانیش وردە وردە کەمبوونەوە، ئەمەش بوە هۆی ئەوەی هەتا بەر لە جەنگی یەکەمی جیهانی کاری بیناسازی سەربازی کەمببێتەوە، لە کارگە بچوکەکانی چەخماخسازیدا بەرهەمهێنانی چەکی تازە و پێشکەوتوو بۆ شەڕ پەکی کەوتبوو، بۆیە تەنیا پیشەسازی کەلوپەلی بەکاربردنی رۆژانە بۆ خەڵکی شارەکە و گوندەکانی بەرهەمدەهێنرا، وەك: پێڵاو، جلوبەرگ، ڤاپوڤاچاغ، خشڵ و زێڕنگەری، زین و کورتانی ولاخ، عەرەبانە و گالیسکە و لەم بابەتانە.

جگە لە باڵەخانەیەکی دەوڵەت نەبێ کە لە سەردەمی (عەبدولحەمیدی دووەم)دا بە تەرزێکی نوێتر بنیات نرابوو، نیتر بینا و باڵەخانەکانی دی هەروا لەسەر شێوازە کۆنە سوننەتیەکە کرابوون، لە خشتی کاڵ (قور کە لە کوورەدا سوور نەکرابێتەوە)و تەختە هەروەك چۆن لە دێر زەمانەوە بۆیان مابۆوە.

هەندێ کەلوپەلی چاك و بەنرخ لە شارەکەدا بەرهەم دەهات، بەتایبەت قوماش و جلوبەرگ کە بەدەست دەدوران، شاڵو پاڵتۆ و قوماشی سوور و سپی ڤان لە ئەستەمولْ و شارانی دی ڕەواجێکی باشیان هەبوو و لەدوی دەگەڕان.[55] هەروا ئەرزرۆمیش بازاڕێکی باشی ساغکردنەوەی بەرهەمەکانی ڤان بوو، ئەم بازاڕانە هەلی کاری باشی بۆ کاری چنین و ڕستنو جۆلایی و بازرگان و وەستاکانی کەرەستەی بینا و ئەو شتانەی بۆ بازرگانی پێویست بوون ڕەخساندبوو، دیسان کەلوپەلی دروستکراو لە چەرم، بەرماڵ و کلیم (جۆرە بەرماڵی بۆ نوێژ یا بۆ جوانی)، فەرشی ڤان کە عەشایرە کوردەکان دەیانچنی و بەرهەمیان دەهێنا گرانبەها و دەگمەنبوو، لە گشت لایەکی سەڵتەنەوە خۆیان بۆ دەکوتا.[56]

خشتەی ٦ - ٢ بریتیە لە خەمڵاندنەکانی (فیتال کوێنیە) سەبارەت بە بەرهەمی پیشەسازی لە ڤان:

**خشتەی ٦-٢ بەرهەمی پیشەسازی (دەستکرد ) لە هەرێمی ڤان ( جگە لە هەکاری ) لە دەوروبەری ١٨٩٠دا**

| کەلوپەل | ژمارەی دەزگە و دوکان | ژمارەی کرێکار | بەرهەم | هەرنارده | نرخی گشتی بە لیرە |
|---|---|---|---|---|---|
| قوماشی خوری و لۆکەی هەرزان | ٩٠٠ | ٢٢٠٠ | ٩٠٠٠٠ | ٢٠٥٠٠ | ١٧٠٠٠ |
| جلوبەرگی خوری و لۆکە | ١٠٠ | ٣٠٠ | ٦٠٠٠ | ٢٠٠ | ١١٠٠٠ |
| شاڵی موهێر | ٩٠ | ٢٧٠ | ٦٠٠٠ | ٢٠٠٠ | ٢٤٠٠ |
| جلوبەرگی موهێر | ٤٥ | ١٣٥ | ٣٠٠٠ | ٢٠٠ | ٣٦٠٠ |

| تافته | ١٠ | ٢٠ | ٦٠٠ | - | ١٢٠٠ |
|---|---|---|---|---|---|
| جلوبەرگی ژنانە لە تافتە | ٥ | ١٠ | ٣٠٠ | - | ١٥٠٠ |
| راخەری ترکی (کلیم) | - | - | ١٥٠٠٠ | ٥٠٠٠ | ١٢٠٠٠ |
| گۆرەوی | - | - | ١٠٠٠٠ | ١٠٠٠ | ٣٠٠ |
| زینی و لاخ لە چەرم | ٥٠ | ١٠٠ | ٢٠٠٠ | ٢٠٠ | ٨٠٠ |
| زێڕ و مجەوهەرات | ١٠٠ | ٣٠٠ | ٥٠٠٠ | ١٥٠٠ | ٦٥٠٠ |
| گۆزە و دیزە | ٦٠ | ٦٠ | ٣٠٠٠٠٠ | ٢٤٠٠٠ | ١٥٠٠ |
| کەلوپەلی تر | - | - | - | - | ٢٤٠٠ |

سەرچاوە: فیتال کوینیە La turquie d`Asie, vol. ٢ (paris: E.Leroux ١٨٩١) p. ٦٧٧.

## خشتەی ٧-٢ هەناردەگردنی هەرێمی ڤان ( جگە لە هەکاری ) و دەوروبەری بۆ ساڵی ١٨٩٠

| کاڵاو شمەك | بڕەکەی | نرخەکەی بە لیرە |
|---|---|---|
| مەڕ | ١٠٠٠٠٠ سەر | ٦٠٠٠٠ |
| بزن | ٢٠٠٠ سەر | ٤٠٠ |
| گاو مانگا | ٥٠٠٠ سەر | ١٠٠٠٠ |
| ئەسپ و ماین | ١٠٠٠ سەر | ٥٠٠٠ |
| کەر | ٥٠٠ سەر | ٧٥٠ |
| خوری | ٦٠٠٠٠ هۆقە | ٣٠٠٠ |

| تەفتە | ٢٠٠٠٠ هۆقە | ٣٠٠٠ |
|---|---|---|
| پێستە | ٢٠٠٠٠ هۆقە | ١٢٠٠ |
| گەنم وجۆ | ٢٩٦٠ تەن | ١٠٠٠٠ |
| بۆرەك | ١٠٠٠٠ کیلۆ | ١٠٠ |
| شاڵی تەفتە | ٢٠٠٠ پارچە | ٨٠٠ |
| کەرە (رۆنی ئاژەڵ) | ٥٠٠٠ هۆقە | ٤٠٠ |
| مێوژ | ٥٠٠٠٠ هۆقە | ٧٥٠ |
| کەتان | ٥٠٠٠ هۆقە | ١٠٠ |
| رۆنی کەتان | ١٥٠٠ هۆقە | ١٥٠ |
| گوێز | ٢٠٠٠٠ هۆقە | ٦٠٠ |
| راخەری ترکی (کلیم) | ٥٠٠٠ دانە | ٤٠٠٠ |
| گۆپکە | - | ١٠٠٠ |
| صرج | ٥٠٠ دانە | ٢٠٠ |
| گۆرەوی | ١٠٠٠ جوت | ٢٠ |
| بەردی بەنرخ | - | ١٥٠٠ |
| قوماشی ڤان | ١٠٠٠٠ پارچە | ١٥٠٠ |
| جلوبەرگ | ٤٠٠ پارچە | ٦٦٠ |
| تووتن | ٤٠٠٠٠٠ هۆقە | ١٤٠٠٠ |
| ماسی | - | ٤٠٠ |
| زینی ئەسپ و کورتان | ٢٠٠ دانە | ٨٠ |
| فەروو | - | ١١٤٠ |
| کۆی گشتی | - | ١٢٠٧٥٠ |

سەرچاوە: ڤیتاڵ کوینیە: La turquie d`Asie, vol.٢ (paris: E.Leroux ١٨٩١ p. ٦٧٩

بێگومان ژمارەکانی ورد و یەکاویەك نین، بەڵام هەرچۆنێکبێ دیمەنێکی گشتی و ماقوڵمان دەداتێ لەبارەی واقیعی بەرهەمهێنانەوە. لیستەکەی کۆینیە بەرەهایی تەواو نییە، چونکە تەنیا بەرهەمە بەرچاو و بەبرشتەکانی تێدا تۆمار کراوە، بەڵام ساڵنامەکەی ڤان ۱۸۹۷ - ۹۸ لیستێکی بەرهەمی پیشەسازیە بچووکەکانیشی تێدایە، لەوانە فەرش و مافور و کلیم، چەك و تفاقی شەڕ، قاپوقاچاغی خواردن، گالیسکە و عەردبانەی گواستنەوە و گەشتیاری، بازرگانی، زینی وڵاخ و کورتان، کەرەستە چەرمیەکان، زێڕ و زیو و مجەوهەرات، پێڵاو و زۆر شتی دی.[57]

## ● گواستنەوە و پەیوەندی و بازرگانی

بایەخی مێژوویی شاری ڤان لەوەدەیە کە کەوتۆتە سەر ئەو ڕێگە سروشتیە تەقلیدیانەی نێوان (یەریڤان) و پەتلیس و (تەورێز) و موسڵ. خۆ ئەگەر ئەم شوێنە جوگرافیانە نەبوونایە یا ئەو دەریاچە مەزنەی وا بەلایەوە، ئەوا ڤان دەورێکی ئەوتۆ و بە بایەخی نابووری نەدەبوو (بەهۆی بەرزونزمی هەرێمەکە و ئاووهەوای سەخت و ترسناکی زستانیەوە). جا بەپێی ئەم جێگە باشەیەوە، ڤان سەدان ساڵە بۆتە چەق و گوزەرگەی کاروانە بازرگانیەکان، سەرەڕای دوو ڕێگەی تری کاروان لەنێوان سەڵتەنەی عوسمانی وئێراندا (دیاربەکر – ئامەد) لە باشوور و (ئەرزڕۆم) لە باکوور. ڕێگەی گرنگ و لەبارتریان ئەوەی: ئەرابزون - ئەرزڕۆم - ڤان - ئێران، تا دەگەیشتە ئەستەموڵ و ئەورووپا، بەناو دەریای ڕەشدا، ڕێگەی باکوور - باشوور لەنێوان قەفقاس و کەنداوی فارسیدا ڕێگەی (باتووم – یەریڤان - ڤان – جۆلەمێرگ – هەکاری – موسڵ – بەغدا) وە ڕێگەی ترابزون – ئێران کە لە ڤانەوە یەکتر دەبڕن، ڕێگەی ڕاستەوخۆش هەبووە کە ڤانیان ڕاستەوخۆ بە ڕۆژاوا و دەریای سپی ناوەڕاستەوە دەبەستەوە، بە پەتلیس و سیرت و دیاربەکر –

نامەد – لە باشووری رۆژاواوە تێدەپەڕێ.[58]

ئەم ڕێگەیە زۆرتر لە زستاندا بەکار دەهات، کە دەربەند و تەنگە شاخاویەکانی نێوان ڤان و پەتلیس بە کلیلەی بەفر دەگیران.

سەرەڕای ئەم شوێنە دانسقەیەی ڤان کەچی رۆژێ نەبووە بگاتە ئاستی نێوەندێکی گەورە و پڕ بایەخ بۆ گواستنەوە. گەلێ هۆکاری جۆراوجۆر دەستیان لەمەدا هەبوو و وایان کردبوو کە نەبێتە ناوچەیەکی لەبار بۆ بازرگانی لە سەدەی نۆزدەدا، لەوانە:

زستانێکی دوور و درێژی سەخت، ئەو تەنگە و دەربەندە شاخاویانەی کە کاروانەکان دەبوو بیانبڕن، تەسك و تروسکی و ناڕەحەتی ڕێگاوبانەکان (لە شاخاویە سەختەکاندا – بزنە ڕێ - أ.ب)

خۆ کە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە هاتەبەرەوە، گەلێ ڕێگەی تازە جێی کۆنە تەقلیدیەکانیان گرتەوە، بەتایبەت ئەوانەی بە ڤاندا تێدەپەڕین، بەپێی (کوینیە) لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەدا هەندێ کەشتی لە دەریاچەکەی ڤان کەوتنە هاتوچۆ، بەڵام ئەمانە کەمێك نەبێ کەڵکێکی ئەوتۆیان نەبوو بۆ چاکترکردنی ڕێگە و بانە بازرگانیەکان.

لە ڤانەوە بۆ پەتلیس بە وشکانیدا چوار ڕۆژی دەخایاند، ئەمە ئەگەر ڕێگەکە باشبووایە بە ڕۆژ و نیوێك دەبڕرا، هەروا لە ڤانەوە بۆ مووش پێنج ڕۆژی گەرەکبوو جگە لە دوو ڕۆژ دادەنرا بۆ پێشهاتی سەختی و ناڕەحەتی ڕێگەکە، بەڵام بۆ گەیشتن بە ئەرزڕۆم حەوت ڕۆژی گەرەك بوو لەباتی پێنج ، سەرەڕای ئەوەی موسافیرەکان دڵیان لە مستیانا بوو لە ترسی چەتە و ڕێگر و ئەو هۆزانەی سەر ڕێگە. جا بەپێی ئەوەی کوینیە دەیخەمڵاند خەرجی و تێچوونی گواستنەوەی بازرگانی چوار ڤات بەرز دەبۆوە، ئەوەش بەهۆی ئەو ئاستەنگانەی عەرزمان کردن کە دەهاتنە پێش سستمی گواستنەوە لە هەرێمەکەدا: ١٢٠ کیلۆ لە کاڵا و شمەکی بازرگانی بۆ ماوەی ٣٦٣ کیلۆمەتر لە

ڤانەوە بۆ ئەرزڕۆم ۲۰۰ قرۆشی تێدەچوو، بەڵام هەر ئەم کارە ئەگەر ڕێگەکە باش بووایە و ئەمین و ئومانبووایە، تەنیا ۵۰ قرۆشی خزمەتکارتی پەسبوو.[٥٩]

لەو ماوەیەی نێوان بڵاوکردنەوەی کتێبەکەی کوینیە (لە ۱۸۹۱) و جەنگی یەکەمی جیهانی، دەوڵەت لە بواری ڕاکێشانی ڕێگەوباندا لە ڕۆژەڵاتی ئەنەدۆڵ کاری وای کردبوو کە جێی سەرنج بێت، بەڵام دەستکورتی و نەبوونی پارەی پێویست، هەروەك شوێنانی تر، بوونە هۆکاری جێبەجێنەکردنی ئەوەی دەخوازرا، بۆیە ڕاکێشانی هێڵی ئاسن بۆ ناو ڤان کارێکی زەروری بوو، بەڵام دەوڵەت وەك پێویست گوێی بەو هەرێمە نەدەدا، چونکە توانای سنووردار بوو، بەتایبەت لەبواری ڕاکێشانی هێڵی ئاسن و خستنەکاری شەمەندەفەردا.

کوینیەش دەنووسێ و دەڵێ: شارەکە بۆ ناردنی بروسکە نێودەوڵەتیەکان بە زمانی ترکی و فرانسایی تەنیا یەك بنکەی تەلەگرافی تێدابوو، بە پاڵ سێ بنکە بۆ ناردنی بروسکەی ناوخۆ بە زمانی ترکی، لە گشت هەرێمەکەشدا هەشت تەلەگرافخانە هەبوو، شەشیان ناوخۆیی و دوانیشیان نێودەوڵەتی.[٦٠]

هەر لە کوینیەوە: بەهای هەناردە کردنی هەرێمەکە لە ۱۸۹۰دا ( بەهەکاریشەوە کە لە خشتەکەی ۸ - ۲ دا نییە) گەیشتۆتە ۱٦٥,٧٥٠ لیرەی زێری عوسمانی،[٦١] بەڵام هاوردەکردن، بەهاکەی ۱٧۱,٩٩۲ لیرە بووە، ئەمەش کورت (عجز)ێك دەگەیەنێ لە ترازووی پێدان (مدفوعات)دا بە بەهای ٦,۲٤۲ لیرە.[٦۲]

بێگومان هەناردەی گرانبەهاش بریتیبووە لە ئاژەڵ و بەروبوومە ئاژەڵیەکان، بە دویدا بەرهەمە کشتوکاڵیەکان ئینجا قوماش و پۆشاك و ئەو کاڵایانەی دەستچن بوون.

ڤان باشترین نموونەی سیستمی ئابووریەك بووە کە کەلوپەل و شمەکی

خـاو و دەسـتکردی بەرهـەم هێنـاوە و کەلوپـەل و شمـەکی دروستکراویشـی هاوردە کردووە.

نەخشەی ٨ - ٢ ئەوە دەگەیەنێ کە نزیکەی نیوەی هاوردەکردنی شارەکە لە تەرابزۆنەوە بووە، ئەم شمەکانەش زۆرتـر لـە وڵاتانی تـرەوە دەهێنـران و ڕەوانەی ئەستەمووڵ دەکران، جێی باسە کە ئـەم هاوردەکاریانـە کەلوپـەلی دەستمایەیی نەبوون تـا لـە پیشەسـازی ڤانـدا بەکاربێنـەوە، بـەڵکو کەلوپـەلی بەکاربردن بوون، بەمانا (زیادە و کەمالی) بوون کـە ژیانیـان خۆشتر دەکرد، وەك: (قاوە، چا، شەکر، جگەرە، کاغەز و لەم بابەتانە.)

لە کۆتایی سەدەی نۆزدەشدا، دەوڵەت لیستێکی بۆ ئـەو کەشتیانەی لـە دەریاچەکە کەوتبوونە گەڕ دانـا، ژمارەیـان ١١٠ دانـەبوو، بەرپرسـان ویستیان جموجـۆڵی بازرگـانی لـە دەریاچـەکەدا چـڕ کەنـەوە. دیسـان دەوڵـەت پلانـی دامەزراندن و بنیاتنانی حەوزێکی زەبەللاحی دانا بۆ دروستکردنی کەشتی و دیاریکردن و ڕێکخستنی ئەو شوێنانەی لەنگەری لێ دەگـرن و گـەلێ شـوێنی تر پەیوەند بەکاری دەریاوانیەوە، بـەپێی پێوانـەکانی دەریـاوانی کەشـتیەکان گچـکە بـوون.[٦٣] بـەڵام دەورێکـی باشـیان دەگێـڕا لـە گواسـتنەوەی خـەڵکی و کەلوپەلی بازرگانی. بەناوێترین ئـەو ڕەسـیفانەی کـە کەشـتیەکان لەنگـەریان لێدەگرت لە (ئەدیلکیڤاس) بوو کـە بەنـدەری شـاری ڤانبوو لەبـەری ڕۆژاوای دەریاچـــەکە و (ئیســـکیلیکۆی) لەبـــەری ڕۆژهەڵاتـــی، زوربـــەی خـــاوەن کەشتیەکانیش ئەرمەنبوون.[٦٤]

## • پوختەی باسەکە

دەشێ وشەی (هەژار) باشترین و لەبارترین وشەیەکبێ کە بەسـەر ژیـانی ئـابووری و پـەروەردە و فێرکردنـی ڤانـدا بـبڕێ، ئەمـە لـە بنەڕەتیشـەوە دەگەڕێتەوە بۆ سروشت و هەڵکەوتە جوگرافیەکەی ئەم شارە خۆی، چونکە

لەم هەرێمەدا نە کەناراوێکی دەریایی، نە رووبارێکی گەورەی وا کە بۆ هاتوچۆی ئاووی بەکاربێ، وجوودیان نەبوو، ئەوەی هەیە و نییە ئەو رێگە سەخت و دژوارە شاخاویانە بوو کە دەبوونە ئاستەنگ لەبەردەم هاتوچۆ بە وشکانیدا، جگە لە بەفری زستان ئەو رێگە و بانانەی دەگرت کە بەکاردەهێنران، دەیبەستن، زۆر کەرەت تا بەفرەکە دەتوایەوە و زۆقمەکە دەڕەویەوە شەش مانگێکی پێدەچوو.

جا لێرەدا لەبارەی چییەتی و ماهیەتی ئەو کاڵایانەی کە دەکرا بازرگانیان پێوەبکرێ و بهێنرێنە دەقەرەکەوە، پرسێکی گرنگ دەهاتە گۆڕێ، ئەمە ئەگەر گریمان بارو زرووفێکی لەبارتر هەبووایە، هەر بە سروشتی رەوشەکە ئەم هەرێمی ڤانە لە ئاست بازرگانیدا دوو برا بەشی هەبوو: ئێران و رووسیا. ئابووری رووسیایی دەهات کاڵاوشمەکی (بۆخۆی) لە ناوچەکانی باشووری قەفقاسەوە دەگەیاندە ناوجەرگەی وڵاتی رووس، ئینجا پرسێکی تریش، سەبارەت بەو کاڵا جۆر بەجۆرانەی کە لە ئێرانەوە دەستدەکەوتن و دەکرا ئاڵش و وێڵشێکی پڕ قازانجیان پێوەبکرێ لە تەك هەرێمی (ڤان)دا.

لە واقیعدا ئەو کاڵایانەی کە لە رۆژاوای ئێراندا هەبوون و دەستدەکەوتن هەروەك ئەوانە وابوون کە لە ڤانیشدا هەبوون، با رەوشی سیاسیش (کە لە بەشی سێیەمدا باسی لێوە دەکرێ) لەولاوە بوەستێ کە دەورێکی بەرچاوی هەبووە لە هەژارکردن و دەستکورتی ڤاندا، چونکە ئاسوودەیی سیاسی کۆڵەکەیەکە لە کۆڵەکە سەرەکیەکانی گەشەسەندنی ئابووری. بەڵام وەزعی ڤان زۆر لەمەوە دووربوو.

## خشتەی ٨ - ٢ هاوردەکردنەکانی هەرێمی ڤان (جگە لە هەکاری) دەوروبەری ساڵی ١٨٩٠

| نرخەکەی بەلیرە | کاڵاو شمەك | سەرچاوە |
|---|---|---|
| ٧٧٦٨٠ | کەلوپەلی لە لۆکە دروستکراو، شیت (کالیکۆ)، قوماشی خوری، لۆکەی فرانسایی (لەنەمساوە)، فانیلەی رەش، ساتانی رەش، قوماشی لە خوم دراو، کاڵای خوری، هاوریشمی هەمە جۆرە، شەکر، قاوە، چا، شیش، پلێت، قاپوقاچاغ، پۆڵا، تۆتیا، مس، قورقوشم، مۆم، کهۆل، ئاڵەت و بەهارات، بەرماخ بۆ جگەرە شقارتە، مەرمەڕ، شوشەی پەنجەرە و ..هتد | تەرابزوون |
| ٢٠٠٠ | نەوت، هاوریشم، سەماوەر، کەلوپەلی خوری، خشت، بوور سولین، چینی (گلێنە). | رووسیا |
| ٢٢٨٩٠ | قوماشی میلدار، شیت، مۆزلین، دەزووی هاوریشمی شین، لۆکەی هیندی، قوماشی لۆکەو هاوریشم، قایشی پشت کە لە حەما دروستکراوە دەستەسڕ، قوماشی دەستچن، مس، قرمز | حەڵەب و عەنتاب |
| ٢٤٥٨ | چەرچەف، پەردەی هاوریشم، کاڵای لۆکەیی هەمەجۆر، کونجی، رۆنی زەیتون، بامێ، تۆوکاڵەك، مسی بەکارهاتوو، میوژ، گوێز، کاڵەك، هەنجیر، قوماشی زبری خوری، شاڵ، پشتێنی خوری، پێستەی خۆشکراو. | دیاربەکر (ئامەد) |

| ئەرزڕۆم | قوماشی خومدراوی (تۆگان)، قوماشی (ریگا)، بزمار بۆ ناڵکردن، زینی قەڵتاغ، قایشی پشت، شمشێر، زنجیری ئاسن، (پێوەند)، قاپوقاچاغی مس. | ٥٤٩٥ |
|---|---|---|
| پەتلیس | گوێز، میوەی وشك، یانسۆن، داری سوتاندن، کاڵای سوری لۆکەیی، خەڵووز، قەتران، مەڕمەڕ. | ٣٢٢٥ |
| ئێران | لۆکەی شی نەکراوە، برنج، میوەی وشك، توتن، شاڵ، مافور، گلیم، کاڵای هاوریشمی، لۆکەی هیندی، زاخ، خەنە، کەتیرە، مەڕومالات | ٣١٤٣٤ |
| سیرمت | مێوژ، گوێز، کاڵەك، هەنجیر، شووتی، قوماشی خوری، شاڵ، قایشی پشت، پێستەی مەڕ | ٢٣٨٠ |
| کۆی گشتی | | ١٤٨٥٩٢ |

سەرچاوە:

La turquie d`Asie, vol.2 (paris: E.Leroux 1891 pp 680-84) فیتال کوێنیە

# ● پەراوێزەکان

١- Van vilayeti salnamesi 1315 birinci defa (van: (mutabaa-I 1315. p 207

٢- بڕوانــە کتێبەکـەی (ئـەنا هیـد تـیر میناسـیان): Ermeni kaynaklarina کە (بول دومن) و (فرانسوا جیورجون) بڵاویان کردۆتەوە (عـەلی بـەرکانی) وەریگێـڕاوە: ١٩٩٢ ل ١١٧ - ١١٨ وە کتـێبی (دیکـران کیومیجیان): وردبوونەوە لە وەزعی ڤان لە باسوخواسی ڕێبوارانـەوە، دیسان کتـێبی (ئەنناهیـد تیرمیناسیان): شـاری ڤـان لـە بەرەبـەیانی سـەدەی بیسـتدا The city of van at the turn of the tuentieth century کە بەزمانی ئەرمەنی لەلایەن خانەی بڵاوکردنـەوەی (ریتشارد.ج. هۆڤانیسیان) لە کالیفۆرنیا، خانەی مازدا بۆ بڵاوکرنەوە ٢٠٠٠ ل ١٥٢ - ٩٣

٣- دەربارەی قاتوقڕی و گرانیـە ترسناکەکەی ١٨٧٨ - ٨٠ چاوێ بخشێنە بە ئارشیفی نیشتمانی لە بەریتانیا، فـایلی ژمـارە: ١٣١٥/١٩٥ لـە (گلایتـون)ەوە بۆ (ترونر) ڤان شوبات/ فەبرایری ١٨٨٠، هەنـدێ بەڵگەنامـە وا باسـی دەکـەن کە ١٨٨١یشی خایاندووە.

٤- فـایلی ٢٢٨٢/١٩٥ لـە (دکسـن)ەوە بـۆ (ئۆکونـور) ڤـان ٩ شـوبات/ فەبرایری ١٩٠٨ (تیرمیناسیان)

Ermeni kaynaklarina gore, pp 120-22

٥- Van belediye: orhan kilic xvi. Ve xvii ١٩٩٧ ٢٥٥p

٦- Dahiliye nazareti sicil-I Nufus Idaryi umumiyesi Muduriyeti Memalik-i osmanive, nin ١٣٢٠ senesi دیارە

لەناو شارەکەدا سەرژمێریەکە باشتر بەڕێوەچووە.

٧- فیتاڵ کوێنیە La turquie d`Asie بەرگی دوو (پاریس. ئی.لۆرۆ) ١٨٩١ ل ٧٠٠ ) سامی بەگ (فراشیری) کە سەبارەت بە جوگرافیای سەڵتەنەی عوسمانی باشترین قامووسێکی کۆکردوە: قامووسی جیهان، بەرگی ٦ ئەستەموول، میهران ١٣١٦. وادیارە سەرژمێریەکانی لە کوێنیە و کەسانی ترەوە وەرگرتووە، هەردووکیشیان لەهەمان سەرچاوەوە وەریانگرتووە. سامی بەرپرسێکی عوسمانی بووە، توانیویە ئەو وسەرژمێریانە بە دەستبهێنێ، لەبەرامبەردا، سەرچاوە ئەرمەنەکان باس لە بوونی یەهوود ناکەن کە لە ڤاندا بووبن، هەرچەند بوونیان گومانی تێدا نییە.

٨- هەر بۆ بەراورد: پلەکانی گەرما لە ڤاندا هاوین و زستان دەگاتە ئەوەی لە شاری (کییڤ)دایە.

٩- لە لاس فیجاس، نیڤادا، لە مانگی ئاب / ئاغستۆس پلەکانی گەرما سێ ئەوەندەی ئەو ساڵەیان لێدەهات، لەکاتێکدا لە پاریس و لەندەن دەچووە بیست و دوو ئەوەندە.

١٠- تا ئەمڕۆ ئەمە دەشێ، چونکە بنیاتنانی بینای گەورە لەملاولای ڕێگاوبان لەناو دۆڵ و دەربەندە شاخاویەکان لە ڤان بۆ ڕێبواران تا ئەگەر زریانێکی بەفر و کرێوە لە پڕ هەڵی کرد رەق نەبنەوە. لەناو جەرگەی شاخەکانیشدا تونێلی داخرا و دامەزراوە تا شەمەنەفەرەکان تێیدا داڵدە بدەن، لەکاتی کرێوەی توندی بەفر و زریان.

١١- زوربەی هەرە زۆری کوردەکان موسوڵمانن، بەپاڵ هەندێ یەهوود و مەسیحیەوە کە هەندێ موسوڵمانانی هەڵگەڕاوەی سەر بە عەشایرەکان چوونەتە پاڵیان.

١٢- ئەم وەسفانە پشتیان بە کتێبەکەی (مارك سایکس) بەستووە:

The kurdish Tribes of the ottman Empire) jurnal )

of the royal Anthropological institute of great britain and Ireland 38 (July to December 1908 pp. 451- 86

سەبارەت بە ڕەوشى گشتى عەشايرەكانيش دەگرێ بچيتەوە سەر كتێبەكەى (مارتن ڤان برۆنيسين):

Agha, shakh, and state: the social and political structures of kurdistan (london : zed books 1992. Tribes and the state of Iran: the case os simko`s ,Revolt

بەماناى: (عەشرەتە كوردەكان و دەوڵەتى ئێران: ياخيبوونى سمكۆ كە ريزبەندە لەگەڵ كۆمەڵەى: The conflict of tribe and state in Iran and afghanistan

بەماناى (ململانێ لەنێوان عەشاير و دەوڵەتى ئێران و ئەفغانستاندا) خانەى بڵاوكردنەوەى (ريتشارد تابر) نيويۆرك،ساينت مارتنز، ١٩٨٣

١٣- تكايە بەهەردوو بەشى ٥ ، ٤ دا بچۆرەوە، ئەم باسە دووبارە دەكاتەوە.

١٤- بڕوانە بەشى حەوت لەم كتێبە.

١٥- بارزانيەكان لەمە بەدەرن، عەشرەتەكەيان گەورە نەبوو، بەڵام شێخى عەشرەتەكەيان ناووناوبانگ و نفوزێكى ئاينى ئەوتۆى هەبوو كە لە سنوور تێپەڕيبوو، بەو مانايەى ئەم عەشرەتە ببوە مەترسيەك بۆ دەوڵەتى عوسمانى و دەوڵەتانى تر، وەهەتا ئەمڕۆش، بڕوانە بەشى حەوت.

١٦- نەخشەى ٤ - ٢ بە شێوەيەكى بنەڕەتى پشت بە كتێبێك دەبەستێ كە (ف. ر. مونسل) ئامادەى كردووە، ئەفسەرێكى سەربازى بووە و بۆتە كونسۆڵى بەريتانيا لە ڤان، بە پلەى يەكەميش وەك سيخوڕێك (راپۆرتى سەربازى دەربارەى رۆژهەڵاتى تركيا لە ئاسيادا بۆ :(بەشى هەواڵگرى لەوەزارەتى جەنگ) لە لەندەن لە ١٨٩٤ ناردووە:

Military report on estere Turky in asia: compiled )

for the Intelligence division of the wor office london: wor office 1894

وە (مارك سايكس): عەشرەتە كوردەكانی ناو سەڵتەنەی عوسمانی. جا ئەم دوو ژێدەرە بە نەخشەكەی (مونسل) ژمارە ٢٥٠٠٠٠ - ١ بەراورد كراون، كە عەشرەتە كوردەكانی گرتۆتە خۆ و لەوەزارەتی جەنگی بەریتانیاوە دەرچووە، بەهۆی ئاڵوگۆڕی موڵكی عەشایرەكان بەزەحمەت و بگرە نەستەمە بتوانرێ جێگە و رێگەیان دیاریكرێ، بەتایبەت كە جەنگی یەكەمی جیهانی سەرانسەر رەوشەكەی گۆڕی، لەمڕۆدا دەبینین كە ناوی ئەو عەشرەتە كوردانەی لەزەوی و شوێنی زۆردا نیشتەجێن جیاوازن لەگەڵ گەورەتر لەخۆیان. بۆیە لەوەی (مارك سایكس)دا بۆ ئەم كتێبە ئەوەی پێشتر بووە دانراوە بەڵام هەندێكیشی لێ بەدەركراوە.

١٧- (تیرميناسیان):

(The city of van (Ermeni kaynaklarina gore p. 131

بەمانای شاری ڤان ، ل١٨٨

١٨- بچۆرە سەر نەخشەی ٢ ٢ و كتێبەكەی (رۆبەرت. ه.هوسن):

Van in the world: paradise in the next : the historical Geography of van/ Vaspurkan, in Armenian van

كە لەلایەن (ریتشارد .ج .هوفانیزیان)دوە دەرچووە: كالیفۆرنیا، خانەی مازدا بۆ بڵاوكردنەوە ٢٠٠٠ ل٣٧

١٩- لەكاتی لێكۆڵینەوەكەدا دوو پەترەریك هەبوون (رۆیل شیمونی دەیەم) ١٨٦٠ - ١٩٠٣ وە (بنیامین شیمونی پانزدەیەم) ١٩٠٣ - ١٩١٨ .

٢٠- كۆنسوڵە بیانیەكان زۆرجار لەبارەی ئەم رەوكردنەی نەستووریەكان دواون و بەتایبەت سەرنجیان لەوەداوە ئەمانە توانیویانە وەك كەسایەتیەكی پیرۆز و سەنگین و بەویقار لە دەقەرەكانی ئیمپراتۆریەتی رووسیادا بژین و

بسوڕێنەوە.

٢١- بەشێکی زۆر لە نەستووریە باوەڕدارەکان، کلدانیە کاتۆلیکەکانیان کە سەر بە پاپابوون، ئەوانەی لە باشوور لە دۆڵی (تیگریس) دەژیان لەو بەسەرهاتانەی کە بەسەر هەرێمی ڤاندا هات، هیچ دەخلێکیان پێوەی نەبوو و رۆڵی ئەوتۆیان نەدەبینی.

٢٢- کوێنیە: La Turquie d'Asie, p ٦٣٦

٢٣ بەگوێرەی راپۆرتە ساڵانەکانی ئەنجومەنی ئامریکایی ١٩١٠ - ١٩١١ (جۆرج. س. ڕینۆڵدز) لە ڤان سەرۆکی بەش بووە و لێپسراوی کاروبارە گشتیەکانیش، بەڵام ژنەکەی خاتوو (مارسا. و. ڕینۆڵدز) سەرقاڵی سەرپەرشتیکردنی کاروباری ئافرەتان و فەرش چنین بووە، ئەمە هەروەك بەشێك لە چالاکی بواری پیشەسازی، کە بە ئافرەتان سپێررابوو، (ئێرنست. ت. یارو) مامۆستا بووە لە دواناوەندیەکەی کوڕان، هەردوو خاتوو (ئا. جیرترود رۆجەرز) و (کارۆلین سیلیمان) پێکەوە دواناوەندیە کچانەکە و بەشە ناوخۆییەکەیان دەبرد بەڕێوە. رۆجەرز بەشی ناوەندی و دواناوەندیەکەی پێسپێررابوو، هەرچی سیلیمانیش بوو هەردوو بەشی دایەنگەکە و سەرەتاییەکەیان بەرەو ڕوو کردبوۆوە، خاتوو (گریزیل. م. ماکلارن) یش لە کڵێسا کاروباری ئافرەتانی دەبرد بەڕێوە و بەناوچەکەشدا دەگەڕا.

ئەم زانیاریانە لە ڕاپۆرتی ژمارە ١٠٠ی ساڵانەی لیژنەی راسپێردراوە ئامریکاییەکانی نێردراوە بیانیەکان لەتەك راپۆرتی سەدەهەمین دانیشتنی کۆنگرە کە لە (بۆستن) لەنێوان ١١ - ١٤ی تشرینی یەك/ ئۆکتۆبەری ١٩١٠ گیراوە.( بۆستن ، ئەنجوومەنی ئامریکایی ١٩١٢)

٢٤- (وامان مەزندە دەکرد کە ژمارەیەکی زۆر لە باوەڕداران لە کڵێسا کۆنەکەدان و بەدەر لەو زانیاریە شەخسیانەی خۆشمان): (ئەرشیفی لیژنەی

راسپێرراوە ئامریکاییەکان بۆ کاروباری دەرەوە، زانکۆی هارڤارد - راپۆرتی ساڵانە لەبارەی بەشی (ڤان)ەوە بۆ ساڵی ١٩١٠.

٢٥- هەر دەوڵەتێ چۆنی بۆ بلوایە کونسوڵێ یا جێگری کونسوڵێکیان دادەنا، لە واقیعیشدا لەم دوو پلەیەدا جیاوازیەکی ئەوتۆ نەبوو، هەر بۆ نموونە: لە ١٨٩٠دا جێگری کونسوڵی بەریتانیا هەروەك خۆی کونسوڵ بێ، راستەوخۆ راپۆرتەکانی دەنارد بۆ باڵوێزخانەکەیان لە ئەستەموول، نەك لە رێی کونسوڵەکەیانەوە لە ئەرزرۆم.

زۆر کەرەتیش ئەو راپۆرتانەی هی دەوڵەتەکانی تر بوون ئاماژەیان بەوەدەدا کە جێگری کونسوڵی بەریتانیا لە ڤان، کونسوڵە. جا بۆ روونەدانی هەر هەڵەیەك لەم کتێبەدا جێگری کونسوڵ لە ڤان ئیشارەی ئەوەی پێدەدرێ کە کونسوڵە، مەگەر نازناوە ئەسڵیەکەی کاریگەربێ لەسەر ئەو دەقەی باس دەکرێ.

٢٦- ئەو حەلە، لە ١٩١٠ دەستیان نەدابووە پەروەردە و فێرکردن، (گرایس. هـ. کناب) : نێردراوێك بۆ ڤان: Mission at van بە نهێنی لە ساڵی ١٩١٦ بڵاوی کردۆتەوە .ل١٢، (کلارنس .د.ئەشیر) : پزیشکی ئامریکایی لە ترکیا Anamerican physician in Turkey بۆستن و نیویۆرك، کۆمپانیای (هیوتن میفلن) ١٩١٧ ل ٢١١،

٢٧-گشت بەراوردکاریەکانی پەیوەند بە کشتوکاڵ و کێڵگەکان لەم پەرەگرافەدا دەرهێنراون، جگە لە حاڵەتێك نەبێ کە ئیشارە بۆ شتێکی دی بکات. لەم کتێبە بڕوانە:

Orman ve maden ve ziraat Nezarati, kelcm-I mahsus muduriyeti isfatistik subesi (Istanbul matbaa-(yi osmani, 1327 mali

وە دەبێ وەك ڕاگوزاریەك بڕوانرێتە ئەو سەرژمێریانەی دەربارەی قانوونن و زۆریش ورد نین، سەبارەت بەو بەراوردکاریە تاکەکەسیانەش ئەوە

یەکسانە بە دابەشکردنی بەرهەمەکە بەسەر کۆی گشتی دانیشتوان، مەبەست لە بەرهەمی هەر تاکێکە.

٢٨- بەرهەمهێنانی ترێ و دۆشا و مێوژەکەی بایەخێکی تایبەتی هەبوو، (ئۆرهان کیلیج) لە تۆمارەکانی باج و دەرامەتی سەرەتای سەدەی حەڤدەدا چاوی بەوەکەوتووە کە رەزی موسڵمانەکان لە ڤان ٢٠٠٠٠٠ هەزار هێشووی بەرهەم بووە، بەرامبەر بە ٤٠٠٠٠٠ هەزار هێشووی غەیرە موسوڵمانەکان؛

Kilic, Ve XVI. Yuzyillarda Van 1548- 1648 p 274

قانوونیش رێگەی دەدایە مەسیح و یەهوود کە شەراب بخۆنەوە، بەڵام لە موسوڵمانان حەرام کرابوو.

٢٩- ئەوەی خەبیرە عوسمانیەکە ناوی بردبوو بە (شەراب) لەوانەیە بەشێکی زۆری دۆشاو و شەربەتی ترێی گرتبێتەوە، جا هەروەك بەرهەم وحاسڵاتەکانی تر، دەکرا ترێ لە شێوەی شەراب و دۆشاو و مێوژدا بۆ ماوەیەکی درێژ عەمبارکرێ.

٣٠- لێرەدا بەرهەم بەپێی چۆنێتی و چەندێتییەتی، ئەمەش بە پێی ساڵنامەی :

Salnamay-I velayti 1876 Erzurum, 1293 hicri senesi (Erzurum velayeti matbaasi, 1293 pp 152-55

سەرژمێریە کشتوکاڵیەکانی ١٣٢٥ ئاماژە بەوە دەکەن کە تووتن بەرهەمێکی گەورە و گرنگ بووە، لە چاو هەرێمی رۆژاوای ئەنەدۆڵدا بەرهەمی تەنیا جوتیارێك زۆر زیاتر بووە.

٣١- ساڵنامەی ساڵی ١٨٧٦ ئیشارە بە ١٤٦٠٠ گاو ٤٦٤٠٠ مانگا و ٢٤٥٥٠ گوێرەکە لە ڤاندا دەدات کە هەبوون، خۆ بەهاتنی ساڵی ١٩١٠ ئەم ژمارانە گۆڕانێکی ئەوتۆیان بەسەردا نەهاتووە (سەرژمێریە کشتوکاڵیەکانی ساڵی ١٣٢٥).

٣٢- نرخی نانێك لە ڤان هەر ٦٠ بار بووە، یانی بەرامبەر بە ٢،٨ رەتڵ

یان ١,٢٨ گەم، کە ئەمە زۆر گرانە و بەتایبەت کاریکردبووە سەر چینە هەژار و کەم دەرامەتەکان، هۆکاری ئەمەش بەتایبەت ئەوەبوو کە ئەرمەنەکان وا ڕاهاتبوون هەرچی پارەیەکیان لەدەستدابووایە دەیاندا بەگەنم و عەمباریان دەکردو دەیانشاردەوە، تا لە بازاردا نەدەما ئینجا گرانیان دەکرد، دیارە لەمەشدا گوێیان بە خەڵکە هەژار و نەبووەکە نەدەدا... کابرایەکی ترکی خێرخواز (جەمال بەگ) فڕنێکی کردبۆوە، هەر نانێکی دەدا بە ١٥ بار تا نرخی ئاردی بازاڕ دابەزێنێ، بەڵام ئەم کارە کەڵکێکی ئەوتۆی نەگەیاند، تاکە کەسێك چی پێدەکرێ؟ .(فایلی٢٠٨٢/١٩٥ لە مونسیل بۆ کۆنۆر، ڤان ٢ئایار /مایۆ ١٩٠٠).

٢٣- هەندێ ڕاپۆرت لە نووسراوە دیپلۆماتیە جیاجیاکاندا ئیشارە بە کەمی بەروبووم و گرانی و قاتوقڕی دەدەن. هەر بۆ نموونە بڕوانە فایلی ژمارە ١٣١٥/١٩٥ لە کلایتن بۆ ئۆکۆنر، ڤان ٢ شوبات/ فەبرایر ١٨٨٠. وەفایلی ٢٠٦٢/١٩٥ لە مونسل بۆ ئۆکۆنر، ڤان ٢٩ کانوونی یەك /دیسامبر ١٨٩٥، وە فایلی ٢٠٨/٤٢٤ لە تیریل بۆ کۆنر، ڤان ١٠ کانوونی دوو/ یەنایر ١٩٠٥ و هتد.

٢٤- بەلایەنی کەمەوە کونسوڵێکی بەریتانی هەستی بەوە دەکرد کە کوردەکان زیاتر لە ئەرمەنەکان گیرۆدەی دەستی قاتوقڕی و گرانیەکەن و پێیەوە دەناڵن: (فایلی ١٣١٥/١٩٥ لە کلایتن بۆ ترونەر، ڤان ٢٥ ئەیار/مایۆ ١٨٨٠).

٢٥- فایلی ژمارە ٢٠٦٣/١٩٥ لە مونسل بۆ ئۆکۆنر، ڤان ١٠ نیسان/ئەپریل ١٨٩٩.

٢٦- سەبارەت بە پەروەردە و فێرکردن لە ڤان بفەرموو بۆ ئەو کۆڵینەوە و شیکردنەوە رەخنە ئامێزە فرە لایەنە (تا ڕادەیەك ) کە (هـ.هـ.لامب)ی کونسوڵ پێشکەشی کردووە، لە فایلی ١٥٢١/١٩٥ ڤان ٢٢ کانووی یەك/ دیسامبر ١٨٨٥ (ڕاپۆرتێ دەربارەی وەزعی پەروەردە و فێرکردنی گشتی لە ولایەتی

ڤان) :

Report at the state of public Instruction in the .vilayet of van

٣٧-تیرمیناسیان: ١٣٢Ermeni kaynaklarina Gore, p

٣٨- ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ پەروەردە و فێرکردن و ڕۆشنبیری (یۆنسکۆ)وە نووسینگەی ئامریکایی بۆ سەرژمێریکردن.

٣٩- ١٣١٦Salname-i Nezaret-I maarif-i umumiye Sene-I hicriye sine mahsustur (Istanbul matbaa-i ١١-١٢١٠amire) pp

٤٠- کوینیە: ٦٥٥La Turquie d`Asie, p دەشێ ئەوە بڵێین کە کوینیە لەسەرژمێریکردن و قسەکانیدا پێوەیان دەنێ و زێدەڕۆیی دەکا، دەربارەی نفوسی کاتۆلیکە پاپاییەکان وەك کلدانیەکان کە ئەمانە لە هەرێمی ڤاندا کەمینەیەکی بچوك بوون.

٤١- ساڵنامەی (نەزارەتی مەعاریفی عومومی) ١٣١٧ ل ١٤٢٨-٢٩.

٤٢- ساڵنامەی ولایەتی ئەرزڕۆم ١٢٨٨

٤٣- پەراوێزی (٤١) ل ١٤٢٢

٤٤- بڕوانە کتێبەکەی (تیرمیناسیان)، پەراوێزی (٣٧) ل ١٣٢

٤٥- ١٩١٩-١٩١٠Eastern Turkey mission ١٦,٩,٧ABC Report of Village work in ١١١٦a.no ٢٥Documents, Vol ١٩١٠the Van station Field

بەمانای نێردراوی ڕۆژهەڵاتی ترکیا ١٩١٠-١٩، بەڵگەنامەکان و بەرگی ٢٥ أ ژمارە ١٦ ڕاپۆرتێ دەربارەی کارکردن لە گوندەکاندا و لەو ناوچەیەی کە بەشەکە لە ڤان دەیگرێتەوە، نێردراوی ڕۆژهەڵاتی ترکیا ١٩١٠

٤٦- ساڵنامەی (نەزارەتی مەعاریفی عومومی) ١٣١٨ ل٤٦، ١٤٢٠-٢١

٤٧- (تیرمیناسیان) شاری ڤان، ل ١٩٢ (ڕۆبینا برومیان): (کولتووری

ئەدەبی لە هەرێمی ڤان) چاپی: ریتشارد . ج. هۆڤانیسیان، کۆستا میسا، کالیفۆرنیا: خانەی مازدا بۆ بلاوکردنەوە ، ل١٣٢-٥٢

٤٨- بروانە کتێبەکەی (نایری هامکیان):

The architectural heritage of vaspurakan and the preservation of memory layers

چاپی: ریتشارد .ج. هۆڤانیسیان، کالیفۆرنیا، خانەی مازدا ٢٠٠٠ ل ١١٦ - ٨٧

٤٩- تیرمیناسیان: THE CITY OF VAN, PP ١٩١ - ٩٢

٥٠- ساڵنامەی نەزارەتی مەعاریفی عمومی ١٣١٧ ل ١٤٢٨ - ٢٩

٥١- پەراوێزی (٤٠) ل ٦٥٩ - ٦٠، ٦٦٢ - ٦٤

٥٢- ئەو وەسفەی لەبارەی رووبەری ئەم دوو دارستانەوەیە ئەوە دەردەخا کە هیچ رووپێوییەکی بۆ نەکراوە. گیڤا کە دەڵێ: سێ سەعات بە درێژی و نیو سەعاتیش بە پانی، مەبەستی ئەوەیە کە بەپێ دەبڕرێ، وە (کارکیکان)یش کە دەڵێ: بە چوار درێژی و دووانیش پانی، خەملاندنە و هیچی تر.

٥٣- ساڵنامەی ولایەتی ئەرزڕۆم ١٢٨٨ ل ١٦٦

٥٤- وشەی (شاڵ) جۆرە بەدحاڵیبوونێك دەدا، چونکە ئەوسا شاڵ وەك ئەمڕۆ نەبوو، کەتەنیا پارچە پۆشاکێك بێت بۆ لەبەر کردن و رازاندنەوە، بەڵکو گەورە و فرەوان بووە و نێر و مێ بەکاریان دەهێنا چونکە گەرمبوو.

٥٦- بۆ دەستکەوتنی لیستی بەرهەمەکان، بڕوانە:

ولایەتی ڤان، ساڵنامەی ولایەت ١٢٨٨ ل ١٦١ - ٦٢

ساڵنامەی ولایەتی ئەرزڕۆم ١٣١٥ ل ١٥٤ - ٥٥

٥٧- ساڵنامەی ولایەتی ڤان ١٣١٥ ل ١٥٤ - ٥٥

٥٨- Kilic. Yuzillarda Van ١٥٤٨, pp ٢٨٦-٨٨

٥٩- سەرچاوەی پەراوێزی (٤٠) کوێنیە ل ٦٧٤ - ٧٥

٦٠- هەمان سەرچاوە. ل٦٢٤ - ٢٥

Internation (turkish and Franch): Van and Baskale
internal
Turkish only): Van, Ercis, Vosdan, Karcekan, )
Dizi, colemerik, mahmudi

٦١- هەمان سەرچاوە، ل٢١٦، دووبارەی دەکەینەوە کە سەرژمێریەکانی کوێنیە تەنیا ژمارەی مەزندە و خەملاندنن، وردو راست نین.

٦٢- هەمان سەرچاوە، ل٦٧٩ وە ٦٨٤، ئەمە هەکاری و (سانکاک) دەگرێتەوە کە کوێنیە بە جیا سەرژمێری بۆ کردووە، چونکە ئەو کاتە لە رووی ئیداریەوە لە ڤان جیاکرابۆوە، دیسان ئەوە دەڵێینەوە کە دەبێ لەم سیاقەوە سەرژمێرییەکانی تەنیا بە مەزندە و خەملاندن وەرگیرێن نەك وەك ژمارەی ورد و راست.

٦٣- قەبارەی تێکڕایی ئەو کەشتیانە لە نێوان دەتەن بۆ ١٥ تەندا دەبوون.

La turquic d`Asieکوێنیە Van Vilayeti Salnamesi
1315 .p 157. 64. pp 668-71 - 64

## بەشی سێیەم
## لاگیری* و سیاسە و دەستەڵات

ڕۆژێ نەبووە لە ڕۆژان کە ڕۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵ ملبدات بۆ حوکمی ڕەهای عوسمانی، دەڤەرەکە سەختتر بووە لەوەی کە حوکمێکی ڕاستەوخۆی بەسەردا بسەپێ، چونکە دوورەدەستبووە لە ناوەندی حوکمەوە لە ئەستەموول. سروشتی ناتەبای دانیشتوانەکانی لە کورد و ئەرمەن و ئەستووریەکان، نەشیبووە سەرچاوەیەکی بەردەوام بۆ داهاتی دەوڵەت.

بۆیە سوڵتان سلێمانی قانونی شێوە دەستەڵاتێکی دیاریکراوی لەو هەرێمانەدا بەرپاکرد و دایمەزراند، حوکم و بەڕێوەبردنی ئەو دەڤەرانەی بەرەو رووی سەرکردە مەسیح و موسوڵمانەکانی ناو خۆیان کردبۆوە، جا هێزەکانی دەوڵەت لە ناوەندی حوکم بەدەگمەن نەبووایە ئەو عەشایرانەیان وەڕس نەدەکرد، مەگەر ببوونایەتە مەترسی لە ڕێگەبڕیکردنی بازرگانی یا لە لاگیری و ملکەچیەکەیان بۆ دەوڵەت پێیان لێ هەڵبڕیایە و یاخی ببوونایە و هەڵبگەڕانایەتەوە.

لە نیوەی سەدەی نۆزدەوە کە چاکسازیەکانی دەوڵەت وردە وردە رووی لە ڕۆژهەڵات کرد، بار و زروفەکەش دەستی بە گۆڕان کرد، بیرۆکراتی زیاتر

---

* لاگیری: لایەنگری - ولاء، إنحیاز

سەری هەڵدا و ئارەزووی کاربەدەستان و فەرمانبەرانی دەوڵەت کەم کەم بۆ ئەوە دەچوو کە راستەوخۆ و وبە فیعلی کاروبار بگرنە دەست و بیبەن بە رێـوە، رۆژەڵات بەهێڵـە تازەکـانی تەلەگرافـەوە بەپایتەختـەوە ببەسـتن و بـەهۆی مەترسـی رووسیشـەوە حوکمـەت توانـای خـۆی لـە کارکردنـە سـەر رێڕەوی رووداوەکان لـە ناوچـەکەدا زیـاتر کـرد و وپـەرەی پێـدا، ئەمـەش لـە سونگەی بەهێزکردن و چەسپاندنی هێزی سەربازی خۆیەوە لە رۆژەڵاتدا.

## • موڵکایەتی

دەلاقەیـەکی ئـابووری ترسـناك شـاری ڤـان و لادێکـانی گردبـووە دوو لەتەوە، ئەمە سەرەرای ئەو جیاوازیە ئابووریـە فرەوانـەی لـە نێـو گونـدەکان خۆیشیانا سەری هەڵدەدا، دێی وا هەبوو یـەجگار نـەبووە و نـەدارا بـوون، سا مەسیحی بوونایە یا موسوڵمان بـەردەوام هـەژاربوون. لـە سالانی هـات و پـڕ خێریشـدا هێشـتا ئەمانـە بـە فەلاکـەت دەیانگوزەرانـد، خـۆ سـالانی وشـك و نـەهاتی جـنگی برسـێتی و نـەبوونی تێیـان گیر دەبـوو و شـپرزەی دەکـردن. کەچی هەندێ گونـدیش هـەبوو هەرچـۆنێك بـێ دەیـانتوانی خۆیـان بگـرن و بەسەر ئەو دژواریەدا زاڵبن.

خاوەن موڵکە ئازادەکان (کـە لەمـە باشـتریان پـێ ئـاگوترێ) لـە هـەرێمی ڤان لەتەوقەسـەری ئـابووری لادێکانـەوە بـوون. ئەمانـە زۆرینەیـەکی کـورد و ئەرمەن و کەمێکیش لە ئەستووری و کلدانی ناو گونـدەکانبوون، ئـەوەی ئـەم توێژاڵـەی لـە چیتی دامـاوان جیـادەکردەوە موڵکداریـە قانوونیەکـەیان بـوو بەسـەر زەویەکانـەوە، چـونکە هەنـدێکیان لـە موڵکـدارە ئازادەکـان بـوون و زۆریشیان ناچار کرێیان دەدا یان باجیان لەسـەر ئـەو زەویـە دەدا کـە مـوڵکی سوڵتانبوو.[١] بۆ ئەوەی زەویەکە بەدەستیانەوە بمێنێ و لـەتوانا و خێروبێـری کەڵکەوەربن، رێژدیەکی ماقوڵیش لە بەروبوومەکەی بۆخۆیانبێ.

...

زوربەی ئەو گوندانەی بەم شێوەیە زەویەکانیان وەبەردەهێنا لەلایەن دەوڵەتەوە پارێزراوبوون، وادادەنرا کە لەژێر سایەی سەڵتەنەی عوسمانیدان بەڵام دانیشتوانی گوندەکانیدی، بۆ بەربەرەکانی هێرش و پەلاماردانی عەشیرە کوردەکان چەك و تفاقی شەڕی خۆیان هەبوو، ئەمانە موسوڵمان و مەسیحیان هەمیشە چەکەکانیان بە پاڵ خۆیانەوە بوو، هەرچەندە نەیاندەتوانی پێشی ئەو پەلامارە رێکوپێکانەی عەشایرە گەورەکان بگرن بەڵام هێندەیان لەدەستدەهات کە ئەو هێرشانە لەسەر چەتە و پەلاماردەران بکەوی. ئیتر چونکە ئامانجی ئاسانتر هەبوو، ئەم عەشایر و چەتانە نەدەچوون بەلای ئەماندا، زوربەی گوندە شاخاویەکان دانیشتوانەکانیان ئەرمەن و نەستووری بوون، لەبابەتی ئەوە بوون کە گوتمان.

بەڵام ئەو گوندانەی کە بە (موڵکایەتی) عەشایرە کوردەکان ئەژمار کرابوون، لەرووی ئابووریەوە دەستکورتتربوون بەڵام دەیانتوانی هەرچۆنێکبێ مانەوەی خۆیان بپارێزن، بە ئایینیش موسوڵمان و مەسیحیبوون. ئەمانە سەرانە تەقلیدیەکەی خۆیان دەدا بەو عەشایرانەی دەوروبەریان تا لە عەشایری تریان بپارێزن یان هەر لەو عەشرەتەی کە خاوەنی موڵکەکەیانە.

ئا ئەم جۆرە سیستەم و تەرتیباتە لە زوربەی هەرێم و دەڤەرە ئەوروپایی و ئاسیاییەکاندا، بەر لەسەردەمی نوێ، هەبوو کارپێکراو بوو، لە رۆژهەڵاتی عوسمانیشدا هەر لە کۆنەوە، بەر لە عوسمانیانیش هەر بووە.

وەك گشت ئەو سیستەمانە کە باج و سەرانە وەردەگرن، رێکخستنی کارەکانیان لەسەر هەمان فیکرەبوو، لە بەرژەوەندی لایەنە بەهێز و دەستەڵاتدارەکە بوو تا زۆر لە فەلا و جوتیارەکان بکاو وناچاریان بکات هەتا هەتایە کاربکەن و سەرانەش بدەن، ئەمە لەباتی ئەوەی بە یەکجاری دەستبگرن بەسەر زەویوزارەکانیاندا. ڕوونتر با بڵێین: برسیکردنی فەلا و

جوتیارەکان و دواییش ئەوەی بەرهەمی هێناوە لێی سەنێ و تالانی بکەن.[٢]

لە هەندێ حاڵدا پەیڕەوکردنی ئەمە بەخێر و دەستکەوت بۆ خاوەن موڵکە کوردەکان و لادێییەکانیش دەشکایەوە. لەولاشەوە گوندە ئەرمەنەکان لەژێر دەستی (محەممەد سادق)دا بوو کەسەر بە عەشرەتی (حەیدەران) بوو، ئەمانە لە ڤانیش هەر بووە و دەوڵەمەند بوون، رەعیەی وایان هەبوو گوایە لە هەموویان دەستکورتتر بوو بەڵام بەلانی کەم سەد سەر مەڕی هەبوو کە ئەمە گاڵتەی پێناکرێ، ئەگەر لەگەڵ گوندەکانی تردا بەراورد بکرێ.

محەممەد سادقیش ملهوڕێکی بەناوێ و جاروبار جینایەتکارێکی چاونەترسی رووقایم بوو، لە هەردوو دەوڵەتی فارسی و عوسمانی یاخی دەبوو و شووڵی لێ هەڵدەکێشا.[٣]

بەڵام ئەو گوندانەی کە لە هەموان ژیانیان بەرپووتتر بوو، ئەو گوندە موسوڵمان و مەسیحیانە بوون کە لە هیچ کام لەو دوو جۆرەی سەرەوە نەبوون، چەك و تفاقێکی شەڕی ئەوتۆیان شك نەدەبرد، هەرچەندە لە پەنا دەستەڵاتی عوسمانیشدابوون بەڵام لایان لێ نەدەکرایەوە و رۆژێ لە رۆژانیش عەشرەتێکی تر نەدەهات بە هاواریانەوە. بەڵکو عەشایرەکان لەسەر دەستگرتن بەسەریاندا، شەڕیانبوو، هیچ کاتێکیش ژیان لەناوجەرگەی شەڕ و پشێویدا خێری بەناوچەوانەوە نەبووە.

ئەو عەشایرانەی بەردەوام گوندەکانی خۆیان دەپاراست زۆرجار هێرشیان دەکردە سەر ئەو گوندانەی لەدەرەوەی دەستەڵاتیاندابوون و تالانیان دەکردن. لەم جۆرە پەلامارانەدا کەمجار خوێنی تیا دەڕژا، بەڵام خۆ ئەو فوربەسەرانەیان ماڵ کاول و هەژار و برسی دەکرد، زوربەی جار ڕانە مەڕەکانیان دەدرانە پێش و بە تالان دەبران.[٤]

لەسەدەی نۆزدەدا چاودێرە ئەوروپاییەکان وایان دادەنا کە ئەهامەتی ئەو گوندانەی بەر هێرش و پەلامار دەکەوتن، کێشەیەکە هەر بۆ

ئەرمەنەکانە، بەڵام ئەمە پێچەوانەی واقیع بوو، جەردە و عەشایرەکان بەپێی ئاسانی کارەکە و قەبارەی دەستکەوتەکانیان ئامانجەکانیان دیاریدەکردن و هەڵیان دەبژاردن، نەك بەپێی ئینتیمای ئایینی. بەڵام ئەوەبوو ئەرمەنەکان دەیانتوانی داد و شەکوای حاڵی خۆیان بگەیەننە کونسوڵگەریە ئەوروپاییەکان و میسیۆنێرە ئامریکاییەکان، زۆر کەرەتیش بێوەیان دەنا و زێدەرۆییان دەکرد لە گێڕانەوەی دەردیسەری و بەزارەکانیاندا، ئەمەش بەو هیوایەی کە کۆمەك بکرێن و قەرەبووی زیانەکانیان بۆ بکرێتەوە، لەبەرامبەردا موسوڵمانەکان کێشە و تەنگژەکانیان نەدەگەیاندە رۆژاواییەکان، بۆیە بەزارەی موسوڵمانەکان لەکن ئەوروپایی و ئامریکاییەکان بزربوو، جا کە لە کوردیان دەنووسی بە (کوردەکان)یان ناودەبردن، هەروەك کۆمەڵ کۆمەڵ بن و شاڵاو بۆ ئەرمەنەکان بەرن. لە واقیعدا پێکادانەکان لەنێوان دوو لایەندا بوو، عەشایر و نیشتەنیەکان.

هەندێ کونسوڵی بیرتیز و کراوە کە راپۆرتیان دەنووسی لەبارەی پەلاماری، عەشایرەکان بۆ سەر گوندە کوردەکان، لەو راپۆرتانەیاندا و لە تۆمارەکانی عوسمانیدا ئەوە دەردەکەوێ کە ئەهامەتی و کوێرەوەریەکان جیاوازی نەدەکرد لەنێوان تایفەیەك و ئەوی تردا، مزگەوتەکان هەروەك کڵێساکان تاڵان دەکران، موسوڵمان و مەسیحی وەك یەك دووچاری تاڵان و روتکردنەوە دەبوونەوە.[٥]

بالۆرەی دووەمی درۆکردنەکە ئەوەیە کە تەنیا عەشایرە کوردەکان بەرپرسن لە موعاناتی هەژاران و نەداراکان. کەچی هەندێ لەو کۆسپ و ناستەنگانەی جوتیاران کە باسدەکرا لە هیچ کات و شوێنێکدا نەبینرابوون و نەبیسترابوون، جوتیاری موسوڵمان و مەسیحی قەرزێکی زۆریان دەهێنایە سەر خۆیان بە پشتی ئەوەی کە لە حاسڵاتدا یا بە رەهنی زەویەکانیان بیدەنەوە، بەڵام کە بەرهەم و حاسڵاتەکانیان بایی ئەوەندە نەبوو کە

قەرزەکانی پێ بدەنەوە، ئەوا دەست بەسەر زەوییەکانیاندا دەگیرا و دەهاتنە سەر ساجی عەلی.[6]

زۆرجار بازرگان و سووخۆرە ئەرمەنەکان خۆیان بۆ جوتیارە ئەرمەنەکان دەنایەوە بۆ ئەو مەبەستە. لە ساڵی ١٩٠٠ (ساڵی گرانییەکە) هەر بۆ نموونە، دەستەیەك لە بازرگانە ئەرمەنەکان کەوتنە (ئابڵووقەدانی بازار) لەرێی شاردنەوە و عەمبارکردنی گەنمەوە، جا نرخی گەنم چووە ئاسمان و فڕی، بەسایەی پشت و پەنای ئەورووپایەکانیشەوە ئەو بازرگانە چاوبرسیانە لە سزا و لێپرسینەوەی دەوڵەت خۆیان قوتار کرد و وەك بەرزەکی بانان بۆی دەرچوون، چونکە فەرمانداری شار نەیدەتوانی عەمبارەکانیان بشکێنێ و گەنمەکە بێنێتە دەر، یان نرخی نان هەرزان کات، لەباتی ئەمە لە تەقەڵلای ئەوەدابوو کە لە هەرێمەکانی تردەوە گەنم هاوردەکات، لەمەشدا بازرگانە ئەرمەنەکان پێشی دەکەوتن و هەر خۆشیان بوون تا بینەقاقای جوتیارەکانیان نابووە قەرزەوە.[7]

## ● عەشایرە کوردەکان

شێواندنی ئەمن و ئاسایشی ناوچەکە لە تەرەف عەشایرە کوردەکانەوە کرۆکی گشت ئەو گیر و گرفتانەبوو کە لە رۆژهەڵاتی عوسمانیدا سەریان هەڵدەدا، هەتا هەرەشە و مەترسی لەمەش گەورەتر هاتە ئاراوە، هەرەشەی شۆڕشگرانی ئەرمەن.

هەر بە فیترە ئەرمەنیەکان و دەوڵەتی عوسمانی دوژمنی یەکتر نەبوون، ئەرمەنەکان رۆژێ لە رۆژان ئەو هێزەیان شك نەدەبرد کە بە تەنیا خۆیان پەلاماری دەوڵەت بدەن و مەترسیەکی راستەقینەی بۆ دروستکەن ئەگەرەکو دەستیان نەخستایە دەستی لایەنە دەرەکیەکانەوە.

بە پێچەوانەوە، پاراستنی سەلامەتی ئیسلام و ئەرمەنیش کە بۆ خۆیان

داسەکابوون، لە بەرژەوەندی دەوڵەتی عوسمانی بوو، بەلانی کەمەوە هەر نەبێ تا دەوڵەت بتوانێ باج و خەراجەکانی خۆی بەبێ سەرئێشە گردکاتەوە، بەڵام رەوشی عەشایر جیاوازتر بوو، بەبێ دوو دڵی حوکمەت پشتگیری ئەو دانیشتووە جێگیر و نیشتەنیانەی دەکرد و دەشچۆوە بە گژ ئەو لایەنە عەشایریە کورد و نەستووریانەدا.

بە درێژایی مێژوو دانیشتووەکان دووچاری هێرشی ئەو عەشایرانە دەبوونەوە و جاری واش بووە کە خوێنی تێدا دەرژا، حوکمەتی عوسمانیش هەروەك گشت ئەو حوکمەتانەی رۆژهەڵاتی ناڤین هیواخوازبوو کە سنوورێك بۆ ئەم رووداوانە دابنرێ، ئەمەش بەپێی یەك لە باوەرە سوننەتیە ئیسلامیەکان: رزگارکردن و بەرپاگردنی دادپەروەری لە ئەرکە سەرەتاییەکانی دەسەڵاتدارە.

ئەم بیروباوەرە ئاییینیانەش کاریان کردبووە سەر هەڵسوکەوتی فەرماندار و بیرۆکراتەکان، بەڵام هۆکارێکی ئاشکراتر لە پشت ئەو دڵەراوکێیەی عوسمانیەکانەوە بوو بەرامبەر دانیشتوانە جێگیر و داسەکاوەکان: بازرگان و فەلاکان وا لێبکەن هیچ نەبێ هەست بەوە بکەن کە باج و خەراجێکیان وا بەسەردوە و دەبێ بیدەنە دەوڵەت، رەوەند و کۆچەرەکان لەمەیاندا بە دەگمەن چاویان لەوان دەکرد تا مل بدەن بۆیە سەیر نەبوو کە عوسمانیەکان لەپێناو پاراستنی ئەوانەی جێگیر و نیشتەنین لە شار و لادێکاندا کار بکەن، ئیتر بەبێ گوێدانە ئایین و مەزهەبیان.

دوژمنایەتیەکی رەها حوکمەت و ئەو عەشایرانەی لێك دابریبوو، ئەمەش هەروەك هەر پەیوەندیەکی تری نێوان هەر دەوڵەتێك و عەشایرەکانی، تەنیا بەڵگەیەکیش لە ئازارا نەبوو کە نیشانە بێ بۆ (هاوکاریەکی ئیسلامیانە) لەنێوان ئەو عەشایرانە و هێزە نیزامیەکانی سوپا و دەرەدك.[٨]

عەشـــایرە كوردەكـــان زۆر بـــە زەحمـــەت كـــۆنترۆڵ دەكـــران، چـــونكە چـــەكداربوون و تـــەنیا ملكەچـــی ســـەرۆكەكانیان بـــوون، تاكـــە ڕێگەیـــە بـــۆ ملكەچكردنی یەك لەوانە پەلامارێكی سەربازی بەرفراوانبوو كە پاكتاوكردن و سەركوتكردنێكی بەدوادا بهاتبا، بەڵام سەڵتەنەی عوسمانی لەوپەری توانای سەربازیشـــیدا ئـــەو جـــۆرە ئۆپەراســـیۆنە گەورەیـــەی لەدەســـت نـــەدەهات و نەیدەتوانی بە ئەنجامی بگەیەنێ، ئەوەی لە دەستی دەهات تەنیا بەكارهێنان و جێبـــەجێكردنی سیاســـە و پیلانـــی دووبـــەرەكی نانـــەوەبوو، لەولاشـــەوە خراپترین و جینایەتكارترین یاخیبوویەكی بەوە سزادەدا كە ڕێزی دەگـرت و دەیخستە پلەوپایەیەكی ڕەسمی دەوڵەتەوە.

دەوڵەتی عوسمانی لە بەجێهێنانی ئەركەكانی خۆیـدا درێغـی نـەدەكردن كە بریتیبوون لە پاراستنی ڕەعیەتـەكانی سوڵتانو بـەردەوامبوونی حوكمی ئیمپراتۆری، جـا سـەرەڕای گشت ئـەو هـەموو گیروگرفتـە گەورانـە و بـوونی كاربەدەسـتی خۆویسـت و مشـەخۆر و گەنـدەڵ كـە بەرژەوەندیـەكانی خۆیـان لـەلا لـەهی دەوڵـەت و تاكـەكانی میللـەت لەپێشـتربوو، كەچـی سـەڵتەنەكە بەردەوامبوو لە بەجێهێنانی ئەركەكانیدا، بەڵام بەبێ دانی مووچەی سـەرباز و فەرمانبەرەكانی سەركەوتنی مەحاڵبوو.

كەواتـە یـەك لـە پێویسـتیەكانی تـری دەوڵـەت بـە پلـەی یەكـەم پـارە و دراوبوو، بۆیە عەشایرەكانی ناچار كـرد كـە هـیچ نـەبێ بەشـێكی كـەمی ئـەو باجانەی وا لەسەریان بیدەنە فەرمانبـەرانی بـاج و دەرامـەتی كشـتوكاڵ، لـەو گوندانەی كە لەژێر دەستی عەشایرەكاندا بوون.[9]

بەڵام ئەو برە پارانە بەشێكی كەمی خەرجی هێزە سەربازیەكان نـەبێ كە ئیمچە دەسـتەڵاتێكی بەسـەر ناوچـەكەدا سـەپاندبوو، هـیچ كـونێكی تـری نەدەگرت، خۆ ئەگەر ئەو هێزانەش نەبوونایە ئەوا ئەو عەشایرانە پشـێوی و بەرەڵاییەكی وایان لە دەڤەرەكانیاندا بەرپا دەكرد كە باسی باج و خـەراج لە

ڕۆژهەڵاتدا لە کولەکەی تەڕیشدا نەدەکرا، کام فەلای بێ لایەن و داماوە تالان دەکرا چونکە باجی بە دەوڵەت داوە و کاروانەکان ڕووتدەکرانەوە، ئیمکانیەتی پەرەسەندنی کارگەکان کە باجی خۆیان دەدا و بازرگانی سەردەمەکەش ئەمانە ببونە خەونێك و ڕۆژێ لە ڕۆژان نەدەهاتە دی.

عوسمانیەکان ناتاجی ئەوەبوون کە عەشایرەکان لەژێر چاودێری خۆیاندا بمێننەوە، ئەمەیش لەبەر مەترسی دەستتێوەردانی هەمیشەیی دەوڵەتانی ئەوروپا، چونکە ئەوانە هەردەم چاویان لەسەر ڕۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵ بوو، لەدوی سوسەی پشێویەك دەگەڕان، خۆ ئەگەر ئەم چاودێریە نەبووایە ئەوا عەشایرەکان دەیانتوانی ئەو سوسەیە بێننە دی، بەتایبەت هێرش و پەلامارەکانی دژ بە ئەرمەنەکان زۆر کەڕەت بووە بیانوو بۆ ئەگەری دەستێوەردانی ڕووسیا.

هەر بە هیوای هێنانەدی ئەمە، شۆڕشگێڕانی ئەرمەن کەوتنە پەلاماری عەشایرە کوردەکان، تا ئەوانیش بکەونە تۆڵە سەندنەوە و ئەمە دوایی ببێتە زامنە بۆ دەستێوەردانێکی ئەوروپایی لە ڕۆژهەڵاتدا. بەڵام تەنیا لەنگەرگرتن و هاوسەنگی سیاسەتە گەورەکان بوو کە نەیدەهێڵا ڕووسەکان دەستوەردەن لە هەرێمەکە. خۆ ئەگەر ئاڵۆزی و گرژیە عەشایریەکان لە ڕۆژهەڵاتی عوسمانیدا سەرهەڵدەن ئەوا ئەگەری ئەوە هەیە کە ڕای گشتی لە ئەوروپای ڕۆژاوادا نەتوانێ لە ئاست پەلامارێکی ڕووسیادا بووەستێتەوە و دژی بێت.

لەبەر ئەمە، زۆر زەرووری و سروشتیش بوو لەیەك کاتدا، کە دەوڵەتی عوسمانی ڕووبەڕووی ئەو عەشایرانە بوەستێتەوە، وەك پاسیش دەکرێ ئیدارەی هەرێمی ڤان لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدە و سەرەتای بیستدا، کەوتۆتە شەڕی زۆر قورسەوە بۆ جڵەوگیری ئەو عەشایرانە تا بیانخاتە ژێر ڕکێفیەوە، بەڵام لەوەدا تەنیا سەرکەوتنێکی کەمی بەدەستهێناوە، ئەوەش بە پلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ کەمی و لاوازی تواناکانی دەوڵەت.

## ● بیرۆكراتی عوسمانی

بەپرسانی دەوڵەتی عوسمانی بەگشتی لەسەر ئەو خواستەیان یەكبوون كە دەبێ سەڵتەنە ڕزگار كرێ و بپارێزرێ، بەڵام بەزۆری لەسەر چۆنێتی بە ئەنجامگەیاندنی ئەم خواستەیان ناكۆكبوون، لە دەستپێكی قۆناغی چاكسازی ناو سەڵتەنەوە هەتا كۆتایی ئیمپراتۆریەتەكەش، تەقلیدیەكان بەربەرەكانی چاكسازیەكانیان دەكرد. بەو ئاواتەوەی كە دەستگرن بەسەر دەستەڵاتدا، ئەم بەربەرەكانیەش بەتایبەتی لە ڤاندا ڕەنگی دابۆوە. لە دوای شۆڕشی ١٩٠٨ كە چاكسازانی گەیاندە سەرپۆپەی دەستەڵات، زۆرجاریش ناحەزیی شەخسی و مشتومڕ دەبووە بەربەستی گەیشتن بەم ئامانجە پیرۆزە.

لە هەرێمی ڤان، زۆرجار ئامانجەكانی هەردوو دەستەڵاتی مەدەنی و سەربازی ڕاست و چەپ لە یەكدی دەوەستانەوە. هەندێ كاربەدەست ڕێگەی هەندێ چالاكیان دەدا كە لەلایەن شۆڕشگێڕانی ئەرمەنەوە ئەنجام بدرێ، ئەگەر ئێستە بووایە بە مەترسیدار لە قەڵەم دەدرا. بەڵام ئەوكات شتەكە زیاتر وەك ڕێكەوتنێكی سیاسی دەهاتە پێشچاو، هەر بۆ نموونە: (تایەر پاشا)ی حاكمی ڤان ١٨٩٧ - ١٩٠٦ بەری بەرەڵلا كرد بۆ حیزبی (تاشناق) تا دەستگرێ بەسەر ئەرمەنەكانی ڤاندا، چونكە ئەم كابرایە زیاتر بایەخی بە بەرپابوونی ئاشتییەكی كاتی دەدا نەك بەدانانی سنوورێك بۆ ئەگەری شۆڕشێك كە هەڵبگیرسێت.

هەروا ئەو هاوپەیمانیەی كە لەنێوان كۆمەڵەی (ئیتیحاد وتەرەقی) و حیزبە شۆڕشگێڕە ئەرمەنەكاندا بوو، گەورەترین مەترسی لەسەر دەوڵەت دروست كرد، بەڵام ئەو هاوپەیمانییە كاتیخۆی كە عوسمانیە دیموكراتخوازەكان و ئەرمەنەكان مەسەلەیەكی هاوبەشی پێكیەوە گرێ دەدان، هەر لە ئەورووپاوە دروستببوو، مەسەلەی دژایەتیكردن و بەربەرەكانی

حوکمەتەکەی سوڵتان (عەبدالحەومیدی دووەم)، (شۆڕشی برایەتی) چاوی عوسمانیە دیموکراتخوازەکانی بەر شەوارە خستبوو نەك ئەرمەنەکان لەو دوورکەوتنەوە بنەڕەتیەی کە لەڕاوبۆچوونی هەردوو تەرفدا هەبوو، دیموکراتخوازەکان ئیمپراتۆریەتێکی سەردەمانە و تازەیان دەویست لە رووی سیاسیەوە، ئامادەشبوون کە تارادەیەکی باش ئۆتۆنۆمی بدەنە ئەو کۆمەڵانەی کە بە ئاشکرا هاوسۆزی خۆیان دەردەبڕی بەپاڵیانەوە. بەڵام شۆڕشگێڕە ئەرمەنەکان ئۆتۆنۆمیان بە هەنگاوێك دەزانی بەرەو سەربەخۆیی تەواو، لەوەشدەچێ کە رۆژێ لە ڕۆژان باوەڕیان بەوە نەبووبێ کە دەوڵەتی عوسمانی سادیموکراتیبێ یان پاشایی، ئامادەبێ بە خواست و ئارەزووی خۆی ئۆتۆنۆمیان بداتێ. ئەمەش لە خۆیدا ئەگەرێکی راستە. لەبەرامبەر ئەمەدا شۆڕشگێڕان ئامادەبوون کە ئەو پەیوەندیەی خۆیان بە دیموکراتخوازەکانەوە برەخسێنن بۆ بەهێزکردنی توانای رێکخراوە یاخیبووەکانیان.

## ● سوپا

ئەو ترکانەی لە ئەنەدۆڵ و بەشی عوسمانی ئەورووپاوە هاتبوون زوربەی سەربازەکانی ڤانیان پێکهێنابوو، سەرەڕای ژیانێکی سەخت کەدەیان گوزەراند، کەچی مووچە و مانگانەکانیشیان دوادەکەوت و جاری وا هەبوو بە دووسێ مانگ جارێ دەیاندانێ، ئەمەش ئەو سەربازانەی ریسوا و موحتاج کردبوو، خێزانی زوربەیان لەو جوتیارانە بوون کە شتێکی ئەوتۆیان لەدەستدا نەبوو تا حەواڵەیکەن بۆیان کە لە ڤان بە کولەمەرگی دەژیان.

سەربازەکانیش بۆ ئەوەی هەرچۆنێکبێ بژین، گیانێکیان بەو بەشە خۆراك و چێشتە کەمەبوو کە لە سەربازگەکاندا دەیاندانێ، بشزانە کە ئەو بەشە هەرگیز تێری نەدەکردن، بەسکێ تێر و بەدە برسیبوون.

سەربازەكانی ڤان لە ساڵی ١٩٠٤ نەك بەهۆی دواكەوتنی موچەكانیانەوە هەشت مانگ، بەڵكو بەهۆی ئەو بەشە كەمە خواردنەی دەیانلدرایە ڕاپەڕین و كەوتنە یاخیبوون.[10]

نێزیكبوونی سەربازگەكان لەیەكترو ئەو ژیانە كولەمەرگیەی كە تیا بەسەریان دەبرد هۆیەكبوو بۆ تەشەنەكردنی دەردودو تیایاندا، لە مانگی ئادار/ مارسی ١٩١٠ پەتای تیفۆئید لەناو بنكەی سەربازی ئەرزڕۆمدا داكەوت، ڕۆژانە بیستیان لێ دەمرد، پەتاكەش تا دەهات پەرەی دەسەند و لەو بنكە سەربازیە گەورەیەشدا تەنیا شانزە پزیشك هەبوون بۆ چارەكردنی دوو هەزار تووشبوو و دەردەدار، جگەلەوەی كە یەك دانە موزەمید و پەرستیاریان نەبوو.[11]

پەتای كۆلێرا و ڕشانەوە لە ١٩٠٥ گەیشتە بنكەی سەربازی ڤان.[12] هەروەك چۆن (تیفۆئید - گرانەتا)یش لەنێو سەربازەكانی (مووش)دا لە زستانی ١٩١٢ - ١٣ بڵاوبۆوە[13]. بەم جۆرە لە ڤان و شارەكانی تر سەربازەكان بەدەست پەتا و درم و ڕشانەوەوە موبتەلا ببوون و دەیانتناڵاند و توانای سەربازی و شەڕكردنیشی لێبڕیبوون، لەو سەروبەندی جەنگی یەكەمی جیهانیەدا، كاری كردبووە سەر ڕێڕەوی شەڕەكەش.[14]

كۆلۆنێلێكی بەریتانی (ئەمیلیۆ كلاپتن) كە كونسوڵی وڵاتەكەی بوو لە ڤان، باس لە بڵاوبوونەوە و تەشەنەكردنی یەك لەو پەتایانە دەكات لەنێو سەربازەكاندا و دەنووسێ:

((تەورێز: ٢٢ مایۆ/ئەیار ١٨٩٨

شەرمەزمەندم بەوەی كە هەواڵی هەڵكشانی ڕێژەی مردن لەناو سەربازە تركەكانی شاری ڤانتان لە زستانی پاردا پێڕاگەیەنم: لە شارەكەدا پێنج بەتالیۆن و نزیكەی ٢٥٠ بۆ ٣٠٠ كەس هەبوون. مردووەكان لەنێوان ٥٠٠ بۆ ١٠٠٠ سەرباز، دانیشتویەكی نێزیك بە نەخۆشخانەی سەربازی پێی ڕاگەیاندم

كە ڕۆژانە لاشەكان دێن، بۆخۆم سەرنجی پەتاكەم داوە و ئەمەش لە ڕەنگ و ڕووی سەربازەكانی ناو شاردا دەبینرێ، بەزەحمەت ژمارەیەكی وردی مردووەكانیان دەزانرێ ، هەرچەندە دەستەلاتداران دەیانەوێ بیشارنەوە، بەلام بە ٢٠٪ ئەگەر مەزندەكرێ ئەوە زیادەڕۆیی نییە.

پێیان گوتم كە كەتیبەكەی ناو سەرا ژمارەیەكی زۆری لە دەست داوە، لەنێوان ٣٠ - ٥٠ كەس، بەلام وەزعی كەتیبەكەی (بشكالە) باشترە. هۆكاری ئەم مردن و لەناوچوونانە دەبەمەوە بۆ پەتای (تیفۆس - ڕەشە گرانەتا)، هەرچۆنێكبێ ڕاستیەكەی ئەوەیە كە ئەمانە سەرمایان دەبێ، لام وایە خواردنی سەربازەكان باشە و بەشدەكات، بەلام جل و پۆشاك و نوێن و پێخەفەكانیان لەوەدا نییە كە لە سەرما بیانپارێزێ، ژور و قاوشەكانیان بەباشی گەرم ناكرێن.

سەخترین ئەركێك و لە هەمووی ناخۆشتر دابینكردنی پاسەوانیە لە شەودا، جا لە ترسی هەوڵدانی شۆڕشگێڕان بۆ تێكدانی ئاسایشی ڤان و نەبوونی متمانەش بە پۆلیس، دەستەلات ئێوەندە پاسەوانەكانی چڕكردۆتەوە و ژمارەشیانی زۆرتر كردووە، ئەمەش كارەكەی بەباشی بە ئەنجام گەیاندووە.

پاسەوانە تركەكە سەرڕای ئەو پشووەی ناوبەناو چەند سەعاتێ هەیەتی، كارەكەی خۆی بەجێ دێنێ، بەلام سەربازەكان، سەرما زۆر و سەختەكەی شەوانی درێژی زستان كە پلەكانی گەرما دەچێتە خوار سفرەوە، تاقی كردۆتەوە، ئەو پالتۆ سەربازییەی پێیانە لە وەها سارديەكدا كەلكی ئەوتۆ نادات، لەم جۆرە كەشوهەوایانەدا بێگومان كە سەرما لێیاندات مرۆڤ پەك دەخات.[٢١])).

## • حیزبە شۆڕشگێڕە ئەرمەنەکان

دەستە و کۆمەڵە شۆڕشگێڕە ئەرمەنەکان لەناو خۆیاندا زیاتر لە کوردەکان تەبا و یەکگرتوتربوون، بەڵام ئامانجی زۆرو تاکتیکی فرەیان هەبوو کە دەیانویست بیگەنێ، لە ساڵی ١٨٧٠ ڕێکخراوی شۆڕشگێڕانی ئەرمەن لە ڤاندا بە دوو حیزبی بچووکەوە دەستی دایە کارکردن؛ یەکیەتی ڕزگاری (کە لە ساڵی ١٨٧٢ دامەزرا) وەکۆمەڵەی خاچی ڕەش (کە لە ساڵی ١٨٧٨ دامەزرا) ئەمەیان کۆمەڵەیەکی نهێنی بوو ڕێبازێکی شۆڕشگێڕانەی خوێناوی گرتبووەبەر. بەڵام هیچ کام لەم دوو حیزبە کاریگەرییەکی هەقیقی نەبوو، یەکەم حیزبێ کە کاری شۆڕشگێڕی ئەنجام دەدا حیزبی (ئەرمیناکان) بوو کە لە لایەن دەستەیە لە قوتابیانی ڤانەوە لە ١٨٨٥ دوە بە پێچەوانەی کۆمەڵەکانی پێشووەوە کاریان دەکرد، بزووتنەوەی (ئەرمیناکان) لەسەر بنەما شۆڕشگێڕیە باوەکانی سەدەی نۆزدە خۆی گرتبوو، ئەمە بە پێچەوانەی دەستە و کۆمەڵەکانی ترەوە، یانی بەرنامە و قانون و ڕێکخستنێکی ناوخۆو و لیژنەی ناوچەیی لە شارۆچکەکاندا هەبوو، جگە لەمەشقی سەربازی و ڕۆژنامەیەکی شۆڕشگێڕانە (ئەرمینیا) و کۆمەڵێ بەرپرسی شۆڕشگێڕ بە پاڵپشتی ژمارەیەك ئەندامی یاریدەدەر.

کونسوڵی رووسی لە ڤان، لیوا (کامساراگان) لە رووی ئامادەکاری سەربازی و شەڕی چەتەگەرییەوە هاوکاری دەکردن، چونکە خۆی ئەرمەنبوو ئیتر درگەی کونسوڵخانەکەی بۆ ئاوەڵا کردبوون و بۆخۆیشی مەشقی سەربازی پێدەکردن.

ئەم بزووتنەوەی ئەرمیناکانە لە شارەکانی ئێراندا بۆ ڕاییکردنی کاروبار و ئاودیوکردنی چەك و جبەخانە بە ئاسانی بۆ ناو شاری ڤان نووسینگەی کردبۆوە، ئەم کارە سیمایەکی زەرووری هەر جوڵانەوەیەکی

شۆڕشـگێری ئەرمـەنبوو، لەگـەڵ ئەمەشـدا ئـەم حیزبـە نـەیتوانی ببێتـە حیزبێکی شۆڕشگێڕی بەهێز، چالاکیەکانی تەنیا لە چەند شەڕ و پێکادانێکی کەمدا نـەبێ لەگـەل سوپای عوسمانی و کوردەکان زیـاتر تێنەپـەڕی. بـەڵام گرنگرتین چاکەیەکی ئەوەبوو کـەبوە یـەکێ لـە هۆکارەکانی ڕاخیبوونەکـەی ڤان لە ١٨٩٠.[٦٦]

ئەو حیزبە شۆڕشگێڕانەی کە لـە ڤانـدا جێگیربـوون و ڕاخیبوونەکـەیان بەرپاکرد تەنیا دووانـی بچووك بـوون بـە پـاڵ (ئـەرمیناگان )ەوە، دیـارترین سەرکردەشیان لە هاوڵاتیانی رووسی بوون.

حیزبـی (هانشـاك)ی شۆڕشـگێڕ لـە (ژنێـف )دامـەزرابوو (سویسـرا ١٨٨٧) حیزبێکی مارکسی، لـە بیروبـاوەڕدا لەگـەڵ کۆمۆنیسـتەکاندا یـەکانگیری بـوو، (لـە دەسـتپێشـخەریەکدا کـە ئامـاژە بـوو بـۆ ڕێزێکـی زۆر لـە بیروبـاوەڕی کۆمۆنیستی، ئەم حیزبە بەیانی یەکەمی دامەزراندنی کۆمۆنیستی وەرگێڕایە سەر زمانی ئەرمەنی).

دامەزرێنەرانی لەو قوتابیە ئەرمەنانە بوون کە لە قەفقاسیای رووسیادا بـوون و فەلسـەفەی شۆڕشـی بـاوی ئـەو سـەردەمەیان لـە مێشـك ئـاخنرابوو، پەیوەنـدی باشیشـیان لەگـەڵ حیزبـە شۆڕشـگێڕەکانی نـاو رووسـیادا هـەبوو، ئەیارەکانیان بەرنامەکەی ئەمەیان بەوە وەسف دەکرد کـە (سۆشیالیسـتیەکی مولحیـدی پێشـکەوتنخوازە). جـا حیزبەکـە خۆیشـی بـە شـانازیەوە ئـەوەی رادەگەیانـد کـە سۆشیالیسـتە و مولحیـدە و بـەڵام نەتەوەییشـە. دەیویسـت ئامانجەکانی لەبەرپاکردنی شۆرشێکدا لە ئەرمینای بەشی ترکیادا بینێتەدی، ئەمەش بەهۆی بوونی ژمارەیـەکی زۆری ئەرمـەن لـەم بەشـەدا لەچاو بەشـە ئەرمینیاکەی رووسیا. پاش بەرپاکردنی شۆڕشـەکە ئـەم حیزبـە وای بەچـاك دەزانی کە دەوڵەتیکی کۆمۆنیستی بنیاتنێ، وە بـەپێی سیاسـەی ئـەو کۆمەڵـە هاوشێوانەشی، شۆڕشـە نیشـتیمانیەکەیان دەگـرا ببێتـە بەشـێك لـەو شۆڕشـە

جیهانییەی چاوەڕوان دەكرا،

(لویز نالبەنـدیان) كەیـەك لـە مێـژوو نووسـە بەناوبانگـەكانی سـەرەتای شۆڕشـی ئەرمەنـە، لـەبارەی ڕێبـازی حیزبـی (هانشـاك)ەوە دەڵـێ: بریتیبـوو لەجـەنگێكی پڕوپاگەنـدەی گـرژی و تۆقانـدن و ڕێكخسـتن و چـالاكی نـاو جوتیـاران و كرێكاردەكـان.[17] مەبەسـتیش لـەم ڕێبـازە هەڵگیرسـانی شۆڕشـی ئەرمەنی بوو.

لـە بەیانەكـەی ئـەم حیزبـەدا هـاتبوو كـە (سـەرلەنوێ لـە قاڵبدانـەوەی ڕواڵەتـەكانی ڕێكخسـتنی كۆمەڵایـەتی و گۆڕینیـان لـە ئـەرمینیای نـاو تركیـا زەرووریەتێكـە ئەگـەر بـە زۆریشـبێ، ئەمـەش بـەڕێی بانگەشـە بـۆ شۆڕشـێكی میللـی)[18]. ئـیتر تۆقانـدن و چاوسـووركردنەوە بـووە ڕێبازیـان؛، دەبـوو بەرپرسـانی عوسمانیـان بترسـاندایە و لـە ئەرمـەن و تـرك دوژمنـەكانیان بكوشتایە: (لە ناوبردنی ئەو ئەفرادانەی تركن یان ئەرمەن و دوژمـنن و وان لــە دەوڵەتــدا وە قەلاچــۆكردنی ســیخوڕ و تاوانبــاران و ناپاكــان) (لــە بەیاننامەكەیانەوە)[19]

یەك لە لقەكانی ئەم حیزبە تەنیا كاری ئەوەبوو كە تیرۆر بكاو كاری تیرۆریستی ڕێكخات، لـە هەوڵێكیشـیدا بـۆ پێشـبینیكردنی داهاتووی شـۆڕش، حیـزب ئـەوەی ڕاگەیانـد كـە باشـترین و لـەبارترین كـات بـۆ هەڵگیرسـاندنی شۆڕشەكە ئەو كاتەیە كە عوسمانیەكان دەچنە جەنگەوە.

هەرچەندە لە ڤاندا شانەیەكی زۆری ئەم حیزبەی تێدابوو، بـەڵام ڕۆژێ لـە ڕۆژان ئـەم شـارە بەناوەنـدێكی چالاكی و جموجـۆڵی هانشـاك دانـەنراوە، لەسـاڵانی ١٨٩٤ - ١٨٩٥ حیـزب گشـت توانـا و هێزێكـی خـۆی خسـتبووە سـەر شۆڕشی (ساسۆن) و(زیتون)[20]. ئەو كاتە ئەم حیزبە سیاسەی بنەڕەتی خـۆیی لـە شۆڕشـی ئەرمەنـدا خسـتبووە سـەر: ئامـادەكردنی گشـت هێـزو لایەنـە گەوردكان بۆ سەرخستنی دۆزی دامەزرانـدنی دەوڵەتێكی ئەرمـەنی، لە ڕێـی

هێنانەکایەی هاوسۆزیەك بەرامبەرتەو ئەرمەنانەی سەردەبڕران.

دەستەو کۆمەڵی هانشاکی دەستیان دایە هەڵگەڕانەوە لە دەوڵەت و کەوتنە کوشتنی موسڵمانەکان و ڕێگەگرتنی نێوان شارەکان. ئەمەش وای لە کوردەکان و سەربازانی دەوڵەت کرد کە تێکۆشن بۆ دامرکانەوەی ئەم ئاگری یاخیبوونە، جا ئەمانیش کەوتنە سەربڕینی ئەرمەنەکان وەك تۆڵەیەك بەرامبەر تاوانی سەربڕینی موسوڵمانەکان.

ئەمە لەناو نێوەندە ڕاگەیاندنە ئەوروپاییەکاندا کاریگەری گەورەی جێهێشت، بەشێوەیە لە بەرژەوەندی یاخیبووەکان دەکەوتەوە. ئەو میدیایانە تەنیا بایەخیان بە هەواڵی کوشتوبڕی ئەرمەن دەدا، دەنگوباسی کوشتوبڕی موسوڵمانەکانیان پشتگوێ دەخست، لەمەشەوە پاڵەپەستۆیەکی میللی و گەورەی ڕای گشتی بۆ سەر دەوڵەتان هاتە ئاراوە، بەڵام ئەوروپاییەکان لەم چوارچێوەدا نەیانویست هیچ شتێ بکەن ؛ لەباتی ناردنی چەك و تفاقی شەڕکردن لیژنەی لێکۆڵینەوەی جیاجیایان دەنارده دەفەر و هەرێمەکان، بەمەش ستراتیژی هانشاك شکستی خوارد، لە ساڵی ١٨٩٦ حیزبەکە بووە دوو بەشەوە و حیزبی (تاشناق) توانی لایانخات و کاروباری شۆڕشی ئەرمەن بگرێتە دەست خۆی.

(تاشناق)یان ( یەکیەتی شۆڕشگێری ئەرمەنی) وە یان ( ARF کە لە وشەی – داشناکتسوتیون-دومیە و بە ئەرمەنی دەکاتە – یەکیەتی) بە رەسمی لە تەموز/ یۆلیۆ یان ئاب / ئاغستۆس ١٨٩٠دا لە ناوچەی قەفقاسیای رووس دامەزرا.[٢١] یەکەم گۆنگرەشی لە (تەفلیس) ساڵی ١٨٩٢ بەست، بەرنامە و دیسپلینەکانی خۆی تێدا ڕوونکردەوە بە ئامانجی: یەکیەتی شۆڕشگێری ئەرمەن تێدەکۆشێ بۆ چەسپاندنی ئازادییەکی ئابووری و سیاسی لە بەشە ئەرمەنەکەی ناو ترکیا، ئەمەش لە ذووتوێی یاخیبوونێکی چەکداریەوە.

بەرنامەکەی باسێکی رون و وردی ئەم چالاکیانە دەکات:

(چەكدارگردنى گەل) وە (كردەى تێكدان و خاپوركردن) وە (بەسزاگەياندنى بەرپرسەكانى دەوڵەت و ناپاكە ئەرمەنەكان و كوشتنيان) و ....هتد[23] ساڵى ١٨٩٠ و لە گەرمەى كۆنگرەى دامەزراندنەكەيدا، حيزبى (تاشناق) شەرێكى ميللى دژ بە حوكمەتى تركى ڤاو دا.[24]

هەروەك هانشاك، ئەميش باوەرِى سۆشياليستى كردە رِێبازى كارى خۆى و بووە ئەندام لە (رِێكخراوى حيزبە سۆشياليستەكان و حيزبەكانى تر – second International)دا، بەلام ئەم حيزبە لە چەسپاندنى بيرورِا ئابووريەكانى و توندوتۆڵكردنى ئامانجە نەتەوەييەكانيدا وريا و لێزانتر بوو.

(كۆنگرەى جيهانى يەكيەتى شۆرِشگێرِانى ئەرمەنى) دەستەى كارگێرِى حيزبى تاشناقى دامەزراند، لە ١٨٩٨ كۆنگرەى دووەمى جيهانى حيزبەكە بەرپرسياريەتەكانى حيزبى لەنێوان (نووسينگەى رۆژاوا) و (نووسينگەى رۆژهەلات)دا دابەشكرد. بارەگەى نووسينگەى رۆژهەلات لە شارى (تەفليس) بوو كە لە وێوە سەرپەرشتى كاروبارەكانى ليژنە ناوچەييەكانى حيزبى دەكرد لە هەرێمى قەفقاس و رۆژهەلاتى ئەنەدۆڵ و ئێران.

بەلام بارەگەى نووسينگەى رۆژاوا لە شارى (ژنێڤ)بوو لە سويسرا، لەوێوە سەرپەرشتى كاروبارەكانى حيزب دەكرا لە ئەستەموولّ و روژهەلات و لە ناوەرِاستى ئەنەدۆڵ و شوێنەكانى ترى جيهان كە لقى حيزبيان لێبوو. بە ئەوروپا ويلايەتە يەكگرتوەكانى ئامريكاوە، جگە لەمە ١٩٠٧ دەستەيەكى تايبەتى بەرپرس بۆ دەفەرى (ڤان - مووش) دامەزرا، ئەمە بايەخى دەفەرەكە دەردەخات لەلايەن حيزبەوە، لە ساڵى ١٩١٣ نووسينگەيەكى جيا كە بنكەكەى لە ئەرزرۆم بوو، بەرِێوەبردنى هەرێمى رۆژهەلاتى ئەنەدۆڵى گرتە دەست.[25]

ئەو تەكتيكانەى كە شۆرِگێرِەكان پەيرِەويان دەكرد، دەقاودەق وەك ئەو تەكتيكانە وابوو كە شۆرِشگێرِان بە گشتى لە ئاخرو ئۆخرى سەدەى بيستدا

پەيڕەويان دەكرد.

سەرەتاكانى (ماوتسى تۆنگ) لە چين و ژەنەراڵ (فۆنگياب جياب) لە ڤيەتنام و (ڤيدڵ كاسترۆ) لە كووبا تا ڕادەيەكى زۆر باش لەو سەرەتايانە دەچوون كە تاشناق لە ئەنەدۆڵدا ئەو سەردەمە بەكاريان دەهێنا.

(ماو) دەيگوت: شۆڕشگێڕان پابەندن بەوەى دووربينيان هەبێ، يانى بڕوانەنە دور، سەركەوتنى شۆڕشگێڕان بەندە بە ئارامگرتن و ڕێكخستنێكى هێمن و لەسەرخۆوە. ئەمەش پەندێكبوو كە دەبێت شۆڕشگێڕە ئەرمەنەكان هەر لەسەرەتاوە فێرى ببوونايە، بەڵام تا جەنگى يەكەمى جيهانى پەلامارە گەورەكانيان سەرينەدەگرت و فاشيلبوون، خۆ هەركە زياتر شارەزابوون و زانياريشيان پتربوو ئيتر وردە وردە كەوتنە ڕێكخستنى ريزەكانى خۆيان لە لادێ و شارەكاندا، فوريان دەدا بە دەمى ئەيارە ئەرمەنەكانيانەوە و هاوپەيمانيشيان لەگەڵ خەڵكانى تردا دەبەست، هەتا لەگەڵ عەشايرە كوردەكانيشدا.

## ● خاڵە لاواز وبەهێزەكانى ياخيبووەكان

لە ململانێكەياندا لەگەل دەولەت، شۆڕشگێڕان بێگومان خاڵى بەهێزيان هەبوو، لەوانە:

● پێكهاتەى كۆمەڵ و هەيكەلى دەستەلات لە رۆژەلاتى سەلتەنەتدا:

دەستەلاتى عوسمانێكان بەسەر هۆزە كوردەكاندا لاوازبوو، زۆر كەرەت نەياندەتوانى هەتا رەعيەتەكانى خۆيشيان لەدەست كوردەكان بپارێزن، سا ئەو رەعيەتانە موسڵمان بوونايە يان مەسيحى، جا ئەو سەركوتكردنەى لەلايەن كوردەكانەوە بوو ئەرمەنيەكانى هەڵدەنا ناچار پەيوەنديبكەن بە شۆڕشگێرانەوە و بچنە ناويان.

● كەمدەستى و هەژارى عوسمانيەكان: عوسمانيەكان لە تواناياندا

نەیوو کە باری گرانی بەرپاکردنی ئاسایشی رۆژهەڵات هەڵگرن، ئەو ژمارە سەرباز و پۆلیسانەی کە دەنێردرانە ڤان و دەڤەرەکانی دی رۆژهەڵات، بەشی نەدەکرد، جگەلەوەی مووچەیەکی کەمیشیان هەبوو، نەك هەر ئەمە بەڵگو چەند مانگێك دەمانەوە و لەچاوەڕوانی هاتنی مووچەدا بوون. ئەوەندە سەرباز و پۆلیسی ئەوتۆیان بەدەستەوە نەبوو کە بکەونە راوەدوونانی یاخیبووە ئەرمەنی و ئاژاوەگێڕە کوردەکان.

بەمەش ئەو سەرباز و پۆلیسانە پتر چاوشۆری بەرتیل و بەرتیلکاری دەبوون لە بەرامبەر چاوپۆشیکردن و وازهێنان لە گرتنی یاخیبوویەك یا تاوانبار و ئاژاوەگێڕێکی ئەو هۆزانە. جیا لەمەش خەڵکەکەیان رووتدەکردەوە و ئەمەش وای لە زۆریان دەکرد بچنە پاڵ شۆڕشگێڕان.

- مەترسی وەزعی سەڵتەنەی عوسمانی: زۆرینەی ئەو خەرجی و پارە و پوولەی بەدەست عوسمانیەکانەوە بوو بۆ سەرکووتکردنی جولانەوە یاخیبوودکانی (وڵاتانی بەڵکان و دورگەی کریت) و ڕووبەڕووبوونەوەی (هەڕەشە و مەترسی رووس) خەرجدەکران.

- دابەزینی ئاستی گوزەران هەتا ئاستی نەبوونی و نەدارایی لەلای ئەرمەنیەکانی رۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵ: ئەرمەنەکان بە هەزارحاڵ دەیانتوانی پێویستیە هەرە زەرووریەکانی خۆیان دابین بکەن، ببوونە نێچیری هۆزە کوردەکان، بۆیە ئامادەبوون هەرچیەکیان لەدەست بێ بیکەن تا باری ژیانی خۆیانی پێ چاککەن، لەوانە شۆڕش و چوونە ناو شۆڕش.

- پاڵپشتی ئەوروپا: رای گشتی ئەوروپا بێخەبەربوو لە ئازاری موسوڵمانەکان و چەوساندنەوەیان لەلایەن ئەرمەنەکانەوە، کەچی رۆژنامەکانی ئەوروپا زوربەی جار هەرباسیان لە نەهامەتیەکانی ئەرمەنەکان دەکرد، حوکمە سەرەتاییەکانیان هەمیشە بەلای مەسیحیەکاندا دەشکایەوە و کاریگەریشی هەبوو لەسەر دۆزەکەیان، ئەوەش بە سایەی

سياسەتمەدارانى وەك (ويليەم گلادستن)، ئەمە هۆكارێكى كاريگەربوو بۆ گردكردنەوەى پاڵپشتيەكى ئەوروپايى لە خزمەت دۆزى ئەرمەنەكاندا.

شۆڕشگێڕەكانيش كە لە هەندێ شەڕياندا خاڵى بەهێزيان دەست دەخست لەولاتر هەندێ خاڵى لاوازيان بۆ دەبووە ئاستەنگ؛ شۆڕشگێڕەكان نەياندەتوانى تاسەر نهێنى پلانەكانى خۆيان بپارێزن، ☒ رووسەكان و ☒ عوسمانيەكانيش تۆڕى سيخوڕى و هەواڵگرى تريان لەناوياندا وەشاندبوو، هەردوولا پارەى باشيان دەدا بۆ دەستخستنى زانياريەكان، بەپێى راپۆرتى عوسمانيەكان، ئەو هەواڵگرانە زانيارى زۆر راست و رەوان و ورديان دەدايە سەروتر لە خۆيان هەروا شۆڕشگێڕە دوورخراوەكانيش كێشەيەكبوون بۆخۆيان، كۆمەڵە كەسێكبوون ئامادەبوون هەروا بە ئاسانى چەكەكانيان كێ بيەوێ بۆى بەكاربخەن. لە ساڵى ١٩٠٩ سەركردەى تاشناق لە ئەرزرۆم بە دەستى ئەرمەنيەك، چونكە لە ليژنەكەى لابرا بوو، تيرۆر كرا.[٥] لە ساڵى ١٩٠٨ (داڤيد) شوێنى حەشارگەى چەك و تەقەمەنيەكانى پيشان حوكمەت دا، داڤيد يەك لە ئەندامانى تاشناق بوو، ڤينى لە (ئارام مانوكيان) بوو كە يەك لە سەركردەكانى ليژنەى ڤانبوو، لە ئەنجامى ئەو خيانەتە دوو هەزار پارچە چەك كەوتە دەست دوژمن و فەوتا.

ريزەكانى شۆڕشگێڕان پەرتوبڵاوبوون، هانشاك نەيتوانى يەكبوونى حيزبەكەيان بپارێزێ، لەگەڵ تاشناقيشدا يەكيان نەگرت، لەلايەكى دى ئەرميناكان سۆشياليستى حيزبەكانى دى و دەستگرتن بە داوێنى ئەوروپاوەى رەتكردەوە و قەبوڵى نەبوو، ناكرێ بگوترێ كە شۆڕشگێڕانى ئەرمەن لە ڤان لە ئامانج و كاركردندا يەكبوون، تەنيا لەم قۆناغەى دوايى هەڵمەتەكەياندا نەبێ، نێزيك بە جەنگى يەكەمى جيهانى.

جا هەرچى چەندە دەلاقەكەى نێوان لايەنە شۆڕشگێڕە جياجياكان فراوانبێ ئەوا دەلاقەى نێوان شۆڕشگێڕان و خانەدانە ئەرمەنەكان پتر

فراواندەبوو، بەتایبەت بازرگانەکانیان.

رابەرایەتیکردنی کۆمەڵی ئەرمەن لە دەستی ماڵباتە بازرگانە دەوڵەمەندەکان و کڵێسادا بوو. شۆڕشگێڕانیش هەڕەشەی ئەوەیان لێدەکردن کە رایاندەماڵن و دەست بەسەر پلەوپایە و رابەرایەتیەکانیاندا دەگرن، جا ببوونە مەترسی بۆسەر سەرچاوەی دەستەلاتی بازرگانان.

لەسایەی حوکمی عوسمانیدا بازرگانان کارێکی باشیان بەئەنجام دەگەیاند، لە واقیعیشدا بەتاوابوونی سەدەی نۆزدە بازرگانە ئەرمەنەکان سامانەکانیان دوو هێندەی لێهات و لە سامانی موسوڵمانەکانی دەوروبەریان گەلێ تێپەڕاند، بازرگانەکان ویست و نەزعەیەکی موحافیزکارانەیان هەبوو و پەیوەندیەکی توندیش بە حکومەتیەوەی گرێ دابوون.

چونکە ئەمانە ئاتاجی راپەڕاندنی کاروباریان بوون لەلایەن دەوڵەتەوە: بەدەستهێنانی روخسەت و مۆڵەتی دەوڵەت، رزگارکردنی شمەك و کالاکانیان لەخانی گومرگەکان و گەلێ خزمەتگوزاری تر کە لەلایەن دەوڵەتەوە نەبووایە نەدەکرا، سەرەرای پاراستنی دوکان و مارکێتەکانی ناوشاریان و کاروانەکانی سەر رێگە و بانەکان.

بەروبوومەکانیان بە حوکمەت دەفرۆشتەوە، ئەمە بووە سەرچاوەیەکی گرنگی گرێبەست و وەزیفەکانیان، هەتا ئەگەر پارەکەش بە رێکوپێکی نەدرابا، ئەم بازرگانانە پێویستیان بە سیستمێکی مەدەنی بوو بۆ پارێزگاریکردن لە دەوروبەرێکی شیاو و لەبار بۆ ساغکردنەوەی کالا و شمەکەکانیان، شۆڕشگێران بوونە هۆکاری ئاژاوەیەکی مەدەنی لە ڤاندا.

بازرگانەکان لە خانووی خۆش و ڤەشەنگدا دەژیان، منالەکانیان دەناردە ڤوتابخانە ئەرمەنەکان و ئەوانەی نێردرا و مسیۆنێرە ئامریکاییەکان کردبوویانەوە، ئەمانە زۆر لەوانەی موسوڵمانەکان باشتربوون، دەستیان گرتبوو بەسەر کەرتە گرنگە بازرگانیەکانی شارەکەدا، لەبەر ئەمانە

هەمووی... ڤان زەوییەکی بە پیت و لەبار نەبوو بۆ شۆڕشکردن تیایدا.

سەرەڕای ئەمەش دەشێ شۆڕشەکە لە کن چینە کەمدەست و هەژارەکان ئەوەنە جێی ڕەزامەندی نەبووبێ، ماوەیەکی دوور و درێژ هەندێ دژایەتی دەوڵەتیان دەکرد و بەباشی ملیان بۆ نەدەدا، وەك ئەرمەنەکانی (زیتون) کە هەر خۆیان لە گوندە شاخاویەکانیاندا نیمچە سەربەخۆیەك بوون. بەڵام زوربەی ئەرمەنە ڕۆژەلاتیەکان ناچار ملیان بۆ بار و رەوشەکەدا بوو، بە واقیعەکە ڕازیبوون، چونکە لە سەدان ساڵەوە هەر رەعیەتێکی دەوڵەتی عوسمانیبوون. دەشێ دەستەلاتداران و حاکمانی خۆیان خۆش نەویستبا و لووتیان پیا نەهێنانایە، بەڵام سەدان ساڵە توانیویانە بەم حاڵەشەوە بیگوزەرێنن، نانی خۆیان پەیاکەن و ئایین و خو و نەریتی خۆیشیان بپارێزن. جوتیارەکانیان زۆرتر نەزعەیەکی موحافیزکارانەیان هەبوو، چونکە لەوە دەترسان کە ئەگەر گۆڕانێکی بنەڕەتی ڕوویدات باری ژیانی ئەمانیش تێکچێ، ئەم دوو دڵەیشیان لە جێی خۆیدابوو، بەوەدا کە وەك دەرکەوت گومانەکەیان ڕاست دەرچوو.

کارکردن بۆ ئەوەی ئەرمەنەکانی ڤان بکرێنە لایەنگر و هەواداری شۆڕش وردە وردە و لەسەرخۆ بەرێوە دەچوو، شۆڕشگێڕان هۆکاری یەکەمبوون کە ئەو ئەرمەنانەیان لە ملکەچیە کۆنەکەیانەوە بۆ سوڵتان کە خۆشیشیان نەدەویست، داگێڕن.

لە ڕاستیشدا ڕووسەکان بوون کە جوڵانەوە جودا خوازییە ئەرمەنیەکەیان ئاوا زلکرد نەك شۆڕشگێڕە ئەرمەنەکان خۆیان، کە ئەرمەنیە ڕۆژەلاتیەکان بۆنی نفوزی ڕووسیان کرد نیدی ئەمانیش گۆڕان، ڕووسەکان لە نێوان ۱۸۲۷ - ۱۸۲۹دا سەرەتا لەشکرەکانی فارسیان شکاند و ڕاویاننان ونینجا عوسمانیەکان. ئەم ڕووسانە ۲٦۰۰۰ ترکیان کوشت یا گرتنیان، لەو زەویانەی بەشەڕ داگیریان کردبوون ڕایان گواستن، بەدەفەری

پەریڤانیشەوە (ئەوەی ئەمڕۆ کۆماری ئەرمەنستانە) چونکە ترکەکان لەوێ زۆرینەبوون، هەندێ ئەرمەن هاوکاری و پاڵپشتی رووسەکانیان دەکرد، بەتایبەت لە هێرش و پەلامارەکانیاندا، رووسەکانیش ئەو زەویوزار و کێڵگانەی لە ترکەکانیان سەندبوو دەیاندا بە ئەرمەنەکان، لە باج و سەرانە ئاساییەکانیشیان خۆشبوون، بۆیە لە ئێران و سەڵتەنەی عوسمانیەوە زیاد لە سەد هەزار ئەرمەن رژانە دەڤەرەکەوە، ئەم کارە دیسان لە ساڵی ١٨٧٧ - ١٨٧٨ لە شەڕی رووس و ترکدا دووبارە بۆوە، کە ئەرمەنەکان لە باکووری رۆژهەڵاتی سەڵتەنەوە کەوتنە پێش سوپای رووس و چاوساغیان بۆ دەکردن، تا بە رادەی ئەوەی لەناو ئەو شارانەی کە داگیر دەکران ببوونە پۆلیس بۆ رووسەکان. خۆ کە شەڕ تەواوبوو و رووس کشایەوە نێزیکەی ٢٥٠٠٠ ئەرمەنیان لەتەکدا رۆی، لەبەرامبەر ئەمەدا رووسەکانیش سەد هەزار موسوڵمانیان لەو خاکانەی کە لە شەڕەکانی ئەم دواییانەدا گرتبوویان دەربەدەر کرد.[٣٦]

هەرکام لە موسوڵمانان و ئەرمەن کەوتنە ئەو باوەڕەی کە رووس و ئەرمەنەکان هاوپەیمانی یەکن، لەوەی موسوڵمانەکان و بەچاوی خۆیان دییان کەچی بەسەر هاو ئایینەکانیان هات بە جۆرێکی دی لە ئەرمەنەکانیان دەڕوانی، ئەوانەی بە پێچەوانەی جارانەوە ئێستە بوونەتە مایەی ترس و هەڕەشە بۆیان، ئەو رەوشەی لەبەرەبەیانی مێژووەوە لە نێوانیاندا بوو ئێستە گۆڕا، لەمەدا موسڵمانەکان زۆرتر زەرەرمەند بوون، خۆ ئەرمەنیش گۆڕانی گەورەیان بەسەردا هات، ئەوساکە ئەوەی لە خۆشی و نیعمەتدا بوو وە ئەوەشی نەبووە و نەدارا بوو هەموان ملکەچی ئەمری واقع بوون، بەڵام ئێستە وا هەلی زێڕین بۆ ئەوانە هەڵکەوتووە کە لەژێر بارگرانی عوسمانیدا دەیانناڵاند. ئیستە ئەو ئەرمەنەی دەیەوێ لەو حوکمە هەڵگەڕێتەوە بۆی هەیە راپەڕێ، بۆیە لەم حاڵەدا دەستخستنە ناو دەستی رووسەوە شتێکی

سوود بەخشە، چونكە رووسيا دەستڕۆيشتووە و لەسەڵتەنەی عوسمانی نفوزی زیاتربوو جگە لە هەلی ئابووری زیاتریش، هەتا ئەگەر هەریەك لە رووسە ئەرسەدۆكس و ئەرمەنە گریگۆرییەكان وا تەماشای یەكتر كەن كە لەلایەكی تر بیدعەچیە و بێڕێزی بە ئایینەكەوە دەكات، بەڵام ئاخری و ئاقیبەت خۆ هەردوولا مەسیحین. ڕۆڵەی یەك تایەفەن، ئەمەش كۆڵكەی هاوبەشێكی وایە كە لەنێوان ئەرمەن و موسوڵماندا هەرگیز بوونی نییە، جگە لەمە رووسەكان ڕێگەیان بۆ ئەرمەن تەختكرد بۆ دەستكردن بە دامەزراندنی وڵاتێكی تایبەت بە خۆیان با لەژێر سایەی حوكمی قەیسەریشدا بووایە.

زیاد لە ٥٠٠ ساڵ ئەم ئەرمەنانە دەربەدەربوون، لە ڕێی ڕاگواستنی موسوڵمانانی یەریڤانەوە و گۆڕینەوەیان بە ئەرمەن، دور لە زێدی خۆیان و خاكە هەژارەكەیان لە ئەنەدۆڵ و باشووری قەفقاس. رووس ئەرمینیای دروستكرد، بەڵام سەرەڕای بوونی زۆرینەیەكی موسوڵمان لە رۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵ كەچی ئەرمەنەكان تەماعی ئەوەیان لێنیشت كە ئەو ئەرمینیایە درێژكەنەوە بۆ ناو سەڵتەنەی عوسمانی، هەتا ئەگەر ئەمە پێویستی بە ڕاگواستنی بەردەوامی موسوڵمانەكانیشبێ لەو ناوچانەدا. دیارە و گومانی تێدا نییە كە گشت ئەو گفت و وادانەی لە دەستخستنە ناو دەستی رووسەوە دەهات چەوربوون و نەدەكرا چاویان لێ بپۆشرێ.

## ● ئەوروپاییەكان

هەوڵ و تەقەللاكانی عوسمانییەكان بۆ سەركوتكردنی یاخیبووانی ئەرمەن لەلایەن ئەوروپاییەكانەوە یەك خرا، حوكمەتەكەی عوسمانیش هەمیشە دەسەوسانبوون لە ڕێوشوێن هەڵگرتنی یەكلاكەرەوە، بەهۆی دەستێوەردانی ئەوروپا لەسایەی هەڕەشەی بەردەوامی رووسدا.

جا بەهۆی پەلامارە ئابووریەکانی ئەورووپاوە، عوسمانێکان زۆر زۆر ئاتاجی هاوپەیمانێك بوون، یا هەر نەبێ بۆ کەمکردنەوەی لیستی دوژمنە زۆرەکانیان، هەتا ساڵی ۱۹۰۷ عوسمانێکان بەریتانیەکانیان بە نیزیکترین دۆستێ دادەنا لێیانەوە، ئەم دۆستایەتیەش شتێ لە سەیروسەمەرەیی لەخۆگرتبوو، چونکە بەریتانیەکان لەدەستخستنە ناو کاروباری ناوخۆی دەوڵەتەکە نەدەکەوتن، هەتا کار گەیشتە ئەوەی خۆیان بە پارێزەری ئەرمەن دادەنا. حوکمەتە بەریتانیە یەك لە دوای یەکەکان کە دەهاتن زۆر باش لەلای رای گشتی و پەرلەمانی وڵاتەکەیان خۆیان بە مەسەلەی ئەرمەنەکانەوە دەنالاند، رای گشتی و پەرلەمانیش خوازیاری جوڵەیەکی دیپلۆماسیانە و هەتا سەربازیش بوون بۆ بەهاناچوونی ئەرمەنەکان.

وەك ئەمڕۆ، لە سەدەی نۆزدەدا باوەڕ و عەقیدەی سەربازی بریتیبوو لەوەی حوکمەت رێو شوێنی گورج و یەکلاکەرەوە بگرێتە بەر بۆ لێدانی یاخیبووان، خۆ ئەگەر حوکمەتەکە ئەمەی نەتوانی تەوا هەل بۆ یاخیبووان دەرەخسێ تا خۆیان رێکخەن و خەڵك کۆکەنەوە و بیانخەنە ژێر چەکەوە، ئەوانەشی هاوسۆزیەکیان لەتەك دۆزەکەیاندا هەبوو سەرتجیان دا کە دەوڵەت لاوازە، جا چوونە ناو یاخیبووانەوە، لەبەرامبەردا بەهۆی خۆتێهەڵقورتانی بەریتانی و فرانسایی و رووسیاوە عوسمانیان لەگرتنەبەری رێ و شوێنی یەکلاکەرەوە دەسەوسانبوون.

لە چەند حاڵەتێکا بەریتانێکان لەسەر یاخیبووەکان خۆیان تێهەڵقورتان و زۆریان هێنا بۆ حوکمەتەکەی ئەستەموول تا لەو یاخیبووە مەدەنیانە خۆشبێ و بۆ ئەوانەش ئاسانکاری بکات کە لاگیری خۆیان پیشاندەدا بۆ شۆڕش.[٣٧]

لە واقیعیشدا بەریتانیەکان لەگەڵ ئەو وەزعەی رۆژەڵاتی سەڵتەنە کە دروستببوو تەفاعولیان نەکردبوو، بەڵکو لەگەڵ وەزعی سیاسی ناو

بەریتانیای خۆیاندابوون. بەدەگمەن نەبێ، لەو جیرۆکانەی کە ئەرمەنەکان دەیاندا بە گوێیاندا ، شتێکی تریان نەدەبیست.

هەر بۆ نموونە: کە عەشایرە کوردەکان هێرشیان کردە سەر موسوڵمانەکان، کونسوڵەکان جووڵەیان بۆ نەکرد، خۆ ئەگەر ئەرمەن بەر ئەو هێرشە بکەوتبا ئەوا بروسکە و نامە دادەباری بەسەر باڵیۆزدا لە ئەستەمووڵ و داوای کشانەوەی ئەو بەرپرسانە دەکرا کە سستیان لەم کارەدا نواندووە سەرەنجام لە رۆژەلاتدا ئەفسەر و کاربەدەستان ناچار دەبوون نەرمی و چاوپۆشی بنوێنن بەرامبەر یاخیبووەکان. ئەمە بەپێی ئەو فەرمانانەی لە کونسوڵخانەکانەوە دەردەچوون.

بۆیە هەردوو کونسوڵ لە (ڤان و پەتلیس) توانیان کارێکی وا بکەن کە ئەفسەر و کاربەدەستان بکشێنرێنەوە و داوای لێبووردنیش لە یاخیبووان بکەن و گشت ئەمانەیان بۆ چووەسەر.

هەر بۆ نموونە: پاش ئەوەی دوو هەزار پارچە چەك و تەقەمەنی لە ڤان دۆزرایەوە و پاش کوشتنی ئەو ئەرمەنیەی کە شوێنەکەی پیشاندابوون و دوای تیرۆرکردنی هەندێ پۆلیسیش، کونسوڵی بەریتانیا داوای لە والی کرد ئەو یاخیبووە ئەرمەنانەی دەستیان لە کارەکەدا بوە بگیرێن و ئەو موسڵمانانەش کە ئەرمەنەکانیان کوشتووە دیسان بگیرێن، بەلام داوای دادگەییکردن و سزادانی موسوڵمانەکانی کرد و لێبووردنیش بۆ ئەرمەنەکان، لەرێی باڵوێزخانەی بەریتانیاوە لە ئەستەمووڵ پاڵەپەستۆ خرایە سەر دەوڵەت تا داواکان بهێنرێنە دی.[٢٨] حوکمەتیش ناچار ملی دا بۆ ئەو خواستانە، موسوڵمانەکان دادگەییکران و بەرپرسە عوسمانیەکان لە کارەکانیان دوورخرانەوە، سا کاری خراپیان کردبێ یان نا.[٢٩] بەلام سەرکردە یاخیبووەکان دەستگیرکران و دوایی مەرەخەس کران.

عوسمانێکان بە تایبەت گرنگیان بە داواکاریەکانی رووسیا دەدا. چونکە

چاك دەیانزانی كە رووسەكان دەیانەوێ لە رۆژهەلآتدا پشێوی بەرپاكەن، بەڵام دیسان دەرگیان بەوە كردبوو كە هەر رووسە بۆتە گیروگرفت و ئاستەنگە هەقیقیەكان و ئەوانەشی بەرووی كەمایەتیە مەسیحیەكاندا دروستدەكرێن دەیانكاتە بیانوو بۆ دەستێوەردانی سەربازی، ئەوەبوو لە شەڕی ١٨٧٧ - ٧٨دا هەر واشیان كرد، ئەو شەڕەی لەسەر عوسمانیەكان لە زەویوزاری ئەوروپا و ئاسیاشیان زۆر كەوت.

رووسەكان یارمەتیدەری راستەقینە و بە كردەوەی یاخیبووە ئەرمەنەكانبوون، (وەك لە بەشەكانی ئایندەدا دەردەكەوێ). رووسەكان بە بیانووی ماف خۆیان لە دەستێوەردان لەدەرەوەی سنووریاندا، پشتی یاخیبووەكانیان دەگرت، سەركردە شۆڕشگێڕە ئەرمەنەكانی ناو ڤان روسیایی بوون و ملیان بۆ قانوونی عوسمانی نەدەدا، ئەمەش بەپێی ئەو رێكەوتنانەی كە بەربەستی دەكات لە دادگەییكردنی هاوولآتیانی ئەوروپایی و سزادانیان لەلایەن دەستەلاتدارانی عوسمانیەوە.[٢]

جا لەوە دەچێ كە پاڵپەستۆی ئەوروپاییەكان بووبێتە هۆی لاوازی و كزی توانای عوسمانیەكان كە شەڕیان لەگەڵ یاخیبووەكاندا دەكرد، هەر ئەم حاڵەشبوو كە لە ئەوەكانی داهتووشدا وابوو، لەناوبردنی یاخیبووەكان بریتیبوو لە سزادانی هەركەسێ كە هاریكاری كردبێتن و بەگژداچوونەوەی یاخیبووەكان خۆیشیان، بەریتانی و رووس و فرانساییەكانیش هەر ئەم ستراتیژەیان بەرامبەر یاخیبووانی ولآتانی ژێردەستی خۆیان بەكاردەهێنا و پەیرەویان دەكرد.

یەك بەراورد بەسە كە بكرێ لەنێوان مامەڵەكردنی عوسمانێكان لە ڤان و ئەورێ و شوێنانەی كە بەریتانیا بەرامبەر یاخیبووەكان لە هیند دەیگرتنەبەر، مامەڵەی فرانساییەكان لە باكووری ئافریقا و مامەڵەی رووسیا لە قەفقاس، تا بەتەواوی (سیاسەی پێوان بە دوومەن) كە ئەوكات

پەیرەو دەکرا، دەردەکەوێ، دیارە بار و زروفەکەی ڤان و ئەو شوێنانەش جیاواز بوو، چونکە ئەوروپاییەکان دەیانویست داگیرکاریەکە بەسەر زۆرینەکاندا بسەپێنن، بەڵام عوسمانییەکان هەوڵیاندەدا بۆ پاراستنی زۆرینەیەکی موسوڵمان لەدەست کەمینەیەکی دیاریکراو کە یاخیبووە ئەرمەنەکانبوون.

لەگەڵ ئەمەشدا ئەوروپاییەکان رێگەیان نەدەدا بە عوسمانییەکان کە ئەو شێوازانەی خۆیان بۆ سەرکوتکردنی بزووتنەوە شۆڕشگێڕیەکانی لای خۆیان کە بەکاریاندەهێنان، ئەمانیش بەکاریانبهێنن، بەراوردێك لەنێوان رووس و عوسمانیاندا ئەوە دەسەلمێنێ کە یەکسانی لەنێوان ئەو دووانەدا و لەو بوارەدا باری کردبوو، لەواقیعدا رووسەکان، ملیۆنەها یەهوودیان لە دەڤەرەکانیانەوە لە باکووری رۆژاواوە ڕاگواست. کە ساڵی ١٨٧٨ تێومرگەڕایەوە کۆی قوربانیانی ڕاگوێزان گەیشتە ١،٢ ملیۆن موسوڵمان لە قەفقاس و ٤٠٠ هەزار ترکی تەتاری، ئەمەش لە ئەنجامی داگیرکاری رووس بۆ ئاسیا و دورگەی (قرم)، سەرەڕای ئەمەش کەچی دەنگێکی ناڕەزایی لە ئەوروپاوە لە دژیان نەبیسترا و نەشیان دەهێشت عوسمانیەکان هەتا کەمینەیەك کەلێیان هەلگەڕاوەتەوە و یاخیبووە، دایمرکێننەوە.

لە رۆژهەڵاتی سەڵتەنەی عوسمانیدا ماق خاوەنداریێتی خاڵێکی ناکۆکی سەرەکی لەنێوان لایەنەکاندا دروستکردبوو، لە هەندێ ناوچەدا، سەرەك عەشرەتە کوردەکان سەدان ساڵبوو خۆیان گەورە و دەرەبەگ و فیۆداڵبوون، ئەو ئەرمەنیانەی لەسەر زەویەکانی ئەمانە بوون، ساڵانە بەشێکی دیاریکراویان لە حاسڵاتەکە دەدا بە خاوەن موڵکەکە، هەروا لە بەرامبەردا خزمەتی سەرەك عەشرەتەکانیشیان دەکرد تا لە پەلاماری عەشرەتە کوردەکانی تر بیانپارێزن. جا لەسایەی ئەو گۆڕانکاری و چاکسازیانەی بەسەر ساحەی عوسمانیدا هات، دیارە ئەرمەنەکانیش ویستیان سنوورێ بۆ

ئـەم ڕەوش و بـاری گوزەرانـە دانـێن، بـەڵام سـەرەك عەشـرەتەکان وایـان نەگەرەك بوو، گەرەکیان بوو بارو گوزەرانەکە وەك خۆی بمێنێتەوە.

گـۆڕینی بـاری موڵکایـەتی زەویـوزار تـەنیا لـە ڕوانگەیـەکی تیـۆری ڕووتەوەدیە، زوربەی هەرەزۆری زەویوزارەکان موڵکی سوڵتان بوون، بەلام بە کـرێ دابـووی بـە بەرپرسـانی کۆکردنـەوەی بـاجی کشـتوکاڵ، خـۆ لـە ڕووی پراکتیزەکردنەوە ئەو زەویانە مـوڵکی سەرەك عەشرەتەکان بـوون، قانوونـە تازەکـان ئـەوەیان دەگەیانـد کـە تۆمـارکردنی زەوی وا ئەنجامـدرێ کـە ئـەو زەویانـە موڵکایەتیـەکی تایبەتـە. جـا ئایـا چـەك (تـاپۆ)ی موڵکایەتیـەکان تەسـلیم وبـە جوتیارەکـان دەکـرێ یـان بەسـەرۆکی عەشـرەتەکان کـە عەیامێکبوو هەر خۆیان گەورەی زەویەکانن؟

چـەند جارێـك تەقـەللای چاکسـازیکردن درا و هەنـدێ زەوی بـەناوی جوتیارانـەوە تۆمـار دەکـرا، بـەڵام ژمارەیـەکی زۆری موڵکایەتییـەکان هـەر بـەپێی سیسـتمە کۆنەکـە مـابۆوە، مشـتومڕ و وتوویـژێکی زۆری قـانوونی و ناقانوونی لەبابەت ئەوەی کـەکێ خـاوەنی زەویـە و کـێ خـاوەن نییـە دەکـرا. ئەم دیاردەیە نەبەلای سەڵتەنەوە شتێکی سـەیر و سـەمەرە بـوو و نـە بـەلای هـەر دەسـتەلاتێکی تـری دنیـادا. بـەڵام ئـەو گـرژی و وئاڵۆزیـەی نێـوان موسوڵمانان و نەرمەنی توندتر و قووڵتر دەکردەوە.

هـەرکام لـەو دووانـە وەك یـەك بـەرەورووی کێشـە سـوننەتیەکەی موڵکایەتی ببوونەوە، ئەوانیش لە سونگەی پەیوەندیەکی نیمچە فیۆداڵیـەوە بەسـترابوونەوە بـەخاوەن زەویەکانـەوە و مشـتومڕیانبوو لەسـەر زەویـەکان. ناشـتوانرێ کـە بگـوترێ کـە لایـەنێکی ئـاینی زیـاتر لەویـدی بـە دەسـت سیستمێکی بۆماوەی کۆنەوە کە هیچ ویژدانێکی تێدا نییـە و زۆر بـە سستی دەگۆڕرێ، ناڵاندویە و ئازاری چەشتووە.

کێشەی دووەمی پەیوەندیە موڵکایەتیە زەویوزاریـەکان، کێشـەی نێـوان

ئەرمەنـەکان خۆیـان بـوو، لـە قۆناغـە جیاجیاکـانی مێـژوودا سـەڵتەنەی عوسمـانی ڕەوی زۆری ئەرمەنـەکانی چـاوپێکەوت کـە ڕووەو هەنـدەران دەبوونـەوە، هەنـدێ لەوانـە چووبوونە نـاو ئـەو سوپایەی رووسـەوە کـە لـە ڕۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵەوە لە دوای شەڕی ١٨٧٧ - ١٨٧٨ کشایەوە، هەندێکی تر لەتاو توندوتیژی هەڵاتن و یـان چوونە پاڵ ئـەو بزووتنـەوە شۆڕشگێڕیانەی نـاو ئێـران و رووسـیا و یـان هەنـدێ بـەدوی کـارو گوزەرانـدا ڕوەو ویلایەتـە یەکگرتووەکانی ئامریکا، رووسیا ببونـەوە. جا ئەگـەر مـاوەی مانـەوەیان لـە دەرەوە لە سنووری قانوونی خۆی تێپەڕی ئـەوا زەویـەکانیان بـە وازلێهێنـراو (مەتروکە) دادەنرا و دەستی بەسەردا دەگیرا، لەراستیشدا زیاتر دراوسێکانیان یان سەرەك عەشرەتەکە دەستی بەسەرا دەگرت.

جا ئەوانەی دەگەڕانـەوە داوای زەویـەکانیان دەکـردەوە، بـەڵام موڵکـدارە تازەکان نەیاندەدانەوە[٦] هەوڵەکانی دەوڵەتیش بۆ چارەسەرکردنی ئەم جـۆرە نیزاعانـە جۆراوجـۆر بـوو، بـەپێی خواسـت و پلـەی گـەرموگوڕی داواکـار و جیددیەتی لەسەر داواکەی، ئەوەبوو لـە کۆتـایی سـاڵانی نـەوەدەکانی سـەدەی نۆزدەدا، بۆ نموونە: حوکمەت هیچ هەوڵێکی نەدا بـۆ گێڕانـەوەی زەویـوزاری ئەرمـەن کـە دەسـتدارێکی سـەر بـە عەشـرەتی حەیـدەرانی داگیری کردبـوو بەناوی (حسێن) لە (باتانووس)، کە دەوڵەت زانی سەرەك عەشـرەتەکە لاوازە و دەستی نـاڕوا دەسـتی بەسـەر زەویەکـەدا گـرت.[٣٢] لایەنـە پەیوەندیـدارەکانی دەوڵەتیش نەیانتوانی هیچ بەرامبەر حسێن بکەن، هەتا ئەوکاتەی حوکمـەت هاتەوە سـەرخۆی و کـەمێ بازووی تونـد بـوو، ئـەوەش دوای تێپـەڕبوونی دە ساڵ.

لە راستیشدا، سـەرۆکە دەسـتەلاتدارەکان کـە زەویـەکانیان داگیر دەکـرد، ئەمە کاری دەکـردە سـەر خـاوەن موڵکـە موسـوڵمان و ئەرمەنـەکان.[٣٣] خـاوەن نفوزەکان هەر کە هەلیان بۆ بڕەخسایە، بەبێ گوێدانـە برایـەتی و هاوزمـانی

و هاوشاییەی دەستیان دەگرت بەسەر زەویەکاندا. ئەو زەرعات و بەروبوومانەی تاکە کەسێك یا ئاواییە سەربەخۆکان دەیانکردن لە زەوی خاوەن موڵکە بچووکەکاندا، گشتیان لەناو مشتی ئەو وسەرەك عەشرەتە بەتوانا و بەهێزانەدا بوون، هەرکات بیانویستبا بۆخۆیانبوو.

لە ئاوڕدانەوەیك بەلای (مەسەلەی کشتوکاڵ)دا، کونسۆڵی بەریتانی لە ساڵی ١٩١١دا سەرنجی ئەوەی دابوو کە مەسەلەی زەوی ئەرمەنەکان (لەراستیدا هێند گرنگ نییە لەچاو مەسەلەیەکی دی گرنگتری وەك دەستکردن بە چارەسەرکردنی مەسەلەی داواکاری - کوردەکانی ڕابە - بۆ گێڕانەوەی ئەو زەویانەیان کە ئاغاکانیان لێیان زەوت کردبوون) بەلام لەسەردەمی تەشکیلاتی سوارەی حەمدیەیەدا دەستەڵات و نفوزی ئەم ئاغایانە و وسەرکردە کوردەکانیدی زیادی کرد، ئەوەش بە سایەی ئەو ئیمتیازاتانەی کە لە سەردەمی (عەبدولحەمید)دا دەستیان کەوت. ئینجا ئەم ئاغا و سەرکردانە وردە وردە دەستیان کرد بە زەوت کردنی زەوی و زارەکانی ئەو-کوردانەی ڕابە- و ماڵ و کەل و پەلیان و دواییش دەیانکردنە خزمەتکاری خۆیان.[٢٤]

موسوڵمان و ئەرمەنیەکان چونکە زەربیە و باجەکانیان دوادەخست ونەیانبوو بیدەنە حوکمەت، گەلێ زەویوزاری خۆیان لەدەستدا، جا ئاغا و سەرۆکە کوردەکان و ئەرمەنە خاوەن پرۆژەکان لە مەزادی ئاشکرادا دەستیان کردە کڕینی گوند و لادێکان. جاری وا بووە سەرتاپا گوندێك (بەزەوی و جوتیارەکانیشیەوە - نێر و مێ) دەکڕا.[٢٥]

## ● لە ڕۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵدا ژیانێکی سیاسی ئاڵۆز و گرژ

ئەوەی بیویستبا لە ژیانی سیاسی ڕۆژهەڵاتی سەڵتەنەکە بگەیشتبا دەبوو بیزانیبا کە پڕە لە تەنگژە و ئاڵۆزی. زۆر کەڕەت لەو ڕۆژهەڵاتەدا ڕەوشەکە

بەوە وەسف دەکرا کە ململانێیەکی دوو تەرەفیە، بەپێی ئەوانەی دەیانگێڕایەوە، سەرەڕای ئەمبەرەوبەرکردن و گۆڕانی تەرەفەکانی ململانێکە.

چونکە هەندێك وای باس دەکرد کە ململانێیەکی نێوان ترك و ئەرمەنە یان ترك و کوردە، وەیان کورد و ئەرمەنە، یان عوسمانی و رووسی و هەتا سەری دەکێشا بۆ موسوڵمانان و مەسیحیش. بەڵام لە ڕاستیدا واقیعە سیاسەکە زۆر لەم مەزندەکردنانە ئاڵۆزتربوو، لایەنەکانی زۆر لێك جیاوازبوون و هەرچی هێز و بەرە ناوخۆییەکانیشە تەقەللای خزمەتکردنی بەرژەوەندیە تایبەتەکانی خۆیانبوو، قەتاو قەت ڕیزەکانی عەشرەتە کوردەکان یەکنەبوون. زوربەی کەڕەت لەنێوان خۆیاندا دەکەوتنە شەڕ و پەلاماردانی یەکتر، زیاتر لەوەی شەڕ لەگەڵ حوکمەت یان شۆڕشگێڕانی ئەرمەندا بکەن، لەوانەیە باشترین نموونەیەك بۆ ئەمە لەو دوو کۆنفدراڵیە عەشایرە کوردەیە گەورەیەدا خۆی دەبینێتەوە: (حەیدەرانلی) کە گەورەترین عەشرەتێك بوو و بووە سێ پارچە عەشرەت لە دەوروبەری (پاتنووس، ئەرگیس و بارگیری) گرد ببوونەوە، ئەم حەیدەرانلیانە لەناو ئێرانیشدا پەلیان بلاوببۆوە، زۆرجار ئەم عەشرەتانە پێکداهەڵدەپژان و هەرگیز دەستەڵاتی عەشرەتێکی گەورەتر لە خۆیان قەبووڵ نەبوو.

بەڵام (شوکاك) دووەم کۆبەندی عەشایری لە رووی قەبارە و زۆریەوە، ئەمانە لە دەڤەری (سەرای) بۆ خوارەوە لە رۆژەڵاتی ئەنەدۆڵ و رۆژاوای ئێراندا بوون، شوکاکەکان بە ڕواڵەت یەك ڕێکخراویان پێکەوە نابوو کە سەرکردەیەکی بالا پێشەنگیان بوو، بەڵام لە واقیعدا کۆنفیدڕاڵیەکیان پێکەوە نابوو کە پڕبیوو لە دووبەرەکی و توندوتیژی وا بەلانی کەمەوە حەوت عەشرەتی گەورەیان لێ جوێ ببۆوە و لەوانیش هی گچکەتر، ئیتر بەهۆی کەمی شوێنکەوتوانیان، سەرکردە بالاکەیان کە پێشەنگی دەکردن،

لاوازترین و بێ دەستەڵاتترین سەرکردەیەکبوو.[36]

ئەم شوکاکانە زۆرجار لەناو یەکدا دەکەوتنە گیانی یەك، یا پەلاماری عەشرەتی تریان دەدا. لەسەروبەندی شۆڕشی مەشروتەدا لە ئێران (شۆڕشی دەستووری کە لە ١٩٠٥ەوە درێژەی کێشا بۆ ١٩١١) کۆمەڵێ لەم شوکاکانە دایانە پاڵ مەشروتەییەکان. لەلایەکی ترەوە بەشێکی تریان چوونە پاڵ بەرەی شاو هاوپەیمانە رووسەکانی.[37] جا زۆر دوربوو کە هیچ کام لەمانە گوێیان بە لایەنی سیاسی دابێ لەمەسەلەکەدا وتەنیا و تەنیا بە دوی دەستکەوتی شەخسی خۆیانەوە بوون، نەك ئیدۆلۆژی. شایانی گوتنە کە وەلا و لاگیری بەلای شوکەکانەوە، لە باشترین حاڵدا شتێکبوو لە پلەی دوواوە دەهات.

زۆر جار پەیوەندی نێوان شۆڕشگێڕانی ئەرمەن و عەشرەتە کوردەکان تێکدەچوو، کەرەتی وابوو دۆست و هاوپەیمانی یەکتربوون، جاری واش نەیار و دوژمن، ئەمەش بەپێی بەرژەوەندیە بەرامبەرەکانی یەکدی، کاتێ بە نامانجی ئەوەی کاردانەوەی تۆڵەسەندنەوەی لێ بکەوێتەوە، ئەرمەنەکان شاڵاویان دەبرد بۆ عەشرەتە کوردەکان، هەر عەشرەتی کوردی تر یارمەتی شۆڕشگێرە ئەرمەنەکانیان دەدا لە ناودیوکردنی چەك و وتفاقی شەڕ بۆناو رۆژدەلاتی عوسمانی. بۆیە بە دەگمەن گوندە ئەرمەنەکان و عەسرەتە کوردەکان بە ئاسوودەیی و تەبایی دوو هاوسێ پێکەوە دەگوزەران، بەلام حوکمەتیش هەر بە ئەنقەست ئەو عەشرەتە کوردانەی لە ئێرانەوە پەنایان هێنابوو لە نێزیك گوندی ئەرمەنەکانەوە نیشتەجێی دەکردن، ئەوە بەو هیوایەی کە ئەرمەنەکان لە عەشرەتە کوردەکانی دی بپارێزن. بەئامانجی جۆرە بڕیارێکی ئاوها ئەرمەنەکان شادمانبوون.[38]

## ● پەراوێزەكان

١- ئەمە سيستمێكە بە زۆرى ناو دەبرێ بە (كۆكردنەوەى باج و خەراجى كشتوكاڵى) بە درێژايى چەند سەدەيەك ئەمە لە چوارچێوەى ئەو باج و سەرانانەى كە دەوڵەت لە خەڵكى كۆدەكردەوە بەڕێوەدەچوو، جا چونكە بيرۆكراتەكان ژمارەيان كەمبوو ئەوانەش كە باجيان كۆدەكردەوە (باجگرەكان) نەشارەزابوون، ئەوا ماڧ سەندنى باجەكان لە خاوەن موڵك (لەگەڵ سەندنى كرێى باجگرەكەش) دەدرا بەو كەسەى كە زۆرترين دەستكەوتى دەدايە دەوڵەت، لە واقيعيشدا كارى باجگردكە لە دەڤەرێكى وەك ڤان لە كشتوكاڵدا ببووە پيشەيەك كوڕ لە باوكيەوە بۆى دەمايەوە، پشتاوپشت ئەوە لەدواى ئەوە دەيانكرد، لە لايەن بنەماڵە دەوڵەمەند و سەرەك عەشرەتەكانەوە قۆرغكرابوو، لە دوا ساڵەكانى سەدەى نۆزدەدا ئەم وەزعە گۆڕا، كە ژمارەى ئەو زەويانەى بەناوى جوتياردكانەوە تۆماركران زۆربوون و حوكمەتيش تواناى باج گردكردنەوەى زيادبوو، بە پاڵ ئەمەشەوە چوونە سەر سيستمێكى تازە، ساڵانێكى زۆرى گەردكە.

٢- بۆ دەستخستنى نموونەى ئاليەتێكى ئەم سيستمە بچۆرە سەر فايلى ١٩٧/٤٢٤ لە موناهان بۆ ئۆگۆنرى، پەتليس تشرينى يەك/ ئۆكتۆبەر ١٨٩٨

٣- فايلى ٢٢٨٤/١٩٥ لە ديكسن بۆ لوزر، ٢٢ ئەيلوول/سەپتەمبەرى ١٩٠٨

٤- بۆ دەستخستنى نموونە دەربارەى كارى داگيركردنەكانى عەشايرە كوردەكان، بچۆرەوە بۆ فايلى ١٦٨٨,/١٩٥

٥- هەر بۆ نموونە: (ميتران پاشا) كە سەركردەيەكى كورد بوو، لە جەزيرە دەيرێكى ڕوخاند، كەرەسەى بيناكەى بۆ دروستكردنى بازاڕ و دوكانێكى جوان بەكارهێنا. مزگەوتێكى هەر لەوێ كردە مۆڵگەيەكى سوارەكانى حەميدييە، كە خۆى سەركردەيى دەكردن، ئەمە يەكێكبوو لەو

یانزە مزگەوتەی کە مستەفا پاشا روخاندی و دار و پەردووەکانیانی کردە کەرەسەی بیناسازی : (فایلی ۱۲۵/۱۹ لە تیرلی بۆ ئۆکۆنر، ڤان ۷ تشرینی یەك/ ئەکتۆبەر ۱۹۰۲) لە کتێبەکەی (جانیت کلاین)ەوە:

Power in the periphery:thc hamidiye, Light cavalry and the struggle over ottoman kurdistan

کە نامەیەکی دکتۆرایە بۆ زانکۆی برستن ۲۰۰۲ ل ۲۸۱ وە هەر لە لاپەڕە ۲۸۰ - ۸۱ لەم کتێبەدا ژمارەی ئەو پەلامارانەی تێدایە کە کراوەتە سەر موسوڵمان و ئەرمەنەکان: فایلی ۱۷۲۸/۱۹۵ لە هامبسۆن بۆ وایت، ئەرزڕۆم ۱٦ کانوونی دوو/یەنایر ۱۸۹۱، فایلی ۲۲۸۲/۱۹۵ لە سافرستیان بۆ شیبلی، بەتلیس ۳۲ حوزەیران/یۆنیۆ ۱۹۰۸، MAE Nantes AA ۱۱۱۲ لە ڕۆکفێری بۆ کامبون، ژمارە (٦) نهێنی، ۱۳ نیسان /ئەپریل ۱۸۹٦. بڕوانە باسی پەیوەند بە چالاکی عەشرەتە ئەیارەکانی موسوڵمانان و مەسیحیەکان لە بەشی چوارەمدا.

٦- بڕوانە فایلی ۲۰۳/٤۲٤ لە فریمان بۆ ئۆکۆنر، ۷ حوزەیران /یۆنیۆ ۱۹۰۲

۷- فایلی ۲۰۰/٤۲٤ لە موتسل بۆ ئۆکۆنر، ڤان ۲۰ حوزەیران/ یۆنیۆ ۱۹۰۰

۸- فایلی ۱٦۸۸/۱۹۵ لە دیڤی بۆ لوید ، ڤان کانوونی یەك /دیسامبر ۱۸۸۹ یەكێ لە نموونەی کەم ڕێزی عەشرەتەکان بەرامبەر بە حوکمەت: لە ۱۹۰۸ سەرکردەیەکی تازە دانراوی دەرەك دەگاتە بەتلیس، کەلوپەلەکانی بە دوو پاسەوانەوە لە کاروانێکی تردا دەبن، کوردی سەر بە عەشرەتی (مۆدیکی) پەلاماری کاروانەکە دەدەن، دوو پاسەوانەکە دەکوژن و کەلوپەلی سەرکردەکەش دەبەن.

فایلی ۲۲۸۲/۱۹۵ لە سافرستیان بۆ شیبلی، ۲۰ ئەیار/ مایۆ ۱۹۰۸،

۹- بچۆرەوە سەر پەراوێزی (۱) سەبارەت بە باجی کشتوکاڵ.

۱۰- فایلی ۲۰٦/٤۲۲ لە تیریل بۆ ئۆکنۆر، ڤان ۸ کانوونی دوو/ یەنایر ۱۹۰٤

۱۱- فایلی ۹۷٤٤/۸۸۱ لە لۆزر بۆ گرای ،قوستەنتەنیە ۱۰ نیسان /ئەپرێڵ ۱۹۱۰

١٢- بڕوانە کتێبەکەی (سوزان .ر. نورتن) ٢ کانونی دوو/یەنایر ١٩٠٥:
ABC 16.9.8 Eastern 1905 Turky mission, Womans Board. Vol 1 estern Turky 1903-1909. Letters no 18

١٣- فایلی ١٩٥/٢٤٥٠ لە موناهان بۆ مارلنگ، ئەرزڕۆم ٢٩ ئەیلوول/ سەپتامبر ١٩١٣

١٤- بچۆرەوە سەر بەشی دووەمی ئەم کتێبە.

١٥- فایلی ١٩٦/٤٢٤ لە ئەلیوت بۆ کوری، تەورێز، ٢ ئەیار /مایۆ ١٨٩٨

١٦- گشت ئەم زانیاریانەی پەیوەندن بە مێژووی قۆناغە سەرەتاییەکانی دەستە و کۆمەڵە شۆڕشگێڕیەکانەوە، لە (لویز نلسباندیان) ەوە وەرگیراون:
The armanian Revolutionary movement (Barkeley: university of California press 1963. pp 80- 84, 178- 90

هەروا (هراتش داشنابیدیان):
History of the Armanian Revolution

کە (براین فلیمینگ و فاهاها بیشیان) وەریانگێڕاوە : میلانۆ، خانەی جیمی بۆ بلاوکردنەوە ١٩٨٩ ل ٢١ - ٢٥ دیسان کتێبی هراتش داسنابیدیان:
The hnchakian party

کە (مارین . أ. نەراکیلیانز) وەریگێڕاوە ، وە کتێبی (ئەناهید تیرمیناسیان) کە (ا.م.بیریت) وەریگێڕاوە: زانکۆی کامبردج ،ماساتشوسیتس ، زوریان ١٩٨٤

١٧- نالبەندیان: The armanian Revolutionary movement.p ١١٠

١٨- لە کتێبەکەی داسنابیدیانەوە وەرگیراوە: ل ٢٢

١٩- هەمان سەرچاوە

٢٠- بەپێی کتێبەکان، ئەو باسانەی لە بارەی ڕوداوەکانی (ساسۆن) و(زیتون)ەوەن جیاوازن، هەر بۆ نموونە بڕوانە کتێبی (جاستن ماکارسی):
Death and Exil: The Ethnic cleansing of ottoman Muslims

زانکۆ بریستن، داروین ١٩٩٥ ل ١١٩ - ٢١، وە کتێبی کاموران گورۆ:
The Armanian File (London: Rustem and Weidenfeld and Nicolson 1985) pp 137-54
دیسان کتێبی صلاح صونییل:
The ottoman Armenians (London : Rustem: 1987. p117
وە کتێبی ریتشارد .ج. هۆنانیزیان:
The armenian question in the ottoman Empire 1876-1914 in his the Armenian people Vol. 2
نیویۆرك، ساینت مارتن ١٩٩٧ ل ٢١٨ - ٢٦، وە کتێبی داشنابیدیان، ل ٢٧

٢١- کەس مێژووی دیاریکراوی نازانێ، رێکخراوەکە لەسەرەتادا بە (یەکیەتی شۆڕشگێرانی ئەرمەن) ناونرا، دوایی، (یەکیەتی شۆڕشی ئەرمەن) پاشان هەردوو حیزبی (هەنشاك و تاشناق) یەکیان گرت، بەلام زۆری نەبرد هەلۆەشایەوە و جیابوونەوە لە یەکتر.

٢٢- History of the ARF, pp ٢١ - ٢٥

٢٣- The armenian Revolutionary movement, p ١٥٦

٢٤- دیکران میزروب کالیحیان:
The Armenian Revolutionary Federation under ottoman constitutional Rule 1908 - 1914
نامەی دکتۆرا لە زانکۆی بۆستن ٢٠٠٢ ل ٨ ، ٦ کە ئاماژە دەکات بۆ:
Referring to Hratch Dasnabedian, H.H Mshnagtzution. Gazmagerbagan (Beirut: n.p. 1974) pp. 25- 29

٢٥- فایلی ٢٣٤٧/١٩٥ لە سیبلی بۆ لۆدز، ئەرزڕۆم یەکی تشرینی دوو/ نۆڤامبر ١٩٠٩

٢٦. ماکارسی:
Death and Exile. Pp ٢١-٢٢, ١١٢-١٦

٢٧- فایلی ٤٢٤ - ٢٠٠ لە ئۆکۆنەر بۆ سالیزبیری، قوستەنتەنیە، ئەیلوول/ سەپتەمبەری ١٩٠٠، وە فایلی ١٩٩/٤٢٤ لە مۆنسل بۆ ئۆکۆنر، ڤان ٢٤ تشرینی یەك/ ئۆکتۆبەر ,١٨٩٩

٢٨- فایلی ٩٤٣٣/٨٨١ لە دیکسن بۆ بارکلی، ١٣ نیسان/ ئەپریل ١٩٠٨. وە هەر ئەم فایلە لە دیکسن بۆ بارکلی، ٢٤ ئەیار/ مایۆ ,١٩٠٨

٢٩- فایلی پێشوو لە بارکلی بۆ گرای، قوستەنتەنیە ٥ نیسان / ئەپریل ,١٩٠٨

٣٠- ئەمومژیەك بالّی کێشاوە بەسەر بەکاربردن و رەخساندنی رووسەکان بۆ ئەو ماف و هەقانەی کە لە پەیماننامەکاندا هاتوون، ئەوەش بەهۆی ئەوەی کە هەندێ لە یاخیبووەکان دوو یان سێ رەگەزنامەیان هەبوو، عوسمانێکانیش سووربوون لەسەر ئەوەی کە دەبێ دادگەیی ئەوانەی رەگەزنامەی عوسمانیان هەیە، بکرێ. بەمجۆرە هەندێ یاخیبوو دادگەیی نەدەکرا بە یارمەتی رووسەکان توانیان سنوور ببەزێنن و دەربازبن، بەلام کەسانی دی دادگەییش کران و زینداش کران. بڕوانە بەشی پێنجەم لەم کتێبە.

٣١- لە نووسراوە دیپلۆماتیەکاندا زۆر کەرەت ئەم کێشەیە باسکراوە، هەر بۆ نموونە: فایلی ٢٣٧٥/١٩٥ لە مۆلینۆ-سیل بۆ لودز، ڤان ٩ تشرینی یەك/ ئەکتۆبەر ١٩١١. وە فایلی ٢٤٥٨/١٩٥ لە سمیدس بۆ مالیە، ڤان ١٧ شوبات/ فەبرایر ١٩١٤. وەك چاوەڕوانیش دەکرا، گێڕانەوەی ئەو زەویانەی کە لە ئەرمەنەکان زەوت کرابوو لەلای عەشایرە کوردەکانەوە گوێی پێ نەدەدرا، هەتا خەریکبوو ئەمە ببێتە هۆی ڕاپەڕینێکی میللی. بڕوانە: مەسەلەکەی (سەعی بەگ)ی (ئیرجیك) لە بەشی حەوتەمدا.

٣٢- فایلی ٢٠٨٢/١٩٥ لە مونسل بۆ ئۆکۆنر، ڤان ٢٤ تەموز/ یۆلیۆی ١٩٠٠ سەبارەت بەو گوندانەی بۆ ئەو ئەرمەنانەی نێزیکبوون لە هێزەکانی دەوڵەتەوە لە ڤان، دەگێڕرانەوە. مونسل دەنووسێ: هێشتا ئەو گوندە

ئەرمەنیە گەورانەی نێزیك بە دەریاچەکە لە قەزای (ئەرگیش) وان لەژێر سایەی کەتیبەکانی سوپای نیزامیدا، ئەمەش بە فەرمانێك لە والی ڤانەوە، بەهۆی ئەمەوە دورن لە هەر دەستدرێژیەکی کوردەکان.

٣٣- فایلی ٢١٠٤/١٩٥ لە ساتۆ بۆ دوبونسن، ڤان کانوونی دوو/ یەنایر ١٩٠١.
وە فایلی ٢٠٨٢/١٩٥ لە مونسیل بۆ نۆکۆنر، ڤان ٢ ئەیار / مایۆ ١٩٠٠: MAE Nantes AA E/ ١١٩(کلاین ) وا هەستدەکات کە ئەرمەنەکان زیاتر لەوانی دی ئازاریان بەدەست تالان و بڕۆوە چەشتووە، وە بەهۆی بوونی شۆڕشگێرانی ئەرمەن و چالاکیەکانیانەوە دیسان هەر چەشتوویانە، وە دەکرێ خاوەن موڵکەکان بە ئاپاك تاوانبارکرێن و بەمەش دەست بەسەراگرتنی زەویەکانیان ئاسانتر دەبوو، کلاین: Power in the periphery. P ٢٩٨

وە بڕوانە لیژنەی ڕێگە پێدراوە ئامریکاییەکان:
Barton, James l, papers, 1877- 1943. Box 11:2

٣٤- سەرچاوەی پێشوو، کە لە فایلی ٢٣٧٥/١٩٥ ڤان ٦ شوبات / فەبرایر ١٩١١ وەرگیراوە (مولینو-سیل):
N tes on Journey from Van to Erangan

٣٥- فایلی ٢٢٤/٤٢٤ لە ساڤرستیان بۆ ماکگریگۆر، پەتلیس ٢٥ تەمووز/ یۆلیۆ ١٩١٠ کە لە کتێبەکەی (کلاین)ەوە وەری گرتووە: ل ٢٩١

٣٦- فایلی ١٩٥/ ٢١٤٦ لە تیریل بۆ نۆکۆنر، ڤان یەکی ئەیلوول/ سەپتەمبەری ١٩٠٢. دەبوو (کافر ئاغا) سەرۆك بووایە، کە ئەوەی سەرکردەیەکی بەتوانا و جەربەزەی وەك (عەلی خان) بوو، بەڵام هەر بە مردنی ئەم زۆری نەبرد عەشرەت پەرتەوازە بوون و بوونە ئاردی ئاودرك.

٣٧- فایلی ٥٤٠/٣٧١ لە دیکسن بۆ نۆکۆنر، ڤان ٢١ کانوونی دوو/ یەنایر ١٩٠٨,

٣٨- فایلی ٢٠٢/٤٢٤ لە ساتو بۆ نۆکۆنر، ڤان ٢٠ ئاب / ئاغستۆس ١٩٠١.

# بەشی چوارەم
## یاخیبوونەکەی ١٨٩٦

عوسمانیەکان پاش شکستەکەیان لە شەڕەکەی ١٨٧٧ - ٧٨ یاندا لەگەڵ ڕووسیا، ئیتر هەرێمی ڕۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵیان پڕبوو لە ئاژاوە و گێرەشێوێنی، لەسەروبەندی شەڕەکەدا کە سەربازەکان ڕاپێچی بەرەکان دەکران، گەلێ شوێن وەك ڤان و بەتلیس دەستەلاتی دەوڵەت هەرەسی تیایاندا دەهێنا و شیرازەی لەدەست دەردەچوو، خۆ کە شەڕەکەشیان دۆڕاند و سەربازێکی زۆر تیاچوو، قۆناغێکی پشێوی و ئاژاوە هاتە پێش کە لە دەفەرەکەدا سیرایەتی کردبوو، بەپێی وەسفی ئەوروپاییەکان[١]: عەشرەتە کوردەکان وا کەوتبوونە یەك دەستیان چووبوو بە خوێنی یەکتردا کە دەتوت جەنگێکی ڕاستەقینەیە، بەردەوام پەلاماری عەشایرەکانی ڕۆژهەڵات بۆسەر دانیشتوە مەسیحی و موسوڵمانەکان لەم حەلانەدا پەرەی سەند[٢]، کوشتن کەمبوو بەڵام دزی و ڕاووڕووت لە گشت لا تەشەنەی کردبوو،[٣] دەستە چەتە و ڕێگری گەرۆك کە لە ١٠ - ١٢ کەس پێکدەهاتن بە ئاواییەکاندا دەگەڕان و چ مەڕوماڵاتێکیان چنگ بکەوتایە دەیاندایە پێش و بەتاڵان دەیانبرد[٤]، جا گوندنشینانی ئەرمەن و موسوڵمان کە ماڵات و حاسلاتەکانیان لەدەستدەدا، کەسانێکبوون کە لەو بەرەلایی و بێسەروبەریەدا زەرەرمەندی یەکەم.

لە پەنا زرووفێکی پڕ ئاژاوەی ئاوهادا، دانیشووە نیشتەجێکانی ڤان کەوتنە ئەوەی کە مشوورێکی خۆیان بخۆن بۆ دەربازبوون لەو وەزعە،

(كلایتن) كە كونسوڵی بەریتانیا بوو لە ڤان، لەم بارەیەوە دەڵێ:

مەسیحیەكان زۆر وەڕسن. ئامادەن ڕوو بكەنە هەرلایەك كە هاوكاری و هەركۆمەكێكی لێ دەستكەوێ[6]، بەشێكی زۆری ئەرمەنەكان بەو هیوایە بوون كە رووسەكان سەرلەنوێ پاماڵی هەرێمەكە بكەنەوە[7]، بۆیە زۆریان پشتگیریان لەو تەكتیكە دەكرد كە دەبێتە هۆكار بۆ ڕوودانی شتێ لەم بابەتە، ڕاپۆرتی دنە و هانەهانەی وا كەوتبووە ڕوو، ئەگەر چی كەمیشبوو، لەبارەی پەلامار و هێرشی چەتە ئەرمەنەكان بۆ سەر كوردەكان.[7]

ئەرمەنەكان هەوڵی تیرۆركردنی (بەحری پاشا)ی فەرمانداری شاری ڤانیان دا.[8] سەرباری ئەمەش شۆڕشگێڕانی ئەرمەن دوژمنایەتی نێوان موسوڵمان و ئەرمەنیان لەناو شارەكەدا قووڵتر و خەستتر دەكردەوە و وتاری دژ بە دەوڵەتیشیان دەدا.[9]

## • گوزەرانێكی خراپ لە پاڵ ئێراندا

دەشێ زوربەی ئەو كوردانەی كە دەستدرێژی و شڕەخۆریان دەكرد لە ئێرانەوە هاتبن، خۆیان دابووە پەنا دەستەڵاتەكەی عوسمانی، لە ڕۆژاوای ئێرانیشدا حوكی ڤانوون و دەوڵەت بەتەواوی نەمابوو، تا رووسەكان لە ١٩١٠دا پاماڵی ئەو ناوەیان كرد، ئەو ناوە، بەدەر لە هەندێ سەربازگەی ڤایم و وبچووك لە چەند شارێكدا، ئیتر هێزی سەربازی نیزامی ئێرانی تیادا نەمابوو، دەستەڵات كەوتبووە دەستی عەشایرە كوردەكان و شۆڕشگێڕە ئەرمەنەكان.

عەشرەتی گەورەی وەك (حەیدەرانلی) و (شوكاك) لە هەردوو دیوی سنووردا لكوپۆپیان هەبوو، سەرەك عەشرەتی تاك تاك، وەك (شەریف)ی عەشرەتی (شكیفتی) كەسەر بە شوكاكبوون و خاوەنی زەوییوزاربوون، لەهەردوو دیو لایەنگریان لێ كۆدەبۆوە، ئەفرادەكانی ئەم عەشرەتانە

سوێندیان خواردبوو کە لە سەرۆکەکانیان زیاتر مل بۆ کەسیدی نەدەن و لە خزمەتیدابن. نەبۆ ئێران و نەبۆ سەڵتەنەی عوسمانی.

لە نێوەڕاستی هەشتاکانی سەدەی نۆزدەدا، لە شاری ڤاندا بازوو و مەچەکی دەوڵەت توند و بەهێزبوو، چ لە رووی ژمارەی سەرباز و دەرەکەوە و چ لەرووی جۆری چەکیشەوە. ئەمانە خۆئامادە کردنێبوو بۆ هێرشێکی بەرفرەوان بۆسەر ئەو دەستدرێژی و ڕەفتارە عەشایریانەی لە ئێرانەوە دەهاتن، بەرلەمەش، لە ١٨٧٩ کە حوکمەت دەستی زۆر کورتبوو کەچی ئەوپەڕی توانای خۆی دەخستە گەڕ بۆ بەرەورووبوونەوەی هێرش و پەلاماری کوردەکان . هەتا لەو ساڵەدا لە کاتی ئەو بەرەورووبوونانەدا کەتیبەیە دەردەکی شاری ڤان سنووری بەزاند و چووە ناوخاکی ئێرانەوە، بە پلەی یەکەم بەمەبەستی هۆشداریدان بەو عەشایرانەی ئەوێ و سزادانیان لەسەر رەفتارەکانیان.[١٠]

کە ساڵی ١٨٨٤ سوپای عوسمانی لە ڤان گردبوونەوەیەکی ئەنجامدا و ئامادەبوو بۆ سەرکوتکردن و رێگرتن لە هاتنە ناوەوەیەکی زۆر گەورەی عەشرەتێك بە گشت بارگە و بنە و ئەفرادەکانیەوە، بە مەبەستی ئەوەی لەمدیو جێگیربن[١١].

ئەم ئۆپەراسیۆنانەش دیسان سنووورداربوون و مەودایان ئەوەندە نەبوو، عەشایرەکانیش ئازادیەکی بەرفراوانیان هەبوو تا بە ئارەزووی خۆیان لە هەر کوێیە دور لە وبنکە و سەربازگەگانی سوپا بێن و بچن .[١٢]

رۆژاوای ئێرانیش، لەولاوە دالدە و پەناگەیەکی ئەمین و بێ ترسبوو بۆ شۆرشگێرە ئەرمەنەکان، بەهۆی نەبوونی حوکمێکی کاریگەر تا جڵەوی ئەمان و ئەیارە کوردەکانیشیان بگرێ. بۆ ماوەیەکی دور و درێژ شار و لادێی ئەرمەنەکان توانیان خۆیان پڕچەککەن، حیزبە ئەرمەنییە شۆڕگێڕکانیش ئەم دەڤەرانەی رۆژاوای ئێرانیان بە زەویەکی بە پیت دەزانی بۆ جموجۆڵ و

گەشەسەندنی چالاکیەکانیان.

ناوچـەی بـاکووری ڕۆژاوای دەریاچـەی ڤـانیش ببـووە پێگەیـەك بـۆ شۆڕشگێڕان. حیزبەکان لێی گردبوونەوە و چەك و تفاقەکانیان تیا عـەمبار دەکرد، ■ وای لێهات ناوچەی (سەڵماس) لە خواروی ڕۆژاوای دیلمان و دیلمان خۆیشـی و دەوروبـەریان لـەژێر دەسـتەڵاتی ئەرمەنـدابوون، گونـدەکانی دەوروبەری شاری (خۆی) پڕچەك کرابوون، لـە ناوچـەکەدا ژمـارەی ئەرمـەن بەشێوەیەکی بەرچاو زیادی کرد، سەرەڕای داباڕینی دەستە دەستەی پەنابـەر لەترسـی ئاژاوەکـانی سـاڵانی ۱۸۹۰. [١٤] (سـەڵماس)یش هـەتا کلۆپـەی جـەنگی یەکەمی جیهانی ناوچەیەکی ئاسوودە و ئـەمین و ئومـانبوو بـۆ یـاخیبووانی ئەرمەن. [١٥]

ئامدیوکردن و گەیاندنی چەك و جەنگاوەر بە قاچاغ لـە ئێرانـەوە وەك ئـەو ڕێکوپێکیـە و چـڕوپڕیەی دوای سـاڵی ۱۹۰۰ نەمایـەوە. [١٦] بـەڵام دەکـرێ بگـوترێ کـە لـە هەشـتاکان و نـەوەدەکانی سـەدەی نـۆزدەدا ڕۆژاوای ئێـران نێوەنـد و چـەقی کـاری ئامـدیوکردنی ئەرمەنـەکانبوو بـۆ دەڤـەری ڤـان. چەکەکان لە رووسیاوە دەهێنران بۆ ناوچە ئەرمەنەکان لە ئێران، لێرەشـەوە بـەناو گونـدە ئەرمـەن و چـیا و دۆڵـە سـەختەکانی هـەردوو دیـوی سـنووردا دەگەیەنرانە عەمبارە نهێنیەکان لەشارەکانی دەڤەری ڤان و دەوروبەری.

لـەدوای شۆڕشـەکەی سـاڵی ۱۸۹٦ لـە ڤـان، دەسـتەڵاتدارانی عوسمـانی بـە وردی توانیان هەندێ لەو قاچاغە ڕێیانە دەستنیشان بکەن، پێشتریش بەر لە ۱۸۹٦ هـەر ئـەوان توانیبوویـان گـەلێ قاچـاغە ڕێـی سـەرەکی بدۆزنـەوە و دەستنیشانیان کەن.

هەرچـەندە ئـاڕمی حیزبـی (تاشـناق) بەسـەر ئـەو چـەکانەوە بـوو کـە بەڕێوەبوون بۆ سەڵماس و عوسمانێکان گرتنیان، بـەڵام قاچاغچێکان بـەر لـە ۱۸۹٦ زۆریان ئەندامبوون لە حیزبی (هانشاك) [١٧]

عەشایرە کوردەکان یان ئەرمەنەکان دەستەڵاتێکی ڕەهایان نەبوو بەسەر سەرانسەر ئەو زەویانەی کەوتبوونە باکووری ڕۆژاوای دەریاچەی (ورمێ)و ڕۆژاوایشیەوە، زۆرجار ئەم دوو لایەنە لەسەر دەستبەسەراگرتنی ناوچەکە دەکەوتنە گیانی یەکتر و شەڕ دەقەوما، ئەنجامەکەشی ماڵوێرانی و کاولکاریەکی زۆربوو، پێکدادانەکانی نێوان عەشرەتی شوکاك و شۆڕشگێرانی ئەرمەن لە (بشکاڵە)وە هەتا (کالاس) نائارامیەکی زۆریان دەنایەوە (وەك ئەوەی کە دوایی باسی دەکرێ)[18] بەڵام لە دە ساڵی ١٩٠٠دا سەرکردە بەناوێکانی سەرسنوور لەگەڵ شۆڕشگێرەکاندا ڕێککەوتنێکیان ئەنجامدا، هەردوولا توانا و کۆششی خۆیان دژ بە عوسمانیکان یەکخست. هێز و وزە و تەقەڵلای هەردوولا کە لە نێراندا دژ بەیەکیان بەخەرجدەدا نیستە یەکیان خست و رووە و عوسمانیکانیان ئاراستەکرد.[19]

ناکۆکیەکانی نێوان عەشایرە کوردەکان و دانیشتوانی شار و گوندەکان تەنیا لە شێوازی ژیانی سوننەتی عەشایریدا نەبوو، ئەگەر بەراوردیکەین بەدانیشتوانەکانەوە، عەشایرەکان هەژاربوون (جگە لە سەرۆکەکانیان)، ئەو پەلامار دانەی کوردەکان ئەودی دەگەیاند کە هەژارەکان دەناڵێنە هەژاتر لە خۆیان.[20]

بەڵام ئەرمەنەکان بووەتر بوون بۆیە ببوونە پارووییەکی چەور و نەرم، لەعەینی کاتدا کێشەکانی نێوان نەتەوەییە ئەرمەنەکان (ئاژاوەگێڕەکان، وەك کونسوڵەکان ناویان لێنابوون) و کوردەکان بەپاڵ یەکتر تاوانبار کردنەوە مەترسیدارتر بوو.

(س.م.هالوارد) کە کونسوڵی گشتی بەریتانیا بووە لە ڤان وای دادەنێ کە زۆربەی هەرمزۆری موسوڵمان و ئەرمەنەکان لە ئاشتی زیاتر خوازیاری شتی تر نین. بەڵام (ئاژاوەگێڕانی ئەرمەن) و عەشایرە کوردەکان وازناهێنن و دەیشێوێنن.[21] کوردەکان پەلاماری دانیشتوانەکانیان دەدا و لەناوخۆشدا

دەچوون بە گژ یەكتردا، بەمە لە هەشتاكان و نەوەدەكانی سەدەی نۆزدەدا چەندەها شەڕ و فەرتەنەی بچووك بچووكیان دەنایەوە، حوكمەتیش كارێكی وای نەدەكرد كە سنووری بۆ ئەم پێكدادانانەی نێوان عەشایرەكان دانێ و بیان وەستێنێ، ئەمەیان بەنەنقەست بوو یان لە بێدەستەلاتییەوە بوو، بەڵام ئەوەی كە گومانی تێدا نییە ئەوەیە كە سەرەك هۆز و عەشرەتەكان لە ئاست هەر دەستتێوەردانێكی دەوڵەتدا زۆر چاو قایم و بێباكبوون.

بەهۆی ناجێگیری و ئاژاوەی ناو لادێكانەوە، خەڵكێكی زۆر لە ترسان ڕژابوونە ناو شاری ڤانەوە، ڕاستە كە خەمڵاندنە ئەوروپاییەكان زێدەڕۆییان كردووە لەوەی كە ژمارەی پەنابەرەكانیان لەو شارەدا بە دە هەزار كەس مەزندەكردووە. بەڵام بوونی ژمارەیەكی زۆر لەمانە لەناو شارەكەدا بێگومان مەترسیەكی زیاتریان دروستكردبوو لەسەر ئەگەری ڕودانی ئاژاوە تیایدا.[٢٢]

خەڵكە نیشتەنیەكەی بەشی عوسمانی لەرۆژەڵاتی ئەنەدۆڵ كە داد و بێدادیانبوو، هەڤیانبوو، بە دەمیش خۆشبوو كە بگوترایە: ئەركی دەوڵەتی عوسمانیە كە ڕێ و شوێن بگرێتە بەر سەبارەت بە ڕەوشی شاری ڤان. چونكە دۆزینەوەی ڕێگە چارەی گونجاو هەروا ئاسان نەبوو، ڕێگەچارە بۆ گەلێ كێشەی ناو ئەو شارە مەحاڵبوو. هەرێمەكە نێچگار نەدارا و نەبووە بوو، هەر دەوڵەتێكی تریش بووایە و هەر ڕێگە چارەیەكی تری بگرتبایە بەر كەڵكی نەبوو، بەهۆی وشكە ساڵیو كەشوهەوای سەخت و بە بیابانبوونێكی ئەوتۆی دەشتاییەكان كە هەزاران ساڵبوو دەستی پێكردبوو، ئەمانە گشتیان هۆكاری كەمی حاسلاتبوون، تارمایی ڤاتوڤڕی و گرانیش هەردەم لەبەرچاوبوو، زوو زوو بەشێوەیەكی ناوبەناو خۆی پیشان دەدا و كەمی بارانبارینیش گەیشتبووە ئاستێكی وا كە لەخوار ئەوەوەبوو كە چاوەڕوان دەكرا.

ئەم واقیعە بەسەر گشت ڕێگە چارەكانی تردا زاڵتربوو، وەك پەرەپێدانی پەروەردە و خوێندن لە ڤوتابخانەكاندا و پرۆژەكانی ئاودان و ڕێگەوبان و

ڕاکێشانی هێڵی ئاسن و هەتا زۆرکردنی ژمارەی هێزەکانی ئاسایشیش، ئەم چارەسەرکردنانە پارەوپوولێکی فرەیان گەرەکبوو کە ڕۆژێ لە ڕۆژان لە دەستدا نەبوو. جا حوکمەت لە عۆدەیان نەدەهات.

بەسایەی دنەی رووسەکانەوە نەستووریەکان ژمارەی پەلامار و شاڵاوەکانیان بۆ سەر کوردەکان تایبەتایە زیاتر دەکرد، تا وای لێهات گوندە کورد نشینەکانیان دەسووتاند و یاخیبوونی خۆشیان لە دەوڵەت بە ئاشکرا دەخستە ڕوو، هەر بە ئاشکراش داوای یارمەتی و پاراستنیان لە رووسیا دەکرد. کونسوڵی بەریتانیا لە ڤان دەنووسێ: (نەستووریەکان هەڵەن، سیاسەتێکیان گرتۆتە بەر کە حەتمەن رق و کینەی موسوڵمانەکان زیاتر دەکات.[٢٤])

نەستووریە شاخ نشینەکان (بەترکی –عەشیراتس) بە درێژایی مێژوو نیمچە سەربەخۆییەکیان هەبوو، جۆرە ساردی و هەست بە نەوعێ لە زوڵملێکراویەك باڵی بەسەر پەیوەندیاندا بە کوردەکانی ناوخۆیانەوە کێشابوو، چونکە شێوازی ژیانی ئەوانیش عەینی ئەوانبوو، ملکەچبوون بۆ حوکم و فەرمانەکانی سەرۆك و ڕابەرە ئایینیەکانیان. بەڵام گلەیی نەستووریەکان لە عوسمانیەکان زۆر سادەبوو: فراوانبوونی دەسەڵاتی دەوڵەت، نەستووریەکان لەم فراوانبوونە دەترسان، نەبا حوکمەت لەو شێوە حوکمە زاتیەی خۆیانیان کەم بکاتەوە.[٢٥]

ئەم ترسەشیان لەوەهمەوە نەبوو، چونکە ئەگەر بهاتبا و دەوڵەت دەسەڵاتی بەسەر گشت لایەکی سەڵتەنەدا بسەپاندایە نەك تەنیا بەسەر مەسیحیەکانی ڕۆژهەڵاتدا ئەوا ڕاستیان دەکرد و باش بۆی چووبوون. لەمەدا کوردەکانیش هەر ئەو ترسەیان لێنیشتبوو و پێشبینیان دەکرد.

توانای حوکمەت لە بڵاوکردنەوەی ئیسلام و ئاسایش زۆر سنووورداربوو، لە ١٨٨٠ سەربازەکان لە ڤان ئەوەندە زەخیرەیەکیان نەبوو کە تێری پێ بخۆن،

لە ئەوەدەکاندا سەربازەکان زەخیرەیان دەدرایە بەڵام بە دەگمەن مووچەیان بۆ سەرف دەکرا، ژمارەشیان ئەوەندە نەبوو بەشی ئەوە بکات کە لەو زەویە پانوپۆڕانەدا چاودێری بکەن و ئاگایان لە دوژمنەکانیان بێ کە چی دەکەن. لەباتی بڵاوکردنەوەی هێز لە گشت ناوچەکاندا، بەرپرسە سەربازیەکانی ڤان ناچار بوون سەربازەکان پێکەوە کۆکەنەوە و داڵدەیانـدەن. ئەمـە لەبەر ئەسبابی ئابووری و کەمی ژمارەیان. کە سەربازیان دەنارد بۆ دامرکانەوەی ئاژاوەیەك ، بەهۆی ئەو ڕێگە دوور و درێژەی کە دەبوو بیانبڕیایە، تا ئەمان دەگەیشتن، جینایەتکاران دەمێکبوو هەڵاتبوون و ناوچەکەیان چۆڵ کردبوو.[٣٧]

سەرەڕای ئەمەش دەوڵەت بەپێی توانا بۆ پاراستنی گشتی دەجووڵا، زۆر جار ئەو جووڵانەش گران و سەخت بوو، لە ١٨٧٩دا کە کوردە لادێییەکان ئاوایی مەسیحیەکانیان تاڵان دەکرد، سەربازەکانی دەوڵەتیش لە تۆڵەی ئەمەدا گورج دێی کوردەکانیان کاول دەکرد.[٣٨]

کونسۆڵی بەریتانیا لە ئەرزڕۆم سەرنجی ئەمەی دەدا (خۆی بەرپرسی گشت کونسۆلگەریەکان بوو لە ڕۆژهەڵاتدا) کە حوکمەتی هەرێمەکە دەیەوێ چاکسازی بکات بەڵام دەستی کورتبوو لە دەفەرەکەدا و پارەیەکی ئەوتۆی بۆ ئەمە شك نەدەبرد.[٣٩]

لەپەنا ئەم ڕەوشەدا، کارە چاکسازیەکانی دەوڵەت لە ١٨٨٠ەوە نەبێ دەستی نەدرایە، ئەوکاتەش ڕەوڕەوەی چاکسازی بە ئاستەم و پچڕ پچڕ کەوتە جووڵە.[٣٠] بەڵام کە ساڵی ١٨٩١ تێوەرگەڕا باری شاری ڤان بە شێوەیەکی هەست پێکراو باشبوو.

جا بەپێی ئەو لێشاوە ڕاپۆرتە درۆودەلەسانەی کە لە بەریتانیا بوون، کونسۆڵی بەریتانیا لە ڤان (جۆرج بولارد دەیڤی) بیرخەرەوەیکی دەربارەی ئەو ڕاوبۆچوونە چەواشەکاریانە نووسی، کە پەی دەرپەی لە ڕۆژنامەکاندا

سەبارەت بە ئەرمەن بڵاودەکرانەوە، بەتایبەت لە (دەیلی نیوز)دا، وەسەبارەت بە رەوشی کورد و ئەرمەن بە گشتی، زوربەی قسەکانی دەیڤی (کە خۆشبەختانە لە درێژیدا ئەدەگەیشتە نازناوەکەی) بریتیبوو لە ڕەتکردنەوەی ئەو درۆیانەی کە گوایە کۆمەڵکوژی لە مەسیحیەکان کراوە و ئینکاریی ئەو پێداگرتنانە گوایە دەوڵەت پیلانی بەدەستەوەیە بۆ کاری تری لەو شێوەیە، بەڵام ئاماژەی دەدا بەوەی کە ئەو باج و سەرانە ناقانوونیانەی عەشایرە کوردەکان دەیخەنە سەر ئەرمەنەکان، ئیستە بەشێوەیەکی باش کەمی کردووە وە تەنیا لەناوچە دوردەستەکاندا نەبێ نەماوە، بەڵام بەر لە شەش ساڵ هەبوو.

هەرچۆنێبێ، ئەم (تەرتیباتە) فیۆداڵیانە ناهەقیەکبوو لە ئەرمەنەکان دەکرا. هەروا دەیڤی هەستی بەوە کرد کە باج و سەرانەکان گشت کات بێویژدانیەك بووە و کراون، لەگەڵ ئەمەشدا کاری باجگری بە (رەقی و دژواری) ئەنجام نەدەدرا و دانیشتوان ئەدەرِوتێنرانەوە: (من خۆم وای بۆ دەچم کاری دابەشکردنی — دەیەك - و کۆکردنەوەی تارادەیەك بە ویژدان و بە ئینسافەوە بەرێوە دەچوو وە باشتریش دەبێ. بە کورتی: باجەکان زۆرن و میللەتیش ترنجاوەتە ناو ئەبوونیەکی زۆرەوە، بەڵام نارِەزایی لە باجدان زیادەرِۆیی پێوەنراوە، ئەرمەنیش وەك باقی کۆمەڵانی تر لەم چوار چێوەیەدا حاڵیان حاڵی ئەوان). تا ئێرە دەیڤی وای دادەنا کە دادگە و لێپرسراوی هەرێمەکان جۆرە چاکسازیەك دەکەن، بەتایبەت لە دوو بواری دادگەری و داراییدا، راستە لاگیری بەلای موسوڵمانەکاندا هەر هەیە بەڵام ساڵ بەساڵ ئەمە نامێنێ.[٦]

## ● حەمیدییە

هەرێمی ڤان پێویستی بە زیادکردنی دەستەڵاتی پۆلیس بوو، بەڵام دەستپێشخەریەکەی دەوڵەت بۆ چەسپاندنی دەستەڵاتەکەی لە رۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵ کاردانەوە و ئەنجامی ئەرێنی لێ کەوتەوە.

لەساڵی ١٨٩٠ سوڵتان (عەبدولحەمیدی دووەم) ویستی رێگە چارەیەك بۆ هەندێ کێشە و گیروگرفتی سەربازی وەدۆزێ. ئەویش لەرێی داهێنانی فیرقەیەکی ئەسپسواری غەیرە نیزامی لە عەشایرە کوردەکان، ئەمەش ناونرا (فیرقەی حەمیدییە)، ئەرکیان بەوە دەستنیشان کرا کە لەکاتی جەنگدا سوارە ئامادەکەن، لە ئاشتیشدا ئەمن و ئاسایشی هەرێمەکانی رۆژهەڵات دابینکەن. واش بۆی دەچوون کە ئەم فیرقەیە هاوشێوەی بەتالیۆنە قۆزاقیەکانی سەر بە لەشکری رووسبن، بەڵام ئەمەی ئێرە گەلێ لەوان جیاوازتربوو، بەتایبەت لە رووی دیسپلین و زەبتوڕەبتی سەربازیەوە.[٣٣]

فیرقەی حەمیدییە لەسەر ئەساسی رێکخستنێکی عەشایرییەوە دامەزرێنرا، عەشرەتە بچووکەکان بەتالیۆنێکیان پێکدەهێنا بەڵام عەشرەتە گەورەکان چەند بەتالیۆنێك، سەربازەکانیش لەژێر حوکم و فەرمانی سەرەك هۆزەکانیان بوون.

کە ئەفسەرەکانی لەشکرە نیزامیەکە لە یەکەی حەمیدییەکاندا دادەنران، دەستەڵاتێکی ئەوتۆیان نەبوو، هەرچۆنێك بێت، ئەو ئەفسەرانە پلەیان بەرز نەبوو، دانان و ناردنیشیان لەناو عەشرەتێکی کورددا وەك ئیفلیجکردنێك بوو لە بەرزکردنەوەی پلە و دەرەجەکانیاندا.

بەتالیۆنەکانی حەمیدییە بەرگێکی رەسمی تایبەتیان دەدرایە و تفەنگی تازەشیان پێ دەدرا بۆ بەجێهێنانی ئەرکەکانیان. لەرووی تیۆریەوە پلانی حەمیدییە سوودی زۆری بۆ دەوڵەت هەبوو، گومانیشی نییە کە کەمی

ئەسپسوار لەناو سوپاى عوسمانيدا ناستەنگێكى گەورەبوو لە رۆژهەڵاتى وڵاتەكەدا، ئەمە لە شەڕەكەى (قرم)دا بە ئاشكرا پێيانەوە دياربوو، وە لە شەڕى ترك و رووسى ساڵى ١٨٧٧- ٧٨ وە هەروا لە شەڕەكانى ناوەوەى وڵاتدا.

عوسمانيەكان پارە و پوولێكى ئەوتۆيان بەدەستەوە نەبوو لەو رۆژهەڵاتەياندا تا لە پۆليس بەخەرجيدەن، جا ئەگەر بكرێ و عەشايرە كوردەكان لەژێر دەستەڵاتێكى سەربازيدا كۆكرێنەوە، ئەوە لە بەرگريكردن لە سنوور و لەسەركوتكردنى جموجوڵى ياخيبوونەكاندا بەشدار دەبن، ( دەبێ بشزانرێ كە زوربەى لايەنگرانى حەميدييە رۆژێ لە رۆژان بيريان لەوە نەدەكردەوە كە ئەم باتالۆينانە بۆ باجگرى دەشێن) بەمە دەتوانرێ سەركردە كوردەكان كە هەواو بيرى سەربەخۆيى لە كەڵلەياندا بوو، لغاو بكرێن و بهێنرێنە ناو سيستمى عوسمانيەوە. بڕيارێكيش دەرچوو بەوەى كە سەركردەكانى حەميدييە و كوڕەكانيان لە ئەستەموولْ و رۆژهەڵات دەخرێنە قوتابخانەى تايبەتەوە، بەو نيازەى كە تێكەڵ بە رۆشنبيريەكى سياسى عوسمانى كرێن.[٢٢]

ئەوانەى دژ بەم حەميدييانە بوون و بەربەركانيان دەكرد، قەت تايبەتمەنديەك و يەك لە چاكەكانى ئەم فيرقەيەيان بەدەما نەهاتووە، لە ساڵى ١٨٩٦ عەشايرەكانى حەميدييە دەورێكى گرنگيان بينى لە پەلامار و سنوور بەزاندنەكانى شۆرشگێرانى ئەرمەن لە ئێرانەوە و راونانيان.

يەكەكانى حەميدييە لەشەڕەكانى يەمەن و بەشى ئەورووپاى دەوڵەتى عوسمانيدا بەشداربوون، هەروەك هەندێ لە عەشايرە حەميدييەكان بەرگرييەكى پياوانەيان لە مەسەلەى عوسمانى كرد، لە جەنگى يەكەمى جيهانيدا كە دژ بە رووسەكان دەجەنگان. سەرەراى پاراستنى موسڵمانە مەدەنيەكان لەدەست تاڵان و برۆ و كوشتارى رووس و ئەرمەنەكان، ئەم دوو لايەنە لە جەنگى يەكەمدا گەلێ ناوچەيان داگيركرد و تا دواى جەنگيش

هەر بەردەوامبوون، لەمەدا حەمیدییە دەورێکی چاکیان دەبینی.[24]

بەپاڵ ئەمەشەوە، دەبێ ئیشارە بەوە بدرێ کە لایەنە نەرێنی و سەلبیەکانی سیستمی حەمیدییە ئەودیوی نەرێنی و ئیجابیەکانی شاردۆتەوە. بەهۆی پێکهاتە سەرکردەییەکەی حەمیدیەوە بەرپرسانی دەوڵەت هەستیان بە نیگەرانیەکی زۆر دەکرد، دەستەڵاتی حەمیدییە بە دەست ژەنراڵ (زەکی پاشا)وە بوو (بە ترکی موشیر بوو)، ئەم پیاوە سەرکردەی لیوای چواری ئەرزڕۆم بوو، دوایی لە (ئەرزنگان). فیرقەکە لەرێی ئەمەوە نەبێ ملی بۆ سەرکردایەتی سوپا نەدەدا.

سەرکردە مەدەنی و عەسکەریەکان لە هەرێمەکانی وەك ڤان هیچ دەستەڵاتێکیان بەسەر فیرقەکەدا نەبوو. لە ساڵی ١٩٠٢ فەرمانداری شاری ڤان و سەرکردەی سوپاکەی گەلێ ناڕازی و ناڕەحەتبوون لەوەی کە نەیاندەتوانی دەست بخەنە رێی کوردە حەمیدییەکان تا گوندە ئەرمەنەکان داگیرنەکەن، هەرچی دەستەڵاتێ بەسەریاندا نەیانبوو، زەکی پاشاش لەم ڕووەوە هیچ یارمەتی و هاوکاریەکی نەدەکردن.[25]

جا بەهۆی ئەو ناتەباییە هەمیشەییەی زەکی پاشاو دەستەڵاتی مەدەنی و عەسکەری شاری ڤانەوە، کاریگەرێتی سیستمی حەمیدییە دایە دواوە، زەکیش هەروەك ناوەڵزاوایەکی سوڵتان واوبوو بەسەر حەمیدییەوە، لە دامەزراندنیەوە تا ڕامالینی سوڵتان عەبدولحەمدی دووەم.[26]

وەك دەرکەوت، ئەو نیازە بنەڕەتیەی کە حەمیدیەی لەسەر دامەزرا — بەمانا ئیمکانیەتی شەتەکدانی عەشایرە کوردەکان بەزەبتوڕەبتێکی سەربازیەوە - خەیاڵ پلاوێکبوو، ملکەچی و لاگیری بۆ حەمیدییە و دەوڵەت ڕۆژێ لە ڕۆژان نەیتوانی ملکەچی و لاگیری عەشرەتەکانی خۆیانیان لە کەللە دەرکات. ئەو عەشرەتانەی لەژێر سایەی ئەم سیستمەشدابوون ڕۆژێ نەبوو لەناوخۆیاندا بەیەکدا نەدەن، ئەوەی تیایاندا گۆڕابوو تەنیا ئەوەبوو کە بە

چەکی تازەترو باشتر شەڕەکەیان دەکرد. ئەو عەشرەتەی کە چەکی لە دەوڵەت وەرنەگرتبوو خۆی بە لاوازتر دەهاتە پێش چاو، ئەمەش لەنگەری هێزەکانی لە رۆژهەلاتدا لار کردبوو، لە روانگەیەکی سەربازیشەوە ئاژاوەی زیاتریان نابۆوە و خراپترین مامەڵە ئەوەبوو لە تەک ئەم بەتالیۆنانەی حەمیدییەدا بکرابا کە گوێیان نەدەدایە فەرمانەکان و ملیان بۆ نەدەدا [٣٧]، ئەمەش بە تایبەت لە ئەوەدەکاندا کاتی یاخیبوونی ئەرمەنەکان دەرکەوت، یەکەکانی حەمیدییە سەرپێچیان دەکرد و فەرمانەکانیان پشتگوێ دەخست و تاوانبار و بێتاوانیان وەك یەك سزا دەدا .

زۆر کەرەت لە هەرێمی ڤان دەوڵەت ناچار دەبوو هێزێك لە سوپای نیزامی بنێرێ تا نەهێڵێ یەکە حەمیدییەکان ئەو گوندانەی وایاندەزانی سەر بە شۆڕشگێڕانن، تالآنیان کەن.

پشتبەستن بە عەشایرەکانی حەمیدییە بۆ بەدواداچوونی فەرمان و ئوموری دەوڵەت مەحاڵبوو، مەگەر لەکاتی بەجێهێنانی ئەو فەرمانانەدا ئەویش بە بەشداری هێزە نیزامیەکان، حەمیدییەکانو سەربازەکان بە رواڵەت سەر بە یەك لەشکربوون، ئەمە ڕاستە، بەڵام هەریەکە و ڕوو لە سەرکردایەتیەکی جیای خۆی بوو.

## • پلانە شۆڕشگێڕیەکە

هەروەك لەبەشی سێدا دەرکەوت ، شاری ڤان بووە بنکەی یەکەم ڕێکخستنی شۆڕشی ئەرمەنی بەڵام سست و ناکاریگەر، هەروا لەنێو دەفەرەکاندا بۆ یەکەمجار پەلاماردانی جەنگاوەرە ئەرمەنەکانیان بەخۆوە دی، بەر لە شەڕی ١٨٧٧ - ٧٨ هەوادارانی ئەرمەن چالاکی خۆیانیان دەستدابوویە، بەڵام دەستە و تاقمە شەڕکەر و یاخیبووەکانیان ناتەبا و ناڕێك بوون وەك بۆ دزی بچن [٣٨]. دوو کۆمەڵ کە بیانتوانیبا لە هەرێمەکەدا

ئاژاوە بنێنەوە (هانشاك) و (تاشناق) بوون، ئەمانە هەتا بەر لە سەرەتای نەوەدەكانیش كارو چالاكیەكانی خۆیان دەرنەدەخست، حیزبی (ئەرمیناكان) یەكەم حیزبێكی ڕێكخراو بوو لە ڤان كە لە ئێرانەوە چەكی هاورد.[39]

شۆڕشگێڕانی ئەرمەن ڕۆژێ لە ڕۆژان نەیاندەتوانی سەركەوتن بەسەر دەوڵەتی عوسمانی و هەتا بەسەر عەشایرە كوردەكاندا بەدەست بهێنن، بەبێ كۆمەك و یارمەتی دەرەوە، شۆڕشگێڕان ئامانجیان شكستپێهێنانی موسوڵمانەكان نەبوو، بەڵكو هێنانەكایە و ڕودانی پەرچەكرداری وەحشیانە بوو دژ بە ئەرمەن، حەتمەن ئەمە دەیتوانی ببێتە هۆی كۆكردنەوەی كۆمەكی ئەوروپایی و دەستێوەردانی دیپلۆماتی فرانسایی و بەریتانی، پاڵی بە ڕووسەوە دەنا تا لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا جەنگێ بەرپاكات، دواجار ئەرمەن دەبنە خاوەن دەوڵەتی خۆیان.

ئەم پلانە خەیاڵ پلاونەبوو، ئەم پلانە لە بولگاریا بە هەقەتی هاتە دی، كە شۆڕشگێڕانی بولگار لە ١٨٧٦ پەلاماری موسوڵمانەكانیان دەدا و نێزیكەی هەزار كەسیان كوشت، كاردانەوەی موسوڵمانەكانیش بەوە بوو كە ٣٠٠٠ بۆ ١٢٠٠٠ مەسیحی بولگاریان كوشت. بەمە رووس بڕیاری دا پاماڵی وڵاتەكە بكات، ئەوەبوو لە كۆتاییدا ٢٦٠٠٠ هەزار موسوڵمانی بولگاری تیاچوون و ٥٧٥٠٠٠ هەزار موسڵمانیدی لە زێدی خۆیان ڕاگوێزران، ئەناوا میرنشینی بولگار هاتە دی.[40]

لێرەش، بەم تەرحە، شۆڕشگێڕانەی ئەرمەن دەیانویست چاو لەو سەركەوتنەی بولگاریەكان بكەن.[41]

دیارترین چالاكیەكی شۆڕشگێڕانەی ئەم ئەرمەنانە ئەوە بوو كە دوژمنایەتیەكی خۆیان لەگەڵ كوردەكاندا قووڵتر كردەوە . هەر بۆ نموونە: لەمانگی تەموز/ یۆلیۆی ١٨٩١، (غاراك) كابرایەكی ئەرمەنی بوو، لەكاتێكدا كە خەریكی ئامدیوكردنی برێكی زۆر لە چاپەمەنی و بەیاناتی شۆڕشگێڕانە

بوو کە لە (مەرسیلیا) چاپ کرابوون و دەیویست بە ئێراندا بیانهێنێ، گیرا و دوو دەرەگی کورد لە بشکالە پاسەوانیان دەکرد، کە گەیشتنە نێزیک دەیری (فاراك) شەش ئەرمەنی بۆیان لەبۆسەدا بوون، لەو دەرەگە یەکیان کوژرا و ئەویدی بریندار بوو.

(دەیڤی) کونسۆڵ وای بۆ دەچوو کە ئەم ڕووداوە ئەرمەنەکان زیاتر هاندەدا بۆ چالاکی زیاتر، گوتبووی: وا چاوەڕوان دەکرێ ئەم ڕوداوە ببێتە هۆی پەردسەندنی دوژمنایەتی نێوان کورد و ئەرمەن و واش بکات کە پاراستنی نیزام و پێکەوە ژیان و دادپەروەری لەنێوان لایەنە جیاوازەکانی میللەتدا دژوارتر ونارەحەتتر بکات، ئەمەش کارێکە حوکمەتە ناوخۆییەکە هەمیشە هەوڵی بۆ دەدات بیهێنێتە دی ((SIC"

لاوازی دەستەلاتی دەوڵەت بەسەر عەشایرە کوردەکاندا ڕاپەڕاندنی پیلانی کارەکانی شۆڕشگێڕانی ئاسانتر دەکرد، لە ڕێی ئەو کارە تۆڵەسەندنانەیانەوە، کوردەکان ئامادە باشی زیاتریان تێدابوو بۆ پارمەتیدانی شۆڕشگێڕەکان تا ئەوەی دەیانویست بێتەدی. لەسەرتای مانگی تشرینی دوو/نۆڤامبری ١٨٩٥ کوردێك لە نزیك (سەرای) کۆمەڵێ ئەرمەنی چاوکرد کە ژمارەیان ٥٧ کەسبوون، لە ئێرانەوە چەکیان دەهاورد، ئەم هەواڵەی گەیاندە ناو قەلاکەی سەرای، دەستەیە لە حەمیدییە و دەرەکیان بۆ دەرچوو تا ڕێیان لێ بگرن، دوانزە کورد لەو پێکدادانەدا کوژران و هەشتیش لە ئەرمەنەکان، نیوەی ئەرمەنەکان ڕایان کردە ناو ئێران، باقیەکەی تریان بەردەوامبوون و بەرەو هەرێمی ڤان بوونەوە، لەوێ لەگەڵ کوردەکانی گوندی (بوغازگیسن)ی ئەرمەنی دیسان پێکهەڵپژانەوە، لەمەدا دووچاری شکستێکی ناهەموار بوون، دووانیان لە زیندانی ڤان توند کران، گوندەکەش تالانکرا.

بەمجۆرە ئەو ڕوداوە بووە پزیسکێ و لەوەوە گەلێ هێرش و پەلاماری

تری کوردەکان بۆ سەر گوندە ئەرمەنەکان لەناوچەکەدا سەری هەڵدا، دەوڵەتیش دەرەکی دەنارده ناوچەکه بەڵام کارێکی ئەوتۆیان پێ نەدەکرا تا ئاوێ بە ئاگرەکەدا بکەن. بۆیە ئەرمەنەکان ناچار ئەو ناوەیان چۆڵکرد و تا هێرشەکان ئەوەستان نەگەڕانەوە.

ئەم ورەور و وردە شەڕ و پێکدانانە نەبووە کۆتایی بۆ پلانە شۆڕشگێڕیەکە، بەڵکو لە ئەوەدەکاندا ئینجا بزاڤی مەزنی شۆڕشگێڕی لەمسەر و ئەوسەری ڕۆژهەڵاتدا بەدیارکەوت، لەساڵی ١٨٩٥ یاخیبوونەکە لە (زیتون) دەستی درایە، دوای ئەم لە (ڤان)، بەلای دەوڵەتیشەوە پلانەکە شارراوە نەبوو، بەڵام وای چاوەڕوان نەدەکرد کە بەو ڤەبارە فرەوانە بێ.[٤٤] بۆ ئەمە ژمارەی پاسەوان و دەوریەکانی عەسکەر و پۆلیسیان زیاتر کرد، بەڵام لەناوچەکانی تری سەڵتەنەکەوە سەربازیان نەدەهاورد. باڵیۆزخانە بیانیەکان لە سەرچاوە تایبەتیەکانی خۆیانەوە ئاگایان لێبوو کە لیژنە شۆڕشگێڕە ئەرمەنەکان سوورن لەسەر ئەوەی ببنە هۆکار بۆ ڕوودانی کوشتارێکی تر، دەنگۆی ئەوەش هەبوو گوایە خۆیان ئامادە دەکەن بۆ یاخیبوونێک لەچەند ناوچەیەکدا.[٤٥]

دەبێ ئەوەش بگوترێ کە ئەم شۆڕشگێڕانە لەلایەن گشت ئەرمەنەکانی شاری ڤانو دەوروبەریەوە پشتگیری نەدەکران. بەر لە هەموو شتێ دەبوو شۆڕشگێڕەکان بکەونە گیانی ئەو ئەرمەنانەی لەگەڵیان نەبوون، ئەمەش لەپێناو گردکردنەوەی هەواداران لەدەوری پیلانەکەیان، لەمەدا تیرۆرکردن پیاوە ئایینیەکانیشی دەگرتەوە، لە ١٨ کانوونی دوو/ یەنایر، لەگەرمەی جەژنی لەدایکبوون لەلای ئەرمەن (بوغۆس)ی مەترانی ڤان، کەوا ناسرابوو دژ بە ڕێکخراوەکەیانە، کە بۆ کڵێسا دەچوو تا قوداسێک بەڕێوە ببات، کوشتیان.[٤٦]

بەڵام ئەو ئەرمەنیانەی تر کە بە ئاشکرا دژیانبوون (لەناویاندا کاهین و

بازرگان و پیاوە بەناوێکانی ناو کۆمەڵی ئەرمەنی) ئەوانیش تووشی تیرۆر و تیرۆکردن دەبوونەوە.[47] لە پیادەکردنی پلانەکەیاندا شۆڕشگێڕان سەرکەوتووبوون، بەڵام ئەوەی قورەکەی خەستتردەکردەوە، ئەوەبوو کە سوڵتان (عەبدولحەمیدی دووەم) لە چەند شۆڕشگێڕێکی ئەرمەنی کە تاوانباربوون خۆشبوو و لێبوردنی بۆ دەرکردن. ئەمە بۆ دڵنەوایکردنی ئەوروپاییەکان. دیارە ئەمە ئاگری یاخیبوونەکەی زیاتر خۆشکرد.[48]

شۆڕشگێڕان زیاتر خەریکی هاوردن و کێشکردنی چەك و جەنگاوەر بوون لە ڕووسیاوە بۆ هەرێمی ڤان بە ڕێی ئەرزرۆم و ئێراندا.[49] لە ١٨٩٥دا هەندێ لە ئەندامانی ڕێکخراوی تاشناق لە ڕووسیاوە هاتنە ئەرزرۆم، ئەمانە دەستیان کردە پارە کێشانەوە لە کەسایەتیە پاردارەکانی ناوچەکە تا پارەوپووڵ بۆ کڕینی چەك پەیدا کەن، لەو ئەرمەنانەی کە ئەندام بوون لە ئەنجوومەنی بەڕێوەبردنی هەرێمەکەدا، لەلایەن ئەوانەوە هەڕەشەیان لێ کرا تا دەست لەکاری ئەو ئەنجوومەنە بکشێنەوە.[50]

زوربەی ئەو شۆڕشگێڕانەی هاتبوونە ناو هەرێمی ڤانەوە لە ئەرمەنیەکانی ڕووسبوون. جگە لە هەندێکی ناو ڤان کە چووبوون بۆ ڕووسیا تا مەشقی سەربازی بکەن، کە ساڵی ١٨٨٧ هێزەکانی عوسمانی ژمارەیە لەو شۆڕشگێڕانەیان دەستگیرکرد کە چل کەسێکبوون، کاتێك دەیانویست لە ئێرانەوە بپەڕنەوە بەمدیو سنووردا، لەوانە یەك ڕووسی و دووانزە عوسمانی و گەنجێکیش پاسپۆرتی بەریتانیای پێبوو بەناوی (هاری ویلیامز)، ئەمانە بڕێکی باش بڵاوکراوە و ئەشریاتی پروپاگەندەکردنیشیان پێگیرابوو.[51]

دوایی دەرکەوت کە (ویلیامز) ئەندامە لە حیزبی (هانشاك) و ناوە ئەسڵیەکەی (هاروتن نۆهاندجیان)ە، لە لەندەن ژیاوەو بۆتە خاوەنی پاسپۆرتی ئەو وڵاتە، گشت ئەمانە بەهۆی بەڵگەنامەی ساختەوە.[52]

دەستەیە لە گەنجانی ئەرمەنی لە زستانی ١٨٩٥ - ٩٦ نێزیك بە

کونسوڵگەری ڕووس لە خانووی گەورە گەورەدا کۆدەبوونەوە بۆ مەشقکردن و هەتا بۆ تاقیکردنەوەی چەکیش !![53]. لە بەهاری ساڵی ١٨٩٦ یاخیبووەکان بۆ دانانی نەخشەی چۆنێتی یاخیبووەکەیان کۆبوونەوە، ئەم ڕووداوە شار گشتی دەیزانی. کە هەستیان کرد واکەس لێی نەپرسینەوە و خۆی تێنەگەیاندن، بڕیاریاندا چاوقایمانەتر بێنە پێش و بجوڵێن، بەمەبەستی کەللەیکردنی موسوڵمانەکان و بێتاقەتکردنیان، جا یاخیبووانی ئەرمەن پەردەیان لە ڕووی خۆیان هەڵماڵی و بە ئاشکرا ڕایان دەگەیاند کە دەیانەوێ یاخی ببن.

کونسوڵی بەریتانیا ( س.هـ.ویلیامز) کارەکانیانی بە (جینایەتێکی کەربازاڕی) وەسف کردبوو، دەیگوت: (پێشتر ئەو هۆشداریەم دابوو سەبارەت بەو جینایەتە کەربازاڕیەی کە شۆڕشگێڕان دەیکەن، دەستە دەستەیان شەوانە بەردەوام بە شەقامی گەڕەکە ئەرمەنەکاندا بە دەمانچە و تفەنگەوە دەسوڕێنەوە، ژمارەیەکی کەمیشیان نەبێ نازانن ئەو چەکانە بەکاربێنن، زوربەی زۆری ئەرمەنەکان هیچ هاوسۆزیەکیان بۆ ئەمانە نییە، بەڵام ترس خەڵکە ئەرمەنەکەی داگرتودو ئاوا دەسەوسانی کردون.[54]

بەڵام کوردەکان، لەدەرەوەی شارەکاندا دەکوژران و لەتوپەت دەکران و پیشانی خەڵکی دەدران. ئابەمجۆرە یاخیبووان دەیانویست پاڵ بە موسوڵمانەکانەوە بنێن تا ئەوانیش پەلاماری ئەرمەنەکان بدەن، بەهیوای کۆکردنەوەی هاوسۆزی زلهێزەکان و پشتگیریکردنیان لە دۆزەکەیاندا، وە هاندانی گشت ئەرمەن بۆ پاڵپشتی شۆڕشگێڕان.[55]

کونسوڵ (ولیامز) بەڕوونی و ئاشکرا دەڵێ: سنوور بەزاندن و زێدەڕۆییەکانی شۆڕشگێڕان، بەتایبەت سەبارەت بە هاندانی موسوڵمانەکان ئاستەنگێکی قوت کردۆتەوە لەبەردەم هێنانەدی ئاشتی لە دەڤەرەکەدا.

هەستی بەوە کردبوو کە ئەم یاخیبووانە پێش لە چاکسازیەکی ڕاستەقینە دەگرن و پەکی دەخەن: ئەگەر بکرێ بێدەنگ بکرێن، لەو

باوەڕەدام کە کۆسپێکی سەرەکی لەبەردەم چەسپاندنی ئاسایش لەناوچەکەدا رادەماڵرێ.[56]

دەبێ ئەو پرسە بێتە گۆڕێ کە ئاخۆ بۆ دەوڵەت ئاوا سست و خاو و خلیچك و نەرمە لەگەڵ ئەم یاخیبووە ئەرمەنانەدا، ئەوانەی (بەجادەکاندا بە چەکەوە دەسووڕێنەوە)، ڕێی تێناچێ کە جموجۆڵی کونسۆڵی ڕووسیا و ئەوانەی بە چاودێری ئەو مەشقیان بە جەنگاوەرەکان دەکرد، بەلای دەوڵەت و بەرپرسانەو شارراوە بووبێ؟. بێگومان وەڵامی ئەم پرسەش دیسان وا لەناواخنی سیاسە نێودەوڵەتیەکاندا.

## • دەستێوەردانی ئەوروپا

لە ساڵی ١٨٩٥ - ٩٦ سەڵتەنەی عوسمانی ڕووبەڕووی پارچە پارچەبوونێکی زۆرەملێی ڕاستەقینە بۆوە، لەوانەیە هۆکاری گرنگی ئەمە ئەو کاردانەوەیەی ئەوروپا بووبێ، بەتایبەت بەریتانێکان، لەبەرامبەر پشێویەکانی ١٨٩٤ - ٩٥ی (ساسون زیتون).

ئەوروپاییەکان داوای گرتنەبەری ڕێوشوێنی توندیان دەکرد بەرامبەر سەڵتەنەی عوسمانی، چونکە ئەوان تەنیا دەنگۆی ئەو کارە تۆڵەسەندنانەویان دەبیست کە لە بەرامبەر ئەرمەنەکاندا ئەنجام دەدرا، ئاگایان لەوە نەبوو کە ئەرمەنەکان چیان بە موسوڵمانەکان دەرکرد، بەڵام سەبەبی هەقیقی ئەو بۆچوونە باوەی ئەوسابوو کە لە نێوەندە دەوڵەتیە ئەوروپاییەکاندا بڵاوبۆوە گوایە سەڵتەنەکە وا لە داڕماندا و ئەمڕۆ یا سبەی دەڕوخێ[57]. جا هەر کەسە و دەیویست پەلاماربدا و بەشی خۆی بپچڕێ.

(ڕۆبەرت سیسیل) کە لۆردی (سالسبۆری) بوو، لە حوزەیران/ یۆنیۆی ١٨٩٥ بووە سەرۆکی وەزیرانی بەریتانیا، داوای گرتنەبەری ڕێوشوێنی دەکرد دژ بە عوسمانێکان[58]. لە قۆناغیکی ساڵی ١٨٩٥دا (سالسبۆری) کەشتیگەلی

بەریتانیایی نارده (لیمنوس) ڕێك بەرامبەر گەرووی (دەردەنیل) . لەبەردەم ئەنجوومەنی وەزیرانیشدا وای پێشنیار کرد کە کەشتیگەلەکە گەرووکان ببڕێ و بچێت ئەستەموولّ داگیرکات، ئەم کارە بە ڕاوێژکردن بکرێت لەگەڵ ڕووسیادا، بەپێی ئەو سیاسەیەی کە دەمێکبوو ڕووسەکان بە عەزرەتیەوە بوون بۆ پەیڕەوکردنی، ئاشکراشبوو کە دەیانویست ئەستەموولّ داگیرکەن تاکو ئاسایشی هاتوچۆی دەریایی لە دەریای ڕەشەوە بەرەو سپی ناوەڕاست، زامنکەن.

زۆری نەمابوو ئەوە بێننەدی، لەنیوەی دووەمی ساڵی ١٨٩٥ ئەوروپاییەکان کەوتبوونە سەواو مامەڵەی دابەشکردنی تالانی و دەستکەوتەکانیان، زۆر کەرەت وایان دەزانی عوسمانێکان بەرەو کۆتاییە حەتمیەکەیان دەچن. ئەوەی کۆلیشی کۆتابوون تەنیا نەبوونی متمانە بوو لەناو زلهێزەکان خۆیاندا، لەولاوە ئالمان ڕازی بوو کە ڕووس ئەستەموولّ ببات بۆ خۆی، بەلام تەنیا بەنیەتی ئەوەی دوری بخاتەوە لەهاوپەیمانە فرانساییەکانی و هێنانی بۆناو کۆڕی ئالمان.[٥٩]

دیارە ئەمەش لەلایەن فرانساوە ڕەتکرایەوە، بەلام ئیتالیا دەیخواست کە (ئەلبانیا) پاروویەکبێ بۆخۆی، بەلام لەملاوە نەمساییەکان ڕازی نەدەبوون. ڕووسیا بیری لە هێرشێك دەکردەوە کەتەنیا خۆی بیکات، بەلام لە ١٨٩٥ تەنگەژەی (مەنشوریا)ی باکووری چین دەستی گرتبوون و پیوەی ئەوق ببوون لەوەی بکەونە جەنگێکی ئەوروپاییەوە. لەبەرامبەردا، کەسیش متمانەی بە نیەت پاکی ڕووس نەبوو، ڕاستە کە هێزە ئەوروپاییەکان لەسەر وێرانکردن و کاولکردنی سەڵتەنەکە کۆکبوون بەلام هەرگیز نەدەگەیشتنە ڕێککەوتنێکی ئاوها کە چۆنچۆنی ئەمە بکەن، لەوە دەچێ ئانەمە ئاکە هۆکارێك بووبێ بۆ قووتاربوونی سەڵتەنەکە لە گورگان خواردنێکی حەتمی.

عوسمانێکان و ئەوروپاییەکان گشتیان دەیانزانی کە لەناو حوکمەتەکانی

ئەوروپادا پیلان بۆچی دادەنرێ، هەریەك جووڵە دژ بە ئەرمەن زامنی ئەوە بوو کە لەناویان بەرن... بەڵام حوکمەتەکەی سوڵتان هیچی دەستەڵات نەبوو جگەلەوەی کە هەر لە دوردوە سەیرکات و تابۆیشی دەکرێ کیشە و گیروگرفتەکان کەم بکاتەوە، بۆیە لەیەك لە قۆناغەکاندا وا باشتر بوو کە لە ڤان و شارەکانی تردا ڕێگە ئاچووغکات بۆ ئەرمەن تا بەئاشکرا لەجادەکاندا بەچەکەوە خۆیان بنوێنن و هەڵمەتی پڕوپاگەندەش بۆخۆیان بکەن، چونکە ڕێبەندیکردن لێیان سەرێشەی گەورەتری لێدەبێتەوە. بگرە شۆڕشێکی بەربلاوی تری ئەوتۆ کە بە جارێ پێوانەکان تێك دەدا و دەبێتە هۆی دەستێوەردانێکی سەربازی ئەوروپایی، لە کۆتایشدا لێبوردەیی و لێخۆشبوون لە قارەمانێتیە شۆڕشگێڕیەکاندا شتێکی چاوەڕوان کراوە، لەوانەیە باشیشبێ.

لەساڵی ١٨٩٦ یاخیبوونەکەی ڤان هەڵگیرسا، پاش ئەوەی پیلانە ئەوروپاییەکان بۆ لەتوکوتکردنی سەڵتەنەکە دوای بڕا، ئەویش بەهۆی ناتەبایی و یەکتر تاوانبارکردنی لایەنە ئەوروپاییەکان لەناو خۆیاندا.

## • شۆڕشەکەی ١٨٩٦

کاتێك شۆڕشەکەی ١٨٩٦ ی ئەرمەنی هەڵگیرسا ڕەوشی هەرێمی ڤان خەریکبوو بەرەوباشی دەچوو، کاردانەوە نێودەوڵەتیەکان بەرووی شۆڕشەکانی (ساسون و زیتون) لە ١٨٩٤ - ٩٥ بەوە دەوڵەتیان قایل کرد کە ئاسایشەکەی هێندەی پەیوەستە بە گرتنە خۆی ئاژاوە ناوخۆییەکان و دامرکاندنەوەیان هێندەش پەیوەستە بە گردکردنەوەی سەربازەکان لەو خالانەدا کە دەشێ دوچاری داگیرکاریەکی ڕووسیا ببنەوە، لە واقیعیشدا هەڕەشەیەکی گەورەی ڕووسیا بە ئەگەری داگیرکردنێك هاتە گۆڕێ، ئەویش بەهۆی گیروگرفتی ئەرمەنەوە. جا لە ساڵی ١٨٩٥ هێندەی نەمابوو پیلانی ئەرمەنەکان و کارە تۆڵەسێنەکان و دەستێوەردانە ئەوروپاییەکان سەربگرن

و سەرکەون. کە دەوڵەت بڕیاری دا هەرچۆنێکبێ و چی لە دەستدا بێ بیکات بۆ دانانی سنوورێك بۆ نارەزاییەکانی ئەرمەن و پاراستنی ئاسایش لە رۆژهەلاتی مەملەکەتدا.

هەنگاوی یەکەم لەوەبوو ئەرمەنەکان بخەنە ناو بیرۆکراتیە فەرمان رەواکەی عوسمانیانەوە، سەرەتا دانانی پلەیەکی ئیداری بەناوی (جێگری فەرماندار) کە کەسێکی مەسیحی بێت.[10] هەروا دەوڵەت بە باشی زانی کە سەربازێکی زۆر لە رۆژهەلاتدا بۆ بەرگەماڵی ئاسایش و یەکخستنی هەوڵەکان بۆ یاخیبوون بڵاوکاتەوە، بەر لە تەشەنەکردنی و ڕوودانی کوشتار و کوشتاری بەرامبەر، بەرپرسیارێتی لەشکر لە ڤاندا سپێردرا بە سەرکردەیەکی بەتوانای سەربازی (سەعدەددین پاشا)، ئەوەندەش سەربازی خرایە ژێردەست کە بەشی هێورکردنەوەی ڕەوشە ئەمنیەکە بکات. بۆ یەکەمجار سوپا دابەشکرا بەسەر ناوچە دورە دەستەکاندا، بۆ ئەم مەبەستەش پێنج بەتالیۆن موهەییا کرا.[11]

سەعدەددین پاشا توانایەکی چاکی هەبوو، لەگەڵ ئەو هەموو مەترسیانەدا دەستەڵاتێکی گەورەی شەخسیشی پێدرابوو، بۆیە لە کارەکەیدا گەیشتە ئاستی تەحەدداکردنی ئەمنی و بەتوندی و چاونەترسانە رووبەڕووی دەبۆوە.

بار و زرووفە ئەمنیەکە لە میسالیەتەوە زۆر دوور بوو، ئەو پێنج بەتالیۆنە دەورێکی گرنگیان دەبینی لە باشکردنی ڕەوشەکەدا، بەڵام بەشی نەدەکرد، زۆر کەڕەت جڵەوگیرکردنی هێزێکی گەڕۆکی وەك عەشایرە کوردەکان کارێکی زەحمەتبوو، کە ترکەکان لە ٢٠ ئادار / مارسی ١٨٩٦ هێرشیان کردە سەر چوار گوندی ئەرمەنی، ٢٦ کوژرا و زۆر کەسیش زامدار بوون، سەعدەددین پاشا خۆی لەو شەڕەدا سەرکردەیی بەتالیۆنێك سەرباز و پەلێك سوارەی حەمیدییەی دەکرد، بەڵام نەیتوانی ئەفرادە مەدەنیەکانی

عەشایرەكان دەستگیركات، چونكە تا ئەمان گەیشتن ئەوان هەڵاتبوون.[٦٢]

وەك هەمـوو جارێـك، گیروگـرفتی پـارەوپوول، كـەمی سـەرباز و بـەش نەكردنیان و دەبوو بەشێوەیەكی ڕێكوپێك مووچەیان بدرێتێ، تا بە باشترین شێوە ئەركە سەربازییەكانیان بەجێ بهێنن.[٦٣]

سـەرەڕای ئـەو هـەوڵ و تەقەللایانـەی عوسمانێكـان بـۆ چەسـپاندنی ئاسایش، گـرژی و ئاڵۆزیـە شۆڕشـگێڕیەكان لـە ڤـان ڕوو لـە زیـادبوون بـوو، (ویلیامز)ی كونسوڵی بـەریتانی وای مەزنـدە دەكـرد كـە نێزیكـەی چوارسـەد ئەنـدامی تاشناق و پـەنجا ئەنـدامی هانشـاك وان لـە ڤانـدا. بـە مـەرجێ ئـەم ژمارانە تەنیا ئەو ئەندامانەی دەگرتەوە كە سوێندیان خواردبوو و ئەندامە ئەساسیەكانی هەردوو حیزبەكە بوون.

دەیگوت: تاشناقێكان هاووڵاتیانی خۆیانیان دەترساند و هەڕەشەیان لێ دەكردن، بەڕەفتارە شێتگیری و وەحشیاساكانیان دانیشتوانە موسوڵمانەكانیان دەوروژانـد، هەرچـی كـارێكیش دەكـرا بـۆ چاكسـازیكردن ئـەمان تێكیـان دەدایەوە[٦٤].

لیژنە شۆڕشگێڕیەكان كەوتنە بڵاوكردنەوەی نەشریات و بەیاناتەكانیان و دروشـم بـۆ هانـدانی خـەڵكی بـەرەو شۆڕشـكردنیان بـە دیوارەكانـدا هەڵدەواسی. لەو دروشمانەی تاشناقێكان لە ئادار/ مارسدا هەڵیان كردبوو:

(( ڕێكەوتن مەحاڵە، چەك فـڕێ نـادەین، شـەڕەكەمان شـەڕێكی پیرۆزە، بە دڕندانەترین شێوە دڕێژەی پێدەدەین تا دوا هەناسە، دەبا ڕێگەپێدراوانی ملهوڕ بچنە دۆزەخەوە، هەرگیز خۆنادەین بەدەستەوە، ئێمـە شۆڕشـگێڕین و ئەمەش دوا قسەمانە: یا ئازادی یا ئەمان، بژی گەلی ئەرمـەنی، بـا هـەر بـژی شۆڕش.[٦٥] ))

ڕاپۆرتەكان ئیشارە بەوە دەدەن كە شۆڕشگێڕەكان پیلانی ئەوەیان دادەنا لـە ڤانـەوە بجـوڵێن، ئەرمەنـە عادیـەكان یـان بـەلانی كەمـەوە ئەوانـەی

پەیوەندییان بە کونسوڵگەرییە بیانییەکانەوە بوو، هەواڵەکانی ئەم جوڵان و شۆڕشەیان شەش مانگ بەر لە ڕوودانی دا بە ئەوروپاییەکان[٦٦].

بەریتانییەکان لە ئێرانەوە زانیاریان بۆ هاتبوو کە شۆڕشگێڕەکان بە بیانووی کۆکردنەوەی کۆمەک و فریاگوزاری بۆ قوربانیانی ساسون کەوتوونە پیتاک کۆکردنەوە، بەڵام پارەکانیان داوە بە چەک و ئامێری ڤانیان کردووە، ئەمە وەک خۆئامادەکردن بۆ کودەتایەک[٦٧].

(نازم پاشا)ی فەرمانداری ڤان ڕاپۆرتێکی بۆ ئەستەموول بەرزکردەوە، تیایدا دەیگوت: ئەرمەنەکانی شارەکە گشتیان چەکدارن و چەک عەمبار دەکەن و دەیشارنەوە. پیلانی یاخیبووەکان سادە و ساکاربوو، لەوە دەچوو زیاتر پشتی بە هیوا و ئاواتێک قایمبێ وەک زیاتر لە حیسابات و تەقدیرات. وایان ئەخشەکێشابوو کە بەشە ئەرمەنییەکانی ناو شارەکە بگرن و دەستی بەسەرداگرن، بەتەمای گەیشتنی هێزێک لە ئێرانەوە کە بتوانێ بە تەواوی دەست بەسەر گشت شارەکەدا بگرێ.

بێگومان یاخیبووەکان لە کارێکی ئاوهادا وا دەردەکەوت کە چاوەڕوانی ئەوەبوون، ڕووسیا بێتە سەر خەت، پێچەوانەی ئەمەش کەلکێکی ئەوتۆ نادات بە دەستەوە. بە ئەقڵیشدا ناچێ گەوایان زانیبێ دەتوانن هەر هەموو لەشکری عوسمانی ڕامالن، بەڵام لەوانەیە دیسان پیلانی ئەوەیان نەبووبێ کە ئەگەر لە ئەساسدا شۆڕشەکە سەرکەوت چی ڕوودەدات؟

لەوانەیە ئەخشەکانیان تەگەیشتبێتە ئەم ئاستە، چونکە لە (زیتون و ساسون) و شوێنەکانیدی لە نەوەدەکانی سەدەی نۆزدەدا هەرشتێ لەم بابەتە ڕوویدا، لەوەشی دەکرد ئەو واقیعەش دیسان بەسەر ڤاندا هاتبێتەوە.

شۆڕشی ١٨٩٦ لە سێی حوزەیران/ یۆنیۆ لە ڤانەوە دەستی پێکرد، بەڵام لە واقیعدا ڕوداوەکان لە مانگی تشرینی یەک/ ئەکتۆبەری ١٨٩٥ەوە سەری هەڵدا، لەوەش دەچێ کە هێزە عوسمانییەکان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی

ئامادەبوون، چونکە لە ڕاپۆرتێکی دورو درێژدا کە سەعدەددین پاشا سەرکردەی سوپاس ڤان ئامادەی کردووە، باس لەوە دەکات کە ٢٣ ڕوداوی شۆڕشگێڕانە بەر لە هەلگیرسانی یاخیبوونەکە لە ناوچەکەدا ڕوویانداوە، لە ڕاپۆرتی ڕۆژی ٢٢ /تەموز/ یۆلیۆدا هاتووە کە: ئامادەکاری بۆ شۆڕشکردن بەر لەو ڕوداوانە بووە، یاخیبووەکان ئەو درەختانەی بڕیبوویاننەوە و خشتیان بەکارهێناوە بۆ بەربەست دروستکردن لە دەوروبەری کڵێسای (دیرە) و بینای نێردراوە پرۆتەستانتەکان و گەڕەکی (نورشین) و (تیبباشی) و (حاجی بوغان) لە کڵێسای (ئیریک)... لەم حاڵەدا گەڕەکە ئەرمەن نشینیەکان وەك قەڵایەکی قایمی وای لێهاتبوو دەتگوت ئەفسەرێکی سوپا کاری ئەندازیاریەکەی بۆ کردون.[69]

بەپێی ڕاپۆرتی تری هەر لەم چەشنە کە سەعدەددین پاشا و کونسۆڵ ویلیامز[70] لەشەوی دوو لەسەر سێی حوزەیران / یۆنیۆ داویانە، یاخیبووەکان تەقەیان لەو سەربازە ترکانە کردووە کە بەلای گەڕەکی گاردنی ئەرمەنیدا ڕەتبوون، بۆتە هۆی برینداربوونی هەندێ سەرباز و ئەفسەر، بەڵام ماڵە ئەرمەنەکان قایم کرابوون و ئامادەبوون بۆ شەڕکردن.[71]

(ویلیامز)ی کونسۆڵی بەریتانیا لە ڤان، نووسیویە:

(( لە شەشی حوزەیران/ یۆنیۆ، دوو شوێنم چاو کرد کە یاخیبووەکان دەیان پاراست، من لەتەك نێردراوی ئامریکایی د.رینۆڵت[72]دابووم ، لەو شێوە بەرگری و دامەزراندنەی پەیرەو دەکرا واقم ورمابوو، ئەوان خۆیان دەیانگوت کە تا دە ڕۆژ دەتوانن بەرگە بگرن و چاوەڕوانی گەیشتنی هێزن لە ئێرانەوە.

هەندێ نیشتمان پەروەری ئامریکایی و ڕووس و بولگارشیان لەناوا بوو، کۆی ئەو بیانیانە دووانزە بۆ پانزە کەس دەبوون. بەڵام کۆی گشتی هەموو یاخیبووەکان خۆی دەدا لە شەش سەد کەس، ئەرمەنەکان تفەنگی ڕووسیان

پێبوو، دەیانگوت ئەو چەكانەمان لەڕێی ئێرانەوە بەهۆی ئەرمەنەكانی ناوخۆوە پێگەیشتووە، ئەندامانی لیژنەی شۆڕشگێڕان جۆرە جلێكیان پۆشیبوو كە جیایەكردنەوە لەوانیدی.

من كە ئەم زانیاریانە باس دەكەم بۆ ئەوەیە كە پیشانیدەم یاخیبووەكان ئەم چەكانەیان بۆ پاراستنی ماڵ و منداڵیان نەكردۆتە شان، بەڵكو بۆ ئامادەبوون بۆ كودەتایەك. بەڵگەنامەی وام لە كنە كە دەری دەخات موسوڵمانە بێتاوانەكان هەر ئەوەندەی بەبێ قەسد بەلای ئەم یاخیبووانەدا ڕەتبوون یا لێیان نێزیكببنەوە، كوژراون. [73]))

بەڵام ئەو ئەرمەنیانەی كە لە شۆڕشەكەوە ئەگلابوون، خۆیان خستبووە پەنای كونسوڵی ئینگلیز و پەنایان بۆ بردبوو، لە بەرامبەردا لە هەشتی حوزەیران / یۆنیۆ ئەوانیدی لەگەڵ هێزە عوسمانیەكان بەشەڕ هاتن، چاودێرە سەربازیە عوسمانیەكان ڕایانگەیاند كە ئەرمەنەكان بە چەكی ڕووسیەوە و لە مەتەریزە قایمەكانیانەوە، كە پێشتر ئامادە و دایانمەزراندبوو، تەقەیان دەكرد[74].

لە لایەكی دی كە عەشایرە كوردەكان زانیان ئەرمەنەكان تەقە لە سەرباز و مەدەنیە عوسمانیەكان دەكەن، جوابیان نارد كە ئاخۆ پێویست دەكات بێنە ناو شارەوە و لەشەڕەكەدا بەشداربن یان نا؟ سەدەددین پاشا فەرمانی پێدان كە پێویست ناكا و بگەڕێنەوە[75].

هەر زوو بە زوو ئەوە بە جوانی ڕوونبۆوە كە هەلی سەركەوتن بەدەست یاخیبووانەوە نییە، كەچی سەربازەكان لە ترسی تەلەفیاتێكی زۆر لە نێو خەڵكەكەدا، هێرشیان نەدەكرد، لەباتی ئەمە (بابی عالی) داوای لە دەوڵەتانی بەریتانیاو فرانسا و ڕووس و فارس كرد كە كونسوڵەكانی خۆیان لەوشارە ڕاسپێرن تا بكەونە ناوبژیوانی لە نێوان هێزەكانی دەوڵەت و یاخیبووەكاندا. ئەمە كرا، نەخشە و پیلانی جۆراو جۆر خرایە ڕوو و مەرج

بۆ یاخیبووان دانرا، دەوری بالیۆزە ئەوروپاییەکان و نوێنەرانی سوڵتان ئەوەبوو کە ڕێگەچارە بۆ هەردوولا وەدۆزن، هەر بەو چەشنەش کاتیخۆی ڕێگە چارەیەکی ئاوا درایە شۆڕشگێڕە ئەرمەنەکان کە ئەمبەری عوسمانی (نەك ئەوبەری ئەوروپا) شاری ئەستەموولیان گرتبوو، بەپێی ئەوە ڕێیان بۆ چۆڵکرا و بەرەڵا کران.

بەڵام لەم دەرەتانەی ڤاندا، دەوڵەت داوای سزادانی سەرانی دەستە شۆڕشگێڕەکانی دەکرد، یاخیبووانیش بەو مەرجانە ڕازی نەبوون و ڕەتیان کردەوە[٧٦]. ئینجا هێزە عوسمانییەکان پەلاماری یەك لە شوێنەکانی ئەرمەنیەکانیا دا و زۆر بە ئاسانی گرتیان، ئەمە وەك دەرکەوت یاخیبووانی هێنایە سەر ئەوەی کە بە ئاسانی شکست دەخۆن و دەبەزێن.[٧٧]

لە نۆ و دەی حوزەیران /یۆنیۆ تەقە لە مەتەرێزی ئەرمەنەکانەوە کز بوو، بەشی زۆریان ڕایان کرد، [٧٨] چونکە زانیبوویان کە ئەو هێزە فریادڕەسەی لە ئێرانەوە چاوەڕوانی بوون بۆیان بێت، لەکوێوە هاتبوو گەڕابۆوە بۆ ئەوێ[٧٩]. خۆ ئەوانەی کە دەشهاتن بۆ ڤان لە ڕێگەیاندا پەلاماری گوند و عەشایرەکانیان دابوو بەمە ژمارەیان کەمبۆوە، ژمارەیەکی تریان لە (جاتاك) گیران.

سەعدەددین پاشا ڕایگەیاند کە ٢٤٠ موسوڵمان و ٢١٩ ئەرمەن لەناو شارەکەدا کوژران، بەڵام ویلیامز ژمارەی قوربانیانی بە ٥٠٠ کەس خەملاندبوو، لەوانە ٣٠٠ موسوڵمان.[٨٠] لە ڕۆژانی دوایی شەڕ و کوشتار لەنێوان یاخیبووانی ئەرمەن و سەربازەکان و عەشایردا لە ناوچە و گوندەکانی هەرێمەکە بەردەوامبوو، یاخیبووان بەتایبەت لە (ئەرگیس و باك و ئیرجیك) چالاکبوون، بۆیە ژمارەیەك لە لادێیە موسوڵمانەکان کوژراون.[٨١]

بەڵام گومانی تێدا نییە کە گوندی ئەرمەنەکان لە دەرەوەی شارەکان زیاتر دەبوونە ئامانج و عەشایرە کوردەکان پەلاماریان دەدان. بەپێی

ڕاپۆرتەکانی سەعدەددین پاشان ژمارەی کوژراوانی ناو شارەکە و هەمووو وڵات گەیشتە ٤١٨ موسوڵمان و ١٧١٥ ئەرمەن، بریندارانیش ژمارەیان خۆی دەدا لە ٣٦٣ موسوڵمان و ٧١ ئەرمەن.

پاش ئەمە وردە شەڕی پچڕ پچڕ، ناوە ناوە لەنێوان ئەو ئەرمەنانەی لە ئێرانــەوە دەهــاتن و ســەربازی عوسمــانی و عەشــایردا هــەتا پــایزی ١٨٩٧ بەردەوامبوو.[٨٢]

هێزە عوسمانیـەکان بـە چاکی ڕووبەڕووی یـاخیبووان بوونـەوە، ئەمـە بووە مایەی سەربەرزی و شانازی بۆ سـەعدەددین پاشای سـەرگردەیان، هـەتا نێردراوە ئامریکاییـەکان ( کە لـە عوسمانیانـەوە نێزیك نـەبوون) دادانیـان بەو ڕاستەدا نا، چونکە کاتێ یاخبووەکان هەرەشەی ئەوەیان کـرد کـە دەست بەســەر مولکــەکانی نێردراوێتیەکەیانــدا دەگــرن، ســەربازەکان هــاتن و پاراستنیان، تەبیعی ئەم کارە بووە مایەی مەدح و سەنای ئامریکاییـەکان بـۆ ئەو کارەی دەوڵەت لەسەرووبەندی ئەو یاخیبوونەدا و هەتا پاشیش.[٨٣]

بە ڕوونی ئەوە کەوتەڕوو کە شۆڕشگێڕان لەو ئاستەدا نـەبوون بـۆ هـەر جۆرە یاخیبوونێکی سەرکەوتوو، ئەمەش لـە ڕووی لۆژیکیـەوە دەشـێ ئەگـەر ئــەوان تــەنیا مەبەســتیان وروژانــدنی کــاری تۆڵەســەندنەوە بــووبێ بــۆ گردکردنەوەی دەستێوەردانی ئەوروپاییەکان، بەڵام دیسان ئەوەش ڕاسـتە کـە کاڵفامی یاخیبووان و نەشارەزاییان و ناڕاستی تەقدیری هـەلی سـەرکەوتنیان پـێش دەسـتدانە کارەکـە ئـەوەی بەسـەرهێنابن. سـەرکەوتنە خەیاڵیەکـەیان مەستی کردبن، بۆیە هەرزە ئاسا بە گەڕەکە ئەرمەنەکاندا بەچەکەوە خۆیان دەنوانــد، هــەتا ڕادەی کوشــتنی ســەربازە عوسمانێکــان بەشــێکی کــەمی ئــەم یاخیبووانە (بەزۆری بریتیبوون لە گـەنجی نەشارەزای سـەرکێش) مەشـقیان پێکرابوو یان گلابوون لە بەکارهێنانی چەکەوە.[٨٤]

## ● لادێ

کێشـە و تەنگـەژەکان لـە ڤانـەوە پـەلی بـۆ گشـت لایـەکی هەرێمەکـە کێشابوو، بەتایبـەت باشـوور و ڕۆژاوای شـارەکە.[85] هـەروەك یاخیبوومکـانیش چاوەڕوانبوون، عەشایرە کوردەکان پەلاماری ئەو دێیانەیان دەدا کە ئەرمەنی تێدابوو، مەڕومالآتیان زەوت دەکردن و لە دانیشتوانەکانیان دەکوشت و ترس و بیمیـان دەخسـتە دڵـەوە. لەسـەر حیسـابی ئـەم لادێییانـە دەسـتکەوتیان دەچنییەوە بەلآم تۆلە ئەستاندنەوەش هۆکارێکی بنەڕەتی ئەو دەستدرێژیانە بوو، چونکە یاخیبووە ئەرمەنـەکان لـە ڕێـی کشانەوە و ڕاکردنیانـدا لـە ڤان پەلاماری گونـدی موسـوڵمانەکانیان دابـوو[86]. لـە پـەنا ناوچـەی (ئـەرگیس)دا لـەو کاتـەی دەکشـانەوە ژمارەیـەکی زۆری ئەرمـەن کـوژران، ژمارەیـەکی ئەرمەنی ئەرگیسیش بۆ ماوەیە هەڵاتنە ناو ئێرانەوە[87].

لـە ناوچـەی (جاتـاك) گونـدە ئەرمەنـەکان کەوتنـە بـەر هێـرش و پەلاماردان، چونکە بەشـداری یاخیبوونەکـەیان کردبـوو، بـەڵام ئەوانـەی لـەو ناوچـانەدا بـوون کـە ئاژاوەیـان بـە خـۆوە نـەدیبوو و لـە کشـانەوەی یاخیبووەکانیشـەوە بـە دووربـوون، کەچـی هێشـتا پریشـکی ئـەو بەڵایـە گرتنیەوە[88]. بارو زرووفەکە بەیەکا چووبوو: هەندێ لـە سـەرکردە کوردەکـان دەچوونە گوندی ئەرمەنـەکان و داگیریـان دەکـرد، سـەرکردەی کـوردی وایـش هـەبوو دەیپاراسـتن و ڕێـزی لێـدەگرتن[89]. هێرشـی ئەرمەنـەکان بۆسـەر عەشرەتە کوردەکان (بڕوانە ئەو زانیاریانەی کەوا دێن) بووە هۆی شێواندنی ڕەوشەکە.

بۆ پاراستنی هێمنی و ئاشتی ناو شارەکە لە پەلاماردانی تـر، دەوڵـەت لـە هەرێمـەکانی تـرەوە هێـزی زیـاتری ڕەوانـەی هـەرێمی ڤـان کـرد، (شەمسـی پاشـا)ی فەرمانـدار بـەپاڵ بڵاوکردنـەوەی سـەربازەوە پەناشـی دەبـرد بـۆ

تێگەیاندن و قایلکردنی خەڵکە دڵ گەرمە موسوڵمانەکەی دڵیان پڕبوو لە ڕق و کینە، لەم هێورکردنەوەیەیاندا تا ڕادەیەکی باش سەرکەوتن.[90]

چەتە و ڕێگری ئەرمەن تا ماوەیەکیش لە ناوچەکاندا دەسوڕانەوە و هەڵیان دەکوتایە سەر کوردەکان، بەڵام لە کۆتایی مانگی ئاب /ئاغستۆس ئەم مەترسیە و مەترسی داگیرکاریەك لە ئێرانەوە و کوشت و کوشتاری بەرامبەریش هیچی نەما.[91]

## • پەلامارەکانی سەر سنوور و دژە پەلامارەکانیساڵی ۱۸۹۷

پاش شکستی یاخیبوونەکەی ڤان، ململانێ و پێکدادانی چەکدارانە لەسەر سنووری هەرێمەکە لە نێوان موسوڵمان و ئەرمەنەکاندا بەردەوامبوو، ئەو شۆڕشگێڕە هەڵاتوانەی لە ئێران یەکانگیرببوونەوە و خۆیان کۆکردبۆوە، ژمار و شکستخواردوی دەستی عەشایرە کورەکان بوون. شۆڕشەکە لە ڤان فاشیلبوو، ئەمە ڕاستیەکە بەڵام شۆڕشگێڕان نەخشە و پیلانیان دادەنا بۆ تۆڵە کردنەوە لە کوردەکان.

لە مانگی ئاب / مایۆی ۱۸۹۷ (ج. س. ئیلیوت) کونسوڵی بەریتانیا لە ڤان سەردانێکی ئەو شۆڕشگێڕانەی کرد کە لە (سەلماس) خەریکی خۆ ڕێکخستنەوە بوون، چونکە وەك هەواڵی پێگەیشتبوو گوایە دەیانەوێ پیلان دانێن بۆ پەلاماردانی کوردەکان لە حوزەیران/ یۆنیۆ[92].

لەوانەیە ڕووسەکان لەو پەلامارانەی ساڵی ۱۸۹۷دا بەشداربووبن، بڕوابوونی تەواو بەزانیاریە موخابەراتیەکان مەحاڵبوو، بەڵام وا هاتبوو کە لە نیسان /ئەپرێلی ۱۸۹۷ چەند نامەیەك بەردەست کەوتبوون کە لە تەفلیسییەوە هاتبوون، ئەوەیان ڕادەگەیاند کە ڕووسەکان ئامادەن بۆ دەستەبەرکردنی چەك و پارە و شەڕکەر تا هاریکاری شۆڕشگێڕانی ئەرمەنی پێ بکەن لە ئێرانەوە (ئەگەر وەزعەکە وەك خۆی مایەوە.)[93]

ڕوداوەکانیش نیشارەیان بەوە دەدا کە — بە تایبەت بوونی ئەفسەرانی سوپای ڕووس (لەوانەیە ئەرمەنی ڕووسیایی بووبن) هەروا بوونی چەکی تازەی ڕووسی لەو پەلامارانەی ئەم دواییەی ئەرمەنەکاندا - پارمەتی و کۆمەکی ڕووس شتێکی ڕاستبووبێ.

ئەو شۆڕشگێڕە ئەرمەنانەی لە ڕۆژاوای ئێراندابوون بەردەوام ئەزیەتی ئەو کوردانەیان دەدا کە دانیشتووی ناوچە سنوورویەکانبوون، لەسەرەتای مانگی ئاب / ئاغستۆسی ١٨٩٧ هەوڵی پەلامار و داگیرکردنی خاکی عوسمانیان دەدا، لە ئاڵوگۆڕکردنی نامە و نامەکاری دیپلۆماتکارەکاندا ژمارە و چۆنێتی هێرشەکانیان ڕووننین، بەڵام بێگومان هێرشەکانیان زۆربوون، لە یەك لەو ئۆپەراسۆنانەیاندا هێزێزێکی فارسی نێردرایە ڕۆژاوای ئێران بۆسەر کوردەکانی شوکاك، ئەمە لە تۆڵەی هێرش و پەلاماریاندا، لەمەدا چەند یەکەیەکی شۆڕشگێڕانی ئەرمەن بە ڕەزامەندی ئەفسەرە فارسەکان چووبوونە ناو ئەو هێزەوە.

فارسەکان هیچی وایان بۆ نەکرا بەڵام ئەرمەنەکان توانیان سنوور ببەزێنن و بچنە سەر کوردە شوکاکەکانی بەری عوسمانی، لە یەك لە گوندەکانی سەر سنووردا نزیکەی ٤٠ - ٥٠ کوردیان کوشت، ژمارەیان بە ١٥٠٠ - ١٨٠٠ کەس خەملاندبوون، ٢٠٠ لەوانە ئەسپسواربوون.[٩] واش چاوەروان دەکرا کە هێزێکی دی لە (سارای)یەوە لە سنوور بپەڕێتەوە، بەڵام هەر لە عەینی کاتدا کۆمەڵێکی تریان لەلای شاری (بشکالە)وە پەڕینەوە، ئەمەیان پەلاماری عەشرەتێکیاندا کە بە (شاکیفتی شوکاك) دەناسران، ئەمانە ئەو ئەرمەنانەیان ڕاونابۆوە بۆ ناو ئێران کە ویستبوویان بچن بە دەنگی شۆڕشەکەی ١٨٩٦ەوە لە ڤان[٩٥]. هێزەکە پەلاماری ڕەشماڵەکانی (شێخ قادر)یان داو چوارسەد کەسیان لێ کوشتن (لەناویاندا ژمارەیەکی زۆر ژن و منداڵ کوژران)، ئەمە بەپێی وەسفی کونسوڵی بەریتانیا لە تەورێز:

(( کە لە دۆڵەکە نێزیك بوونەوە، ڕەشماڵەکان لە وێکانێ هەڵدرابوون، بۆ ئەوەی ئەسپەکانیان ببەستنەوە و – قوربانی پیرۆز- یش بخۆن، ماوەیە وچانێکیان دا، ئینجا ڕووەو دەوار و ڕەشماڵی کوردەکان بوونەوە، کە بەپێی کەشەکە هەر دەوارە و لەمسەر و ئەوسەرەوە کرابۆوە، هەر کە ئەو پەڕلەیەی بۆ خۆیان دەستنیشان کردبوو لەگەڵ کازیوەی پێنجی ئاب/ ئاغستۆس ١٨٩٧، سێ جار لەسەر یەك ڕەشماڵەکانیان دایە بەر ڕێژنەی دەستڕێژی گوللەی چەکەکانیان، خۆ کە چەکەکانیشیان دانایە سەر عەرد ئینجا شمشێرەکانیان ڕاکێشا و بەرەو کوردە بێ چەکەکان بوونەوە، دەستیان بە داپاچین و کوشتنی هەر یەکێ دەکرد کە لە ئاست تیغەکانیاندا بووایە، لە پیاو و ژن و منداڵ و هەتا شێخ خۆی و هاوسەرەکەشی کە بە دەستی (دکتۆر ئۆهانیان)ی سەرکردەی پەلاماردەران کوژران.

سەرژمێرەکان ئیشارە دەدەن بەوەی کە لەو هێرشە کتوپڕە ناکاوەدا، لەو کوردانە نێر و مێ ٤٠٠ کەس کوژران، کە دەبێ ئاماژە بەوە بدرێ کە ئەو شەڕکەرە پەلاماردەرانە لەو (ئازایەتیەیاندا) گشتیان گەنجی خوێندەوار و سەر بەخانەوادەی بەناوێ و ناوداربوون، زۆریان خەڵکی تەوریز بوون و هەندێکیشیان خەڵکی ترکیا، جگە لەوەی زۆریشیان ئەرمەنی ڕووسیایی بوون.

لە نێو ئەو گەنجانەی کە لە ڕووسیاوە هاتبوون، هەیانبوو سەرباز بوو لە سوپای ڕووس مۆڵەتی کاتی وەرگرتبوو، هەشبوو هەر لەو سوپایەدا فێراری کردبوو. جگە لەوەی کە گشتیان تازەترین تفەنگ و چەکیان کردبووە شان. ئەمەم لە نامەکانی پێشووتردا باسکردووە، وەك دەریشدەکەوێ ئەمانە دەتوانن چەك و تفاقی تریان لەبەرەکەی ئەوبەری (ئاراس)ەوە- بۆ نموونە ڕووسیا – دیسان چنگکەوێتەوە.))[٩٦]

لەشکری عوسمانی خۆی ئامادەکرد بۆ شەڕکردن بە پاڵ ئەو کوردانەی

بەربەرەکانی ئەو داگیرکارانەیان دەکرد کە زوو بە زوو تووشی شکست هاتن و کشانەوە بۆ ناو وڵاتی فارس، لە شەڕێکدا تەرمی ئەفسەرێکی ڕووسیایی هەر بە جلە ڕەسمیەکانیەوە دۆزرایەوە (لەوانەیە ئەفسەرێکی ئەرمەنی ناو سوپای ڕووسبووبێ)، وە تەرمی چەند سەربازێکی فارسیش کە جێیان هێشتبوون.

فارسەکان لەسەر سنوور هێزیکی گەورەیان گردکردەوە، داوای عوسمانێکانیان ڕەتکردەوە بۆ ڕاگیرکردنی ئەو شۆڕشگێڕە ئەرمەنانەی رایان کردبووە ناو خاکەکەیانەوە.[97]

لەلایەکی ترەوە (شەریف)ی سەرۆکی ئەو عەشرەتەی کە ٤٠٠ کەسیان لێ کۆژرابوو، هێزەکەی کۆکردەوە و پەلاماری ئەو گوندە ئەرمەنیانەی دەدا کە لەودیو ئێران بوون. زیاتر لە ١٥٠ کەسی لێ کوشتن.[98] بەڵام باش نازانرێ کە ئاخۆ گشت ئەو کوژراوانە، ئەرمەن بوون یا کورد، کە لە قەلا و جوتیاری بێتاوانی سەر مەزراکانبوون. چونکە تۆڵە بە دەگمەن لە کەسی تاوانبار کە جینایەتەکەی کردبێ، دکرێتەوە.

## ● پەراوێزەکان

١- فایلی ١٨٤٦/١٩٥ لە گرایفز بۆ کوری، ئەرزرۆم ٣ ئەیار/مایۆ ١٨٩٤

٢- ئەو نمونانە لە ئەنسکلۆپیدیای کۆنسولگەرەکەوە دەربارەی رەوشەکە وەرگیراون، بڕوانە فایلی ١٨٩٢/١٩٥ لە هالوارد بۆ گرایفز، ڤان ١٦ تەمووز/یۆلیۆ ١٨٩٥ وە فایلی ١٨٣/٤٢٤ لە هالوارد بۆ گرایفز، ڤان ٣٠ حوزەیران/ یۆلیۆ ١٨٩٨ باس لە پەژارەی مەسیحیەکان نەکراوە کە زۆریان بە پروپاگەندە دراونەتە قەڵەم، دەشێ بابەتی ڤات و ڤریەکە باشترین دەلیل بێت، چونکە بە کورتی باس لە ئازارەکانیان کراوە و دەردیسەری موسوڵمانەکانیش خراوەتە پشتگوێ یان هەر لە چەند راپۆرتێکی کورتدا

بەسەریدا تێپەڕیون، خۆ برسێتی و ڤات و قڕیەکەش هیچ جیاوازییەکی نەکردووە لەنێو ئایینەکاندا، هەر برسێتی و دەرد نەبوو بەڵکو پەلاماری عەشایرە کوردەکانیش با لەولاوە بوەستێ کە ئەویش پەتایەك بوو بۆ سەر داماو و هەژارەکان.

٣- ڕاپۆرتی ١٨٤/٤٢٤ لە هێربرت بۆ سالزبیری، قوستەنتینیە ١٥ تشرینی دوو/ نۆڤامبر ١٨٩٥.

٤- فایلی ١٣٧٦/١٩٥ لە کلایتن بۆ ترۆتر، ڤان ٢٧ حوزەیران/ یۆلیۆ ١٨٨١

٥- فایلی ١٣١٥/١٩٥ لە کلایتن بۆ ترۆتر، ڤان ٢٤ ئاب/ ئاغستۆس ١٨٨٠، بێگومان ئەرمەن هەر کە لە دوای شەڕەکەی ١٨٧٧-١٨٧٨ بۆیان دەرکەوت رووس دەیەوێت دەستبگرێت بەسەر ڕۆژهەڵاتی عوسمانیدا، خۆیان بەوانەوە گرێدا و دوی کەوتن، لە بەرامبەریشدا، جێی گومان نییە کە (هـ. س. أ. ئایریس)ی کونسۆل لەو نووسینەیدا زیاد ڕۆشتووە کە دەڵێ ئەرمەن لە ڤاندا دوو جۆرن: ئەوانەی لەگەڵ رووسدان و ئەوەنەشی سەربەخۆییان دەوێ (فایلی ١٤٥٠/١٩٥ لە ئایریس بۆ ویندهم، ڤان ٢٥ ئەیلول/ سەپتەمبەر ١٨٨٣، ئایریس زێدەڕۆیی کردووە (بڕوانە پەراوێزی (١١) لە خوارتر)

٦- کونسۆڵ (کلایتن) وای بۆ دەچوو کە سەرەڕای ئەوەی زۆر لە ئەرمەنەکان حەز بە کلکگرێدان ناکەن لەگەڵ رووسدا، کەچی نفوزی رووس لەسەر ئەرمەنەکان لە زیادبووندایە، فایلی ١٣٧٦/١٩٥ لە کلایتن بۆ ترۆتر، ٢٣شوبات/ فەبرایر ١٨٨١

٧- فایلی ١٨٠٤/١٩٥ لە دیڤی بۆ فیتزمۆریس،ڤان ٨ کانونی یەك/ دیسامبر ١٨٩٢

٨- فایلی ٦٤٤٧/٨٨١ لە دەیڤی بۆ فیتزمۆریس،ڤان ٨ کانونی یەك/ دیسامبر ١٨٩٢

٩- فایلی ١٣٧٦/١٩٥ لە کلایتن بۆ ترۆتر، ڤان ٢٧ حوزەیران/ یۆنیۆ ١٨٨١

١٠- فایلی ١٦٨٨/١٩٥ لە دەیڤی بۆ لوید، ڤان ٦ کانونی یەك/ دیسامبر ١٨٨٠

١١-فایلی ١٤٨٨/١٩٥ لە ئایریس بۆ ئیفیریت، ڤان ٢٧ ئەیار/ مایۆ ١٨٨٤، ئایریس سەرنجی دابوو کە دە هەزار کورد ڕاپەریون، بێگومان ئەمەش زێدەڕۆییەکە بۆ خۆی.

١٢- یەك لەو هۆکارە بنەڕەتیانەی کە وای کرد دەوڵەت سنورێك دابنێ بۆ پەلاماردانی حیزبە کوردیەکان، ئەو هەڵە چەسپاوەبوو لە عەقڵی عەشایریدا، چەند سەدەیەکی زۆربوو کە عەشایرەکان حوکمی ڕۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵ و ڕۆژاوای ئێرانیان دەکرد، کە ئەم عەشایرانەش لە ناو خاکی سەڵتەنەکەدا دەستیان دایە پەلاماردان، وەك هەموو جارێ ژماریان بێشومار بوو، ئەم تابوورە ئەسپانە ڕێگەی فرەوان و تەنگەی پان و بۆریان گەرەکە پیا گوزەرکەن، ئەگەر نا دەکرێ بەرامبەرەکەیان ڕێیان لێبگرێ، جا شۆڕشگێڕە ئەرمەنەکان لەبەرامبەر ئەمە هێزەکانیان دابەش کردو بە کۆمەڵ کۆمەڵی بچوك بە دزیەوە بەپێ سنوریان دەبەزاند و دوایی یەکیان دەگرتەوە، زوربەی کەرەت بە پیادەیی دەهاتن بەمەش توانیبویان خۆیان لە دەسەڵات ونکەن و نەبینرێن.

١٣- SAMI ONAL, SADETTIN PASA'NIN ANILARI

(ئەستەموول، ڕەمزی کیتابیڤی ٢٠٠٣) ل ٨٣. ئەمە یادداشتێکە کە (سەعدەدین پاشا) بەدەست نووسیویە و (ئۆنال) گۆڕیویە سەر شێوەی ترکی ئەم سەردەمە.

١٤- فایلی ١٩٥ - ٢١٤٧ لە تیریل بۆ ئۆکۆنر، ڤان ١ یەلوول/ سەپتەمبەر ١٩٠٢. تیریل دەیگوت: هیچ بوونێکی حوکمەتم لەم شوێنەدا هەست پێنەدەکرد.

١٥- دەربارەی بەناو حوکمێکی ئەرمەنی لە ناوچەی (سەلماس)دا، بڕوانە

فایلی ٩٥٤٨/٨٨١ لە دیکسن بۆ لۆزر، ڤان ١٥ حزەیران/ یۆنیۆ ١٩٠٩ پاشکۆی ژمارە (٥)، راپۆرتێ لەبارەی مەسەلەی سنووری نێوان (ورمێ) و (سەلماس)ەوە.

١٦- تەماشایەکی بەشی پێنجەم بکە.

١٧- Dahiliye Nezareti. Sami onal, Sadettin pasanin Antlari p ٢٥,٩٣,٩٧,١٠٥

لە کتێبەکەی حسێن نازم پاشا:
Ermeni olaylari Tarihi
Ankara کە دوو بەرگە:
osmanli arsivi darie Baskanligi ١٩٩٨

ئەمەی دابێ
Ermeni olaylari Tarihi

بەرگی دووەمە: ل ٢٤٥-٤٧. هەروا دیسان بڕوانە ئەو نموونە زۆرانە لە بارەی نامدیوکردنی چەك و تفاقی شەڕ لە فایلی ١٨٦٣/١٩٥ بەپێی سەرچاوە کونسۆلگەریەکان، وادیارە زوربەی کاری قاچاغی چەك بەر لە یاخیبوونی ١٨٩٦ لە باکوورەوە ئەنجام دراون، لە سنووری ڕووس – عوسمانیەوە، لەبەرامبەردا ئەمە تەنیا ئەوانەیە کە پێیان زانراوە، بەڵام زوربەی کاری قاچاغچیەتیەکانی چەك لە ئێرانەوە سەرکەوتووبوون، فایلی ١٨٦٣/١٩٥ لە هولود بۆ کۆمیرباتش، ڤان ١٣ تشرینی دوو/نۆڤامبر ١٨٩٥.

وادیارە سەعدەددین پاشا ڕێگەی ئێرانی بەبایەختر داناوە، Ermeni olaylari Tarihi کۆمەڵە دیکۆمێنتێکی مێژوویی زۆر بە کەڵك و گرنگە کە پشێویەکانی ساڵی ١٨٩٠ ڕوماڵ دەکەن لەگەڵ باسکردنێکی ورد و درێژی ململانێ و ڕێکخستنە شۆڕشگێڕیەکان.

١٨- لە چوار ساڵی ڕابردودا چالاکیەکانی حیزبە شۆڕشگێڕە ئەرمەنەکان

هەروەك هەر چالاکیەکی سەرکوتکردنی گشتی تر کە ئیدارەیەکی گەندەڵ و بێ ئەقڵ فەرمانی پێ دەدا، ئەوەش بەهەر بەهانە و بیانوویەکەوە بووبێ کە کوێرەوەری و پشێوی و نائومێدی بە مروری زەمان لێکەوتۆتەوە. ئەمە وای لەو دانیشتوانە کردووە کە شارستانێتی تربوون و ئەو وەزعەیان پێ قەبووڵ نەکراوە، ناچار وڵات جێهێڵن، ئاقیبەت کاولبوونی هەرێمێك کە ڕەوشێکی باشی هەبوو (فایلی ١٩٧/٤٢٤ لە ود بۆ دوران، گالاسار-سەلاس، ٧ تشرینی دوو/ نۆڤامبر ١٨٩٨.

١٩- بڕوانە بەشی پێنج.

٢٠- ڤایلی ١٣١٥/١٩٥ لە کلایتن بۆ تروتر، ڤان ٢٥ ئەیار /مایۆ ١٨٨٠

٢١- فایلی ١٨٨٧/١٩٥ بروسکەکانی هالوارد لە ١٦ شوبات /فەبرایر ویەکی ئادار/ مارس و ٢٢ تشرینی دوو/ نۆڤامبر جگە لە مێژووی تر لە ١٨٩٥، کونسوڵ هالوارد بەوردی چاودێری نەدەکرد و کەمجار بایەخی دەدا بەو تەنگژانەی ئەرمەنەکان پێوەی دەنان، زۆر جار لەو ڕاپۆرتانەیدا، هەتا یاخیبوونەکەی ١٨٩٦ ئەوەی دووپات دەکردەوە کە لە ڤاندا ئەرمەن یاخی نابن. دیسان بڕوانە فایلی ١٨١/٤٢٤ لە هالوارد بۆ گرایڤز، ٢٢ شوبات/ فەبرایر ١٨٩٥

٢٢- فایلی ١٨٦٢/١٩٥ لە هالوارد بۆ کۆمبرباتش، ڤان ٢ تشرینی یەك /ئەکتۆبەر ١٨٩٥. لەبارەی شەڕی نێوان عەشایرەکانەوە، هەروا بڕوانە پاشکۆکانی فایلی ١٧٢٨/١٩٥ لە هامبسۆن بۆ وایت، ئەرزڕۆم ١٤ ئادار/ مارسی ١٨٩١.

٢٣- فایلی ١٨٨٧/١٩٥ لە هالوارد بۆ گرایڤز، ڤان ١٤ تشرینی دوو/نۆڤامبر ١٨٩٥,

٢٤- فایلی ١٣١٥/١٩٥ لە کلایتن بۆ تروتر، ڤان ١١ شوبات/ فەبرایر ١٨٨٠

٢٥- فایلی ١٦٥٢/١٩٥ لە دیڤی بۆ تشیرمساید کونسوڵی شاهانە لە ئەرزڕۆم،

ڤان ۳۱ تەمموز/ یۆلۆ ۱۸۹٤ سەبارەت بابەتی دەوڵەت و باجگرتن و سەندنی لە نەستووریەکان.

۲٦- فایلی ۱۳۱٥/۱۹٥ لە کلایتن بۆ تروتر، ڤان ۲٥ نەیار/ مایۆ ۱۸۸۰

۲۷- فایلی ۱۸۷/٤۲٤ لە ویلیامز بۆ کوری ، ڤان ۱ نیسان /نەپریل ۱۸۹٦ راپۆرتی دەوڵەتی عوسمانی لە فایلی ۱۸۷/٤۲٤ لە هەربرت بۆ سالزبیری، ۲ حوزەیران /یۆنیۆ ۱۸۹٦

۲۸- فایلی ۱۳۱٥/۱۹٥ لە کلایتن بۆ تروتر، ڤان ۷ تشرینی دوو/ نۆڤامبر ۱۸۷۹

۲۹- فایلی ۱۸٤/٤۲٤ لە کومبرباتش بۆ کوری، ئەرزرۆم ۱۳ کانوونی دوو/ دیسامبر ۱۸۹٥

۳۰- فایلی ۱۳۱٥/۱۹٥ لە کلایتن بۆ تروتر، ڤان ۲٤ ئاب /ئاغستۆس ۱۸۸۰

۳۱- فایلی ۱۷۲۸/۱۹٥ لە دیڤی بۆ هامسن، ڤان ۱۳ کانوونی دوو/ یەنایر ۱۸۹۱

۳۲- باشرین وەسفێ بۆ مێژووی حەمیدییە دەتوانرێ لە کتێبەکەی (بیرم کودامان)دا ببینرێ، بەناوی:

Hamidiye Hafif suvqri Alaylar: H. Abdulhamid ve Dogu- Anadolu Asiretleri. Tarih Dergisi 32. 1979 pp 427- 80

هەروا بڕوانە کتێبەکەی (جانیت کلاین):

Power in the periphery : The Hamidiye Light Cavalry and the Struggle over ottoman Kurdistan

کە نامەیەکی دکتۆرایە لە زانکۆی (برینستن) ۲۰۰۱

۳۳- چاودێرێکی بیانی بەلای کەمەوە وای بۆ دەچوو کە فیرقەی حەمیدییە سەرکەوتن بەدەست دەهێنێ، بەڵام هەر پاش دامەزراندنی بە ماوەیەکی کەم (فایلی ٦٤٤٧/۸۸۱ لە فۆرد بۆ روزبیری، ڤوستەنتەنیە ۲۸ تشرینی یەك/ ئەکتۆبەر ۱۸۹۳) یادداشتی کۆلۆنێل (تشورمساید)ی، نووسی.

٣٤- هەر بۆ نموونە بڕوانە:(ا. رۆلنسن) سەرگێشیەکان لە رۆژەلاتی نیزیک، لەندەن: میلروز ١٩٢٤ ل ١٨٠-٢١٠.

لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا کە ئەرمەنەکان یاخی و تەوەللا بوون، عەشایرە کوردەکان هەندێ لە موسوڵمانانی شاری ڤانیان پاراست و داڵدەیان دان (بڕوانە: کۆتایی لە ڤان - لەبەشی هەشتیدا) لە ساڵی ١٩٠٩دا فیرقەی حەمیدییە هەڵوەشایە و لە هەرێمەکەدا گرا بە بەتالیۆن لە خەڵکی هەرێمەکان نەك لە عەشایرەکان، بەلام دەبێ نیشارە بەوەش بدرێ کە یەکە چەکدارە کوردەکان لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا ڕاستەوخۆ لە فیرقەی حەمیدییەوە بوون.

٣٥- فایلی ٢١٤٧/١٩٥ لە تیریل بۆ ئۆکۆنر، ڤان ٨ نیسان/ ئەپریل ١٩٠٣

٣٦- زۆرێك لە بەرپرسانی عوسمانی بەتەواوی لە پرۆژەی حەمیدییە ڕازی نەبوون، چونکە خۆیان بە سەربازی نەدارا و هەژار دادەنا، جا بۆیە بەشداربوونە سەربازیەکەیان بیانوو نەبوو بۆ ئەو کێشانەی دەیاننایەوە، بەهاتنی ساڵی ١٨٩٩ هەتا سوڵتانیش کە پاڵپشتی یەکەمی فیرقەی حەمیدییە بوو، لە کاریگەرێتیان کەوتە گومانەوە، هەرچەندە هیچ ڕێوشوێنێکی دەربارەیان نەگرتە بەر بۆ هەڵوەشاندنەوەیان، (فایلی ١٩٨/٤٢٤ لە بلاك بۆ ئۆکۆنر، قوستەنتەنیە ١ ئەیار /مایۆ ١٨٩٩

٣٧- کونسوڵ (تیریل) دەڵێ: ترکەکان دەڵێن گوایە بەبێ هیچ دوو دڵیەك حەمیدییە فیرقەیەکی غەیرە نیزامییە (فایلی ٢١٤٧/١٩٥ لە تیریل بۆ کۆنر، ڤان ٢٤ کانوونی یەك /دیسامبر ١٩٠٣ وە بڕوانە فایلی ٢١٤٧ لە تیریل بۆ ئۆکۆنر ، ڤان ٢ نیسان/ ئەپریل ١٩٠٣)

٣٨- مێژووی هێزەکانی یاخیبووە ئەرمەنەمەکان. ل٢١-٢٢

٣٩- هەر ئەو سەرچاوەیە. ل٢٥

٤٠- ئەم ئیمارەتە دوایی خرایە سەر (ڕۆمیلیای رۆژەلات) و بەمە

مەملەکەتی بولگاری پێکهات، بڕوانە: عومەر توران، کەمایەتی ترکی لە بولگاریا ١٨٧٨-١٩٠٨ ئەنکەرە
Turk Tarih Kurumu 1998. pp 15-78
ماکارسی (مردن و دورخستنەوە) ل٥٩ - ١٠٨، بولگاریەکان خەسڵەتێکیان هەبوو کە ئەرمەنی رۆژەلاتی ئەنەدۆڵ نەیانبوو: ئەوان بە رێژەیەکی زۆر ژمارەیان گەلێ زیاتر بوو لە ژمارەی دانیشتوانی ولاتەکە. (توران. ل ٧٩ - ١١٨) وە (ماکارسی. ل ٨٩ - ١٠٨، ٩٠، ٢٤١ - ٤٢) کە هەردووکیان سەرژمێرێکی تا رادەیە جیاوازی دانیشتوانەکە دەدەن بەدەستەوە.

٤١. بڕوانە کتێبەکەی (ئەناهید تیرمیناسیان):
Nationalism and socialism in the armanenian Revolutionary Movement
کە (ا.م. بیریت) وەری گێڕاوە (کامبریدج، ماشاتسوستس، پەیمانگەی زوریان ١٩٨٤، ل ١٧ - ١٩) وە (ویلیام لانگر: دیپلۆماتی لە ئیمپریالیەتدا، نیویۆرك- خانەی کنویف ١٩٦٠، ل١٥٧ - ٥٨)

٤٢- فایلی ١٧٢٩/١٩٥ لە دیفی بۆ هامبسن، ڤان ٢٠ تەمموز/ یۆلیۆ ١٨٩١

٤٤- فایلی ١٨٤/٤٢٤ لە کۆمبرباتش بۆ کوری، ئەرزڕۆم ١٩ تشرینی یەك/ ئەکتۆبەر ١٨٩٥

٤٥- فایلی ١٨٣/٤٢٤ لە کوری بۆ سالزبیری، قوستەنتەنیە ١٨ تەمموز/یۆلیۆ ١٨٩٥:
Mehmed Hocaoglu, Arsiv vesikalariyla Tarihte Ermeni Mezalemi ve Eermeniler (Ankara: Anda 1976) pp 313-36
کە نووسینی سەعدەددین پاشا دەهێنێتەوە لەسەر هەندێ لە پەلامارە سەرەتاییەکان لە ڤان و لادیکاندا، لە تۆمارە عوسمانیەکانەوە، بۆ ئەگبەنی بە دیکۆمێنتکردنەکانی (هۆکا ویگلۆ) مەبەست نادەن بەدەستەوە و سەرچاوەی ئارشیفی تەواو ناگرێتەوە، بەڵام وادیارە وەرگرتنەکانی جێی متمانەن.

٤٦- فايلى ١٨٦/٤٢ لە ويليامز بۆ كورى، ڤان ٢٦ كانوونى دوو/ يەناير ١٨٩٦ ناهەنگى بەرجەستەكردنى خواوەند لە شەشى كانوونى دوو/يەناير گێڕرا، بە پێى ساڵنامەى يۆليانى.

٤٧- بڕوانە فايلى ١٨٤/٤٢٤ لە كۆمبرباتش بۆ كورى، ئەرزڕۆم ٢١ تشرينى يەك/ ئەكتۆبەر ١٨٩٥، وە فايلى ١٨١/٤٢٤ لە كورى بۆ كيمبرلى، قوستەنتەنيە ١٥ كانوونى دوو/ يەناير ١٨٩٥

٤٨- فايلى ١٨٤/٤٢٤ لە كورى بۆ سالزبيرى، ئيرابيا ٢ تشرينى يەك/ ئەكتۆبەر ١٨٩٥ كەلە كتێبەكەى (موعەممەر ديميريل)ە وەرگيراوە:

(Ermeniler Hakkinda Ingiliz Belgeleri (1896-1918

وە بەڵگەنامە بەريتانێكان سەبارەت بە ئەرمەن:

Ankara : yeni Turkiye, 2002) pp 173-74)

٤٩- فايلى ١٨٣/٤٢٤ لەهالوارد بۆ گرايفز، ڤان ٤ حوزەيران/ يۆنيۆ ١٨٩٥ كە گەلێ زانيارى واتێدا دەربارەى ئامديوكردنى چەك و شەڕوانان، بۆيە ناكرێ هەر هەمووى لێرەدا ريزكەين ، لەيەك لەو حاڵانەى كە جێى سەرنجە: ٢٠٠ شەڕوان دەيانويست سنوور ببڕن و بێنە ناو خاكى عوسمانيەوە، تووشيان بوو بە كەتيبەيەكى رووسياوە ويستيان رێگريان لێ بكەن بەلام گورج خۆيان پێناساندن و ئيتر بە رێى خۆيانەوە رۆيشتن (فايلى ٢١٠/٤٢٤ لە ئۆكۆنر بۆ گراى، قوستەنتەنيە ٢٩ ئەيار / مايۆ ١٩٠٦

٥٠- فايلى ١٨٤/٤٢٤ لە كورى بۆ سالزبيرى، قوستەنتەنيە ٩ تشرينى يەك/ ئۆكتۆبەر ١٨٩٥

٥١- فايلى ١٨٨٧/١٩٥ بروسكەى هالوارد بۆ كورى ٢٥ تەمموز/ يۆليۆ ١٨٨٧

٥٢- فايلى ١٨٣/٤٢٤ لە وەزارەتى ناوخۆوە بۆ وەزارەتى دەرەوە، لەندەن ٦ تەمموز/ يۆليۆ ١٨٩٥. پۆليسى (سكۆتلانديارد) بۆى دەركەوتووە كە (ئۆهاد جيان) لەكاتى مانەوەيدا لە لەندەن لە گن (ئەفيديس نازار بكيان) كە

نووســەر بــووە لــە ڕۆژنامــەی (هانشــاك-HANTCHAK) پێکــەوە نیشتەجێبوون.

٥٣- ئاستی دەست تێکەڵکردنی ڕووسەکان بە چالاکیە شۆڕشگێڕیەکانەوە ڕوون نییە، بەڵام گومانی تێدانییە کە لە ساڵی ١٨٨٠وە لە ڤاندا پارمەتی یاخیبووانی دەدا، کونسوڵی ڕووس لەو سەردەمەدا کە ڕائید (کامسارا غان) بوو وە بە ئەسڵ ئەرمەن بوو، پاڵپشتێکی بەهێزی شۆڕشگێڕان بوو، زانیاری دەدانێ و ڕێوشوێنی تاکتیکی سەربازی فێردەکردن، جا ڕێی تێناچێ کە ئەم کابرایە هەر لە خۆیەوە ئەمانەی کردبێ بەبێ ڕەزامەندی دەوڵەتەکەی (فایلی ١٠٧/٤٢٤ لە کاریتن بۆ تروتر، ڤان ١٢ تشرینی یەك/ ئەکتۆبەر ١٨٨٠. وە فایلی ١٢٢/٤٢٤ لە گوشن بۆ گرانفل، قوستەنتەنیە ١٧ ئادار / مارس ١٨٨١

٥٤- وەك لــە کتێبەکــەی موعەممــەر دیمیریلــەوە وەرگــیراوە. ل١٢٥، کتێبەکەی پەراوێزی ژمارە (٤٨)

٥٥- (مایۆسکای، ڤان، پەتلیس) Vilayetleri Askeri Istatistigi چاپخانەی سەربازی ١٣٢٠ ئەستەموول. ل ١٨٩ - ٩٠

٥٦- بەریتانیای مەزن، پەرلەمان، ترکیا ژمارە ٨ (١٨٩٦، ژمارە ١١٧ پاشکۆی یەك ولە کتێبەکەی (کاموران گورون)ەوە وەرگیراوە، فایلی ئەرمەن (لەندەن: ڕۆستەم و ویدنفالدر وە نیکلس ١٩٨٥ ل١٥٥).

٥٧- بــۆ دەستخســتنی زانیــاری لــەبارەی پلانــە ئــەوروپایی و گیروگرفتەکانــەوە دەکرێ بڕوانیتــە کتێبەکــەی (لانگــر): دیپلۆماتیکردن لــە ئیمپرالیەتــدا، ل ١٩٦ - ٢١٠، لانگــر جێــی متمانــە نیــە، مەگــەر تــەنیا لــە گێڕانەوەی ڕوداوە گەورەکانی ژیانی دیپلۆماتی ئەوروپاییدا کە ئەویش بە کــورتی بەلایانــدا تێدەپــەڕی. لەســاڵی ١٩٢٥ کتێبەکــەی بڵاوکرایــەوە، لــە چــاپخانەی تریشــدا کــەمجار دەســتکاری کــراوە. تۆمــارە ئەرشــیفیە پەیوەندیــدارەکانی بــۆ بەدەســت نــەهاتووە، ئەمــەش بــەڕوونی لــەو

رۆمالكردنەيدا ديارە كە بۆ مێژووى سەڵتەنەى عوسمانى ئەنجامى داوە.

٥٨- لەكاتێكى پێشوترى ساڵى ١٨٩٤ (ئەرسيبالد برايمروز) و(لۆرد روزبيرى) پێشنيارى ئەوميان كرد كە رێ بە رووسەكان بدرێ رۆژهەڵاتى ئەنەدۆڵ داگيركەن.

٥٩- پەيمانە سێ تەرەفيەكەى ئاڵمان و نەمسا - مەجەر و ئيتاڵيا.

٦٠- لەگەڵ دەستپێكى ياخيبوونەكەدا جێگرى فەرماندار دەستبەكاربوو، (ويليامز) دەڵێ: دانانەكەى لەلايەن مەسيح و موسوڵمانەكانەوە بە هێند وەرنەگيرا (فايلى ٤٢٤/١٨٨، ڤان ٧ حوزەيران/ يۆنيۆ ١٨٩٦).

٦١- فايلى ٤٢٤ - ١٨٦ لە ويليامز بۆ كورى، ڤان ٤ ئادار /مارس ١٨٩٦

٦٢- فايلى ٤٢٤/١٨٧ لە ويليامز بۆ كورى، ڤان ٣٠ نيسان/ ئەپريل ١٨٩٦

٦٣- فايلى ٤٢٤/١٨٧ لە ويليامز بۆ كورى، ڤان ١ نيسان /ئەپريل ١٨٩٦ راپۆرتى دەوڵەتى عوسمانى لە فايلى ٤٢٤/١٨٧ لە هيربرت بۆ سالزبيرى ٣ حوزەيران/ يۆنيۆ ١٨٩٦

٦٤- پەراوێزى ژمارە (٦١)

٦٥- هەر هەمان پەراوێز، سوڵتان عەبدولحەميدى دووەم ستەمكار بوو، ليژنەى عوسمانى نارد تالە ئاژاوەكانى زيتونو ساسون بكۆڵنەوە. بۆ زياتر لەبارەى ئەو گۆرانى و هەڵبەستە شۆرشگێرپە ئەرمەنيانەوە بروانە كتێبەكەى (حسێن نازم پاشا) Ermeni olaylari Tarihi لە بەرگى دوو، ل ٢٦٦ - ٦٧، ٢٨٥ - ٩٩

٦٦- فايلى ٤٢٤/٢١٠ لە گيرى بۆ ئۆكۆنر، پەتليس ٢٦ كانوونى يەك / ديسامبر ١٩٠٥ لە تەمموز/ يۆليۆ ١٨٩٥دا باڵيۆزى بەريتانيا (فيليپ كورى) وەزارەتى دەرەوەى ولاتەكەى ئاگادار كردەوە كە لە سەرچاوەى باوەرپێكراوەوە زانيويە كە ليژنە ئەرمەنيەكان (سوورن لەسەر ئانەوەى كوشتارێكى دى)، فايلى ٤٢٤/١٨٢ لە كورى بۆ سالزبيرى، قوستەنتينيە ١٨

تەموز/یۆلیۆ ١٨٩٥

٦٧- فایلی ١٨٢/٤٢٤ لە کیمبرلی بۆ دوران، وەزارەتی دەرەوە، ١٨ نیسان/ئەپریل ١٨٩٥

٦٨- Van Valisi Nazim Pasa'nin Mufettis Sakir Pasa'ya Kasim ١٣١٦, In Hocaoglu, Arsiv vesikalariyla, P ٣٣١

٦٩- Asbakanlik osmanli Arsivi, Hariciye Arsivi, Hazine-١ Evrak, Klasor ٣١٣ dosiya ٦٩

٧٠- ترکیا ژمارە ٨(١٨٠٩) ژمارە ٢٣٧ هاوپێچ (١)، لە کتێبی (گورون)ەوە وەرگیراوە، بە ناوی (فایلی ئەرمەن) ل ١٥٥ - ١٥٦ (ئارشیفی سەرۆکی وەزیرانی عوسمانی، ئارشیفی وەزارەتی دەرەوە)

Hazine-1 Evrak, Klasor 313 dosiya 69

ناونیشانی ئەلکترۆنی تایبەت بە ئارشیفی سەڵتەنەی عوسمانی:

www.devletarsivleri.gov.tr/yayin/osmanli/rehberosm/ 0002-2-blgestan.htm. van vilayeti Aliyyesinden Varid olup Dahiliya Nazarati Celilesinden ba Tazkire71- Gonderilen Haziran Sene 1312.

بەرگی دوو، ل٢٤٤، وەسفەکەی سەعدەدین پاشا و بەرپرسانیدی باشترین وەسفێکن بۆ یاخیبوونەکەی ساڵی ١٨٩٦، بڕوانە کتێبەکەی (سامی ئونال):

Sadettin pasanin Anilari & Ferik Sa`adetlu Kilinan Layihanin Suretidir in Ermeni olaylari Tarihi

بەرگی دوو ، ل ٢٥٩-٧٠ ، هەروا بڕوانە کتێبی:

Hocaoglu, Arsivi Vesikalariyla. Pp 338- 45

٧٢- دەشێ (ڕینۆلدز)بێت نەك (ڕینۆلت)

٧٣- کتێبەکەی (نیسات نورات):
The Armenian History and the Armenian Question
ئەستەمول، بلاوکراوە دیکۆمێنتیەکان ١٩٨٨ ل ٧٥٧، ئەوانەی ویستیان بەرگری لە ژن و منالەکانیان بکەن نیشتیمان پەروەر نەبوون، بەڵکو تەنیا یاخیبوویەکی ڕوتبوون، بەڵگەی زۆرم پێیە کە موسوڵمانە بێ وەییە بێ چەکەکان هەر ئەمەندە توخنیان بکەوتنایە خوێنساردانە دەیانکوشتن.
(ترکیا، ژمارە ١٨٩٦/٦ لە ویلیامز بۆ هێربرت، ڤان ٢٨ حوزەیران/ یۆنیۆ ١٨٩٦ کە لە کتێبی (صەلاحی صونیان)ەوە وەرگیراوە: The ottoman Armineans لەندەن: رستەم ١٩٨٧ ل ٢٠٧

٧٤- Dahiliya Nazareti celilesinden Varid olan ٥, yuz Doksan sekiz ٧٤Tarih Ve Iki. ١٣١٢Haziran sene Numarali Tezkirenin suretidir, In Ermeni Olaylari Tarihi
بەرگی دوو، ل ٢٤٥ - ٤٧

٧٥- Akcora, Van ve cevresinde Ermeni Isyanlari. ١١٢P

٧٦- فایلی ١٨٧/٤٢٤ لە هێربرت بۆ سالزبیری، قوستەنتەنیە ٢١ حوزەیران/ یۆنیۆ ١٨٩٦ (ژمارە ٢٢٥: - ٢٢٦). بۆ نەگبەتی (مایکل. هـ. هێربرت) جێبەجێ کاری کاروباری بەریتانیا بە تەواوی لە کاروباری سەڵتەنەکە و وەزعی ڤان ئەوەندە ئەشارەزا بوو هەرێی لە بڕی نەدەکردەوە، پشتی بەسەرچاوەی تایبەت دەبەست لە ئەستەموول، لەباتی ئەوەی کە پشت بە کونسوڵی وڵاتەکەی ببەستێ لە ڤان. کەمێك نەبێ پشتگیری هەوڵەکانی ویلیامزی کونسوڵی نەدەکرد بۆ هێنانە دی سولحێك. خۆ لەسەرەتاشدا هەر نەیدەهێشت هیچ دەورێ لەم بارەیەوە ببینێ. لە ١٩ حوزەیران/ یۆنیۆ هێربرت بروسکەیەکی بۆ لەندەن نارد کە گوایە (بابی عالی) داوای

ناوبژیوانی کردووە، وەك ئەوەی ناو فایلی ١٨٧/٢٤٢ لە هیربرت بۆ سالزبیری، قوستەنتەنیە ١٩ حوزەیران/یۆنیۆ ١٨٩٦. ژمارە ٢١٧، ٢١٨، ٢٢٢

بەمە هیربرت سەلماندی کە فری بەسەر ڕەوشی ڤانەوە نییە، لەو بروسکەیەیدا باس لەو مەترسیە دەکات کە وا لە ڤاندا، بەشێکی کەمیشی دەخاتە پاڵ ئەوەی – وەك لەسەرچاوە تایبەتیەکانەوە بیستبووی - کە عەشایرە کوردەکان توانیویانە سەعدەددین پاشا بە ٥٠٠ لیرە بکڕن!

دوای سێ ڕۆژ ئەرمەنەکان شاریان چۆڵکرد و یاخیبوونەکە کۆتایی هات (فایلی ١٨٧/٤٢٤ لە هیربرت بۆ سالزبیری، قوستەنتەنیە ٢٢ حوزەیران/ یۆنیۆ ١٨٩٦).

٧٧- فایلی ٦٩٥٨/٨٨١ لە ویلیامز بۆ کوری ، ڤان ١٤ ئادار /مارس ١٨٩٦، ویلیامز دەیگوت: ڕاپۆرتەکەی کونسوڵی گشتی (سیسیل وود) سەبارەت بە شینی بەریتانیایی کە تەرخانە بە ئاژاوە و پشێویەکان، لە زۆر لایەنیەوە پڕە لە هەڵە.

٧٨- لە بەشەکەی (گاردن)ی شاری ڤان، گەڕەکی ئەرمەنەکان پڕبوو لە نەفەق و کون لە دیوارەکاندا، بەمانە خانودکانی ئەو گەڕەکە پەرژین کرابوون، ئەم ڕێڕەوە ژێر زەمینیانە و دیواو دیوی دیواری بەینی ماڵەکان وایان کردبوو کە ساڵانی ١٨٩٦ - ١٩٠٨ هەڵاتنی یاخیبوودکان ئاسانتر بێ. بڕوانە فایلی ٢١٤٧/١٩٥ لە تیریل بۆ ئوکونر، ڤان ٣١ کانوونی دوو/ یەنایری ١٩٠٣

٧٩- هەرچەندە سەرانی یاخیبوونەکە دەستگیرکران، بەڵام کۆمەڵ و گروپی بچووك بچووکیان توانیان سنووربەزێنن و بگەنە ڤان. (فایلی ١٩٥/٤٢٤ لە ئەلیوت بۆ کوری، ڤان ١٠ کانوونی دوو/ یەنایر ١٨٩٨

ئیتر ئەوەی تر کە لەم ڕاپۆرتەدا هاتووە تەنیا پڕو پاگەندە و دەنگودویەکی ڕوتە، لەوە دەچێ کە گروپی بچووك بچووکیان لەسنوور

پەرينەوە.

٨٠- (گـــورون) فـــايلى ئەرمـــەن ل ٥٦-١٥٥، وە (صـــەلاحى صـــونيال) هەردووكيان لە يەك سەرچاوەوە قسە لەسەركردنەكانى (سەعدەددين پاشا) و كونسۆل (ويليامز) دەگوێزنەوە:

BOA Hazine-I Evrak, carton 313

بەلگەنامـەى ژمـارە ٦٩،٩ ئـاب /ئاغسـتۆس ١٩٨٦ وە تـركيـا ژمـارە ٨، ١٨٩٦ ژمارە ٣٣٧ هاوپێچى (١)

٨١- هەر بۆ نموونە بڕوانە ئەم تۆمارانە لە كتێبى:

Ermeni olaylari Tarihi بەرگى دووەم

٨٢- Akcora, Van ve cevresinde Ermeni Isyanlari. P ٢٢-١١٥

٨٣- ليژنەى ڕێپێدراوە ئامريكاييـەكان (١٦،١٠،١) ئارشـيڤى قوسـتەنتەنيە، هەردوو بەرگى (٦،٥) ئـەو بەلگەنامانـەى دەربـارەى ئـازادى ئـاينى و ڕەوشـى ئەرمەنەكانن.

٨٤- وە بڕوانە ڤايلى ١٨٧/٤٢٤ لە ويليـامز بـۆ كـورى، ڤـان ١١ ئـادار /مـارس ١٨٩٦

٨٥- ڤايلى ٦٩٥٩/٨٨١ لە ئـەليوت بـۆ كـورى، ڤـان ٢ تشـرينى دوو/ نۆڤـامبر ١٨٩٧

٨٦- ڤايلى ١٨٧/٤٢٤ لە هيربرت بۆ سالزبيرى، قوستەنتـەنيـە ٢٤ حوزەيران/ يۆنيـۆ ١٨٩٦، ئـەو ياخيبووانـەى لـە ڤانـەوە هـەلاتبوون، ويليـامز واى دابوونـە قەلەم كە گشتيان لـە شـەڕەكانيانـدا لەگـەل سـەربازە عوسمـانى و سـوارەكانى حەميديـيـەدا كـوژراون، بـەلام بـۆ ئـەم قسـەيەى تـەنيا يـەك بەلگـەى نەهێناودتـەوە، ڤـايلى ٦٩٥٧/٨٨١ لـە ويليـامز بـۆ كـورى، ڤـان ١٥ ئـەيلوول/ سەپتامبر ١٨٩٦.

کتێبی: The history of the ARF. Pp ٢٥-٢٧ئیشارە بەوە دەدات کە هەزار جەنگاوەر لەسەر سنووری ئێران تیاچوون، بەڵام بەبێ ئەوەی یەك بەڵگە بۆ ڕاستی قسەکەی بدات بەدەستەوە، دیارە ئەم خەملاندنەش تا ئەوپەڕی پێوەی نراوە.

٨٧- فایلی ٦٩٥٧/٨٨١ لە ویلیامز بۆ کوری، ڤان ١٥ ئەیلوول/سەمتامبر ١٨٩٦، ویلیامز وای دانەوە گوایە ٥٠٠ ئەرمەن بە دەستی کوردەکان سەربڕراون، بەبێ پیشاندانی هیچ سەرچاوەیە کە ئەم ژمارەیە پشتڕاستبکاتەوە، جیا بەراورد لەگەڵ خەملاندنە هاوشێوەکانی تردا، دەردەکەوێ کە ئەم بۆچوونانە زیادەڕۆیی فرەیان ها پێوە، لەگەڵ ئەوەی ژمارەی مردووەکان بێگومان زۆربوون.

٨٨- فایلی ٦٩٥٧/٨٨١ لە ویلیامز بۆ کوری ، ڤان ١١ تشرینی دوو/ نۆڤامبر ١٨٩٦

٨٩- هەر ئەو فایلە ... ١٥ ئەیلوول /سەپتامبری ١٨٩٦

٩٠- هەر ئەو فایلە لە ئەلیوت بۆ کوری، ڤان ١١ ئاب/ ئاغستۆس ١٨٩٧

٩١- هەر ئەو فایلە ... ٢٤ ئاب /ئاغستۆس ١٨٩٧ ، وە لە ویلیامز بۆ کوری، ڤان ٦ تشرینی یەك / ئۆکتۆبەر ,١٨٩٦

٩٢- فایلی ١٩١/٤٢٤ لە کوری بۆ سالزبیری، قوستەنتەنیە ٢ حوزەیران / یۆنیۆ ١٨٩٧

٩٣- هەر ئەو فایلە. لە ویلیامز بۆ کوری، ڤان ٥ نیسان/ئەپریل ١٨٩٧

٩٤- فایلی ٦٩٥٩/٨٨١ بروسکەیە لە (ئەلیوت)دوە لە ڤان بۆ (کوری و سالزبیری) قوستەنتەنیە ٨ ئاب / ئاغستۆس ١٨٩٧، هەر ئەو فایلە لە کوری بۆ سالزبیری، قوستەنتەنیە ١٨ ئاب/ ئاغستۆس ١٨٩٧ وە ئەو بروسکەیە کە نێردراوە ژمارەی کەمتر دەگرێتەوە، تەموموز بەسەر ڕەوشەکەوەیە، دەشێ ئەلیوت باسی لە شەڕ و شۆڕی تر کردبێ پێشتر زانیاری وا گەیشتۆتە

بەریتانیێکان ئەوە دەگەیەنن پەلامارەکە لە ئان وساتدایە (فایلی ٦٩٥٨/٨٨١ لە کوری بۆ سالزبیری، قوستەنتەنیە ٢ حوزەیران / یۆنیۆ ١٨٩٧

٩٥- کارمەنـدانی ڕاگەیانـدنی ئێرانـی ئیشـارە بـەوە دەدەن کـە ئـەو عەشـیرەیە هەشـت سـەد ئەرمـەنیان کوشـتووە، لەوانـەی هەڵاتبوونـە نـاو ئێرانـەوە، بـەڵام دیـارە ڕاپۆرتەکـەیان بـەپێی ئـەو دەنگۆیانـە بـووە و قـەتا و قەت جێی متمانەپێکردن نییە (فایلی ١٨٨/٤٢٤ لە وودز بۆ دوران، تـەوریز ١٦ تەموز/ یۆلیۆ ١٨٩٦)

٩٦- فایلی ٦٩٥٩/٨٨١ لە وود بـۆ هـاردنگ، تـەوریز ١٥ ئاب/ئاغستۆس ١٨٩٧ (وود) لەبارەی دووبەرەکی ئەرمەنەکانەوە لەناو هەردوو ڕێکخراوی (هانشاك و تاشناق)دا دەنووسێ، ئەو سەرنجانەشی لەبەری ئێرانی سەرسنوورەوە داوە، کونسوڵی ڤانیش لەمبەری عوسمانیەوە پشتگیری لـەم زانیاریانـەوە کـردووە ( فایلی ٦٩٥٩/٨٨١ لە ئەلیوت بۆ کوری، ڤان ١١ ئاب /ئاغستۆس ١٨٩٧) لیژنـەیـەکی لێکۆڵینەوەی عوسمانیش دیسان هەر پشتگیری لەو زانیاریانە کـردووە ( هـەر ئـەو فایلـە: لـە کـوری بـۆ سـالزبیری، قوستـەنتـەنیە ٢٣ ئـەیلوول/ سـەپتامبەر ١٨٩٧)وە بڕوانـە The history of the ARF. P ٤٩ کـە ئـەوە دەسـەلمێنێ یەکە ئەرمەنیەکە بریتیبووە لە ٢٥٣ پیاو، لەوانە بیستیان کوژراون.

٩٧- هـەر فـایلی پێشـوو لـە کـوری بـۆ سـالزبیری، قوستـەنتـەنیە ١٠ ئـاب/ ئاغستۆس ١٨٩٧، عوسمانیێکان ناڕەزاییەکی توندیان ئاڕاستەی دەوڵەتی فـارس کرد، کە پەیمان و گفتی دابوو بەوەی لێپرسینەوە لـەو ئەفسەرانە دەکات و سنوورێکیش بـۆ شۆڕشگێرانی ئەرمـەن دادەنـێ، بـەڵام هـیچ بەڵگەیـەك بـۆ کردنی ئەمانە نییە، تەنیا دەستگیرکردنی حەوت کەس لەوانە (هـەمان فایـل لە هاردنگ بـۆ سالزبیری، گالهیـك ١٧ ئـاب/ ئاغستـۆس ١٨٩٧) دیسان ( هـەمان فایل لە وود بۆ هاردنگ، تەوریز ٢٦ ئاب/ ئاغستۆس ١٨٩٧) وە بۆ دەستخستنی ڕاوبۆچوونی عوسمانیێکان بڕوانە گشتاندنەکەی بابی عـالی کـەوا لـەو فایلـەدا

لە کوری بۆ سالزبیری، قوستەنتەنیە ١٦ ئاب/ ئاغستۆس ١٨٩٧.

٩٨- فایلی ٤٢٤- ١٩٦ لە ئەلیوت بۆ کوری، تەورێز ٥ ئەیار/مایۆ ١٨٩٨.

# بەشی پێنجەم
# گۆڕان و پەرەسەندنی شۆڕشەکە
# ١٨٩٧ - ١٩٠٨

لەسەروبەندی یاخیبوونەکەی ١٨٩٦ (بەحری پاشا)ی حاکمی شاری ڤان داوای خەرجیەکی زۆر و چاکسازی ڕاستەقینەی لە حوکمەتی ناوەندی کرد، داوای پاردیەکی ئەوتۆی دەکرد کە هەرێمەکە بتوانێ لەسەر بناغەیەکی دارایی باش خۆی بگرێ، بەپێی پلانەکەی، دەبوو فیرقەی سوارەی حەمیدییە کە لە شۆڕشەکەی ١٨٩٦دا نێردرابۆوە ڤان بەشێوەیەکی هەمیشەیی لەوێ جێگیربێ، حاکم خۆی (بەحری پاشا) سەرکردەیی سەربازەکان بکات. دەشبوو دەستیش بەسەر فیرقەی حەمیدییەشدا بگرێ، بۆیە دەبوو بخرایە ژێر سەرکردەییەکی مەدەنییەوە و مەگەر لەکاتی شەڕدا کە بانگ و ئامادەدەکران.[1]

لە مەرکەز دەوڵەت ڕێگەی دا بە بەحری پاشا کە ژمارەیە لەسوارە لەلای خۆی گلداتەوە، بەڵام داواکاریەکانی تری... هیچ، ژمارەیکی کەم نەبێ لە سەرباز کە بۆ هەرێمی ڤان دانران و پارەیەکی تریش ئیتر ناوبێنە و دەستبشۆ. چونکە سەڵتەنەکە لە ١٨٩٦ - ٩٧ەوە لە دورگەی (کریت) سەرقاڵی بەگژاچوونەوەی شۆڕشێکبوو، لە ١٨٩٧یش دژ بە یۆنان لەشەڕدابوو، وەك هەمیشەش دەبووایە ئاگایان لە سنوریش بێ لەگەڵ ڕووسیادا و بیپارێزن.

لەقەسر و دەربارى سوڵتاندا، سوارەی حەمیدییە پاڵپشتێکی چاکی لەلایەن دەسترۆیشتوانی ئەوێکانێوە هەبوو، هەروا لە سوپاشەوە کە

سەربەخۆییەکەی دەپاراست، ئەو سیاسەیەی کە سەڵتەنەکە بە درێژایی سەدان ساڵ پەیڕەوی دەکرد گۆڕینی هەروا ئاسان نەبوو، سیاسەیەك کە لە هەرێمەکەدا دەستەڵاتی دابەشکردبوو لەنێوان سوپا و مەدەنییەکاندا. جا بۆیە لە مانگی ئایار /مایۆی ۱۸۹۷دا (شەمسەددین بەگ) لە جێی (بەحری پاشا) کرا بە حاکمی ڤان و ئەویان ناردەوە بۆ ماڵ.

ئەمەی تریش هێشتا بە ڕێگەوە بوو بۆ سەر کارەکەی کە دەوڵەت ئاگاداری کردەوە بەوەی کە ئەو پشتگیرییە زەروورییەی کە داوای دەکات و سوورە لەسەری بەو شێوەیە دەست نادات و نابێ، ئیتر ئەویش سووك و باریك دەستی لەکار کێشایەوە.[٢]

بەپاڵ ئەمانەشەوە، بە داهاتنی ساڵی ۱۹۰۰ ڕەوشەکان لە هەرێمەکە باشبوون، ئەم باشبوونە بە جۆرێ دەدرایە پاڵ کارەکانی دەوڵەت، هەرچی چەندە ژمارەی ئەو سەربازانەی کە سەرباری ئەوانەی هەبوون نێردران بۆ ڤان دیاریکراو بوون، بەڵام بەشی ئەوەی دەکرد کە نەهێڵن عەشایر پەلاماری دانیشتووانەکان بدەن، بەتایبەت لە ناوچەکانی دەوروبەری شاری ڤان. بەشێکی زۆری ئەو ئاژەڵ و ماڵاتانەی لە گوند نشینیەکان زەوتکرابوون، توانرا بۆیان وەگێڕنەوە.[٣]

سەربازەکان دەنێررانە ئەو شوێنە تازانەی کە نێزیك بە دەوارو ڕەشماڵی هەندێ لەو عەشایرانەی ناو و ناوبانگیان زڕا بوو، وەك عەشرەتی (حەیدەرانلی) کە سەرکردەکەیان (حسێن) ناوێك بوو لە (باتنووس). جا بەپێی ئەو کەشوهەوا خۆشە وا چاوەڕوان دەکرا کە بەروبووم و حاسڵات ڕوو لە باشی بکات، بەڵام لە ڤان خۆیدا بەهۆی ئەو هەڵاوسانەی نرخی نان لای خەڵکەکە کەمێ نارەحەتی هەبوو،[٤] وەك چاوەڕوان دەکرا ڕەوشی ئابووری باش هاتبووە دەست.

لە چوارچێوەی چاکسازیە ئیداریەکانیشدا، هەندێ بەرەوپێشەوە چوون

هاتبووە دی، پارمەتیدەرێکی ئەرمەن بۆ فەرماندار دانرا، پلەکەی لەژوور گشت پلەکانی وەزیفەوەبوو جگە لە پلەی فەرماندار، هەوڵێکیش درا بۆ ئەوەی ئەرمەنەکانیش بهێنرێنە ریزەوە و بکرێن بە پۆلیس، بەلام ئەمە سەرەتا سەری نەگرت چونکە ئەرمەنەکان نەدەچوونە کارێکەوە تا گورج و بێ دواکەوتن کرێ و مووچەی خۆیان مسۆگەر نەکەن. وەك ئەوەی کە دەوڵەت لەگەڵ موسوڵمانەکانی دەکرد. بەلام بۆ ساڵی ۱۹۰۳ هەندیکیان بوونە پۆلیس[٥].

لە ئەستەمووڵەوە پشکنەرە قەزاییەکان هاتن و هەندێ ئاڵوگۆڕ و چاکسازیان لە سیستمی قەزایی و دادوەری و بەندیخانەکاندا کرد، قانوونێکی بەدناوی چاکسازی سەبارەت بە لێبوردن لە یاخیبووە تاوانبارەکانەوە دەرچوو[٦]. حوکمەتەکەی ڤان درێغی نەدەکرد لەوەی کە ئازار و مەینەتیەکانی پاش شۆڕشەکە لەسەر خەڵکەکە کەم بکاتەوە، بۆیە لادێکان لە باجدان عەفووکران بە مەرجێ ئاژەڵ و مالات وەك قەرەبوویەك بدەن بەوانەی زەرەرمەندبوون لەو ئاژاوە و پشێویانە.

ئەو ئاژەڵ و مالاتانەش هەر ئەو مەڕ و مانگایانە بوون کە کاتیخۆی عەشایرەکان دزیبوویان، بەلام زیاتر مەیلیان بەلای ئەوەدا دەچوو کە لە باتی بەخشین بەفایدەیەکی زیاتر بەکرێ بیاندەنێ. دەوڵەت نەیدەتوانی بەتەواوی جڵەوی عەشایرەکان بگرێ، بۆیە پلانەکە تەنیا لە لادێ نێزیکەکانی شار و سەربازگەکاننەبێ سەرکەوتنی بە خۆوە نەدی، ئەو لادێیانە ۲۵۲ سەر وڵاخیان لەو ئاژەلانەی کە حوکمەت لە ئێرانەوە هاوردبوونی بەرکەوت، جگە لە تۆو و گا بۆ جووتکردن، بەلام پارە ئەوەندە لەدەستدا نەبوو تا بیاندرێتێ بۆ خزمەتی زیاتر[٧].

سەرەڕای ئەوەی کە ئەو بەرپرسانەی دەوڵەت ناردبوونیە ڤان هەموویان هەر بەتوانا و دەستپاك نەبوون، کەچی بیانیەکان بە باڵای دەستەلاتدارانی

شارەکەیاندا هەڵدەدا، بەتایبەت (تایەر پاشا) کە ١٨٩٨ - ١٩٠٦ فەرمانداری شارەکە بوو، ددانیان بەوددا دەنا کە حاکمەکان ناچاربوون کە مامەڵە لە تەك باروزروفێکدا بکەن کە هێجگار دژوارو سەخت بووە. سیاسە، بەتایبەت ململانێی نێوان مەدەنیەکان و باڵە جیا جیا چەکدارەکانی دەوڵەت، هۆکاری ئەو ڕا و بۆچوونە جیاوازانە بوو لەناو دەوڵەتدا.[٨] دەشبێ گیروگرفتی سەرەکی و بنەڕەت لە کەمی سەرچاوەی دارایدا بووبێ، داهاتی ئەو هەرێمانەی دەوڵەمەندتر بوون بۆ خەرجی بەرگری و کارەکانی دەوڵەت لە مەرکەز سەرف دەکران، ئەمەش تا ڕادەیە بەشی دەکرد.

لەبەر ئەمە وا چاوەڕان دەکرا کە داهاتی هەرێمی ڤان هەر لە خۆیدا خەرج بکرێتەوە و خۆبژێوی خۆی دابینکات، بەڵام ئەم توانایەی نەبوو، فەرمانداری هەرێمەکە لە ساڵی ١٩٠٧ ڕای گەیاند کە داهاتی باج لە ڤان بەشێوەیەکی سەرەتایی گەیشتۆتە ١٠٥٠٠٠ هەزار لیرە، ئەمە لە کاتێکدابوو کە خەرجکردنەکانیان ١١٥٠٠٠ هەزار لیرە بووە، کە دەبێ ئەستەموولْ ١٠٠٠٠ هەزار لیرەمان بداتێ، بەڵام ئەم بڕە قەتاو قەت نەگەیشت.

دەشکرا ئەم کورتهێنان (عەجز)ەی کە بە بڕی ١٠٠٠٠ هەزار لیرەیە چارەکرایە، بەڵام داهاتەکانی باج سەندن زۆر لەو بڕەی چاوەڕوان دەکرا کەمتر بوون؛ ٦٠٠٠٠ هەزار لیرە بە باج وەرگیراوە لە باتی ١٠٥٠٠٠ هەزار لیرە.[٩]

فەرماندار تەنیا باس لە ساڵی ١٩٠٦ دەکات، ئەمە ڕاستە، بەڵام ئەم دیاردەیە هەموو ساڵێك دووبارە دەبۆوە، کێشەکە ئاڵۆز و دژوار بوو؛ سەرەڕای ئەوەی سەرباز پێویستبوو بۆ کاری باجگریەکە، خۆ ئەوانیش مووچەی خۆیان دەویست، جا لەبری دامەزراندنی سەربازی تازە، دەوڵەت هەتا نەیدەتوانی مانگانەی ئەوانەش بدات کە لە کاردابوون و باجگرییان دەکرد.

لە ساڵی ١٨٩٧دا کونسوڵ ویلیامز دەنووسێ: (بەهۆی بێپارەییەوە ئیدارەکە بەتەواوی ئیفلیج بووە، هەتا گەورەترین بەرپرسێکیان وا بۆ

هەشت مانگ دەچێ مووچەکەی وەرنەگرتووە، من سەرم سوڕماوە و حەپەساوم لە ئاست ئەو سەبرو ئارامە گەورەیەی کە ئەفسەر و سەربازەکان هەیانە لەم ڕەوشەی وا لەناواندا).[١٠] بەڵام لە واقیعدا سەربازەکانیش هەمیشە دەسەوسان نەبوون، لەساڵی ١٩٠٤ لە ڤان کەوتنە نانەوەی ئاژاوە و هەرا، چونکە نەپارە و نەخواردنیان شك نەدەبرد و لەبرساندا دەیاننالاند.[١١]

گیروگرفتی باجگری و کۆکردنەوەی باجەکان هاوکاتبوو لەتەك سەختی ژیان لە دەوربەرێکی دژواری وەك ڤاندا، باج و سەرانە بە پلەی یەکەم لە فەلا و شوان و گاوان و ئاژەڵدارەکان دەسەنرا، هەرئەوانیشبوون زوربەی جار ڤاتوقڕی و گرانی قوڕقوڕاگەی دەگرتن و دەیتاساندن، مەسیحی و موسوڵمانان وەك یەك دادوبێدادیانبوو بەدەست باجدان و سەرانە سەندنەوە لێیان، هەرچێکیان هەبوو بۆ بژێوی ژیان لێیان دەسەندرا، ئەمە شەگوای حەڵی گشت خەڵکانێکبوو، ئەم واقیعەش تا ئەوپەڕی هەقیقە بوو.[١٢]

هەندێ چاکسازی کە لەم بوارەدا دەکرا تا ڕادەیە سەرکەوتوو بوو، وەك ناردنی باجگری بەکرێگیراو لەلایەن دەوڵەتەوە، بەیاوەری هەندێ سەرباز. ئەمە لەجیاتی ئەوەی سەرۆکە کوردەکان بکەنە وەکیل و باجەکانیان بۆ کۆبکەنەوە، بەڵام ئەم شێوازەش لە گردکردنەوەی برە پارەی زۆردا فەشەلی هاورد، چونکە میللەتەکە هێجگار نەبووە و داماوبوو[١٣].

ویلیامزی کونسۆڵ لە ڤان وای ڕادەگەیاند کە: (لە ساڵی ١٨٩٧ فەرماندار ویستی کەمێ لەمەینەتیەکانی ئەرمەنەکان کەمبکاتەوە - دیارە لە گوندی موسوڵمانەکانیشدا، بەڵام ویلیامز باسی ناکات - ئەوانەی دووچاری ڤاتوقڕی و برسێتی ببووەنەوە) دیارە ئیشاردش بەو ناڕەحەتیانەش دەدات کە لە دەوروبەرێکی ئەوتۆدا بوو کە هەتا بەرپرسانیش لە مووچەکانیان مەحروم بوون و دەوڵەت نیمچە نابوتێك بوو. خۆ ئەگەر باجەکانیان کۆنەکردایەتەوە ئەوانیش بەدەست برسێتیەوە حەلوەلایانبوو.

(( والی فەرمانی قەدەغەكردنی باج سەندنی بۆ ئەو خێزانانە دەركرد كە تەنیا چوار بەش زەوی - گەنمەشامی - یان هەیە بۆ هەریەكێكیان، وەیان هەر ئەوەندەیان پارە هەیە كە بەشی كڕینی دانەوێڵە بكات، كەچی كەس گوێی بەو فەرمانە نەدەدا، چونكە ئەفسەر و بەرپرسەكانیش دیسان لە ئەبوونیەكی گوشندەدابوون، سەیریش نییە كە ئەمانە هەڵپەی ماشینەوەی هەرشتێكیانبێ كە دەستیان بیگاتێ، ئەمە سروشتی بەشەرە...كە ئەم جۆرە فەرمانانەش سەریان نەگرت، والی لەسەر داوای من هەردوو قەزای - هیجیش (سبك) و شاتاخ (جاتاك) - و حەوت گوندی تری لە گشت جۆرە باجێك بوارد و هەتا كاتی درونەی دابێ عەفووی كردن))[٧]

بەڵەییش (ئەو بڕە پارەیەی كە ناموسوڵمانەكان دەیاندا لەبری خزمەتی سەربازی لە لەشكردا) لە ڤان و بەتلیس بۆ ماوەی دوو ساڵ لەغوكراو هەڵگیرا، بەهۆی نەبوونی و دەستكورتی ئەرمەنەكان، دیارە ئەمەش تەقەللایەكبوو پاش شۆڕشەكانی ئەم دواییە بۆ گێڕانەوەی وەلا و ملكەچبوونی ئەرمەن بەلای دەوڵەتدا.[٨]

بارو ڕەوشی ئابووری بەهۆی نەبوونی سەرچاوەیەك بۆ داهاتێكی ئاسایی ڕۆژ بە ڕۆژ لە خراپبووندابوو، بەڵام سەبارەت بە پێویستی بڵاوكردنەوەی ژمارەیەكی زیاتری سەرباز لە هەرێمەكەدا بۆ بەرەنگاربوونەوەی پەلاماری كوردەكان، ویلیامزی كونسوڵ ئیشارە بەوە دەدا كە دەوڵەت لە ڤان پارەیەكی ئەوەندەی لەدەستدا نەبوو كە بتوانێت مووچەی ئەو سەربازانە بدات، دەیگوت: ( ئەم مەسەلەی پارەیە ڕۆژ بە ڕۆژ مەترسیدارتر دەبێ، پارە لە ڤاندا نییە و ئەگەری پەیداكردن و دەستخستنیشی نییە، لابردنی بەڵەد* شتێكی باشە بەڵام دەوایە لە عەینی

---

* ئەم وشەی (بدل)ە عارەبیە كورد كردویە بە (بەڵەد) كە (د)ی دوایی وشەكە كەمێ ئەرمەترە و لەم پیتە عارەبیانەی پێی دەنووسین نیشانەی نیە . (وەرگێڕ)

کاتدا بڕە پارەیەکی بەرامبەر ئەمە لە مەرکەزەوە بنێردرایە [16]. کونسوڵ ئەو سەرچاوەیەی دەستنیشان نەکردووە کە دەبێ حوکمەتی مەرکەزی ئەو پارەیەی لێوە پەیداکا و بینێرێ.

## • عەشایرە کوردەکان

وەك هەمیشە، عەشایرە کوردەکان لاوازی دەوڵەتیان بە هەل زانی و قۆستیانەوە، لە هەرێمی پەتلیس کەوتنە پەلاماردانی یەکتر و کوشت و کوشتار لە یەکتر، هێرشیان دەکردە سەر پۆلیس و ڕان و ڕەوگی گوندە موسوڵمان و مەسیحیەکان [17].

لە باشووری هەرێمی ڤان و باکووری هەرێمی (مووسڵ) گوندی کورد و نەستووریەکانیان داگیرکرد، دانیشتوەکانیان دەکوشتن و بەبێ جیاوازی سووکایەتیان پێ دەکردن [18]. شێخ (محەممەد سادق) کە شێخێکی بە دەستەڵاتی شەمدینانبوو، بۆ ئەوەی هەندێ لە ئەفرادی ئەو عەشایرانە بخاتە ژێر ڕکێفیەوە، پەنای بۆ زەبر دەبرد، هەتا هێرشێکیشی کردە سەر عەشرەتی (بارزان) کە سەرکردەیەکی ئایینی بە ویقار ڕابەرایەتی دەکردن [19].

بەڵام لە باکووری دەریاچەی ڤان و باکووری ڕۆژاوای، ئەو ئەرمەنانەی ڕایان کردبووە ڕووسیا و دیسان گەڕابوونەوە، ببوونە نێچیری دەستی عەشرەتی حەیدەرانلی [20]. زۆر کەرەت ئەم عەشایرانە سنووری نێوان ئێران و عوسمانیان بەکاردەهێنا بۆ داگیرکردنێك ئینجا هەڵدەهاتن بۆ ئەولایەکەی دی. دەستەڵاتی دەوڵەتی فارسیش لە هەرێمە ڕۆژاوایەکانی تەنیا بەسەر شارە گەورەکاندا بوو و هەر لەو شوێنانە دەستی دەڕۆی.

لە ساڵی ۱۹۰۰ نێزیکەی ۷۰۰ کەس لە حەیدەرانلیەکان بەسەرکردەیی

سەرۆکێکی حەیدەرانلی فارسی * بەناوی (تایەر خان)، ویستی نیزیك شاری (سارای) لەلای سنوورەوە پەلاماری عوسمانییەکان بدات بەڵام زوربەیان چوونەوە بەودیودا، سەربازە ماندوە عوسمانێکان بە دوویاندا سنوریان بەزاند، دەوڵەتی فارس ئەم سنوور بەزاندنەی سەربازەکانی پرۆتیستۆکرد، بەڵام لەبەرامبەر کوردەکان ئەو سەربازانەش هیچیان پێ نەکرا[٣١].

ئەگەر ئەم عەشایرە کوردانە بەرووی دەوڵەتدا یەکیان بگرتبا، ژمارەی چەکدارەکانیان لە هەر هێزێکی دەوڵەت زۆر زیاتر دەبوو، بەڵام لە کۆتایی سەدەی نۆزدەدا یەکبوونی ئەو عەشایرانە وا دیاربوو شتێکی مەحاڵبێ. لەبری ئەمە عەشرەتەکان زیاتر پەرتوبڵاو دەبوون، عەشرەتی وا هەبوو کە ململانێ و پێکادانە ناوخۆییەکانی خۆیان لەسەر سەرکردەیی و کورسی رابەریکردن، نەیدەهێشت بپەرژێنە سەر پەلاماردانی عەشرەتێکی تر[٣٢]. جا ئاژاوە و پەرتەوازەیی رۆژ بە رۆژ لەناو ئەو عەشایرە کوردانەدا پەرەی دەسەند، بەجۆرێ کە ئەو سیستمی عەشایرە کۆنەی کە: عەشرەتێکی گەورە سەرۆکایەتی هەموانی دەکرد، روخا و باوی نەما، بەتایبەت لە ناوچەکانی باشووری رۆژهەڵات، بەردەوام ئەوانە لە یەکدی دادەبران و یەکیەتیەکەیان لەناودا دەپچرا، عەشرەتە بچووکەکان لەوانەی سەروتر لە خۆیان دادەبران، هەندێکیان بۆ ماوەیەکی کاتی کەمێ نفوز و دەستەڵاتی پەیدا دەکردەوە هەندێك بچووکتر لە خۆی لێی گرددەبوونەوە، بەڵام بە مردنی سەرۆکە رەشید و بەتواناکەیان ویان کە لە شەرێکدا دەشکان، ئیتر لێك دەترازان و سەر لەنوێ لەیەك جوێ دەبوونەوە. بۆیە بەردەوام شەڕ و هەرتەنەی ناو ئەم گروپە وردانە لە ئارادا بوو[٣٣].

ئەمەش ئەوەی دەگەیاند کە عەشایرەکان نەببوونە مەترسیەکی بەرفراوان بۆ سەر دەوڵەت. ململانێ و دووژمانایەتیە عەشایرەیەکان

---

* کورد بن و لە عەشرەتی (حەیدەرانلی)بن، ئیتر چۆن فارس دەبن؟! ((وەرگێر))

مەترسی زیاتری بۆ ئاشتەوایی نێوان خەڵکەکە هەبوو، حوکمەتیش بەبێ وەستان تەقەللای ئەوەی دەدا کە ئەو ئاژاوە و گێرەشێوێنانە ڕاگری، ئەمەش زۆر گەرمەت شەڕی گەورەی لێ دەکەوتەوە، عوسمانێکان لە ناوچەی (سیرت) زنجیرەیە لەم شەڕانەیان بوو بە تووشەوە، بەڵام ئەم کوردە بەرپرسانە لەو پەلامارانە بۆسەر گوندنشینەکان، توانیان لەبەرامبەر سەربازەکانداخۆڕاگرن، هەتا ئەو کاتەی سوپا تۆپخانەی پەیداکرد و کەوتە دەستی، بۆ تۆپبارانکردنی ئەو گوندانەی لەوەپێش بە ئاسانی بۆی نەدەگیران[٢٤].

لەئاخر و ئۆخری نەوەدەکانی سەدەی نۆزدەدا، حوکمەت دەستی کردە چەسپاندنی ئاسایشی هەرێمی ڤان کە ئەنجامی جیاواز بەڵام بەسوودی هەبوو، لە مەترسی عەشایرەکان سەربازیان دەنارد بۆ پاراستنی گوندەکان[٢٥]، لە باشووری هەرێمەکە عوسمانێکان بەرەنگاری پەلاماردانی عەشایرەکان بوونەوە، ئەویش بە ڕەوانەکردنی سەربازی نیزامی بۆ (هەکاری، سانکاك) تا نەستووریەکان بپارێزن، بەم جۆرە تا ڕادەیەکی باش توانیان ئاسوودەیی لە ناوچەکەدا بپارێزن و سەرکەوتووتووشبن. هەر ئەبێ لەو سەردەمەدا[٢٦]. سەربازەکان بەرەو ڕووی کوردەکانی وڵاتی فارس دەبوونەوە[٢٧]. هەتا کار گەیشتە ئەوەی کە پەنا ببەنە بەر تۆپبارانکردنی ئەو گوندە سەختە عەشایرانەی شوێنەکانیان دژوار و عاسی بوو لەناو شاخەکاندا [٢٨].

لەساڵی ١٩٠٠ لە نێزیك (بشکالە)ی ناوچەی (ئەلباك)وە لە ئەنجامی شەڕێکی خوێناویدا دەوڵەت سەرکەوتنێکی چاکی بەدەستهێنا، بەتایبەت کە سەربازە نیزامیەکان توانیان (شەریف) کە سەرۆکی عەشرەتی (شیکیفتی) بوو دەستگیرکەن، ئەم عەشرەتە سەر بە شوکاك بوون، ببووە خۆرە بۆ دەوڵەت و ئەرمەنەکان [٢٩]. بەڵام دواجار بەهۆی ئەو پەیوەندیەی کە بە حەمیدییەکانیەوە هەیبوو، بەرەڵڵا کرا، کەچی زۆری نەخایاند دەستی

دایەوە پەلامار و ڕێگری لەو کاروانانەی بەرەو ئێران دەچوون.[٣٠]

لە کۆتایی نەوەدەکانی سەدەی نۆزدە سەرهەڵدانی تەنگژەیەکی گەورە بووە هۆی شێواندنی ئاسوودەیی لە هەریمەکەدا هەتا جەنگی یەکەمی جیهانی، ئەو گوند و خانووانەی ئەرمەنەکان لە ئاژاوەکانی ١٨٩٤ - ٩٦ جێیان هێشتبوو کوردەکان دەستیان بەسەردا گرتبوو، بەو بیانووەی کەتا ڕادەیەکیش ڕاستیان دەکرد و لەسەر هەقبوون: ئەوانەی هەڵاتوون یاخیبوون وە دەبێ موڵك و ماڵیان دەستیان بەسەردا بگیرێ. حاکمی ڤان هەندێ لەو گوندە داگیرکراوانەی گەڕاندەوە بۆ خاوەنەکانی پێشوویان، بەلام هەتا دوای ساڵی ١٩٠٨ ئەوەندە ئەنجامی باشی نەبوو[٣١].

لە ساڵی ١٨٩٨ حوکمەت هەر بۆ سەلماندنی دەستەڵاتی خۆی بەسەریاندا، دەستی کرد بە باج سەندن لە عەشایرە کوردەکان. ئەنجامەکانی ئەم کارەشی جیاواز بوون، لە جێیە باجەکان دەسەنرا و سەرکەوتوو بوو، لە جێی تر نەدەدرا و فاشیلبوو[٣٢]. هەندێ لەو عەشایرانە بە ئاشکرا و بێ ڕووپامالی لە قانوون هەڵدەگەڕانەوە. لە ئاب /ئاغستوسی ١٨٩٧ کوردەکانی (مودیکی) لە هەرێمی پەتلیس قایمقامی شاردەکەیان کوشت، ئەمەش هەر بەهۆی باج سەندنەوە، پاشان بەهاوکاری چەند کەسانێك لە عەشایر کەوتنە کوشتنی پێنج ئەفسەر و سێ ڕەقیب و پانزە سەربازی ئەو یەکە سەربازیەی کە نێردرابوون بۆ سزادانی ئەو تاوانبارانە، بەمە توانیان گشت یەکە سەربازیەکە پەرتەوازە بکەن، حوکمەتیش هەتا هێزێك و دوو تۆپی شاخاوی نەنارده سەریان، نەیتوانی یاخیبوونەکەیان دامرکێنێتەوە[٣٣].

لەساڵی ١٩٠٧ لە پەتلیس گوندە کوردە چەکدارەکان باجدانیان ڕەتکردەوە و ئەو سەربازانەی بۆ ئەو کارە نێردرابوون دەریانکردن. لە نەوەندەکانی سەدەی نۆزدە (شێخ سادق) لە دەڤەری (شەمدینان) سیاسەی یاخیبوونێکی بەردەوامی پیادە دەکرد، هەتا لە ساڵی ١٩٠٧دا مرد، (شێخ

تـەها)ی کـوڕی جێـی گرتـەوە ئـەویش هەرهـەمان سیاسـەی بـاوکی پیـادە دەکردەوە[35]. کاتیخۆی لەساڵی ١٩٠٠ شێخ سادق هـەوڵی تیرۆرکردنـی قایمقـامی شـەمدینانی دا، هەرچـەندە قایمقـام تـوانی ڕزگـار بـبێ لەدەسـت بکوژەکـانی بەتەنیا گوللەیەك بە شانیەوە بـۆی دەرچـوو، دیسان حوکمـەت ناچاربوو لـە شوێنەکەی خۆی داینێتەوە[36].

عوسمانێکـان ناچـاربوون کـە بـە پـارێزەوە خـۆ لـە (شـێخ سـادق) و هاوشـێوەکانی لـەو سـەرۆك عەشـرەتانە نێزیـك بکەنـەوە و فـەرمیان کـەون، سەرەڕای ئەوەش کە ببوونە هۆی گیروگرفتێکـی زۆر بـەڵام وەك دەردەکـەوت لە کاتی جەنگدا خزمەتە سەربازیەکەیان شتێکی زەرووری و پێویستبوو بـۆ دەوڵەت.

(دیکسن)ی کونسوڵ لەبارەی شێخ سادقەوە دەنووسێ:

(( ... ناوبراو شێخ سادقی شەمدینان کە لە دەیـەم ڕاپۆرتمـدا، لـە یـەکی کانوونی یەك/ دیسامبری ١٩٠٦ بـۆم باس کـردون، لـە ئاینـدەدا دەبێتـە هـۆی کێشە و سەرێشە، (بـابی عـالی) بروسـکەیەکی بـۆ والـی نـاردووە تیایـدا داوای زانیاری لە بـارەی ئـەم پیـاوەوە دەکـات، دەپرسـێ هـۆی چیبووە کـە هـەردوو کونسوڵی ڕووسـیا لـە (ورمـێ و ڤـان) چوونەتە سـەردانی، مـن گەیشـتومەتە ئەوەی کە لەتەك کونسوڵی ڕووسیا لە ورمـێ پلانـی ئـەوە دادەنـێن کـە داوای پاراستن و پارمەتی بکا و پەیمانیشی داوە کـە پارەکـانی لـە بـانکیکی ڕووسـیا دانـێ، بـەو هیوایـەی کـە ڕووسـەکان هاوکـاری بکـەن لـە سـەندنەوەی ئـەو زەویانەی کە وان لە ولاتی فارسدا و لەلایـەن (شـێخ عوبەیـدوڵڵا )ی باوکیـەوە دەستیان بەسەردا گیراوە.

دەکرێ والی داوای لێ بکات کە بێتە شاری ڤان، دوریش نییـە کـە دوایـی پەنابەرێتە بەر کونسوڵگەری ڕووسیا لە ورمێ. ئیستە ئەو وا لەسەر سنووری فـارس نـەك لـە بارەگـە ئاسایيەکەی خـۆی لـە (نـیری) هـەروەك جـەنابتان

سەرنجتان داوە، ئەم لەپێناو حوکمەتی ترکدا خیانەتی لە باوکی و براگەورەکەی خۆی کردووە، بەمەش لە عورق باوك و فرزەنی چۆتە دەر، دزێکی فێڵباز و تەماعکارە، هیچ ڕەوشتێکی باشی تیا نابینرێ، هەرچەندە لە لای ئەو نێوەندانەی کە نەیاندیوە و دورن لێیەوە ناو وناوبانگێکی شێخایەتی هەیە، بەڵام گەلەکەی خۆی زۆر رقیان لێیەتی، دورخستنەوەی سوودێکی زۆری بۆ گشت وڵات تێدایە، دەبێ بگوترێ کە حوکمەتی ترکیشی خۆشناوێ.[٣٩]))

## ● نەستووریەکان

لە ئاژاوەگێڕی و پشێویەکاندا نەستووریەکان بەشداربوون، دەستە و تاقمی چەتە و جەردەی نەستووری وەك کوردەکان ئەوانیش لەناوچەکەدا ئاسایشیان تێکدابوو، جڵەویان لەدەست سەرکردەکانیاندا نەمابوو، لە بنەماڵە نەستووریەکان چەند تیپێکی جیاجیا لەسەر دەستەڵات شەڕیان بوو، زۆریشیان لە ڕووسیاوە پاڵپشتی دەکران و بگرە چەکیشیان بۆ دەنێررا.

ئەمانە پەلاماری گوند و ئاواییەکانی کوردەکانیان دەدا و ئەوانیش لە بەرامبەردا بەهەمان دەستوور[٤٠] . جا هەردوو لا وایان دادەنا کە پەلامارەکەیان لە تۆڵەی پەلاماری ئەوی تردایە، شتێکی سەیریش بەلای ئەم نەستووریانەوە ئەوەبوو کە لەگەڵ لایەن و کۆمەڵی کوردی تردا دەستیان لەناو دەست دەنا دژ بە کوردانی دی[٤١]. لە هەندێ شەڕ و کێشەدا هەردوولا لە یەك کاتدا هەریەك لە کورد و ونەستووریشیان تێدابوو[٤٢].

لەوەشدەچێ کە قورسترین شەڕێك لەنێوان کورد و نەستووریەکاندا ئەوەی (شیکیفتی) شوکاکەکان بووبێ کە شێخ سادق سەرکردەیی شەڕەکەی دەکرد. پیاوەکانی شێخ لە ساڵی ١٨٩٧ کاهینێکی نەستووریان کوشت، ئەمەش ڕووداوێکی دەگمەن بوو چونکە گشت تەرەق مامەڵەی پیاوانی ئایینیان

بەڕێز و حورمەتەوە دەکرد"[٤٣].

نەستووریەکان لەگەڵ عەشرەتە کوردەکاندا کە زوربەی وەخت دۆستی یەکدی بوون، دەکەوتنە هاوپەیمانیەوە، یان لەتەك ئەوانەی دوژمنایەتیەکی تایبەتیان لەگەڵ شێخ سادقدا هەبوو، یەك لەم جۆرە عەشرەتانە سەرۆکی ئوسقوفە نەستووریەکانی شاری (شەمدینان)یان لە کوشتن ڕزگار کردبوو کە شێخ سادق هەوڵی کوشتنی دابوو[٤٤]. نەستووریەکان هاوکاری عەشایرە کوردەکانیشیان دەکرد لە شەڕەکانیاندا دژ بە سوپای عوسمانی[٤٥].

لە ساڵەکانی ١٩٠٢ و ١٩٠٧ نیمچە شەڕێك لەنێوان نەستووریەکان و (تیاری) و هەندێ عەشرەتی کوردا هەڵگیرسا، ئەوەش بەهۆی پەلاماری یەك لەو دوو لایەنە بۆ تاڵانکردنی مەڕو ماڵاتی لایەنەکەی دی، لایەنی ئەولا بۆ تۆڵە سەندنەوە هەمان شتی دەکرد، لە ساڵی ١٩٠٢ فەرماندار هەوڵی بەرپاکردنی ئاشتی لەناوچەکەدا دەدا، بار و زرووف ئەوروپا ڕێی ئەوەیان پێ نەدەدا کە سزای مەسیحییە نەستووریەکان بدات، بەڵام چەند سەرۆکێکی لە کوردەکان بەند کرد، ئەوەندەش سەربازی بەدەستەوە نەبوو کە بتوانێ شەڕی نێوانیان ڕاگرێ. بەڵام بە ڕێی دیپلۆماتی و دانووسانەوە توانی لە یەکیان نێزیك بخاتەوە و تا ماوەیە ئەو ناکۆکیەی نێوانیان نەهێڵێ.

بە پەنا ئەمەشەوە لە ساڵی ١٩٠٧ فەرماندارمکە بۆ ڕونەدانی شەڕ سوپای بڵاوکردەوە، نەستووریەکان سەربازەکانیان ڕاونا و دەستیا گرت بەسەر چەکەکانیاندا[٤٦]. لەملاتر کۆششی ئەو سەربازانەی نێررابوون بۆ شەڕ لەگەڵ کوردەکاندا ئەنجامی باشی هەبوو"[٤٧].

جارێکی دی ئاشتی بەرپابۆوە، حاکمی ڤان چەندەها جار ویستی ئەم دوو لایە کۆکاتەوە و (کۆنگرەی ئاشتی) ببەستێ بەڵام هەوڵ و تەقەللاکانی بەبا چوو.[٤٨]

نەستووریەکان هەرچی چەندە خەڵکانێکی شاخاوی و سافیلکە بوون،

بەڵام ئەوەیان سەلماند کە دەتوانن سیاسەی ئەوروپا بۆ باری مەسئەلەحەتی خۆیان و پاڵپشتیان بڕەخسێنن، وەك یەك بێ جیاوازی پێشوازیان لە دیپلۆماتکار و جاسووسە ئەوروپایی و ڕووسەکان دەکرد، پەیمان و بەڵێنی وایشیان گرێ دەدا کە هەرگیز نەدەهاتە دی.

ئەمانە پەیتا پەیتا داوایشیان لێ دەکرا کە بێنە سەر مەزهەبی ئەرسەدۆکسی ڕۆژهەڵاتی (ڕووسیایی)، زۆر جار ئەمە ڕوویدەدا و هەتا هەندێکیان ناچار دەگران چەند جارێك لەم مەزهەب بچنە سەر ئەویدی و دوایی بگەڕێنەوە و... تا بەم جۆرە[٤٩]. بەریتانێکان بەتایبەت لەم مەزهەب گۆڕکێیە دەترسان، هەر وەك ئەو ڕێنماییانەی لە سەرۆکی نوسقوفە نێردراوەکانی (کانتربێری) تایبەت بە نەستووریەکانەوە بۆ کونسوڵەکان دەهات، کەوایان بە باشتر دەزانی ئەم نەستووریانە جارێ هەروا لەسەر مەزەبەکەی خۆیان بمێننەوە تا ئەو کاتە گونجاوەی بۆ خۆیان دێنە سەر مەزهەبی پرۆتەستانتی.

بەریتانێکان کاری مەزهەب و مەزهەب گۆڕکێیان دەبەستەوە بە چەسپاندنی دەستەڵاتە ئەوروپایەکانی دی لەناوچەکەدا، ئەمە بووە هۆی پاڵەپەستۆیەکی گەورەی بەریتانێکان بۆ سەر نەستووریەکان، لەو بەرەکانی و ململانێ بێکۆتاییانەدا لەگەڵ کوردەکاندا[٥٠]. لەمەدا باشترین نموونەیەك لەوەدا دەرکەوت کاتێ ئەو نەستووریانەی هەروا بەسەر زاری چووبوونە سەر مەزهەبی ئەرسەدۆکسی ڕۆژهەڵاتی، هاتن و خەبەریان دایە کونسوڵی بەریتانیایی لە ڤان کە بڕیاریانداوە پەشیمان ببنەوە و دەگەڕێنەوە سەر مەزهەبی نەستووری مەسیح، ئەمە لە حاڵێکدا کە ئەگەر کونسوڵگەریەکە ٢٠٠ لیرەیان بداتێ، بۆ ئەمە هەریەك لە کونسوڵ و نێردراوە بەریتانیاییەکان کەلای نەستووریەکانبوون، بیرۆکەی ئەم پێشنیارەیان بەچاك زانی. بەڵام باڵیۆزی شاهانەی بەریتانیایی نەیهێشت پارەکە بدرێ[٥١].

## ● شۆڕشگێڕە ئەرمەنەکان

((ئەلیوت))ی کونسوڵ لە ساڵی ۱۸۹۸ دا نووسیویە:

(( ئەوەی پەیوەندی بە شۆڕگێڕانەوە بێ، وابزانم لەو شەڕەی کە بە شەڕی خاچپەرستیان دادەنا دژ بە ترکیا، دەکرێ ناوی ئەوانەی کە بەشدارییەکی کاریگەریان تیادا کردووە، بیانخەینە دوو خانەوە:

یەکەم/ نیشتیمانپەروەرێکی کارای وا کە حەز بە کاری رێکوپێك ناکا و ژیان لەلای قشە و گاڵتەیە و حەزدەکا دەوری قارەمان ببینێ، بەسەر ورگی گۆمەڵەکەشیەوە دەژی.

دووەم/ ئەو پیاوە یان گەنجەی شوێنپێی ئەو هەڵانەی گرتووە کە لەوەبەر کەسوکارەکەی پیا رۆیشتوون، چاو لەو کارە جەسوور لەخۆ بووردوویانەیان دەکات کە بیستونیەتەوە و ئەمیش رێك وەك ئەوان دەیانکاتەوە. جا خۆی تەرخان دەکات بۆ دۆزی نیشتیمان.

دەبێ ئیشاردش بەوە بدرێ کە زۆر لەوانەی سەر بەخانەی یەکەمن ئەو خوێڕی و بێ ویژدانانەن کە ناپرنگێنەوە لەهەر سەرپێچیکردنێکی وەحشیانە، ئەوانە بەر لە کورد و بەرپرسە موسوڵمانەکان میللەتەکەی خۆیان دەتۆقێنن. ئەمانە لە ئاواییە مەسیحیەکاندا گردەبوونەوە، بەسەر ورگی خەڵکەکەوە دەژیان و ئەو سەرانە و پارانەیان لە گیرفان دەنا کە بە زۆر سەپاندبوویان و دەیان سەند، سووکایەتیان بە ژن و کچان دەکرد بە زۆری و زۆرداری دەیانخستنە ژێر هەواو ئارەزووی خۆیانەوە، ئەوەیشی بەدڵیان نەبووایە و سەرپێچی بکردنایە ئەوا بە خوێنساردیەوە دەیاندایە بەر گوللە و ئیعدامیان دەکرد.

لەبەرامبەردا، ئەوانەی سەر بەخانەی دووەمن شیاوی هەندێ بەزەیین، بەڵام کاتێ خۆیان دەخستە خزمەت شۆڕشگێڕەکانەوە، بەدڵ و گیان تەسلیم

بە گەورەکانیان ببوون، لەگەڵ ئەوەی زوربەی ئەمانە سەر بە بنەماڵە و خانەوادەی بەناوێ و ڕێزداربوون.

بۆ ئەمە، زۆر بازرگان و کەسانی تریش لەوانەی هیچ هاوسۆزییەکیان لەگەڵ شۆڕشگێڕان و شەڕەکانیاندا نییە، ناچاربوون کە لە پارەدان و کۆمەکی داراییاندا بەشداری بکەن. ئەمانە بەشکستی ڕێکخستنەکانی شۆڕش گەلێ دڵخۆش دەبوون[52].))

لە ئەنجامی شکستی یەکەم یاخیبوونەکەی شاری ڤاندا، شۆڕشگێڕان ناچار بوون کە بە خۆیاندا بچنەوە[53]. شتێکی ئاسایی بوو کە کۆششە یاخیبوونەکەیان سەرنجی دەوڵەتانی ئەوروپا بۆلای خۆی ڕاکێشێ، بەڵام ئەو یاخیبوونەیان شکستێکی ناهەمواری خوارد، کۆمەڵێکی کەم لە سەرکردەکانی ئەو یاخیبوونە ڕێبەندکران بەڵام بە نهێنی. باوەڕێکی تەواویان هەبوو بەوەی کە میللەت پشتی دۆزەکەیان دەگرێ، بەڵام هەر پشتگیریکردن بەس نەبوو، چونکە یاخیبووان بەشێوەیەکی بەرفرەوان شەڕوانانیان کۆ نەکردبۆوە بۆ شەڕ کردن، وە برێکی باش وەك پێویست چەك و تفاقی شەڕیان بۆ لایەنگران دەستەبەرنەکردبوو، ئەمەش پەندێکبوو کە باش لێوەی فێربوون٥٤.

هەتا بەر لەیاخیبوونی ساڵی ١٨٩٦، لە ڤان ڕێکخراوی (تاشناق) بەهێزترین ڕێکخستنێك بوو لەنێو ڕێکخستنە شۆڕشگێڕەکاندا[55]. لەگەڵ ئەوەی ڕێکخراوی (هانشاك)یش هێزێکی گرنگ بوو، بەڵام ئێستە، بەهۆی شکستی ساڵانی نەوەدەکانی سەدەی نۆزدە و دووبەرەکی حیزبایەتی ناوخۆوە، هانشاك لە ڤان هەڵوەشا بۆ هێزێکی گچکە. لە ناوچەکانی تریشدا لە ئەنەدۆڵ جگە لە (کیلیکیا) نەبێ دەستەڵاتی خۆی پاراستبوو، جا سەرکردایەتی شۆڕشی ئەرمەن بە تەواوی کەوتە دەست (تاشناق).

لە پاش شکستی ساڵی ١٨٩٦ شۆڕشگێران لە ڤان تا ساڵی ١٩٠١

پەرشوبلاوبوونەوە، کە ڕێکخەری تاشناق (کیزاغ - فارتکس سیرینغیلیان) گەیشت، ئەم کابرایە دەستی کرد بە سەرلەنوێ دامەزراندنەوەی هەیکەلی ڕێکخستنی تاشناق لە شارەکەدا، ئینجا لە ساڵی ١٩٠٢ (فارتان شاباز)یش گەیشت و بەدوویدا (ئیشخان) کە بە (فانا ئیشخان)یش ناوزەد دەکرا، ناوە ئەسڵیەکەی (نیگۆل نۆدا باشیان) بوو، وە لە ١٩٠٢ (گۆمز- دکتۆر فاهان پاپازیان)یش هات و کەوتە کار.

(شاباز و ئیشخان) کەوتنە ڕێکخستنی دەوروبەری (جاتاك) و لەساڵی ١٩٠٤دا (ئارام مانوکیان) کە ئەسڵەن ناوی (سیرغی هوفهانیزیان)بوو، هات. بە داهاتنی ساڵی ١٩٠٥ چەند بەرپەرسێکیتری ڕێکخستنی حیزبی تاشناق هاتنە پاڵیان: (ڕۆبێن دیرمیناسیان، دیکران، ماگیتسی میسرۆب، ملخاس نەرداش هۆفسبیان) جگە لە دوو ئەندامی حیزبی (ئەرمیناکان) کە بریتیبوون لە: (سەلان سەرکیس بەرسیغیان، غیفۆند میلۆیان)[56].

سەرکردەکانی تاشناق ئەرك و کارەکانیان دابەشکرد بە: (ئارام، دیکران و سەرکیس) ڕێکخستنی شاری ڤان و ناوچەکانی ڕۆژەلات و سەرەوەی بگرنە دەست. بەلام (ئیشخان، شاباز و ڕۆبێن دیرمیناسیان) بۆ ماوەیەکی کورت ڕێکخستنی ناوچەکانی باشووریان پێ سپێررا[57]. لە ساڵی ١٩٠٨یش (ئەڕشاك فرامیان) لە کاروباری ڕێکخستندل هاتە ڕیزەوە.

## ● سەرکردەکانی تاشناق

بە مەبەستی دەستبەکاربوونیان لەو کارانەی بۆیان دیاریکراو بوو، سەرکردەکانی تاشناق هەر کەسە و بەرەو ئەو شار و ناوچەیە بۆوەکە پێی سپێررا بوو، لە ڤان چەند بەرپرسێك سەرکردایەتیەکەی هەرێمەکەیان گرتە دەست کە تاجەنگی یەکەمی جیهانی لەسەر کارەکانیان مابوونەوە، ئەوانە: (ئارام، ئیشخان، فرامیان و پاپازیان) بوون[58].

* ئارام مانوکیان، لە شاری (کاراباغ)ی ئیمپراتۆریی ڕووسیا لە ساڵی ١٨٧٩ هاتۆتە دنیاوە، وەك ڕێکخەری بزاڤی کارگەران لە حیزبی تاشناقدا لە ١٩٠٢ کاری کردووە، ئینجا چۆتە (ڤارس) لێر لە ڕاپەڕینێکی کورتخایەندا دژ بە ڕووسەکان سەرکردەیی گرتە دەست، پاش ئەمە ناچار کرا ڕووسیا جێبهێڵێ، بۆیە هاتە سەڵتەنەی عوسمانی و حیزبیش لە ١٩٠٤دا لە شاری ڤان داینا.

مانوکیان هەر بە تەبعی خۆی سەرکردە و ڕێکخەرێکی شارەزا و نیشتیمان پەروەرێکی مولتەزیم بوو، بێ پەروا ئەرمەنیەکی تۆخ بوو، سەرەڕای ئەو ساڵانەی کە لە سەڵتەنەکەدا بردیە سەر کەچی ڕۆژێ لە ڕۆژان فێری خوێندنەوە و نووسینی زمانی ترکی نەبوو[٥٩].

* نیشخان - نیگۆل بۆگۆسیان - ناسراو بە (بانیدۆر)، لە ساڵی ١٨٨٣ لە کاراباغ لەدایکبووە، لە هەردوو شاری (شوشا و یەریڤان) بەتەك ئارام مانوکیانەوە خوێندیان تەواو کرد، چالاکانە لە شارەکانی (ئەلیکساندر و پۆل، ڤارس) کاری دەکرد، ئەمە بەر لەوەی بۆ شەڕکردن بێتە شاری ساسون.

* ئەرشاك فرامیان، کە بە (ئۆنیك دیردزاکیان)یان بەنازناو جەنگاوەری و لە نووسینەکانیدا بە (فیهاب) دەناسرا، ئەم نازناوەی لە (فیشاب و فاهاب - فاراز و نیروسوگرات)ەوە بوو، لەناو سەرکردەکانی ڤاندا ئەم دیار و دەرکەوتوو بوو، لە ١٨٧١ لە ئەستەمووڵ هاتۆتە دنیاوە، لە پەیمانگەی فێرکردنی لاهووت لە (ئیجمیا دزین) خوێندبووی بووە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی تاشناق و دوایی وەك ڕێکخەری حیزب لە بولگاریا و ڕۆمانیا، جگە لە بە ئەندامبوون لە نووسینگەی ڕۆژاوای حیزب و نووسەر لە ڕۆژنامەی (دروشاك) کە ئۆرگانی تاشناق بوو، لە نێوان ١٨٩٩ - ١٩٠٧ فرامیان ڕێکخستنی حیزبی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئامریکا گرتە دەست و ڕەگەزنامەی ئەو وڵاتەشی بەدەستهێنا[٦٠]. لە ساڵی ١٩٠٨ هاتە شاری ڤان.

* ڤاهان پاپازیان، ناسراو بە (غۆمز و دکتۆر) لە ڕێکخستنی هەوالگری نهێنی حیزبی تاشناقدا لە ناوچەی قەفقاسیا کاری دەکرد، لەنێوان ۱۹۰۰ - ۱۹۰۲ لە دەستەلاتی ڕووس هەڵات و پەنای بردە بەر وڵاتی (فینلاند).

* بەڵام (برترام دیکسن) کە لە ۱۹۰۸ کونسوڵی ڕووسبوو لە شاری ڤان، هاوڕێیەکی نێزیکی ئەرمەنەکانبوو، هەرچەندە لە نووسینەکانیدا بۆ سەروتر لە خۆی، پێی دەگوتن: کارە خراپەکانی شۆڕشگێران چەندەها هەنگاو وا لە پێش کارە باشەکانیانەوە لە بۆ گەلی ئەرمەن.

وادیارە کە دیکسن سەرچاوەی هەواڵی نایابی هەبووبێ کە زانیاری ورد و چاکیان سەبارەت بە شۆڕشگێڕانی تاشناق پێ دەگەیاند، زۆر جار چاوی پێیان دەکەوت و هاوسۆزی خۆی بۆ دۆز و ئامانجەکانیان پیشان دەدا، ئەگەر نەڵێین بۆ شیوازی کارکردنیشیان. وەسفێکی چاکی ڕێکخراوەکەیان دەکات:

(( لیژنەی رۆژهەلات – تەفلیس ـی کردۆتە نێوەندێکی خۆی و ڕێک لە گۆڕەپانی یەریڤان بە پاڵ چاپخانەی جۆرجیا و کلێسای ئیجمیا دزینەوەیە، د. هانوئۆگانغینیان و یادیش تۆبجیان و ئەباك فرامیان و ئەرمەن کارۆ، وەك ئەندامانی سەرەکی لیژنەکەن.

ئەم لیژنەیە بۆ بلاوکردنەوەی هەڵمەتی پروپاگەندەکردن بۆ شۆڕشەکەیان لە ڕووسیادا لە کاردایە، ئەگەر پێویستیش بکات گەنجە ئەرمەنەکان کۆدەکاتەوە بۆ ڕەوانەکردنیان. پارە و دارایی کۆدەکاتەوە و چەك و جبەخانەش دەکڕێ یان دەیاندزن و بەقاچاغ ئاودیوی ترکیایان دەکات، سەرەڕای ئەمانە لیژنە کارەکانی بزاڤی شۆڕشگێڕی ڕووسیای لە قەفقاس بەڕێوەدەبا و بەرپرسیشە لە ئەنجامدانی گەلێ کاری تیرۆرکردنی ڤیزەون و کوشتن، لە لایەکی دی ئەم لیژنەی رۆژهەلاتە کەمێ پەتی بۆ لیژنەی هەرێمی ڤان بەرەڵلا کردووە لە سنووری کاروباری ترکدا جگە لە مەسائیلە سیاسیە بالاکان نەبێ کە هەردوو لیژنەی رۆژهەلات و ڕۆژاوا لێی

بەرپرسن و سەربەوانە، وەك دەریش دەکەوێ کە دەستخستنی ڕێگەپێدان لەلایەن لیژنەی ڕۆژەڵاتەوە هەنگاوێکی پێویستە بەر لە تیرۆرکردنی هەر بەرپرسێکی ترك.

دەبێ ئیشارە بەوەش بدرێ کە لیژنەی ڕۆژەڵات بەچوار لیژنەی هەرێمی ناو ترکیاوە پەیوەستە، ئەم لیژنانەش لە ڤان، موش، ئەرزڕۆم و ترابزوندا بارەگەی خۆیان هەس، دوو بارەگەکەی دوایی ڕواڵەتێکی ئاشتیانە و بێ وەییان لەخۆ گرتبووە، چونکە کارەکانیان تەنیا لە سنووری پڕوپاگەندە و کۆمەك کۆکردنەوەدایە، بەڵام لە موش دوو سەرکردە دانراون ، یەکیان ڕووسە و ئەویدی ترکێکی ئەرمەنە.

ڤان نێوەندێکی شۆڕشگێڕی گرنگە لە ترکیادا، لەو حەوت ئەندامەی لیژنەکە چواریان کارا و چالاکن، ئەوانیش: (ئارام، دکتۆر، سەرکیس و ئیشخان)، سێ ئەندامەکەی دی سست و داوەشاون. ئەمە هەربۆ زانین کە لیژنەکانی موش و ترابزون و ئەرزڕۆم سەر بە لیژنەی ڤانن و بەوەوە پەیوەستن.

جگە لەو چوار سەرکردەیەی کە باسمان کردن، سی سەربازی چەکداری شۆڕشگێڕ هان لە ڤان، ٢٥یان ڕووسن و پێنجیش ترکی ئەرمەن. لە زستاندا گشت ئەم گیانباز و (خۆبەخشانە)[٦٢] لە ڤان نیشتەجێن و دابەشبوون بەسەر گەڕەکە ئەرمەنەکانی بەشی گاردنی شارەکەدا، تەنیا بەشەودا بەناو باخچە و ئەنفەقەکاندا هاتوچۆ دەکەن، دەشڵێن ئەمانە هەرگیز دوو شەو لەسەر یەك لە یەك ماڵدا نانوون، هەرچەندە ئەرمەنەکان گشتیان هاوسۆزن بەرامبەریان، ئەگەر بە پەنهانیشبێ، بەڵام زۆر لە ئەرمەنە دەوڵەمەندەکانی ڤان هەست بەوە دەکەن کە بوونی ئەمانە لەناویاندا نەگونجاو و مەترسیدارە.

کەبەهار دادێ ڕێگەوبان دەگرێتەوە و بۆ هاتوچۆ دەستدەدات ، گیانباز

و گیانفیداکان ئەگەر کارێك نەبێ دەستیان بگرێ وەك یاخیبوونەکەی موش و سامسۆن، ئەوا بەچەند دەستەیەکەوە دابەش دەبن لەژێر سەرکردەیی ئەو چوار سەرکردەیەدا، هەر دەستەیە و لە هەرێمێك بۆ هەڵمەتی پروپاگەندە و کۆکردنەوەی گەنج و سەندنی یاربوو لە خەڵك‌و فرۆشتنی چەك و زەخیرە بە لادێیەکان و فێرکردنیان کە چۆن تفەنگ بەکاربێنن و مەشقپێکردنیان لەسەر نیشانە شکاندن و.. یەك لەو چوارە بە زۆری لە ڤان دەمێنێتەوە، پەیوەندیش بەهۆی نامەوە لەنێوان کۆمەڵەی ڤان و پەتلیسدا بەردەوامە، ئەمەش وای لێ کردون کە هەرکات بیانەوێ و پێویستکات کۆدەبنەوە و یەکتر دەبینن.

جگە لەو سێ سەربازە، ئەرمەنەکان بە گشت توێژێکیانەوە نێرینەکانیان ئەندامن لە رێکخستەکەدا، ئەندامە تەمەن بچووکەکان چالاکترن و چەکداریشن، لە ماڵەکانیاندا تفەنگ و فیشەکیان حەشارداوە، لیژنە ئامادە و موهەییایە بۆ چەکدارکردنی ئەوانی دی کە بانگکرێن، ئەوانەی تر کە دەمێننەوە، سست و ناچالاکن بەڵام بەشداری بەرچاویان هەیە بۆ خزمەتکردن بە دۆزەکەیان.

بەپێی ئەو سەرژمێریانەی کە وادەزانم بەپێی زانیاری خۆم زۆر وردن.ئاگادارم کە لیژنەی گیانفیداکان لەشاری ڤان و دەوروبەردا لە ئیستەدا ئەوەندە چەکی حەشارداوە کە بەشی هەزار شەرکەر بکات، هەر لە شاری سەڵماسدا کە لەسەر سنووری فارسە پشت قایم بوون بە ٦٠٠ چەکدار، لە عەینی کاتدا بەتەمای ٢٠٠٠ چەکداریشبوون لە کاتی پێویستدا لە رووسیاوە بۆیان بێت.

دەرەنجام لە ترکیا و وڵاتانی فارس و رووس ئەوەندە چەك و جبەخانەیان هەیە کە بەشی سێ هەزار پیاو بکات، لە کاتێکدا ژمارەی ئەو شەروانانەی لە ریزەکانیاندا ئامادەی چەك هەڵگرتن بوون بەلای کەمەوە لە

ژمارە نەدەهاتن.[62]))

وەك لە پاشان دەرکەوت (ئارام و ئیشخان) دیارترین دوو سەرکردەی ناو لیژنەی حیزبی تاشناق بوون لە شاری ڤاندا، لە ئامدیوکردن و قاچاغدا گەلێ وریا و شارەزابوون، ئیشخان ئەو پەیوەندی و ناسیاویەی کە لەگەڵ ئەرمەنە گوندشینەکاندا هەیبوو لەناوچەی جاتاك پەرەی پێدا و دواجار لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا ئەو ناوە بووە چەقی یاخیبوونی ئەرمەن[64] ئەم ئیشخانە زیاتر رێکخەر و سیاسی بوو وەك لەوەی جەنگاوەر بێ.

بەڵام ئارام وەك چۆن لە رێکخستندا دەستێکی باڵای هەبوو ئاواش لە مەیدانی شەڕدا، لە ١٩٠٧ رابەرایەتی دەستەیەکی دەکرد بۆ شەڕکردن لەگەڵ سەربازە عوسمانیەکاندا لە دەیری (فاراك[65]). بەڵام گەورەترین خزمەتێك کە کردبێتی بڵاوکردنەوەی گیانی شۆڕش و شۆڕشگێری بوو لە گشت لایەکی هەرێمەکە.

ئارام، وەك هەنگاوێکی پێویست یەکەمجار رۆشنبیرکردنی شۆڕشگێری هێنایە ناوان و رێکی خست، خۆی و هاوەڵانی دەستیان بەسەر ئەو رۆشنبیریە تەقلیدیەدا گرت کە بە کڵێسای ئەرمەن سپێردرا بوو و کردیانە جۆرێك لە رۆشنبیرکردن و تێگەیاندنێك کە خزمەت بە پرۆگرام و رێکخستنی شۆڕشگێرانەیان بکات. پلانەکەی تاشناق بۆ ڤان بریتیبوو لە دەستبەسەراگرتنی کڵێسای ئەرمەنی گریگۆری، زۆرێك لەوانەی هامشۆی کڵێسایان دەکرد بوونە لاگیر و لایەنگری شۆڕش و داخوازیەکانی[66]. بەڵام دەیرەکەی (دیریك) لەبەری ئەوبەری سنووری فارس، بۆماوەیە بووە بنکەیە بۆ شۆڕشگێران و عەمبارکردنی چەك. سەرۆکی دەیرەکە (باغرات فاردابت تافاکالیان) شۆڕشگێرێکبوو بەناوێکی نهێنی (زەکی)یەوە[67].

لەناو شۆڕشگێرە بەناوێکاندا ناوی قەشە (فارتان) دێنن کە لێپسراوی باڵای دەیری (ڤردیس غارابد)بوو، ئەمە لە ساسۆن کاربەدەستێکی حیزبی

تاشناق بوو، لە ١٨٩٩ مەترانەکەی ئەرمەن لە پەتلیس سەر بە شۆڕشبوو (ئەمە نەلای دەوڵەت شاراوە بوو و نەلای مونسلی کونسوڵ)، دەچوو ئەو کەلوپەل و پارانەی کە بە کۆمەك بۆ هەژاران و لێقەوماوان دەهات دەیدایە شۆڕشگێڕەکان[٦٨].

هەروەك لێرەدا بەدیار دەکەوێ ئەو پیاوە ئاینیانەی لە ڤان پشتگیری شۆڕشیان دەکرد زۆربوون، بەڵام ئەمانە لە سەرەتادا تا ڕادەیە کەمبوون[٦٩]. لە واقیعیشدا سەرۆکەکانی کڵێسای ئەرمەن لە ڤان هەر بەتەواوی بەرهەڵستی شۆڕشگێڕانیان دەکرد، بازرگانان و پیاوانی ئاینی موحافیزگارانە هەڵوێستیان دەنواند، ئەمەش شتێکی سروشتی بوو، چونکە بەشێکی جیانەبووەوەبوون لە سیستمی عوسمانی، جا نەکرا دوی کاروانی شۆڕشگێڕانێکی مولحید بکەون، جگە لەمەش شۆڕشگێڕەکان نەگەری هێزێکی ئایندەی ناو کۆمەڵی ئەرمەن بوون، دەستەلاتێکی تازە کە دەیتوانی هێز لە دەستی ڕایەرە سوننەتیەکانی کۆمەڵ دەربهێنێ، بەمانا کڵێسا و بازرگان هەردوای شکستەکەی ١٨٩٦ و پاش ئەوەی حیزبی تاشناق کەوتەوە چەسپاندنەوەی پێگەی خۆی لە ڤان ئەویش لە ڕێی هەڕەشەکردن لە دەوڵەمەندەکان بۆ کۆکردنەوەی پارە، ئیتر ئوسقوفو هەندێ کەسێتی بەناوێ کەوتنە داواکردنی پرس و ڕاوێژ لە کونسوڵی بەریتانیا دەربارەی چۆنێتی ڕێگرتن لە شۆڕشگێڕان تا نەگەڕێنەوە، بەڵام ئەم خۆلێنزیککردنەوەیە باشترین بەڵگەیەکە بۆ نیەت و مەرامی سەرکردە تەقلیدیەکانی ئەرمەن[٧٠].

هەروەك لەبەشی دووەمیشدا دەرکەوت، بارەگەی کاتۆلیکۆسی (ئەختمار) کە لە دورگەی ئەختماری بەری باشوور و باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری ڤان بوو، زەویوزارێکی زۆری بەدەمەوە بوو، لەساڵی ١٨٩٥ شوێنی پلەی کاتۆلیکۆس بەتاڵبوو هێشتا کەسێ نەبوو بیگرێتەوە، بەڵام کاروبارەکەی بەسیستمی بەڕوەردەکەیشیەوە هەتا جەنگی یەکەمی جیهانی هیچ گۆڕانێکی

بەسەردا نەهات، جا دەستەلات و کاروبارەکەی کەوتبووە دەست قەشەیەك بەنازناوی (جێگر یا بریکار)ی کاتۆلیکۆس. ئیتر ئاوا ڕەوشەکە وەك خۆی مایەوە[٧١].

لەسەرەتای مانگی تشرینی دوو/نۆڤامبری ١٩٠٥ کۆمەڵێ چەکدار بە سەرکردەیی ئیشخان لە ڤانەوە هاتن و بە دیواری دەیری (هاکافانك)دا هەڵزنان، پیاوە ئایینیەکانی ناوەوەیان تۆقاند و جێگری نەختمارکە (ئەرسن فارتابد) و نهێنگرەکەیشی، لەتەك خۆیاندا ڕاپێچیان کردن و فڕاندیانن، بۆ سبەی بەهانی لاشەکانیان دۆزرایەوە. ئەرسن بۆیە کوژرا چونکە پشتی دەوڵەتی دەگرت دژ بە شۆڕشگێڕان و بەلای تاشناقەوە پلەو پایەیەکیشی لە دەوڵەتدا گرتبووە دەست، وە چونکە لەنێوان دەوڵەت و خەڵکە ئەرمەنەکەدا بوو دەورێکی گەورەی دەبینی. تیریلی کونسوڵ دەیگوت: تاوانی گەورەی ئەرسن تەنیا ئەوەبوو کە دەیگوت (خراپەکاریەکانی شۆڕشگێڕان لە چاکەکاریەکانیان تێپەڕاندووە) و حەزیشی بە هیچ جۆرە پەیوەندییەك نەدەکرد پێیانەوە [٧٢]

بەم شێوەیە دەسەڵاتە ئایینەکە پەندو عیبرەتی بە باشی لەو ڕوداوە وەرگرت، لە ساڵی ١٩٠٦ (دانیال) کە ئەندامێکی تاشناق بوو کرا بە جێگر لە جێی ئەرسن؟، ئەمیش لای خۆیەوە (ئیشخان و ئارام)ی کردە بریکاری خۆی.[٧٣] ئارام کاری پشکنیاری لە قوتابخانە ئەرمەنەکاندا گرتە دەست، بە دانانی ئەمانە پەیمانگەی ئیختمار بۆ فێرکردنی لاهووت بە پەگجاری لە دین دامالرا، کە پێشتر ئەمە ئامانجی سەرەکی ئەو پەیمانگەیە بوو، مامۆستا ئایینیەکان بەرەڵاکران و لایەنگرانی تاشناق جێیان گرتنەوە، وانەکانی لاهوتیشیان لابرد و بوونە وانەی مەشقپێکردنی شۆڕشگێڕانە، مامۆستایان لە باتی بابەتە ئایینیەکان وانەی یاخیبونیان دەگوتەوە [٧٤].

نێردراوە ئامریکاییەکان لە ڤان لەم دەستبەسەراگرتنی تاشناقانە بەسەر

کاروبـاری پەیمانگەکـەدا، وەك حیزبێکـی مولحیـد، گـەلێ تـووڕە و نیگـەران بوون. لە ساڵی ١٩١١دا سەرۆکی نێردراوەکـان (د. ڕینۆڵـدز) دەیگوت: بەشـێکی زۆری زەویـوزاری ئـەم ولایەتـە مـولکی کاتۆلیکۆسـیەی ئیختمـارە، ماوەیـەکی دوورودرێژ ئەم دامەزراوەیە ملکەچی دەسەڵاتی ئەندامانی بێ ئیمـانی تاشـناق بـوو کـە لـە ناویـدا ڤوتابخانەیـەکیان کردبـۆوە، فێرکردنـی ئـایینی و چـوونە کڵێسا تیایدا ڤەدەغە بوو، گەلێ کاری پێچەوانە و دژە ئایینیشی تیادا دەکرا. (٧٥)

بەر لە هاتنی ئارام و هاوڕێیانی، شۆڕشگێڕەکان بایەخێکی ئـەوتۆیان بـە ئەرمەنە لادێییـەکان نـەدەدا، بـەر لـە شۆڕشـەکەی ١٨٩٦ هەنـدێ (بـاج لەسـەر چەك) لە هەندێ ئەرمەنی لادێیی دەسێنرا، ئـیتر بـیر لـەوە نەدەکرایـەوە کـە ڕێکیان بخەن وەك حیزبێ[٧٦]، لە ناو ڕێخستنی لادێکاندا مامۆستایانی ئـایینی سەر بە تاشناق ببونە نووکی ڕم، سیستەم شۆڕشگێڕی بـوو، عوسمانێکان زۆر کەم دەستیان دەخستە ناو ئیش و کاری ئەو مامۆستایانەوە، ئەمـەش بـەپێی ئەو ئەریتەیان کـە ئـایین ئـازادە و تـرسی باڵەپەستۆی ئەوروپاییـەکانیش بـا لەولاوە بووەستێ.

ئـەو ماوەیـەی نێـوان ١٩٠٦ و جـەنگی یەکـەمی جیهـانی ڕێکخـەرەکانی تاشناق بە ڕێکخستنی دانیشتوانی ئاواییەکانی ئەرمەنەکانەوە بردیانـە سـەر، ئەمـەش لـە هەنـدێ گیروگرفـت بەدەرنـەبوو، بـە تایبـەت لەگـەڵ سـەرۆکە تەقلیدیـەکانی ئـاو ئـەو ئاواییانـە، بـەڵام تاشـناق لـەو بەربەرەکانیـە ناوخۆییانەدا سەردەکەوت (٧٧)

کاری تیرۆر و تیرۆرکاری بەشێکی سـەرەکی بـوو لـەو شۆڕشـەی تاشـناق، ئەمەش پارمەتیدەر بوو بۆ هێنانەدی دوو ئامانج:

یەکـەم/ تاشـناق دوژمنـەکانی خـۆی لـە کـۆڵ دەبـۆوە، ئەوانـەی ببوونـە مەترسیەکی ڕاستەقینە یان چاوەڕوانکراو لەبەرامبەر چالاکیەکانیدا. لەوانـە

بەرپرسە عوسمانیە دەستڕۆیشتووەکان ( بەتایبەت ئەو ئەرمەنانەی کە لە دەوڵەتدا بوون و سەلماندبوویان کە ئەرمەن دەتوانن لەناوجەرگەی فەرمانگەکانی حوکمەتدا کاربکەن) وە ئەوەشی ئامادەبوو کە ناپاکی ■ هێڵی تاشناق بکات بەو بیانووەی گوایە خزمەتی بەرژەوەندی نیشتیمانی یان تایبەت دەکات، لە پەتلیس لە ساڵی ١٨٩٨ سەرۆکی پۆلیس لە لایەن شۆڕشگێڕانەوە ڕووبەڕرووی تیرۆرکردن بۆوە[٧٨]. هەروا سەرۆکی دەستەلاتی قەزایی لە ساڵی ١٩٠٧ لەناو شاری ڤان کوژرا[٧٩]. دیسان زۆرێکی تر (وەك پاشان بۆمان دەردەکەوێ).

بەڵام ئامانجی دووەم/ لەوانەیە بە بایەختر بێت، ئەم تیرۆرکردنانە ئاگادارکردنەوەیەك بوو بۆ هەریەك لەوانەی بیانەوێ لە ئایندەدا پشتگیری لە دەوڵەت بکەن یان نایەوێ یارمەتی شۆڕشگێڕان بدات. جێی باسەکە کاری تیرۆرکردن و هەڕەشەی کوشتن تارادەیەکی زۆر بەری باشی هەبوو لە بەدەستهێنانی باربوو و (بەخشینی شۆڕشگێڕانە) لەلایەن ئەرمەن و دەوڵەمەندەکانیانەوە، ئەوانەی هەر بە سروشتی خۆیان مەیلی شەڕ و ئاژاوەیان نەبوو، جا بۆیە بە هەڕەشەیەك زۆر بە ئاسانی لێیان دەکێشرایەوە■ ئەمەش بە ڕوونی دوای کوشتنی چەند کەسانێك کە نەیانویستبوو پارە بدەن و خەڵکی تریشیان هاندەدا کەوابکەن، دەرکەوت.[٨٠]

لە دەیەی ١٨٩٠ەوە حیزب لە ئەستەمووڵ کارە تیرۆریەکانی دەستدایە، مێژووی ئەساسی یەکیەتی شۆڕشگێڕانی ئەرمەن وای دەگەیەنێ کە (لێرەوە بە مێژووی – ا. پ.ا ئیشارەی پێدەدرێ) :

((ڤوستەنتەنیە، پایتەختی سەڵتەنەی عوسمانی کە نیوەی وا لە ئەورووپادا، بەلای تاشناقەوە بایەخێکی جەوهەری هەبوو، وەك شانۆیە بۆ چالاکیەکانی حیزب و بەڵگە و هەڵمەتی دیعایەکردن. لەم ڕووەوە دەبێ وردبینەوە لە چالاکی تیرۆریستی کە لە ساڵی ١٨٩٤دوە هەتا ١٨٩٦ پەرەی

سەند، ئەویش کە ئەندامانی تاشناق دەستیان کردە قەڵاچۆکردنی ئەو ئەرمەنانەی کە لە خزمەتی سوڵتان و دەوڵەتی ترکدابوون، لەوانە (مەقصود سیمون بەگ، ئەرداشیسی جاسووس، حەججی دیکرانی سەرۆکی پۆلیس، قەشەی لەکارلابراو مامیر بنلیان، م. توتنچیان پزیشکی نۆژدار و زۆری تر[81].))

گەورەترین هەوڵێکی تیرۆرکردن کە دەنگی دایەوە و بەناوێ بوو، ئەوەبوو کە تاشناق هەوڵی کوشتنی سوڵتان (عەبدولحەمیدی دووەم)ی دا بە تەقاندنەوەی بۆمبێك، بەڵام سەری نەگرت.

هاوکاربوونی شۆڕشگێڕانە بەبێ بەزەیی دەسەپێنرا، هەرکەس دەستبەرداری دۆزی یاخیبووان ببوایە یان گرفتی بهانیبا ڕێگەیان چارەنووسەکەی مردنبوو، مێژووی یەکیەتی شۆرشگێڕانی ئەرمەن (أ. پ. أ) نیشارە بەوە دەدات کە گیانفیداکانیان گەلێ بەکرێگیراوی ئەرمەنیان ئیعدام کردووە، لەوانەی دەستیان لەگەڵ حوکمەت تێکەڵ کردبوو[82]. هەر بۆ نموونە لاشەی تاوانباران نێزیك بە دەریاچەی ڤانەوە هەڵدەواسرا و دوایی فڕێ دەدرایە سەر ڕێگەو بانە گشتیەکان. جۆرە نیشانە و ئارمێکیشیان پێوە دەنرا کە بزانرێ ئەمانە خائینن[83]. لە دەوروبەری شاری پەتلیس کە دەستەیە لە ئەرمەنە ڕووسیایەکان بەسەرکردەیی (کیفۆرك ) ناوێ لەلایەن قەشە ئەرمەنیەکانەوە بێزاری و وەڕەسیان بەرامبەر دەنوێنرا یاخیبووان دووانیان لەو قەشانە کوشت.[84]

لە ساڵی ١٩٠٣ لە ڤان هەواڵدەرێکی ئەرمەنی کوژرا[85]. وە لە ١٨٠٧دا شۆڕشگێران پۆلیسێکی ئەرمەنیان لە ڤان کوشت، ئەوەش بەهۆی هاوکاریکردنی بۆ حوکمەت لە دۆزینەوەی حەشارگەیەکی چەکیاندا[86]. دیارە تەنیا ئەو کارە تیرۆرکردنانە تۆمارکراون کە گەورەبوون و دەنگیان دابۆوە، لە ساڵی ١٩٠٣ کونسۆلی بەریتانیا لە ڤان نەقیب (ج. ا.تیریل) هەستی کرد

بەوەی کە کارە تیرۆریەکان کاریگەری خۆیان هەس، زۆر کەس حەزیان بەم شۆڕشگێڕانە نەدەکرد و چارەیان گرانبوو، خۆ ئەگەر لەترسی گیانی خۆیان نەبووایە ئامادەبوون خەبەریان لێ بدەن و شوێنی حەشارگەی چەکەکانیان ئاشکرا بکەن[٨٧].

کونسۆڵ دیکسن لە ڤان دێتە سەر وەسفی سروشتی ڕێکخراوەیی و ڕەسمی پرۆگرامی تێپەڕاندنی بیروباوەڕی شۆڕشگێڕانە، کە چۆن سەرکردەکانی لیژنەی تاشناق لە ڤان دەستەڵاتی بەجێهێنانی کاری تیرۆرکردنی ئەرمەن و موسوڵمانەکانیان هەبوو، جگە لە بەرپرسانی دەوڵەت کە بەر لە کوشتنی هەر کامێکیان دەبوو ڕەزامەندی لیژنەی ناوەندی لە تەفلیسیەوە وەربگیرایە[٨٨].

شۆڕشگێڕەکان ئەرمەنەکانیان وا فوودابوو کە پڕیان کردبوون لە هەستێکی دەروونی لێوڕێژ لە هێز و بەخۆنازین و (توانیست) وەك ئێستە پێی دەڵێن. بە درێژایی سەدەکانی پێشتر ئەرمەن لەشکرێکی تایبەت بە خۆیان نەبووە، کەچی ئێستە وا هێزێکی چەکداری ئەرمەن پەیدابوو و سەرنجی دنیاشی بۆ لای خۆی ڕاکێشاوە.

دەمێکبوو ئەرمەن وەك (ڕەعیەت) لەسایەی ئیمپراتۆریە گەورەکاندا دەژیان، کەمایەتیەك بوون لە ناو کەمایەتیەکانی تردا، بۆیە شۆڕشگێڕەکان بەدیهێنانی ئەوەی ناویاننابوو (بەرژەوەندیەکانی ئەرمەن) لەپێش هەموو ئەولەویەتەکانیانەوە بوو، بەڵام پێناسەکردنی شۆڕشگێڕان بۆ (بەرژەوەندی نیشتیمانی ئەرمەن) لەسەر بنەمای تێڕوانینێکی ئایندە خۆی گرتبوو، ئێستاش زۆر کەرەت کار و چالاکیەکانی شۆڕشگێڕان ئەهامەتی زیاتری بۆ گوندە ئەرمەنەکان دروستدەکرد، گومانیشی تێدا نییە کە دنە و هاندانی ئەوروپاییەکان بۆ دەستێوەردان لە سونگەی ئەو ئەهامەتیانەوە خزمەتی مەبەستەکانی شۆڕشگێڕانی دەکرد[٨٩].

هەروەك نموونـەی گشت ڕووکاری شۆڕشـەکانی ئەرمـەن لـە ڕۆژهەڵاتـدا، پاڵپشتی و پشتگیریکردنی میللی ئەرمەن لە یاخیبووندا تەمومژاوی و نادیار بـوو، ئیسـتەش حیزبـی تاشـناق لـە ڤـان دەسـتی گرتـووە بەسـەر ئـەو شۆڕشگێرانەی کە ملکەچی سەرکردەیی هاوولاتی بیانین، کە ئەمانـەش لای خۆیانــەوە ملکەچــی (تــەفلیس)ی ئیمپراتــۆری ڕووســن[90]. بــەلام پاڵپشــتی نـاوخۆیی بـەردەوام گـەورە و فـراوانتر دەبـوو، لـە سـاڵی ۱۸۷۰ لاوانـی ئەرمـەن زۆربەیان لەشاری ڤان بە توندی لاگیری شۆڕشـەکە بـوون[91]. بە هـاتنی سـاڵی ۱۹۰۵ چاودێرە بەریتانێکان هەستیان بـەوە کـرد کـە لادێییـەکان لەخۆیانـەوە زۆر جـار هاوسـۆزی و پاڵپشـتی شۆڕشـگێڕان دەکـەن، لـە بەرامبەریشـدا زۆر گوندی ئەرمەنی تر بە زۆر و ناچاری شۆڕشگێڕانیان دەگرتە خۆ و داڵـدەیان دەدان. چونکە ئەگەر ئەوەیان نەکردبا دەبوونە قوربـانی ئـەو ئەهامەتیانـەی کە شۆڕشگێڕان لە تۆڵەی ئەوەدا بەسەریاندا دەهێنان[92].

لـە هەنـدێ حاڵـدا لادێیـەکان بـە پـاڵ یاخیبووەکانـەوە شـەڕیان لەگـەڵ سوپای عوسمانیدا دەکرد، لـەحاڵی تـردا دەسەوسـان بـوون، بـەلام لـە هـەردوو حاڵەکەدا ئەمانە دەبوونە قوربانی ئەو ئەهامەتیانە و قوڕەکە هـەر بـۆ ئـەوان گیرابۆوە. کە سوپا و یاخیبووان دەکەوتنە شەڕەوە، بێتاوان ڕێك وەك تاوانبار تیادەچـوو، لـە هەنـدێ کاتـدا ئـەو گوندانـەی سـەر بـە شۆڕشـگێڕانبوون دەسووتێنران (نـەك هـەموو کـەڕەتێك)، هەرچـەندە ئەمـە بـەر لـە جـەنگی یەکەمی جیهانی سیاسـەی دەوڵـەت نـەبوو، بـەڵکو کـاتێ ئەمـە ڕووی دەدا کـە سەربازەکان لە شەڕەکەدا زۆریان لێ بکوژرایە و بشکانایە، لەکاتی تـردا تـەنیا داوا لـە لادێییـەکان دەکـرا کـە نـان بەسـەربازەکان بـدەن و لـەکاتی شـەڕەکە داڵـدەیان بـدەن، ئەمـەش زۆر بـەگران دەکـەوت لەسـەر ئـەو کەسـە، کـە ئـاوا ناچاردەکرا نان بدا بە هـەردوولا. گونـدە بەرهەڵستکارەکان دوچـاری تـالان و بـڕۆش دەبوونــەوە، بەتایبــەت ئەگــەر شــەڕەکە لــەنێوان یاخیبووەکــان و عەشایرە کوردەکاندا بووایە[93].

## ● چەکی شۆڕشگێڕەکان

بیــانوو زۆرە بــۆ هۆکــاری چــەکدارگردنی ئەرمەنــە عوسمانیــەکان: مەسـەلەکە بەرگریکردنـە لـە خۆیان یا یاخیبوونـە، ئیتر بـەپێی بۆچوونی چاودێرەکە. لەکاتێکدا خەڵکی شارەکان بە هـەق و هەقیانـەت پێویستیان بـە هەلگرتنی چەك نەبوو، بەڵام لای گوندنشینەکان فـرە مەبەست بـوو، گونـدە چەکدارەکان دەیانتوانی لەدەست جەردە و عەشایرە کوردەکان بـەرگری لـە خۆیـان و ماڵاتـەکانیان بکـەن، زۆری تـریش کـە چـەکدار نـەبوون لـەژێر حیمایەی دەوڵەتدابوون (تەنیا مەبەست لەو گوندانە بوو کەنێزیك بە شار و سەربازگەکانبوون) یان لە پەنا ئـەو سـەرك خێڵانـەدابوون کـە گوندەکـە هـی خۆیان بوو، لە بەرامبەردا، ئەوانـەی بێ چـەك بـوون و لـە هـیچ کـام لەوانـە نەبوون، موسوڵمان بوونایە یان مەسیحی، دەبوونە پارووپەکی ئەرمە قووت .

لە ئاوها رەوشێکدا شتێکی سەیر نەبوو کە شۆڕشگێڕەکان بچن لادێییـە ئەرمەنەکان چەکدارکەن. ئەو لادێییانەی چەکیان لـە شۆڕشـگێڕەکان دەگـرت زیــاتر دەیــانتوانی بــەرگری لەســەرو مــاڵی خۆیــان بکــەن و هــەتا بــۆ تۆڵەکردنەوەش لە لایەنی دی دەستبەسـراو نـەبوون، دەشبێ ئیشارە بـەوەش بدرێ کە ئەوانەی پێویوستیان بە چەکیش نـەبوو ناچاربوون لەگـەڵ گرانـی نرخەکەشیدا بیکڕن. بەمجۆرە بەسروشتی باروزروفەکە چەك هەلگرتن بووە هاوخەمی و هاو بیرییەك لەتەك دۆزی شۆڕشگێڕاندا، چونکە شۆڕشـگێڕەکان هەتا پەیمانێکیان لەو کەسانە وەرنەگرتبا کە ئـەم چـەکە ڕۆژێ لـە ڕۆژان لـە پێناوی خزمەتکردن بە ئامانجەکانی دۆزە شۆڕشگێڕیەکە بەکاردێت، چەکیان بۆ کەس دەستەبەر نەدەکرد.

بـەمجۆرە (بــەرگریکردن لــەخۆ) بــەلای شۆڕشــگێڕانەوە چــەمکێکبوو ناودرۆکێکی فراوانی لـەخۆدەگرت، ئەوپـەڕی بـەرگریکردن لـەخۆ بەلایانـەوە

بريتيبوو لە ياخيبوون كە ئەمەش دەيانگەيەنێ بە سەرهەڵدانى حوكمێكى ئەرمەنى. بەبێ گوێدانە زەرەر و زيانى سەروماڵى سا لە ئەرمەن بكەوتايە يان لە موسوڵمان، كە لەپێناو ئەو ئامانجەدا چار نييە و دەبێ ئەو زيانانە بكەون.

هۆكارى بەرگريكردن لەخۆ لە چەكداركردنى لادێيەكاندا لە ئارادابوو، ئەمە ڕاستبوو، بەڵام كارى كەڵەكەكردنى هەزارا پارچە چەك لە شارە جياجياكانى وەك ڤان و لەو عەمبارانەى كە لە گشت لايەكى ڕۆژهەڵاتى عوسمانيدا بوون، بەتەواوى دەليلێكى جياوازترى لەخۆگرتبوو. ئەو چەكانە بۆ هيچ نەبوو تەنيا بۆ هەڵگيرسانى شۆڕشێكى خوێناوى .

جا بەپێى خراپترين سيناريۆيەك كە ئەرمەن چاوەڕوانى بوون: ئەگەرەكو موسوڵمانەكان لە ناوچەيەك يان زياتر ياخيبوون و كەوتنە سەربڕينى ئەرمەن، ئيتر چۆنچۆنى ئەو چەكە كەڵەكەكراوانەى ناو ڤان لەكاتى پێويستدا بەگەيەندرێ بۆ بەرگريكردن لەو بێ چەكە داماوانە؟ تۆ بڵێى شۆڕشگێڕان گورج بكەونە خۆ و عەمبار بشكێنن و بە عەرەبانە يان بە كۆڵ چەكەكان بەو ئابڵوقەيەى كە سوپا و دەرەكى عوسمانى تەنيويە بگەيەننە شارەكانى (ساسۆن و بشكالە و مووش)؟

ئەمە مەحاڵ و ئەستەمە بەبێ شۆڕشێكى پلان بۆ داڕێژراوى سفت و سۆڵ هەر لەو شوێنانەى كە چەكەكانى تێدا كەڵەكە كراوە.

هەرچۆنێكبێ لە دەيەى ١٨٩٠دا كوشتارى ئەرمەن دەستى پێ نەكرد تا موسوڵمانەكان بەهۆى كارە شۆڕشگێڕيەكانى ئەوانەوە لە كوشتاركردن دەستيان كردەوە و بەرەنگاريان بوونەوە، شۆڕشگێڕان بەڤينيان بەوەبوو كە ئەوە لە ئەنجامى ئەوەدابوو كە لەخۆيان وەشابۆوە.

## ● قاچاغە ڕێگەکان

لە مێژووی یەکیەتی شۆڕشگێڕانی ئەرمەندا هاتووە دەڵێ:

(( لەسەردەمی – یەکیەتی شۆڕشگێڕانی ئەرمەن -دا، یانی ئەو حیزبەی پێش تاشناق، ناوچەی – ئەدرباداغان[*]- ڕۆژاوای ئێران، بەتایبەت سێ گۆشەی تەورێز، سەلەسەد، ماکۆ وێستگەی سەرەکی گواستنەوە چەك و چەکدار بووە بۆناو ئەرمینیای ترکی و وبۆ (فاسبور ئاغا – ڤان). هەردوو ڕێگەی قارس - باسین و یەریڤان – سورمالو، بەتایبەت یەکەمیان، هەتا ئەم دوایییە ئەبێ ئەو بایەخەیان ئەبوو، خەسڵەتە کەمەکانی ناوچەی – ئەدرباداغان - بۆ ئەو چاوپۆشیە باشەی دەستەلاتدارانی فارس بە گشتی دەگەڕێتەوە.

نووسینگەی تەورێز بە شێودیەکی بنەڕەتی پێکهاتبوو لە: هۆڤنان – تافتیان، هۆڤسیب ئیشخان ئەرغوتیان، نیگۆل دومان- ئیغو غایوس درهوڤها نیسیان.

ئەمانە وەك مامۆستا لەوێ جێگیر بوون، وەك کەسایەتی دیار ئەم پارمەتیدەرانەشیان هەبوو: ساتینغ مادینیان (دزاغیغ) فارتان ( سرکیس میهرابیان)، قەشەی سەرەکی لە دەیری ((دیریك)) ئەب بکراد تافاکالیان (زاکی) سیفکاریتس ساکۆ، سەرکیس تۆهانجانیان (فرهد)، گالوسد ئەلویان( دەروێش، توروس)، غارو (ئەریسدا کیس زرویان) وهی تریش.

لەو ساڵانی دابێ هەندێ چالاکوانانی تری تاشناق لە (ئەدرباداغا) کاریان دەکرد، لەوانە: ستیبان ستیبانیان (بالاجان) ، دوکتۆر گەرەبێت باشایان

---

[*] ئەدرباداغان: مەبەست لە ئازەربایجانی ڕۆژاوایە لە ئێران ((وەرگێڕ))

(تاباریغ)، سەمسۆن تادیوزیان (کاریکین)، ئەرمیناغ ئۆخیجیان (سلاك).
هەندێ لەمانە (بەتایبەت : توروس و غارۆ و ساکۆ) بە ڕێکوپێکی دەچوون بۆ ڕووسیا بۆ چەك کڕین، تا بیگوازنەوە بۆ تەورێزو سلمسد، کە لێرکانی چەکەکان لە کارخانەکانی یەکیەتی شۆرشگێرانی ئەرمەن کۆدەکرانەوە، بەڵام ئەوانی دی (بەتایبەت: هۆفسیب ئەرغۆتیان، نیگول دومان، فرتان و فرهد) ئەوپەڕەکەی دەچوون بۆ ڤان تا بەشەخسی خۆیان سەرپەرشتی و چاودێری ئەرکی گواستنەوەی چەك و زەخیرەکان بکەن، لەمەدا سەرۆکایەتی ئەو دەستە و کۆمەڵە گیانفیدایانەشیان دەکرد کە چەکەکانیان دەگواستەوە.

زۆر کەرەت لەو شەڕانەشدا بەشدار دەبوون کە لەگەڵ کۆمەڵە کوردەکان و سوپای ترکدا دەبوو بە تووشویانەوە، دیارترین پێکادانێکیان شەڕەکانی (بوغاز- کیاسان، دیریك) بوو کە (نیگول دومان) سەرکردەیی دەکردن[٩٤].))




**نەخشەی ژمارە ١- ٥**

**ئەو قاچاغە ڕێیانەی یاخیبووە ئەرمەنەکان دەیانگرتە بەر**

مسۆگەركردنى ئـەمن و سـەلامەتى ڕێگـەكانى قاچـاغ و ئـاودیوكردنى چـەك، يـەك لـە مەرجـە گرنگـەكانى شۆڕشـى ئەرمـەن بـوو، زوربـەی ئـەو چەكانەی كە ياخيبووانى ئەرمەن بەكاريان دەهێنا بەشێوەيەكى بنەڕەتى لـە ئيمپراتۆريى ڕووسياوە دەهـاتن [٥٩]. تفـەنگ و دەمانچـە و فيشـەك و دینامیـت كـە دەهێنرايـە سـەڵتەنەكەوە لـە باكووردەوە دەهاتـە هـەرێمى ئـەرزڕۆم و لـە ڕۆژهەڵاتدا بەئێرانـدا بـۆ نـاو هـەرێمى ڤـان، هەرچـەندە ڕێگەكـە لـە ئێرانـەوە دورتربوو بەڵام ئاسوودەتر و ئومانتربوو، ڕووسەكان دەوريەيەكى چڕو پڕيان لەسەر سنوورى خۆيان و عوسمـانى بڵـاوكردبۆوە و چـاودێريان دەكـرد، بـەڵام لەلای سنوورى ئێرانەوە وا توند نـەبوو و گوێيـان نەدەدايـە، ئێرانيـەكان زۆر بەكەمى دەوريەكانيان دەنارده سەر سنوور، تـا ڕادەيـە شۆڕشـگێڕەكان نيمچـە دەستـەڵاتدارێكبوون بەسـەر ناوچـەی سـەڵماس – ديلمانـدا، لێـرە دەيانتوانى چـەكەكان عەمباركـەن و پيلان دانـێن بـۆ پـەلامارو داگيركردنـى سـەڵتەنەی عوسمانى.

دواتــر، ڕاســتەوخۆ لــە ڕووســياوە بڕێكــى زۆر تفــەنگ و دەمانچــە و زەخــيرەی شــەڕكردن بــە ئێرانــدا دەهێنرايــە هــەرێمى ڤانــەوە، بــەڵام لــە نــەوەدەكانى ســەدەی نــۆزدەدا، قاچاغچيـەكان ناچـاربوون وريـاتر بـن. لـە بازاڕەكانى بەشى ڕووسياى باشوورى قـەفقاس چـەك و تەقەمـەنى بەوپـەڕى سەربەسـتيەوە و بـە ئاشـكرا دەفرۆشـرا، ئەرمەنـەكان بـە تايبـەت (تـولا و تەفليس) كە كارخانە و عەمبارى چەكى ڕووسيايى لێبوو، دەيانتوانى بيكڕن، چونكە قـانوونى قەدەغـەكردنى هـەناردەكردنى چـەكيش لـە ئـارادابوو، ئـيتر قاچاغچيەكان دەچوون چـەكەكانيان هەڵدەوەشـاند و بـە پارچەپارچـەكراوى بە سنوورى ڕووس - ئێراندا ئاوديويان دەكرد، لەژێر كاڵای تـر و بـەروبوومى كشتوكاڵدا دەيانشاردنەوە و دەيانـنـا لـە گاليسكەو عەرەبانـە و لـۆرى (ئەگـەر ببوايە)، پاسەوانە سنووريەكانى ڕووسيشيان دەمچەور دەكرد يان لەوانەيە

گەورەکانیان فەرمانیان پێ دابن کە چاوپۆشیان لێ بکەن، چونکە کارێکی ئاوا گەورە و بەرچاو جێی باوەڕ نییە هەروا تێپەڕێ و سووک و باریک سەرکەوتووبێ.

سەنعەتکارە ئەرمەنەکان، ئەوانەی پێشتر لە کارخانەکانی چەک و تفاقی شەڕ لە (تولا) کاریان کردبوو، لە کارگەکانی چەک لە تەوێز و سەلمان دیسان چەکە هەڵوەشاوەکانیان دەم یەک دەدایەوە و عەمباریان دەکرد یان دەنێرران تا لە رۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵ بەکاربهێنرێن[96].

لەو کاتەی قاچاغچیە ئەرمەنەکان سنووری عوسمانیان دەبری تا لێرەدا بەرەورووی مەترسی گەورە و ڕاستەقینە دەبوونەوە، ئەو عەشایرە کوردانەی کە لەمدیوو لەودیوی سنووردابوون ببوونە مەترسیەکی چاوەڕوانکراو بۆیان، چەکەکان بە نرخ و بەبەهابوون، شیاوی ئەو هیلاکی و ئەزیەتە بوون کە قاچاغچییەکان دەیانچەشت، شۆڕشگێڕانی ئەرمەن ئەیاری گەلێ عەشرەتبوون، بەلام ئەک هەموشیان[97]. سەرەڕای ئەوەش عوسمانێکان پاسەوان و دەوریەی زۆر و چڕیان لەسەر سنوورەکەیان دانابوو، بە پێچەوانەی ئێرانیەکانەوە، تا ئەو پەڕی ورویایی و چاوکراوەیی ئاگاداری سنوورەکە بوون، بەتایبەت ئەبا شۆڕشگێڕان پەلامار بدەن، شۆڕشگێڕەکانیش بەهۆی ئەو مەترسیانەی دەوریان و بۆ پاراستنی بارەکانیان دوو جۆر سیاسەیان دەگرتە بەر:

یەکەم/ لەوەدابوو کە توونترین ڕێوشوێنێکی ئەمنیان دەگرتە بەر، گوندە ئەرمەنیەکانیان کردبووە بنکە بۆ خۆیان و عەمباریش بۆ چەکەکانیان، خەڵکی ئەو گوندانە ببوونە هەوالگریان، هەرچی جووڵەی سەرباز و عەشایرێك بووایە گورج پێیان دەگەیاندن. تا شەو دادەهات لەو گوندە سنووریانەدا دەمانەوە، ئینجا دەپەڕینەوە بۆ گوندە نێزیکەکانی دی لە بەری عوسمانی، ئەمە بە ڕێنمایی و چاوساغی دانیشتوانی ئەو ناوە، بە

جلوبەرگی کوردیەوە شەوانە لەم گوندی ئەرمەنیەوە دەگەیشتنە گوندێکی ئەرمەنی دی. بەپشتبەستن بە شوێنی پێکادان و تەقوتۆقەکان و راپۆرتی هەوالگرانیان. عوسمانێکانیش توانیبوویان سێ رێگەی سەرەکی قاچاغ لە ئێرانەوە بۆ ناوشاری ڤان بدۆزنەوە و دەستنیشانیان بکەن:

(( لە یەریڤانەوە بۆ (ئاه) تا دەگاتە گوندی (بایی سیك)ی ئێرانی، لێرەشەوە بۆ (کارئەدیرە) ئینجا بۆ شاخی (ئیزابیە)و شاخەکانی (کۆزلۆکا) و تا دەگاتە ناو ڤان.

چەکەکان دەگوازرانەوە رۆژاوای ئێران ئینجا لە (فار)ەوە بە شاخی (جیریبیران)دا بۆ شاخی (ئاهتا) و شاخی (تەرکاف) تا دەگاتە ڤان.

چەکەکان دەگوازرانەوە رۆژاوای ئێران ئینجا لە (هوکانفان) و(کالاساد)ەوە لە ئێران و بە رووباری (دوشڤان)دا تا (کارا هیساری عەبدوللا ) ئینجا گوندی (کیشیشگول) و بە شاخی (ئیریرك)دا تاناو ڤان[98]))

جگە لەم سێ رێگەیە، هێزە ئەمنیەکانی عوسمانی لەوە ئاگاداربوون کە سێ قاچاغە رێی نهێنی تر هەس، بەڵام ئەیان دەتوانی بە وردی شوێنەکانیان دیاری بکەن. دەبێ ئەو رێگەیانە بێت کە کەوتبوونە سەروو و خوارووی ئەو سێ رێگەیەی کە دەزانران، هەروەك و لەم روونکردنەوەیەدا دەردەکەوێ، لەوپەڕی باشووری ئێرانەوە چەك بە قاچاغ دەگەێنرایە ناوچەکانی (بشکالە – هوشاب - جاتاك)، دەشبێ زۆر گەرەت ئاڵوگۆڕ لەو رێگایانەدا کردبێ[99].

ئەمەش بە پێی ئەوەی لە (مێژووی یەکیەتی شۆڕشگێڕانی ئەرمەن)دا هاتووە، لە ئەوەدەکانی سەدەی نۆزدەدا رێگەیەك لە باکوورەوە کرایەوە، لە یەریڤانەوە راستەوخۆ بۆ بایەزید تا دەگەیشتە ڤان، هەروا رێگەی باشووریش بۆ ڤان بەکاردەهات، وە رێی فارس کە لە باکوورەوە بوو، ئەمانە بۆ ئاودیوکردنی چەك بۆ ناوچەی ساسۆن[100].

دوودەم/ سیاسەکە قاچاغچیە شۆڕشگێڕەکان پەیڕەویان دەکرد ئەوەبوو

کە هاوکاری و یارمەتیدانی نێوان کورد و ئەرمەنیان زیاتر دەچەسپاند و بەتەنگیەوە بوون و پەرەیان پێ دەدا، ئەو سەرۆك هۆز و عەشایرە کوردانەی کە بەرهەڵستی دەوڵەتی عوسمانیان دەکرد ئامادەبوون کە کارئاسانی بۆ ئەو قاچاغچیانە بکەن بەرامبەر بەرتیل و چەك، (کوب محەممەد) کە لە عەشرەتی حەیدەرانی بوو لەبەرامبەر ئەو چەك و زەخیرەیەی کە لەوانەوە دەستی دەکەوت یارمەتی گواستنەوەی چەکی دەدا، لەگەڵ ئەوەی کە ناوچەکەی ژێردەستی دەکەوتە ئەوپەڕی خوارووی هەرێمی ئەرزرۆم لەسەر سنووری ئێران. ئەم پیاوە ڕێیدابوو بە شۆڕشگێڕەکان کە گوندێکی گەورەی وەك (کاجان) بکەنە وێستگەیەك لە ڕێی هاوردەکردنی چەك و عەمبارکردنی تیایدا [101].

لە قوڵایی باشووریشدا، لقێکی (شیکیفتی) کە لە عەشرەتی شوکاك ببۆوە، لەگەڵ شۆڕشگێڕاندا ڕێکەوتبوون کە هاریکاری یەکترکەن لە ناودیوکردنی چەکدا، ئەمەیان هەر زۆر سەیربوو، وەك لە بەشی چوارەم هاتووە، (شەریف)ی سەرۆکی شیکیفتی لە ساڵی ١٨٩٧دا لەگەڵ شۆڕشگێڕاندا کەوتە شەڕێکی خوێناویەوە، بەڵام لە ساڵی ١٩٠٨ پەیوەندییەکانی نێوانیان مووی بەبەینا نەدەچوو، شەریف بۆ ڕێکخستنی تەرتیباتی ئامدیوکردنی چەك لە ئێرانەوە عەبدوڵلای کوڕی ناردە ئێران تا لەگەڵ یاخیبووە ئەرمەنەکاندا کۆبێتەوە و وتووێژ بکات [102]. عەبدوڵڵا پێی ڕاگەیاندن کە:

شێخ ئاماژە بەوە دەکات کە ئەو ئەرمەنانەی نامە دێنن و دەیبەن ترسیان نەبێ، پارێزراون، پیاوەکانی خۆیشی کەلوپەلەکان دەگەیەننە هوشاب. هەروا: لەم قۆناغەی ئیستەدا بەباشی نازانێ کە شۆڕشگێڕان بەچەکەوە بە خاکی ئەماندا تێپەڕن. لەوانەیە لە ئایندەدا ڕێگەی ئەمەشیان بدرێ.

بەمجۆرە ئەرمەنەکان ناچار کران کە متمانە و باوەڕی خۆیان بخەنە

سەر شێخ و لەمەوە تۆوی گومـان چـەكەرەی كـرد. بـەڵام ئـەوەی جێـی باسـە ئەوەیە كە تۆمارە عوسمانی و دیپلۆماتەكان لە دوای ساڵی ١٩٠٢وە باسـی هـیچ ملمڵانێ و پێكادانێكی نێوان (سادق)* و شۆڕشگێڕە ئەرمەنەكان ناكەن وەك ئـەوەی كـە لـە نێـوان ئەرمـەن و سـەرۆكەكانی تـردا دەقـەوما، لـەوە دەچـێ دابەشكردنی كارەكان لەنێوان شێخ و یاخیبووواندا بەری خۆی هەبووبێ[١٠٤].

لە ساڵی ١٨٩٨ دوای تێپەڕینی دوو سـاڵ بەسـەر یاخیبوونەكـەی یەكـەمی ڤانـدا، ویلیـامزی كونسـوڵ دەربـارەی خۆچـەكدارکردنی ئەرمـەن لـە ڤـان و ئێراندا كۆڵینەوەیەكی ئەنجام دا، وای تەقدیر كـرد كـە ئەرمـەنی ڤـان بـەلای كەمەوە هەزار تفـەنگیان هـاپێ، زوربـەی لـە جـۆری (بـیردان)ە كـە پێشـووتر بەشـێكبووە لــە چــەكی ئاسـایی بەدەسـت ڕووسـەكانەوە. وە (مـارتینی)ش لەناوانـدا هـەبوو، لـەو جـۆرەی كـە سوپای عوسمـانی دوایـی بـەكاری دەهێنـا، سەرەڕای ژمارەیەكی نادیار لە تازەترین چەكی وا كە دروستكراوی ڕووسیایە.

ویلیامز وای مەزندە دەكـرد كـە شۆڕشـگێڕان خۆیـان هەمیشـە (تفـەنگی تــازەی ڕووســی)یان بەشــانەوەیە[١٠٥]. بــەڵام چــەكە كۆنــەكانیان بــەباقی ئەرمەنەكانی تر دەفرۆشتەوە.

سەرەڕای كاری قاچاغچێتی، هەندێ ئەرمەن ئەو چەكانەی هەیانبوو لـە كوردەكانیــان كڕیبــۆوە، دەوڵــەتی عوسمــانی ئەوســا یەكــەكانی ســوارەی حەمیدییــەی بــە تفــەنگی مـارتینی چـەكدارکردبوو، ئەمــە لـە نـەوەدەكانی سەدەی نۆزدەدا كە كارە یاخیبوونەكان پەرەی دەسەند.

جا هەندێ لەو كوردانەی ناو سوارەی حەمیدییـە ئـەو تفەنگانـەیان بـە ئەرمەنەكان دەفرۆشتەوە، دەشێ پارەكەیان بەلاوە باشتر بووبێ لـە پاراسـتنی گیانی خۆیان لە دەست شۆڕشگێڕەكان لـە ئاینـدەدا، بـەڵام كوردەكـانی وڵاتـی

---

* لــە ڕاســتیدا: ..... پێكــادانێكی نێــوان (شــەریف) و شۆڕشــگێڕە ئەرمەنــەكان... (وەرگێڕ)

فارس لە بازرگانیکردنێکی ئازادی سوودبەخشابوون، بە کڕینی تفەنگە کۆنەی ڕووسی لە ئێران و دەیانگەیاندە سەر سنوور و لەوێ دەیانفرۆشتەوە بە شۆڕشگێڕەکان. جارێکیان هەواڵ هات کە چەند سەربازێکی یەدەگی عوسمانی تفەنگەکانیان دەفرۆشنەوە، هەرچەندە لەسەرەتای ١٨٩٥ەوە فرۆشتنی چەك ڕاگیرابوو[١٠٦]. دیارە بەرپرسانی عوسمانی بۆ ئەم نامدیوکردنە کاراسانیان کردبوو، بەتایبەت بۆ پۆلیسەکانی لادێکان، ئەمانە چەند مانگێك بوو مووچەکانیان وەرنەگرتبوو یان کە وەریشیان دەگرت بە کەم و کورتی.

ئارام ماتوکیان گورج ئەو هەلەی بە ئاسانی قۆستەوە، لەمەدا ئازایەتیەکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بەرتیلە فورسانەی کە دەدران لە بەرامبەر ئامدیوکردنی چەکەکان و بەدەستخستنی زانیاری پێشوەخت دەربارەی ئەو کار و ڕێوشوێنانەی کە دەوڵەت دەیەوێ پیادەیانکات دژ بە شۆڕشگێڕان.

## ● چالاکیە شۆڕشگێڕیەکان

هەرچەندە لە نەوەددکانی سەدەی نۆزەدا شۆڕشەکەیان شکستی هاورد و پیرۆزی لە چارە نەنووسرا، بەڵام نیەت و مەبەستەکەیان هیچ نەگۆڕا، وەك جاری جاران سیاسەی وروژاندنی کارە تۆڵە سێنەکانیان پەیڕەو دەکرد، ئەوەش وەك وتمان بۆ گردکردنەوەی دەستێوەردانێکی ئەورووپاییانە لە دۆزەکەیان[١٠٧]. بەڵام گۆڕان بەسەر سەرکردایەتی شۆڕشەکەدا نەهات.

(ئەرمیناکان) لە دانیشتوانە ناوخۆییەکانبوون، یانی لەو ئەرمەنە عوسمانیانەی کە بۆ دۆزەکەیان تێدەکۆشان، شۆڕشەکانی یەکەمجار بەر لەهەمووان حیزبی هانشاك ڕابەرایەتی دەکرد، لە ئەرمەنەکانی ناوخۆوە لایەنگیریەکی بەهێز دەکرا، بەتایبەت لەناوچەکانی زیتون و ساسۆن، دوای نووچدانە یەك لە دوای یەکەکان و قوربانیەکی فرە لە ئەرمەن وادەردەکەوت کە ئەرمەنە لادێییەکان ئیدی ئامادە نەبن کە لایەنگری و

پاڵپشتی لە ئاوا رێکخراوێك بکەن، هەر نەبێ بۆ ماوەیەکی کەم خۆیان لێ بکشێننەوە، دیارە سەرکردایەتیەکەش چ لای ئەرمیناکانەوە چ لای هانشاکەوە شکستی خواردبوو، بۆیە حیزبی تاشناق کاروباری گرتە دەست و ئاڵای شۆڕشەکەی گرتە دەستی خۆی، دەرکی بەوەکرد کە تەقەللاکانی ئەوانی پێشوو پلانی ورد و بە ئاگا و هەماهەنگیان پێوە نەبوو، ئەم خاڵی لاوازە ببووە هۆکاری نسکۆیەکی یەکجارەکی.

بەم هۆیەوە تاشناق رێکخەری وەك (ئارام مانوکیان)ی لە ڕووسیاوە هاورد تا ڕیزەکانی ئەو جەنگاوەرە پەراگەندانە رێکخاتەوە کە لە ئەوەدەکانەوە دەجەنگان، سەرکردە ناوخۆییەکانی ئەمانەیان لادا و شانەیەکی ئەرمەنی ڕووسی سەرپەرشتی دەکردن، نەك ئەمە لە واقیعدا هەر زوربەی ئەو ڕابەر و چاودێرانەی کە ئەرمەنەکانیان رێکدەخستەوە و مەشقیان پێدەکردن ئەرمەنی ڕووسیایی بوون.

کونسۆلی بەریتانیا لە ڤان، ئەقیب تیریل، سەردانێکی (مووش)ی کرد، تەنیا بۆ لێکۆڵینەوە لەو یاخیبوونە ئەرمەنیەی کە لە ناوچەی (مووش - ساسۆن)دا بەرپا بوو، لە نەخۆشخانەکەی مووشدا چاوی بە یەك لەو شەڕوانە زۆرانە کەوت کە لە ڕووسیاوە ئامدیوی ناوچەکە ببوون...

لە ڕاپۆرتەکەیدا دەڵێ:

(( لە وەڵامی پرسیارەکانمدا دەیگوت: مامەڵەیەکی زۆر باش کراوە، زۆر سوپاسی ئەو بەتەنگەوەهاتنەی نەخۆشخانەکە دەکات کە بەرامبەری نواندویانە، ناوی (گریگۆر میرزا بیگۆڤ)ە و خەڵکی (ئەلیکساندرۆبول)ە و باوکیشی قەشەیە، لە دەوروبەری ٢٥ ساڵاندایە، ڕەنگ و ڕوویەکی ئەرمەنیانەی تۆخی ها پێوە نەك ڕووسیایی.

لەوە گەیشتم کە لە بەتالیۆنی (کاربازر کنسکی) لە (ئەلیکساندرۆبول) سەرباز بووە، پاش دەرچوونی لە تاقیکردنەوە، گورج رێگەی پێدراوە کە

بچێتە پاڵ سەربازە یەدەگەکان، ئەوەش بەوەی باروزرووفەکەوە. وەك خۆی دەیگوت. سەرکردەی دەستەیەکی پەنجا نەفەری بووە کە ترکەکان ئەم پلەیە بەواتای (مولازم) لێکدەدەنەوە یانی (لێفتینانت). بەڵام لە ڕاستیدا تەنیا لە نەفسەرێکی پلە نزم دەکات.

دەڵێ کە تەمەنی هەژدە ساڵ بووە، ئەندامی لیژنەیەك کە (گوروم)ی پێ دەڵێن ناوەکەی لە لیستی شۆڕشگێڕاندا تۆمارکردووە، ساڵی ڕابردو پاش ئەوەی خزمەتی سەربازی تەواو کرد، هەر ئەو ئەندامی لیژنەی کورومە پێی ڕاگەیاندووە کە دەشێ بڕوا بۆ ترکیا و بداتە پاڵ شۆڕشگێڕەکانی ئەوێ. بەڵام ئەم ئەوەی ڕەتکردۆتەوە و ویستوویە شتێ بەرتیل بدات تا بیبەخشن، پێیان ڕاگەیاندووە کە مەسەلە پارە نییە بەلکو ئەوەی مەبەستیانە پیاوێکی وەك منە کە مەشقی سەردبازی تەواو کردبێ و شارەزایە.

پێم گوت کە من ئەم قسانەم بەلاوە سەیرە، چونکە لە ڕووسیادا ئەم جۆرە کەسانە دەوڵەت و پۆلیس دەیانپارێزن. لە وەڵامدا گوتی پۆلیس ناتوانێ لە دەست شۆڕشگێڕان بمپارێزێ، ئەگەر سەرپێچی ئەو فەرمانەی بکردایە دەکوژرا.

نەیتوانی یان با بڵێین نەیدەویست پلانەکەی شۆڕشگێڕانم پێ بڵێ بۆ ئەو هەڵمەتەیان، وا خۆی دەردەخست کە زۆر کەم لەبارەی شەڕەکانەوە دەزانێ، دەیگوت: هەرچەند نەفسەرێکبووم لە یەدەگی ڕووسیادا بەڵام لەناو شۆڕشگێڕاندا تەنیا شەڕوانێکی ئاسایی بووم، تەقەم دەکرد و فەرمانەکانم جێبەجێ دەکرت. پیلان و نەخشەی سەرکردەکانم نەدەزانی و یان ئاخۆ لە پشتمانەوە چی ڕودەدا و من ئاگام لێ نییە.

لەسێی ئایار / مایۆ لە شەڕی دووەم کە هێرش دەکەنە سەر (جیلی غوزان) بریندار کراوە.

دوایی لێم پرسی ئاخۆ بەچ مەبەست و ئامانجێ تۆ و هاوڕێکانت

هاتوونە تركيا بۆ شەڕكردن؟ لە وەڵامدا گوتى: تۆ باش دەزانى كە ئامانجمان مردنە[١٠٨]. ))

بە پێچەوانەى ئەو شۆڕشە بەربڵاوانەى ترى لەوەبەر، سەرەتا تاشناق هێزەكانيان كردە ئەو ناوچانەى كە زياتر مەيليان بەلاى ياخيبوون و هەڵگەڕانەوەوە هەيە و كار بۆ وروژاندن و تۆڵەسێنى دەكەن، بەمانا ناوچەى مووش - ساسۆن.

ساڵى ١٨٩٦ - ٩٧ لە كۆنگرەى تاشناق لە تەفليس، دوو ئامانجى تەكتيكى ديارى كران كە لە ساڵەكانى ئايندەدا هاتنە وارى جێبەجێكردنەوە: چڕكردنەوەى هێزەكانى تاشناق لە ناوچەى ساسۆن و چەكداركردنى دانيشتوانەكەى. رێكخستنى هەڵمەتێكى موچيارى و تەمێكردن لە (ئەدرباداغان- ناوچەى سەلماسى ئێران) هەتا (ڤاسبوراغان- هەرێمى ڤان)[١٠٩].

هەروەك لەبەشى چوارى ئەم كتێبەشدا هاتووە، ئامانجى دووەم گورج جێبەجێ كرا. ئەرمەنەكانى ساسۆن چەكدارن و مەشقيان پێ كرا، بەڵام ئەم كارە شەش ساڵى خاياند.

هەرچى بەڵگە و نووسراوە ئەوروپايى و عوسمانيەكانە ئاماژە بەوە دەكەن كە شۆڕشگێڕان بە كۆمەڵى هيچگار زۆر لە كۆتاييەكانى سەدەى نۆزدەدا لە ڕووسياوە پەڕيونەتەوە بۆ ناو سەڵتەنە، راستەوخۆ لە سنوورەوە بەرەوخوار ◘ گەيشتوونە هەرێمى ئەرزڕۆم وەيان بە ئێراندا بۆ هەرێمى ڤان[١١٠]. لە باكوورەوە سنوورى ڕووسيايان لە هەرێمى ئەرزڕۆمەوە دەبەزاند و لەوێشەوە ڕووەو باشوور بۆ بەتليس.

لە ساڵى ١٨٩٨دا وردەورد تەقوتۆق لەنێوان شۆڕشگێڕ و سەرباز و عەشايرەكاندا تا گەييە شەڕى بەرفراوان پەرەى سەند. زۆر كەرەت ئەرمەنەكانى ناوخۆ لەناوچەكانى مووش، بەتليس و ساسۆن دەياندايە پاڵ هێرش بەران[١١١]. زۆر كەرەتيش سەربازە عوسمانێكان ئەيان دەهێڵا

یاخیبووان بپەڕنەوە (ناچار زۆر جار ئەو کەتیبانەیان بۆ شەڕەکان دەهێنا کە لەوبەر شەڕیان لەگەڵ یاخیبووان کردبوو) بەڵام دەستە و کۆسەڵە ئەرمەنەکان بەزۆری هەڵدەهاتن بۆ سنووری ڕووس دوایی دیسان هەوڵی گەڕانەوەیان دەدایەوە[112]. ئیتر لە هەرێمی پەتلیس شەڕ گەرم دەبوو.[113]

لەکۆتاییەکانی ساڵانی نەوەدی سەدەی نۆزدە، دەگرا سنووری نێوان سەڵتەنەی عوسمانی و ئێران بە ناوچەیەکی شەڕ دانری، شۆڕشگێڕانی ئەرمەن و هەوادارانیان لەگەڵ لەشکری عوسمانی و پاسەوانانی سنوور و هەندێ عەشایری کورد لە شەڕدابوون، جاروبار سەربازانی فارس و عەشایری کوردی تریش لەگەڵ شۆڕشگێڕان دەبوونە هاوپەیمان، دەڤەری خۆی و سەڵماس کە نیمچە دەستەلاتێکی یاخیبووانیان تێدابوو، ببوونە وێستگەیەك بۆ وەرگرتنی چەك و ئازووقە و پێداویستی تری شەڕ[114].

بەڵام ئەو بەڵگانەی کە وەك ڕوداو و چیرۆك بگێڕرێنەوە و ئاماژە بن بۆ هەڵگیرسانی شەڕی خوێناوی وا کە هیچ کام لە لایەنەکان تەنیا تۆزقاڵێ هەستی بەزەییان پیشاننەدابێ، وان لەبەردەستدا [115]. وا دەردەکەوت کە کاری سنووربەزاندن لە ڕووسیاوە بۆ هەرێمی ئەرزڕۆم زۆر بووبێ یان بەلانی کەم ژمارەیەکی زۆری لێ تۆمار کرابێ.

شۆڕشگێڕان کە ئاشکرا دەبوون دەکەوتنە شەڕەوە لەگەڵ سەربازە عوسمانێکان و عەشایرە کوردەکانەوە [116]. بەڵام ئاگرێ گشت ئەو و سەدان شەڕانەی کە لە نووسینی دیپلۆماتکارەکاندا تۆمارکراون بژمێردرێن، لێرەدا هەندێکیان وەك نموونە دەخەینە ڕوو:

لە ئەیلوول / سەپتامبری ١٨٩٨ لە نێزیك (مالازگیت) چەند شۆڕشگێڕێکی ئەرمەن کە لە ڕووسیاوە دەهاتن لە لایەن سوارەی حەمیدییە و دەستەیەك لە پیادەی نیزامییەوە ڕاونران و زۆریان گوژران، هەر لەو مانگەدا زیاتر لە ٥٠ شۆڕشگێڕ کە لە باکوورەوە کرابوون بەمەدیودا لە شەڕی

نێزيك مووش كوژران، بەشێكى تريشيان لە (توتاك) دەستگير كران، ديلێك كە لە (مالازگيرت) دەستگيركرابوو دەيگێڕايەوە كە دەستەكەيان يەك لەو سێ دەستەيەبوو كە سنووريان بەزاندبوو[١١٧].

لەسەرەتاى مانگى تسرينى يەك / ئەكتۆبەرى ١٩٠٢ سێ دەستە لە شەڕوانان لە شوێنى جياجياوە سنوورى ڕووسيان بڕى (يەكيان بريتيبوو لە ٨٠ بۆ ١٠٠ كەس، دووەم ٦٠ كەس بوون، سێيەم ٥٠ كەس) هەركام لەمانە لەگەڵ سەربازانى عوسمانيدا پێكاهەڵپژان و دواييش شكان ئەوەى ڕزگاريبوو يان هەڵات و چۆوە ئەوديو يان لە گوندە ئەرمەنەكانا خۆى شاردەوە. شەڕەكان وا تەنينەوە تا ئەو گوندانەشى گرتەوە و كوردى غەيرە نيزاميش تياياندا بەشداربوو، دياره بێتاوانێكى زۆريش لەو شەڕانەدا گرفتار بووە[١١٨].)

لە ساڵى ١٩٠٢ لە ڕاپۆرتەكەى لێفتێنانت كە لۆنێل (مونسل) كە كارى كونسوڵى بەريتانياى لە ڤان گرتبووە دەست، ئەوە هاتووە كە كۆمەڵە ئەرمەنێك ٢٠٠ كەس بوون سنوورى ڕووسيان بەزاندبوو، كونسوڵ دەڵێ: (دەبێ ئەمانە هەروەك كۆمەڵەكانى ساڵانى ڕابردوو بەهۆى دەستتێكەڵكردنيانەوە لەتەك پاسەوانە سنوورييەكانى ڕووسيا توانيويانە بێن بەمديودا، چونكە خاڵى چاودێرى ئەو پاسەوانانە زۆرە و بەتونديش چاودێرى سنوورەكە دەكرێ. بۆيە بە زەحمەت كۆمەڵێكى ئاوا بەم ژمارەيە بتوانێ تێپەڕێ و ئاشكراش نەبێ... تەنيا ئامانجى ئەمانە ئەوەيە كە وڵات هەر نا ئارامبێ و دۆزى ئەرمەنيش هەر بمێنێ، بيانوويەكيش بدرێتە دەست ڕووس كە پێويستێتى، تا ئەگەر هەلێكى لەبار ڕەخسا خۆ تێهەڵقورتێنێ و بێتە ناوەوە .)

مونسل ئاماژە بەوە دەدا كە كاتێ عوسمانێكان لەبەردەو ڕووبوونەوەى ئەو تاقمانەدا سەركەوتن، هەوڵێكى زۆر گەورە دەدرا كە ئەو ڕووداوانە وەك كوشتار لە ئەرمەن بخرێنە ڕوو، كە ئەمەش بۆ ڕووسەكان هێنانەدى

ئامانجیان بوو لە شلۆقکردنی باری ئاسایی وڵات.[19])

مونسل لەم قسانەیدا ڕاستی پێکاوە، ئەوانەی کە سنوریان دەبڕی و دەهاتنە ئەمدیو پیلانیان ئەوەبوو کە ئاگری یاخیبوونێکی بەرفرەوانی گەورە هەڵگیرسێنن، وەك چۆن لە ١٨٩٤ بۆ ٩٦ کردیان، ئەو ڕاپۆرتانەی باس لە کوشتار و کۆمەڵ کوژیش دەکەن وان لە خزمەت ئامانجەکانی ئەواندا، لە ساڵی ١٩٠٣ لە سنوورەوە ١٣٠ چەکدار پەڕینەوە کە خەریکبوو ڕووەو باشوور ملبنێن، بۆسەیێکیان بۆ یەکەیەکی ئەسپسواری سەربازەکان نایەوە، لەمەدا دوو ئەقیب و لێفتینانتێك و حەوت سەرباز کوژران، لەو کاتەی کە یەکە عوسکانیەکە داوای یارمەتی دەکرد، یاخیبووان کەوتنە شێواندنی لاشەی کوژراوەکان، بەپێی (تیریل) کونسوڵی بەریتانیا: (وایاندەزانی کە ئەم کارانە وا لە عوسمانێکان دەکات کە لە ڕقدا قەسابخانەیەك بەرپاکەن و چی خراپە بەو گوندانەی بکەن کە دورن لە شەڕەکەوە و بێزیانن، بەمەش سەرنجی دەرەوە بۆ دۆزەکەیان ڕادەکێشن.)

لە واقیعیشدا ترکەکان تۆڵەیان لە گوندەکان نەکردەوە بەڵکو سەربازی تریان هێنا و یاخیبووەکانیان کوشت، بەڵام گورج ڕاپۆرتە هەواڵیەکان وا بڵاوکرانەوە گوایە سەربازەکان گوندی (دیلیبابا)ی ئەرمەنیان وێران کردووە. تیریلی کونسوڵ ڕایگەیاند کە: ئەو ڕاپۆرتانەی کە باس لە ڕودانی کاری وەحشیگەری و کوشتار دەکەن لە ڕاستیەوە دورن و درۆن. لە هەقیقەتدا خراپەیەك بەر ئەو گوندە و دانیشتوانەکەی نەکەوتووە. هەتا تیریل پاش چەند ڕۆژێك لە بڵاوبوونەوەی ئەو دەنگۆیە خۆی سەردانی کرد و شەو لەوێ نووست[20]. ئەرمەنەکان تفەنگ و پاسپۆرتی ڕووسیان پێبوو، ئەسپەکانیشیان نیشانەی سوپای ڕووسیان پێوە بوو[21]. (وەك لەوەبەر باسکرا) پەڕینەوە بە کۆمەڵی گەورە گەورە شتێکی دەگمەن نەبوو، بەڵام کۆمەڵە بچووك بچووکەکان بۆ پەڕینەوە لە سنور باشتر و پەسەندتر بوو، هەندێ

کەرەت هەواڵدەرانی دەوڵەت ڕاپۆرتیان لەبارەی سنوور بەزاندنەکانەوە دەدا، سەربازەکانیش بەو پێیە بۆیان دادەنیشتن تا بیانکوژن یان دەستگیریان کەن[122]. بەڵام بێگومان ئەو دەستە و تاقمانەی لە ئێران و ڕووسیاوە دەهاتنە ئەمدیو گشتیان ڕێگریان لێ نەدەکرا، ڕووداوەکانی دوایی هەردوو هەرێمی پەتلیس و ڤان گەواهی ئەوەن کە زوربەیان توانیویانە بێ ئەوەی ئاشکرا بن سنوور ببڕن.

کونسوڵی بەریتانیا لە ۱۹۰۲دا وای مەزندەدەکرد کە شاخەکانی ساسۆن نێزیکەی ۵۰۰۰ بۆ ۶۰۰۰ چەکداری پێومیە، ئەوانە لەوپەڕی ئامادەباشی و مەشقدان، بەسەرکردەیی (ئەندرانیک ئۆزانیان). لەوانەیە ئەم ژمارەیە زیادە ڕۆییەکی گەورەی پێوەبێ و دیارە ژمارەیەك لەو ئەرمەنانەی ناوخۆیشی گرتۆتە خۆی، بەڵام بەبێ هیچ دوودڵیەك ئەوە پیشاندەدات کە ژمارەیەکی زۆر کەس توانیویانە سنوور ببڕن[123].

لە ناوچەکانی شەڕدا یەك هۆکار لە بەرژەوەندی لادێییەکاندا بوو: عوسمانیەکان ناچاربوون کە سەرباز بنێرن بۆ بەرەنگاربوونەوەی داگیرکاران ئەمە لە خۆیەوە دەبووە هۆی بەرکەماڵی ئاسایش لە ناوچەکەدا، هەر بۆ نموونە: (براهیم پاشا)ی ژەنەراڵی عوسمانی لە ساڵی ۱۸۹۸ فەرمانێکی دا بۆ پارێزگاریکردنی لادێ و لادێییەکان لە شۆڕشگێڕان و عەشایر، سەربازی دەنارد بۆ ئەو گوندانەی هەڕەشەیان لێ کرابوو تیا بمێننەوە، ئەو مەڕو ماڵاتانەی کە عەشایرەکان لێیان زەوت کردبوون و تاڵان کرابوون بۆیان بگێڕنەوە.[124]

## ● ساسۆن

لەسەرەتای سەدەی بیستدا ئەرمەنە شۆڕشگێڕەکان لەناوچەی (مووش - ساسۆن) گردبیوونەوە[125]. ئەو ڕاپۆرتانەی کە لەبارەیانەوە درابوو ئیشارەیان

بەوە دەدا کە لە سنووری ڕووسیا و ئێرانەوە هاتوونە ناوچەکەوە، بەڵام سەرکردەکانیان لە سنووری ڕووسەوە هاتوون و ئینجا یاخیبووانی ناوخۆ لێیان گردبوونەوە، ئەمانە ئالآیەکی (شینی نیلی)یان هەڵکردبوو کە وێنەی بازێکی تێدابوو و گشتیان لەژێر فەرمانی (ئەندرانیك)ی سەرکردەیاندا بوون.

بەبێ هیچ بەڵگە و پاساوێك، مەبەستیان لە یاخیبوونەکەیان ئەوەبوو کە کاردانەوەی تۆڵەسەندنەوە بوروژێنن، ئەوەش دەبێتە هۆی دەستێوەردانی ئەوروپاییەکان.

گوندە موسوڵمانەکانی دەوروبەری ساسۆن هەڕەشەیان دەکرایە سەر، سەرەڕای باجگر و فەرمانبەرانی دەوڵەت، ئەو تەفەللایانەی بۆ وروژاندنی کاردانەوە و پەرچەکردار تا ڕادەیە سەری گرت، هەر بۆ نموونە: دانیشتوانی گوندی (هونان) پەلاماری کۆمەڵێ پۆلیسیان دا و کوشتنیان، ئینجا زوربەی ئەو لادێییانە هەڵاتن بۆ شاخەکان هەندێکیشیان بە گوللەی ئەو پۆلیسانە کوژران کە بۆ تۆڵەکردنەوە دوایان کەوتبوون[١٢٦].

دەوڵەت لە ئەگەری دەستێوەردانی ئەوروپایی ئاگاداربوو، بۆیە پەیتا پەیتا ڕێنمایی توندی دەنارد کە دەبێ سەرباز و کوردە غەیرە نیزامیەکان جڵەوگیرکرێن و ددان بەخۆداگرن، لەژێر دەستەڵاتدا دەرنەچن و پەت نەپچڕێنن[١٢٧]. لەسەرەتای مانگی ئەیار /مایۆی ١٩٠٤ سوپای عوسمانی لە (کالیکوزان cheliegŭzan ) پەلاماری نزیکەی ١٥٠٠ یاخیبووی دا، زۆر خراپ شکاندنیان، دوای ئەوانەش کەوتن کە ڕایانکرد و ٢٥ گوندیش لەمەدا سووتێنرا، سەرەتا ئەوروپاییەکان سەرزەنشتی سەرباز و کوردەکانیان دەکرد بەڵام حوکمەت بە توندی ئەمەی ڕەتکردەوە[١٢٨]. جا وەك هەموو جارێك درۆ و بوختان دەربارەی کۆمەڵکوژی و کوشتار هۆنرایەوە[١٢٩].

بەڵام لەگەڵ گەیشتنی ڕاپۆرتەکانی کونسوڵی بەریتانیا، کە خۆی

چووبووە ناوچەکە، ڕاستیەکی دی سەری هەڵدا، لەمەدا (تیریل)ی کونسوڵ دەڵێ: (سەرەڕای ڕەچاوکردنی گشت بار و ڕەوشەکان، ئەو تۆمەتانەی باس لە کۆمەڵکوژی و کوشتارو دەستدرێژی دەکەن، هەروا بەئاسانی ناتوانرێ بهێڵرێتەوە و جێی باوەڕبن)[30].

## • هەرێمی ڤان

لەسەرەتای سەدەی بیستدا ئەگەر ڤان بەراوردکرێ بە ناوچەی (ساسۆن - مووش) تا ڕادەیە هێمن بوو، خواست و ویستی شۆڕشگێڕان هێشتا گەرموگوڕ و قوڵپی دەدا، بەڵام ئەو بەڕێوەبردنە سستەی کاری ڕێکخستن و مەشقپێکردنەی کە ئارام مانوکیان پەیڕەوی دەکرد وای لەو خواست و ویستە گەرموگوڕە کرد کە ڕێکخستنێکی بنیاتنەری لێ بکەوێتەوە.

لەنێوان ساڵانی ١٩٠٠ - ١٩٠٧ ژمارەی ئەو شەڕانەی لەنێوان هێزەکانی دەوڵەت و شۆڕشگێڕاندا قەوما لە هەرێمی ڤان کەمتربوون لەوەی چاوەڕوان دەکرا. بە پلەی یەکەم ڤان ببووە خاڵی تێپەڕبوونی شۆڕشگێڕەکان، بۆیە زۆربەی ئەو وردەورو تەقوتۆقانەی کە لەنێوان سوپا و شۆڕشگێڕانا ڕوویان دەدا بەهۆی ئەو ڕێبەندیەوە بوو کە کرابووە سەر چەك و خەڵکانی سنوور بەزێن لە ئێرانەوە. هەرچەندە زۆربەی ئەو پیاوانەی لە ئێرانەوە بەڕێوەبوون بۆ ناوچەی مووش- ساسۆن لە هەرێمی پەتلیس، بەڵام دەرکەوت کە بڕێکی زۆر لە چەك و تەقەمەنی تایبەتبوو بەوەی لە ڤان دانرێن و عەمبارکرێن، لە بەرامبەردا، لەکاتی تێپەڕینی ڕاخیبووە هەڵاتووەکاندا بە هەرێمی ڤاندا پاش ئەوەی لە ساسۆن شکستیان خواردبوو، لێرەش لێیان دەدرا و کۆڵەی شەڕێکی تر لەملاش بەرزدەبۆوە، کە کۆمەڵێ لە شۆڕشگێڕان بە سەرکردەیی سەرکردەی ڕاخیبووان (ئەندرانیك) کە لە پەتلیسەوە ڕاوەدوو نرابوو.[31]

جێی ئاماژەیە ئەو شۆڕشگێڕانەی کە لە خوار دەریاچەی ڤانەوە

هەڵدەهاتن دوو کەرەت دورگەی (ئەختمار)یان لەناو دەریاچەکەدا داگیرکرد، ئامانجیشیان لەمە بە زۆری بۆ ڕاگرتنبوو بەرەو ئەو ناوچەیەی لە ڕۆژاوای ئێراندا بەدەست ئەرمەنەوە بوو. سەرەنجام لەشکری عوسمانی توانی ئەگەرەکو بە زەحمەتیشبێ یاخیبووان ڕامالی، چونکە ئەوانیش وەنەبێ لە حاڵێکی باشتردا بووبن لەمان.

یاخیبووەکان تفەنگی تازەتر لەوانیان پێبوو، ئەرمەنەکان دەیانتوانی دوراودور لەنێوان دورگەکە و کەناراوەکەدا سەربازەکان بپێکن، بەلام سەربازەکان ئەمەیان نەدەتوانی، ئەمەش وای لە عوسمانیەکان کردبوو کە تۆپخانە بەکاربێنن، کە بووە زیانکەیاندن بە هەندێ کڵێسا. یاخیبووان کە شەوداهات بە بەلەم هەلاتن.

بەپێی دەوڵەت ئەوانەی کە هەلاتبوون خاچێکی پیرۆز و بە بەها و گەلێ شمەکی پیرۆز و بەنرخی تریان بردبوو، کەچی هێشتا ئەوان سەربازەکانیان بە ئەنجامدانی ئەو تالانیانە تاوانبار دەکرد[١٣٢]. شەرە خوێناویەکانی نێوان موسوڵمانەکان و مەسیحیەکان وە مەسیحی و مەسیحیەکان و موسوڵمان و موسوڵمانەکان بەردەوامبوو، بۆ نموونە:

ئەرمەنەکانی گوندی (ناریك) لەلای (غیفاش)ەوە کە پەنای شۆڕشگێڕەکانیان دابوو، لەلایەن جینایەتکارێکی هەلاتووەوە (عەبدولغەفور) ڕووبەڕووی کوشتن بوونەوە، بەمەرجێ شۆڕشگێڕەکان برای ئەو کابرایەیان کوشتبوو.[١٣٣]

بۆ ئەمە عەشایری کورد و دەوڵەت هاوکاری یەکبوون، هەرچەندە ناکۆکی بەردەوامی نێوانیان لەسەر بەردەوروبوونەوەی ئەو یاخیبووانەی کە دەهاتن، بەتایبەت لە خوارووی ڕۆژاوای ڤانەوە، کە ململانێی نێوان شۆڕشگێڕان و عەشایر (وەك لەبەشی چواردا باسکرا) هەر بەردەوامبوو[١٣٤].

لەساڵی ١٨٩٩ نزیکەی ٥٠ جەنگاوەر لە ڕۆژهەلاتی بشکالەوە سنوریان

بەزاند و پەلاماری (شەریف بەگ)یاندا [135]. بەڵام ئەو توانی ڕاویانێ و بیانشکێنێ، لەمەدا کوردێك و سێ لە هێرشبەران کوژران. شۆڕشگێڕان توانیان بگەنە (زینیس) کە هەر دوو کاژێر لە ڕۆژهەڵاتی (خۆشون)ەوە دورە، لێرە لەگەڵ سریەیەك لە سوپای پیادەی نیزامی بەیەکیانادا، ئەنجام سێ لە ئەرمەن کوژرا و یەکیش دەستگیر کرا، والی لەمەدا فەرمانێکی توندی دەرکردبوو کە نەهێڵرێ کوردەکان بەشداری شەڕەکە بکەن یان بکەونە تاڵان و برۆ [136].

## • ڕووسەکان

هەڵوێستی ڕووسەکان لەبەرامبەر شۆڕشگێڕە ئەرمەنەکان جۆرە تەمومژاوییەکی لەخۆ گرتبوو، لەلایەکەوە حوکمی قەیسەر چارەی فەلسەفەی شۆڕشەکەی نەدەویست و خۆشیی لێ نەدەهات، هەڤیشی بوو، دەترسا لەوەی بۆ خۆی بەگری ئەو ئاگرە هەڵبڕوکێ. هەروا ڕووس خۆی بەتوندی نارازی بوو لەو تەوژمی جوداخوازیانەی ئەرمەن لە ئیمپراتۆری ڕووسیادا، جا بۆ نموونە دەوڵەت دەستی دەگرت بەسەر قوتابخانەی کڵێساکانی ئەرمەندا و دەیکردنە قوتابخانەی ڕەسمی [137]. بەبارێکی تردا دەوڵەتی ڕووس خۆی ڕووبەڕووی کێشەو گرفت ببۆوە لەگەڵ شۆڕشگێڕانی ئەرمەندا، بەتایبەت لە ناوچەی (قارس) [138]. لە لایەکی ترەوە ڕووسیا هیچ سوودێکی لە شۆڕشگێڕە ئەرمەنەکانەوە دەستنەدەکەوت، لە خێریانا تەریکبوو و لەشەڕیانا شەریکبوو، تەنیا لەو سونگەی ئاژاوە و شلۆقیەوە نەبێ کە لە سەڵتەنەی عوسمانیدا دەیانناپەوە.

ئیمپراتۆری ڕووس هەتا ڕوخاندنیشی داوای ئەو زەویە ئەرمەنیانەی دەکرد کە لەژێر دەستی ترکدا بوون بە ڕێڕەوێکیشەوە بۆسەر دەریای سپی ناوەڕاست... ئەمە خواستی ڕووسبوو.

کارەکانی ئەرمەن و کورد لە رۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵ بۆ تێکدانی رێکخستنی سیاسی عوسمانی دەرژانە بەرژەوەندی پلانەکەی رووسیاوە، بەڵام لە رووی سیاسیەوە دانانی ئەم کارانە بەوەی کە هەمیشە هاندەرن بۆ هەڵگیرسانی شۆرشێك لە سەڵتەنەکەدا شتێکی راست نەبوو.

پاڵپشتی رووس لە رووی سیاسی و تەکتیکیەوە بۆ ئەرمەن جارێك بەهێز و جارێك لاواز دەبوو، بە جۆرێ دەوریەکانی رووس لەسەر سنوور هەندێ جار هێرشی شۆرشگێرانی ئەرمەن و ئاودیوکردنی چەکیان رادەگرت، جاری وایش هەبوو رێگە گوشاد بوو. هەندێ لە کونسوڵە رووسەکان لە ڤان پشتگیریەکی چاکی شۆرشگێرانیان دەکرد، بەتایبەت بەر لە یاخیبوونەکەی ١٨٩٦ (لە سونگەی مەشقپێکردنی گەنجەکان و هەوڵدان بۆ بەردانی یاخیبووە بەندکراوەکان و مشورخواردن بۆ پەیداکردنی پەناگەی ئەمین بۆیان لەناو کونسوڵگەریە رووسیەکەدا و ... هتد)

رووسەکان ئاستی هوشیاری و ئامادەباشی ئەمنی خۆیانیان لەسەر سنوور لەگەڵ سەڵتەنەی عوسمانیدا بەرزکردەوە، جاروبار نەیاندەهێشت دەستە و تاقمی بچووکی شۆرشگێران سنوور ببەزێنن، ئەمەش بەهۆی ئەو گلەیی وبێزاریەی کە بەریتانیا و فرانسا بەرامبەر رووس هەیانبوو و دەریاندەبری، چونکە پاڵپشتی شۆرشگێرانی دەکرد.

لەو ماوەیەدا ئەرمەنەکان لەگەڵ پاسەوانانی سنووری رووسدا بەشەر دەهاتن، هەرچەندە ئەو جۆرە شەرانە دەگمەنبوون. پاسەوانەکان بەبێ ئەوەی دەستخەنە رێگەیان مەجالیان دەدا بە تێپەربوونی کۆمەڵی وا کە لە سەدان چەکدار پێك هاتبوو[139]. وەك دەردەکەوت هیچ رێگریەکی ئەوانە نەدەکرا کە لە رووسیاوە ئاودیوی ئێران دەبوون، پاسپۆرتی رووسیان پێبوو، ڤیزای چوونە دەرەوەی دەریایی تەواوی لەسەر بوو، جێی باسە هەتا کۆمەڵی گەورە گەوردش دەیانتوانی بەسەربەستی لەنێوان رووسیا و ناوچەی

ئازەربایجانی فارسیدا بێن و بچن[40].

خۆ هەر کە ڕووسەکان لە ساڵی ١٩١٠دا دەستیان گرت بەسەر ڕۆژاوای ئێراندا ئیتر شۆڕشگێڕە ئەرمەنە چەکدارەکان بە ئازادیەکی ڕەهاوە دەیانتوانی لەو ناوەدا بێن و بچن.

ئەو چەکانەی لە ڕووسیاوە بۆ شۆڕشگێڕان دەهاتنە ناو ئێرانەوە لە ڕاستیدا بەنەزەری ڕووسیاوە ناقانوونی بوون، بەڵام بەوپێیەی کە بڕێکی هێجگار زۆر لە زەخیرە و چەك بە سنوورەکەدا تێدەپەڕی، لەوەی دەکرد کە ئەم ڕێسایە زۆر کەم پەیڕەو دەکرا، هەرکەس شارەزاییەکی یا زانیاریەکی ئەوتۆی لەبارەی هەردوو ناوچەی ڕۆژەڵاتی ئانڤین و قەفقاسەوە ببێ، دەتوانێ ئەوە بێنێتە بەرچاوی خۆی کە لەسەر ئەرزی واقیع چی ڕووی دەدا، لە غیابی فەرمانی ڕاستەوخۆ بۆ قەدەغەکردنی چەك، دەبێ چاوەڕوانی ئەوەش بکەی کە پاسەوانانی سەر سنوورەکە، کەمدەست و نەدارا، بەرتیلی قاچاغچیەکان وەرگرن تا بهێڵن لۆری و عەرەبانە چەکەکانیان تێپەڕن، جا مادەم چەکەکان لەژێر کاڵا و شمەکەکانەوە دەشاردرانەوە ئەوا تێپەڕبوون بە بازگەکاندا ئاسانبوو. خۆ بەلای پشکنەرە ڕووسەکانیشەوە گەڕان و پشکنین بۆ دۆزینەوەی چەك لەژێر کاڵا و شمەکەکاندا کارێکی هێند گران نەبوو، بەڵام ئەمە بە ئاسانی نەدەکرا، پاسەوانەکان بەچاوی خۆیان تفەنگەکانیان نەدەدی، ئەمە مانای ئەوەیە کە قانوون پێشێل نەکراوە و نەبەزێنراوە، بەڵام سروشتی ڕەوشەکە لەکەس شاراوە نەبوو، هەندێ ڕاپۆرتیش هەن لە بارەی ڕێگەگرتنی ڕووسەکان لە بارە چەکی لەو چەشنانە لە سنووری باکوورەوە، بەڵام لە سنووری ئێرانەوە شتێکی لەو جۆرە نەبووە.

ڕووسەکان بۆ نانەوەی ئاژاوە لە دەڤەرەکەدا لە هاندانی عەشایرە کورد و نەستووریەکان دەستێکی باڵایان هەبوو[41]. هەندێ بەکرێ گیراوی خۆیان خستبووە ناویانەوە کە هەندێ قەشەی نەستووری وایان تێدابوو کە لە

ڕووسیا مەشقیان پێ کرابوو، بۆ لایەنگیری لە بەرژەوەندییەکانی ڕووس و وەرگێڕانی بە کۆمەڵی خەڵکە نەستووریەکە بۆ سەر مەزهەبی ئەرسەدۆکسی ڕووسیایی. ئەمەش وەنەبێ کارێکی ئەستەمبێ، چونکە کۆششەکانی پێشتر بۆ سەر کاتۆلیکی تا ڕادەیە سەرکەوتنی بەدەستهێنابوو، نەستووریەکان بەوە شادبوون کە هاوکاریەکەیان لەبەرچاو دەگیرێ و جێی پێزانینە، سەرکەوتنی گرنگیش لەم وەرگەڕانە ئایینیەدا لەوەدابوو کە بووە هۆی ئانەوەی دووبەرەکی و فیتنە، ئەمەش دەقاودەق لەگەڵ پیلانەکەی ڕووسدا هاوجووتبوو.

گومانی تێدا نییە کە ڕووسەکان لە ڕێی پشتگیریانەوە بۆ داخوازیەکانی یاخیبووەکان کە درابووە نووسینگەی (مارشیمون)ی سەرکردەی مەدەنی و ئوسقوفی باڵای نەستووریەکان، ببوونە هۆی ناکۆکیەکان[١٤٢]. وەدەبێ ئاماژەش بکرێ کە یەك لەو خزمەتە گەورانەی ڕووسەکان بۆ یاخیبووان ئەوەبوو کە لە دەرەوەی وڵاتەکەی خۆیاندا نەیاندەهێشت بکەون ژێر باری پرسینەوە و لێپێچینەوەی ئەو وڵاتەوە کە لێین یان وان تێیدا، چونکە زۆر جار هێزە ئەوروپاییەکان عوسمانێکانیان ناچاردەکرد کە قەبووڵی ئەوە بکەن هاوڵاتیە ئەوروپاییەکان لە دادگەکانی سەڵتەنەدا دادگەیی نەکەن چونکە ئەوانە تەنیا ملکەچی ڕێسا و قانوونی وڵاتانی خۆیانن.

جا بەپێی ئەوەی ئەم قانوونە لە ڕۆژهەڵاتی عوسمانیدا بەڕێوە ئەچوو، بۆیە شۆڕشگێڕە ڕووسەکان لەسەر تاوان و جینایەتەکانیان سزا نەدەدران، هەر بۆ نموونە لە ساڵی ١٨٩٧، عوسمانێکان لەشاری ڤان بە توومەتی دەستدرێژی بۆسەر سەرباز و مەدەنی موسوڵمان سێ شۆڕشگێڕیان بە ناوەکانی (فیراموز، ئەرشاك، فارتا) دەستگیر کردن، لەسەر ئەمە کونسوڵی ڕووس گورج هاواری لێ بەرزبۆوە کە ئەمانە هاووڵاتی ڕووسن و لە بینای کونسوڵخانەکەیدا گلی دانەوە و ڕێگەشیان پێدەدرا کە پەیوەندی بە

شۆڕشگێرانی تـرەوە بکـەن. هـەر ڕۆژێکی یـەك شـەموانیش بـەرەو یـەك لـە کڵێسا ئەرمەنەکان دەبوونەوە بۆ وتاردانێکی شۆڕشگێڕانەی ئاگراوی بەسەر ئەو خەڵکەدا. دواجار لە ساڵی ١٨٩٩ ڕووسەکان بڕیاریاندا ڕایانگوێزن بۆ ناو ڕووسیا[١٤٣].

## ● یاخیبوونەکەی ١٩٠٦: پێشهاتەکان

هەرچەندە شتەکە هەر قسە و بۆچوونی ڕووتبوو بەڵام لەوەدەچوو بە زۆری شۆڕشگێڕەکان خۆیان بکەنـە هـۆی یاخیبوونێك لـە بـەهاری ١٩٠٦دا لـە ڤان، لەم ڕوودوە ئەنجومەنی حیزبی تاشناق لـە ژنێڤ لـە شوبات/ فـەبرایر ـنیسان – ئەپریلی ١٩٠٥ کۆبۆوە، بڕیار درا کە ئامادەکاری بۆ (جم وجۆڵێکی بەرفرەوان) لە ڤاندا بکرێ[١٤٤].

ئـیتر لـەماوەی ئـەم دوو سـاڵەدا ڕاپۆرتـەکان دەربـارەی یـاخیبوونێکی چاوەڕوانکراو پەی دەربەی دەکەوتنەڕوو، لەسـەرەتای هـاوینی ١٩٠٤ نێـردراوە ئامریکاییەکان وایان مەزندە دەکرد کە جموجۆڵێکی شۆڕشگێڕانە وا لە ئارادا و هاکـا دەسـتی پێکـرد. چـونکە سەرچـاوە هەواڵدەریـەکان ئـەوەیان پـێ گەیاندبوون کـە لـە ناوشار شـەش دەستەی شۆڕشگێڕ کەوتونـە چالاکی، لـە سنووریشەوە پاڵپشت بەڕێوەیە، هەر بەپێی ئەمانە شۆڕشگێڕەکان هەڕەشـەی تەقاندنـەوەی سـەربازگەکانیان دەکـرد بـە بـاروت، وە موسـوڵمانەکانی نـاو شـارەکە وایـان هەسـتدەکرد. کـە مـانگرتن ڕوبـدات، (چەخماخسـازەکانیش سـەرقاڵی ئامـادەکردنی چـەك بـوون[١٤٥]). بـۆ ئەمـە حیزبـی تاشـناق لـە هەرێمەکـەدا هـەزارا پارچـە چـەکی لـە عـەمبارەکانی نـاو شـار و لادێکانـدا سەریەکنابوو.

لە زستانی ١٩٠٥ - ٠٦ ژمارەیەکی یـەکجار زۆر لـە شۆڕشگێڕان لـە شوێنە دورەکانـەوە ڕژانـە نـاو شـارەکە، کونسـوڵ (ئارسـەر. ئـی. گـیری) دەڵـێ: بـە

چالاكیەكی ڕەهاوە دەیانەوێ لە زستاندا بەردەوامبن لە هەڵمەتی پروپاگەندەكانیاندا بەو هیوایەی هەوڵەكانیان لەمەدا بەری هەبێ تاكو بتوانن لە بەهاردا ئاژاوەیەكی ترسناك بنێنەوە[46]. ئەمە شرۆڤەكردنێكی ئەو هەموو چەشنە چەك و زەخیرانەیە كە لە ساڵی ١٩٠٨ لە شارەكەدا دۆزرانەوە.

پیاو هیچی بۆ نامێنێتەوە جگە لەوەی كە بپرسێ: هۆی چی بوو كە ساڵی ١٩٠٦ هیچ یاخیبوونێك ڕوی نەدا؟ لەوانەیە هۆی سەرەكی ئەوەبووبێ كە ڕووس ناڕازیبوون، چونكە ئەو كات لە ١٩٠٤ - ٠٥ ڕووسیا لەژێر باری قورسی جەنگی ڕووس و ژاپۆندا بوو و شۆڕشی ١٩٠٥ - ٠٦ی ڕووس كە بووە هۆی یاخیبوونێك لە خوارووی قەفقاس[47]. ئەمە كاری كردە سەر پلانێكی ڕووسەكان بۆ دەستێوەردان لە ڕۆژهەڵاتی عوسمانی. بەڵام جەنگەكەی دژ بە ژاپۆن هۆكاری سەرەكی بوو.

كونسوڵی بەریتانیا (تیریل) لە ڤان وای دانابوو كە جەنگی ڕووس و ژاپۆن بووە كۆسپی بەردەم پیلانەكانی ئەرمەن بۆ یاخیبوون و واشی دانابوو كە ڕووس پشتی دەگرتن، بەڵام ڕووسەكان حەزیان بە ڕودانی هیچ پشێوی و گێرەشێوێنیەك نەدەكرد لە سنوورەكانی ڕۆژاوایانەوە، بەتایبەت لەتەك ڕودانی گەلێ گیروگرفتی تر لە ڕۆژهەڵاتدا[48].

جێی گومان نییە كە ئەو شكستە گەورانەی ڕووسەكان بەدەستی ژاپۆنیەكانەوە لە دەریا و زەویەوە تووشیان هات، توانای ئەوەی لێبڕیبوون كە بیر لە داگیركردن بكەنەوە لە دەرەوەی سنوورەكانی خۆیان. لەو هۆكارانەی پارمەتیدەری شۆڕشەكەی ١٩٠٥ بوون ئەو بێئومێدی و ورەبەردانە مەعنەویانە بوو كە ئەو شكستانە بەسەر گەلی ڕووسیایدا هێنا، كارێكی وایان كرد كە هەر جوڵە و كارێكی تری سەربازی لە ڕووی سیاسیەوە شێتی و بێئەقڵیەكی وایە نەبێتەوە. ئیتر سەبەبەكە هەرچێكبێ، ئاماژە بەوەش دەكرێ كە ڕووسەكان لە ساڵی ١٩٠٦دا دەوریە پاسەوانە سنووریەكانی خۆیان

زیاتر کرد و ژمارەیەکی زۆری شۆڕشگێڕانیشیان ڕێبەند کرد کە بچنە ناو سەڵتەنەکەوە[149].

دەشێ شکستی ڕاپەڕینەکەی هەرێمی (پەتلیس)یش دیسان هۆکارێکی تربێت لە دوا خستنی ئەم ڕاپەڕینەی ڤان یان نەنجامنەدانی. لە ساڵی ١٩٠٢ لە گەرمەی ئاژاوەکانی (ساسۆن)دا هەواڵدەرێکی ئەرمەن بۆ (ف.ج.هریمان)ی کونسوڵی بەریتانی گێڕابۆوە کە شۆڕشگێڕەکان پلانی ئەوەیان بووە کە دەستبگرن بەسەر شوێنە ستراتیژیەکانی ساسۆن و ڤان و شوێنی تریش لە ڕۆژهەڵات. وە ئەرمەنی تریش سنوور دەبڕن و لەڕووسیاوە دێن، دەکەونە کوشتنی موسوڵمانەکان تا ئەوانیش بکەونە تۆڵەسەندنەوە و دواجار دەستێوەردانی هێزە ئەوروپاییەکان[150].

دیارە ئەمانە شتی بەڵگەنەویستی سنووردارن، بەڵام لە سونگەی ستراتیژیەوە بەپێی ئەو ڕوداوانەی پەتلیس و ئامادەکاریەکانی ڤان تەفسیرێکی لۆژیکیە. ئەگەر ئەمە ڕاستبێ، ئەوە پیلانەکە لەوەدا بوو سەرەتا ڕاپەڕینێکی گەورە لە (ساسۆن - مووش) بەرپا کرێ، ئەوەش بە مەبەستی کێشکردنی سەربازەکانی عوسمانی و ئینجا بەرپاکردنی ڕاپەڕینێکی تر لە پشت بەرەی شەڕەکەوە کە شاری ڤانە.

بەڵگەکان گشتیان ئاماژە بەوە دەدەن کە سوپایەکی بچووکی ئاشناقیان ئامادە و موهەییا لە ئێراندا بووە، ئامادە بۆ پەڕینەوە لە سنوور بە پیادەیی[151]، وا قەراربوو ئەوانەی لە ئێرانەوە دەهاتن دەبوو بکەوە فریای ڕاپەڕیوانی ڤان، بەڵام ئەگەر بێتو لە ڤانەوە بەرەو پەتلیس بچن گیروگرفتی زۆریان دێتەڕێ. ئەوەش بەهۆی ژمارە زۆریانەوە، چونکە جیاوازی زۆرە لەنێوان ئەوەی دەستە و تاقمی کەم کەم و دور لە یەکتر ئاودیوکەیت و پاشان کۆیانکەیتەوە لە یەکەیەکی گەورددا لە پەتلیس، وەلەنێوان پێشڕەوکردنێکی سەدان کەس (بەقسەی هەندێ لە کونسوڵەکان بە هەزاران)

لەوانــەوە بــە ڕێگــە و بــان و دۆڵــی تــەنگ و بڵنــدا کــە بــە دەســت ســوپای عوسمانیەوەبن.

بەڵام پەلامارێك کە هەر لە ئێرانـەوەبێ پاڵپەستۆی سـەر شۆڕشـگێڕان لــە هــەر شــوێنێ بــن کەمدەکاتــەوە. پیلانێکــی لــەو چەشــنە لەگــەڵ سەرکوتکردنێکی خێرای یاخیبوونەکەی ساسۆندا سەری نـەدەگرت و لـە ڤان یـاخیبووانی دەخسـتە بـەردەم ئەگـەری دەسـتدانە کارەکـە بەتـەنیا و بـەبێ یارمەتی کەس، وەیان هەر وازهێنان لێی و نەکردنی.

## ● عەلی ڕەزا پاشا، حاکمی ڤان

کــە ســاڵی ۱۹۰۷ تێومرگەڕایــەوە و لــە ئــەنجامی گێرەشــێوێنیەکانی نــاو ساسۆن، هەڵوێستی حوکمەتی عوسمانی بەرامبەر یاخیبووەکان کەوتە گۆڕان، حوکمــەت لــە مامەڵەیــدا بەرامبــەر توانــا و دڵڕەقــی شۆڕشــگێڕان سیاســەی (تاڵەوەکــەرەی خۆشــەوەکەرە)ی بــەکاردەهێنا*، بەشــێوەیە پاداشــتی نەرمەنــە بەنەمەکــە بێوەیــەکانی دەکــرد بــەوەی دەینانــە نــاو دەزگــەکانی دەوڵــەت و لەجێی دەستەڵاتداریدا دایدەمەزراندن، لە بەرامبـەردا ئـەو بەرپرسانەی کـە بوودەڵە و ترسنۆکبوون بۆ هەڕەشەی ئەرمەنەکان دەیگۆڕین بە کەسانێك کە ئامـادەبوون ڕووبـەڕووی شۆڕشـگێڕان بوەسـتنەوە. بەورەیـەکی بەرزیشــەوە دەستکرا بە ڕاوەدونانی شۆڕشگێڕان و سـزادانیان، ئەمـە نـاڕەزایی ئـەورووپای لــێ کەوتــەوە. بــەڵام ئەمــە قۆتــاغێکی دامــاوی بــوو، وادیــاربوو ئــەورووپاش نەیدەویست لەم ڕووەوە بگاتە چارەسەرێك.

کــێ دەیتــوانی ڕاســت و ڕەوان بیگوتایــە کــە دەبــێ ئــەو شۆڕشــگێڕانەی هــەڵیان کوتــابووە ســەر بــانکی عوسمانی و بڕیبوویــان بەربــدرێن، یــا ئــەرمی

---

* بەمانای : سیاسەی (العصی و الجزرە).  ((وەرگێڕ))

نوانـــدن لـــە ئاســـت ڕێکخـــراوی تاشـــناق و وچاوپۆشـــی لـــە هەڵمـــەتی پروپاگەنـــدەیان، وەیـــان پـــەیڕەوکردنی سیاســـەیەکی نـــەرم لـــە ساســـۆندا؟... ئەمانە هۆکاری جوانکردنی ڕوخساری عوسمانیەکانبوو لەلای ئەوروپاییـەکان وە یـــا تـــۆ بڵـــێ هۆکـــاری چەســـپاندنی هـــەلی بـــەردەوامبوونی مانـــەوەی سەڵتەنەکەشبوون.

هەردوو تەرەف ڕاگەیاندن و ڕاوێژکارییە ئەوروپاییەکە عوسمانیـەکانیان داگرتبۆوە و دایاندەپڵۆستن، جا ئیتر خۆلێنێزیك کردنەوە هەرچۆنێکبووبێ، هەتا ئەگەر بە پاڵیشیانەوە شەڕیشیان بۆ بکردنایە.

لـە هـەژدەی ئـادار/ مارسـی ١٩٠٧ (عـەلی رەزا بـەگ) کەموتەسـەریفی (بـەرپرس لـە دەڤـەری – سـنکاك)ی هـەکاری (پایتـەختی جۆلـەمێرگ) بـوو، کرابە حاکمی ڤان [٥٢]. ئەم دانانەی هاوکاتبوو لە تەك پەرەسـەندنی چست و چالاکی شۆڕشگێڕە ئەرمەنەکان لە شارەکەدا، بەتایبەت لـە نێزیکیشیـەوە، لـە خواروی هەرێمەکەوە بە درێژایی سنووری ئێران.

لە حوزەیران/ یۆنیۆ ١٩٠٧ دەستەیەك ئەرمەن لە شاخەکانی دەوروبەری ڤان لەگەڵ هێزێکی دەرەك و پیادە و سوارەی نیزامی کەوتنـە شـەڕەوە.[٥٣] لـە واقیعدا کـە ئـەم پشێوییانە ڕویانـدا عـەلی رەزا هێشتا لـە ڤـان دەسـتەڵاتدار نەبوو، بەهۆی ناساغیەوە چوار مـانگێ لـە دەستبەکاربوونەکەی دواکـەوت[٥٤]، (بابی عالی) لیژنەیەکی لێکۆڵینەوەی بەسەرۆکایەتی (تایەر پاشا) ی حـاکمی پێشووی ڤـان نـارد بـۆ پـەیجورکردن لـە باشووری هەرێمەکـە، کـە عـەلی رەزا موتەسـەریفبوو تیایـدا، ئەمـەش بـۆ دڵنیـابوون لـە توانـا و لێوەشـاوەیی وەك لێپسراوێك و بۆ ئـەوەش بزانـرێ ئـاخۆ ئـەم پیـاوە (عـەلی رەزا- و) کەسـێکی شیاو لەوبارە بۆ حوکمکردن لەساتە وەختە دژوارو سەختەکاندا؟

شاندەکە بەوردی ناوچەکەیان پشکنی و لەماوەی دوو مانگدا کارەکانیـان تەواو کرد [٥٥]، پەیجورکردن و گۆڵینەوەکانیان ئەوەی دەرخست کە عەلی رەزا

هەر تەنیا نوێنەری حوکمەت نەبووە بەسەرکەوتوویی لەناو ئەو خەڵکەدا بەڵکو توانیویە ڕێزی هەرکام لە ترکەکان و ئەرمەنیش وەك یەك بەدەست بهێنێ. تایەر پاشا بە بروسکەیەکی خێرا ئەمەی گەیاندە ئەستەموول و گوتی دانانی عەلی رەزا وەك حاکمێکی هەمیشەیی بۆ شاری ڤان گەلێ زەرووریە[151].

وەلحاسڵ لیژنەکە بەری کارەکەی خۆی چنیەوە، بەوەی کە دیسان لەوەشدا سەرکەوت کە زانیاری لە حاکمی پێشووەوە بۆ تازەکە مسۆگەرکات و ئەمەش حاڵەتێکی دەگمەنە و کەمجار ڕوودەدات.

لەسەروبەندی دانانی عەلی رەزای پاشادا دەوڵەت ویستی ئەو کێشە و گیروگرفتە ئیداریانە کە دەستی بەڕێوەبردنی هەرێمەکانی تریشی بەستبۆوە و گیریان خواردبوو پێوەی چاکیان کات. لەمەدا بەر لە دە ساڵ ( بەحری پاشا)ی حاکم ڕاستەوخۆ لە یاخیبوونەکەی ڤانی ١٨٩٦دا هەندێ چارەسەری پێشنیار کردبوو، لەمەدا بەتایبەت ئیشارەی بە هەندێ خاڵی چارەسەرکردنی شەڕی سیاسی و شیرزەیی دەستەلات دابوو کە لە ناکامی جیاکردنەوەی دەستەلاتی سەرکردە مەدەنیەکانەوەیە لەوەی سەرکردە سەربازیەکان هەیانە. جا ئەوەبوو کە عەلی رەزا دانرا کرا بەسەرکردەی لیوا، یانی وەك لێپرسراوێکی سەربازی و حاکمێکیش کە لێپرسراوی ئیداری مەدەنیە، ئەمەش دەمیەکدانێکی نائاسایی دەستەلاتەکانە لەدەستی تەنیا کەسێکدا.[152]

دانانی حاکمێکی خاوەن ئەزموون و شارەزاییەکی لەوەپێش بۆ هەرێمەکە هەنگاوێکی تازەبوو کە لەوەبەر نەنرابوو و پێشوازی لێ دەکرا، وەك باوبووە، لەوە بەر حاکمێ کە دادەنرا ، پێشتر لێپرسراوی ناوچەیەکی تربووە جا ماوەیەکیشی دەویست تا لەگەڵ هەرێمە تازەکەیدا دەسازا و لێی تێدەگەیشت. بەڵام عەلی ڕەزا ساڵانێکبوو لە دەڤەرەکەدا لە خزمەتدا بوو، شارەزاییەکی باشی هەبوو لە کونوقوژبنی و لە مامەڵەکردن لەگەڵ عەشرەتە

کوردەکان و پەرەسەندنی بزوتنەوە جوداخوازیە ئەرمەنەکەدا[158].

(تایەر پاشا) کە بە درێژایی هەشت ساڵ حاکم بوو بەڵام لە تەك ئەو کێشە گەورانەی ڤاندا زۆر بە پارێزەوە توخنیان دەکەوت، جا عەلی ڕەزا لە موجیاریەکەی ئەو سوودمەند بوو، تایەر نەزعەیەکی چاکسازی لەخۆگرتبوو، چالاکیەکانی ئەرمەنەکانی هەروەك ڕوداوی ئەمنی ڕاگوزاری وەدەگرت کە دێن و تێدەپەڕن، بۆیە لە سنووری دادگەکاندا دەیجوڵاندن و بە ڕەزامەندی هەریەك لە سەرۆکی کاروباری قەزایی هەرێمەکە (عەلی بەگ) و پۆلیس و دەرەك مامەڵەی لەتەکدا دەکردن، لەلای کونسوڵە ئەوروپاییەکانیش خۆشەویستبوو و دەستخۆشی ئەرمەنەکانیشی جاروبار بەدەستدەهێنا. بەڵام ئەوەی جێی باسە ئەوەیە کە هێزی یاخیبووان لە سەردەمی فەرمانداریەکەی ئەودا پەرەیسەند و گەورە بوو.

عەلی ڕەزا لێپرسراوێکبوو لە جۆرێکی تر، لەوەنەدەچوو کە پلانێکی کارکردنی دانابێ یان ڕێوشوێنێك (پرۆگرامی دژ بە یاخیبوون) لە ڕووبەڕووبوونەوەیدا لەگەڵ یاخیبووندا، گرتبێتیە بەر، بەڵام کارەکانی ناماژەبوون بۆ تێگەیشتنێکی زیمنی لەوەی کە زەروورییە بە ئامانجی تیکشکانی یاخیبووەکان. گومانی تێدا نەبوو کە ئەوەش هێزێکی سەربازی فرەی گەرەکبوو، ئاخری و ئاقیبەت دەوڵەت دەبوو بەڕێگە چارەی عەسکەری یاخیبوو و ڕێگرەکان تێکشکێنێ، بەڵام ئەو هێزە عەسکەریەی لە ئارادا بوو هیچ ڕۆژێ بەشی نەدەکرد، سا ئیتر میللەتەکە لەگەڵ سیستمەکەدا بووایە یاننا، خۆ کە دەبینێ وا دەتوانێ ژیانێکی ئاسایی بەرێتە سەر و بە دڵنیایەوە بژی لە سایەیەکی دور لە دەستدرێژی جەردە و ڕێگر و داخوازی شۆڕشگێڕەکان بۆ سەرانە سەندن و هەروا دور لەو بەرپرسە گەندەڵە هیچ لەبارانەبووانە، لەم حاڵەدا دەشێ ڕازی بێت هەتا بە دەوڵەتێکی نەخۆش ئەگەر ئەندامانی خۆیانی لە موسوڵمان و ئەرمەن تێدا بەشداربن، چونکە

دەشێ ئەمانە زیاتر دەربڕین لە داوا و داخوازیەکانی کۆمەڵانیان لەوەی کە لێپسراوێکی دەوڵەت و سەر بە کۆمەڵێکی تر بۆیان بکات. بە کورتی هێزی سەربازی و لەولاشەوە سیستەمە مەدەنیەکە و هەستکردن بە هاوبەشی لە دەوڵەتدا، لە شتە زەرورەکانبوو. (دیکسن)ی کونسوڵ ڕەوشەکەی ڤان وتەبیەتی عەلی ڕەزای لە ساڵی ۱۹۰۷دا لەوەدا کورتکردۆتەوە کە دەڵێ:

(( لەوە دەترسێم لێرە ببێتە (یانی عەلی ڕەزای حاکم) قوربانی گیروگرفتەکانی خۆی لەگەڵ شۆڕشگێڕەکاندا، کە کاتێ گەیشتە ئێرە لە باوەڕێکی نەگوڕدابوو کە وڵات شەپۆلێکی گراوەی یاخیبوونی تر بە خۆیەوە دەبینێ، شەپۆلەکە بە بوونی خۆی نەبێ ڕاگیر ناکرێ و وبەری پێناگیرێ، دەستیش بە نیگەرانیەکی زۆر دەکات چونکە زوربەی ئەو چەك و تفاقانەی شۆڕشگێڕان جەنگیان دەکەوێ بە ڕێی سنووردا لە کوردەکانەوە بۆیاندێ، هەروەك لە بروسکەی ژمارە ١٤ی ٣١ کانوونی یەك /سەپتامبری ١٩٠٦ دا باسم لێوەکردووە، لیژنەی شۆڕشگێڕ خۆی داناوە بە دەستەلاتێکی فەرمانڕەوا بەسەر ئەرمەنەکانەوە، بیروڕاکانی سەبارەت بە دادپەروەری بەسەر ئەرمەنەکانەوە پەیڕەو دەکات، ئەمەش زۆر کەڕەت ڕووە و بەجێهێنانی کاری کوشتنی دەبات.

والی پێشوو چاوپۆشی لەم کارانە دەکرد و دەیگوت بە مە گەلێ سەرێشەی لە کۆڵ دەبێتەوە، لە گەلێ گیروگرفت و دەردیسەریش دوری دەخاتەوە ، کەچی عەلی بەگ ئاوا ڕەوشتێکی بەلاوە قەبووڵ نەبوو، کە شۆڕشگێڕان بازرگانێکی ئەرمەنیان فڕاند، فەرمانیدا کە لە بانگی شێوانەوە تا سەعات دەی شەو، بەبێ هەڵگرتنی چرای فانۆس، هاتوچۆ قەدەغەکرێ، فەرمانیشیدا بە دەستگیرکردنی هەر کەسێك کە لە دوای دەی شەوەوە بگەڕێ، لەلایەکی ترەوە هەواڵیان داومێ کە شەوانە نێزیکەی ٤٠٠ سەرباز بە بەردەوامی بە شەقامەکاندا وەك دەوریە (چەرخەچی- و) دەسووڕێنەوە:

مـن واى نـازانم كـه پيـادەكردنى ڕێوشـوێنێكى ئاوها شۆڕشگێڕان پـەك بخات و بيانوەستێنێ، چونكه ئەوان بـه ئـارەزووى خۆيـان دەبـزوێن و ئيسـته ڕووەو باخچـەكان دەبنـەوە. ئەمانـه لـەم دواييانـەدا زۆر كەسـيان هەراسـان كـردووە، قوتابخانـه ئامريكاييەكـەيان بـه جێگەيـەكى لـەبار دانـاوە بـۆ گردكردنەوەى لايەنگيران بۆ خۆيان، خۆيشيان كردووە بـه باوانێكى دڵسۆزى گشت هەتيوێكى ئەرمەن و هەڕەشەش له مامۆستا و نێردراوەكان دەكەن كـه قوتابيـەكان لــه پرۆگرامـى شۆڕشـگێڕانه دوورنەخەنـەوە، بەرێوەبـەرە ئەرمەنەكەى هەتيوخانەكەيان به هەڕەشـەى كوشـتن تۆقانـدووە و ناچاريان كردووە دەست لەكاربكێشێتەوە[٥٩].))

هەر كه عەلى ڕەزا به شێوەيەكى ڕەسمى دەستبەكار بـوو و كـارى گرتـه دەست ئيتر گورج كەوتـه سـەرلەنوێ ڕێكخستنەوەى حوكمـەتى هەرێمەكه و بـەهێزكردنى دەسـتەڵاتى دەوڵـەت، هەڵمـەتێكى بـۆ دەسـتگيركردنى دز و جەردەى ئەرمەن و كورد دەستدايه، چونكه وايدەبينى ئەگەر سنورێك دابنرێ بۆ ئەو سەركوتكردنى خەڵكه لەلايەن ئەوانەوە، ئەوە باشترين ئامرازێكه بـۆ دەستخستنى متمانه لەلايەن ميللەتەوە[٦٠].

عەلى ڕەزا ڕووەو يەك لەو تەنگژانەى هەرێمەكه بۆوە كه زۆرتـر پێـى لەسـەر داگيرابـێ و لـەناوابێ، ئـەويش كـەمى دارايـى و دەسـتكورتى ئيدارەكـەيبوو، بـەماناى مووچـه نـەدان يـان دواخسـتنى. لـه واقيعيشـدا حوكمەتى هەرێمەكه نابووت بوو، وا ده بۆ بيست مانگ دەچوو كه مووچەى فەرمانبـەران و ئـەمن و ئاسـايش و خانەنشـينان نـەدرابوو، پلەوپايـه ڕەسميەكان هەروا بـه بـەتاڵى مابوونـەوە، چونكه ئەوانـەى بۆيـان دانرابـوون لەبەر بێ پارەيى نەياندەتوانى بڕۆن و بچن كارەكانيان بگرنه دەست. كەواته بەر لەهەموو شتێ كۆكردنەوەى باجەكانبوو كه له يەكەم ياخيبوونى ڤانـەوە نەدرابوون و دەبو بسەندرێن، بەهاى ئەو باجانەش كه دەبوو بسەندرێن، بڕە

پارەیەکی گەلێ زۆری دەکرد. بڕێکیان دەچۆوە بۆ بیست ساڵ کە دەبوو بدرایە"[161].

دەشێ ئاماژەش بدرێ بەوەی کە ئەرمەنە خاوەن بەرژەوەندیەکان ئەو باجانەی کە لەسەریانبوو نەیاندابوو، بە تایبەت لە یەکەم باخیبوونەوە، لەبەر چەند هۆیەکبوو کە هەندێکیان بیانوو و پاساوی خۆیان هەبوو، چونکە بازرگانەکان زۆرتر بێزاربوون لەوەی کە باج و سەرانەکانیان بە زۆری زۆرداری دابووە شۆڕشگێڕەکان و ئەوانیش کە زانیان دەوڵەت توانای گردکردنەوەی باجەکانی نییە ئەوانەی خۆیان زیاد کردبوو، جا بازرگانەکان بەوە ڕازیبوون کە ئەو باجە کەڵەکەبووانەی سەریان بە ڤیستی مانگانە بدەنەوە بە مەرجێ دەوڵەت لە کەڵەگایی شۆڕشگێڕان بیانپارێزێ.

عەلی ڕەزاش تا ڕادەیە لەمەیاندا سەرکەوتوو بوو، دەوڵەت توانی باجەکانی خۆی کۆکاتەوە و دەستی کرد بە دابەشکردنی مووچە"[162].

لەمەدا لە لادێکاندا بە توندی باج دەسێنرا، وەك سوننەتیەك عەشایرە کوردەکان مەڕانە و بزنانەیان دەدا، ئەویش بەپێی خەملاندنی خۆیان کە چەند سەریان هەیە، عەلی ڕەزا لەو ماوە کەمەی والیبوو باجگرەکانی دەنارد بۆ ژماردنی ڕان و ڕەوگەکان"[163]. ئەمە بە دڵی سەرەك عەشایر و فەلا و موسوڵمانەکان و ئەرمەنەکان نەبوو، چونکە باجێکی زۆر و زەوەند بەم شێوەیە کۆکرایەوە بەڵام بەدەریش نەبوو لە زۆر و زۆرەملێ"[164].

بەهەرحاڵ کاری باج و باجگری لە شار و شارۆچکەکاندا سەرکەوتووتربوو ، بەشداریکردنی ئەرمەنیش لە بەڕێوەبردندا لە بەرنامەکەی عەلی ڕەزادا کارێکی بنەڕەتی بوو، بەڵام تاکتیکی شۆڕشگێڕان لە ئاست ئەم پرۆسەیەدا نیشەکەی تێکدەدا و ڕێسەکەی لێ دەکردنەوە بە خوری، چونکە حەزیان بە بیرۆکە و چالاکیەکی وا نەدەکرد، چاکسازیەکانی ئەویان بە زیان دادەنا بۆ هەر پشتگیریەك لە دۆزەکەیان، لەمەشدا ناهەقیان

نەبوو، پيلانەكانيان پشتى بەو ململانێيانە قايم بوو كە لە ناوخۆدا هەبوون، جا ئاوێتەكردنى ئەرمەن بە بونيادى دەستەلاتەكەوە ببووە دوا شتێ كە بيانويستايە ڕوبدات.

عەلى ڕەزا ئەرمەنيەكى خۆشەويست لاى هەمووانى بە پلەى جێگرى خۆى دانا، كە (ئۆهانسەفەنى) بوو، براكەيشى كردە قايمقامى قەزاى (غيفاش) [١٦٦]. لە كاتێكدا كە دانانى ئەرمەنيەك بە پلەى جێگرى حاكم بايەخى تايبەتى خۆى هەبوو، بەلام لەوەبەريش ئەمە ڕويدابوو، ئەو پەيوەندى برادەرايەتيە تايبەتيەى كە عەلى ڕەزا و ئۆهانسى پەكخستبوو وايكردبوو كە مەزندەى ئەوە بكرێ گوايە ئەمەى دوايى بەتەواوى و بە شێوەيەكى كاريگەر دەست دەخاتە كاروبارى هەرێمەكەوە، خۆ دانانى براكەشى لە غيفاش نەوەندەى تر ئەم مەزندەيەى چەسپاند، چونكە ئەو پلەى وەزيفەيە دەستەلاتێكى قانوونى دەداتە خاوەنەكەى، قەزاى غيفاشيش بە سايەى شوێنە جوگرافيەكەيەوە لە بەرەوڕووبوونەوەى شۆڕشگێڕاندا بايەخێكى جەوهەرى هەبوو، دەڤەرەكە چەقى جموجۆڵ و چالاكى شۆڕشگێڕى بوو ياخسووس لە دورگەى ئەختماردا، خۆ ئەگەر ئەو چالاكيانە لە دورگەكەدا بنبڕكرێن ماناى ئەوەيە كە كارى شۆڕشگێڕان بنبڕ كرا. (ئەرماراكە فەنى) دەيتوانى ئەهێڵێ شۆڕشگێڕان ئەو دورگەيە وەك بنكەيەكى خۆيان بەكاربهێنن.

هەروەك عوسمانيەكان، ياخيبووەكانيش هەستيان بە شوێن و ڕێگەى جەوهەرى ئەختمار كردبوو و ئەو مەترسيەش كە ئەرماراكە فەنى نابوويەوە، بۆيە ئامادەبوون كە كارێكى وا بكەن پلانەكەى حاكم تێكشكێنن، بۆ ئەمە ئارماكيان كوشتو بەمەش ئاستەنگێكى سەرەكيان لەبەردەم دۆزەكەياندا ڕامالى [١٦٧].

(نۆهانسەفەنی) پاش کوژرانی براکەی ئەوەی بۆ دەرکەوت کە ئیتر ناتوانێ لە ڤان بمێنێتەوە ، داوای لە عەلی ڕەزا کرد کە تەشەببووسی بۆ بکات تابیکەنە جێگری حاکمی (مەعمورەی عەزیز*) و ئیتر ناچار لە ڤان باری کرد[168]. لە گەرمەی ئەم ڕوداوانەدا عەلی ڕەزا بە خواستی خۆی بۆ دڵنیابوون لەوەفای میللەت داوای لە حوکمەتی مەرکەزی کرد کە (میخایلە فەنی) کە وەرگێڕێکی ئەرمەنی بوو لە ئەرزڕۆم بە پلەی جێگری حاکمی ڤانی دانێن (وەرگێڕیش پلەیەکبوو کە دەستەڵاتێکی گەورەتر لەناوەکەیی دەدا بە خاوەنەکەی).

لە مەرکەزەوە داواکەیان جێبەجێکرد[169]. لە بەرامبەردا، دوایی ڕاگەیەنرا کە میخایلە فەنی نایەت، دیارە لە لیژنەی شۆڕشگێڕ دەترسا، بۆیە ئەرمەنیەکی تریان لە جێگەی دانا کە ناوی (لیۆنە فەنی) بوو و کۆنە قایمقامێ بوو[170]. لە بەڕێوەبردنی هەرێمەکەدا ئەرمەن نوێنەریان هەر هەبوو، بەڵام تیرۆرکردنی ئەرماراك و هەڵاتنی نۆهانس دوو نموونە بوون بۆ شکستهێنانی پلانەکەی عەلی ڕەزا.

---

* (مەعمورەی عەزیز: مەبەست شاری جەزیرە - بۆتانە کە پایتەختی میرنشینی بۆتانبووە و ناوی (جەزیرەی ئیبن عومەر) لەو کاتەوە لێی نراوە کە لەشکرێکی عارەب وڵاتەکەیان داگیرکرد، کە (عبدالعزيز بن عمر البختي) فەرمانڕەوای بووە و دەفەرەکە بە (مەعمورەی عەزیزیە) ناونراوە و فەرمانڕەوایانی جەزیرە بە (عەزیزان) ناوبراون.
بۆ زیاتر بڕوانە: محەممەد ڕەسوڵ هاوار – کورد و کوردستان لەسەرەتای مێژووەوە هەتا شەڕی دووەمی جیهانی، بەرگی (١) چاپی (١) چاپخانەی خاك سلێمانی ٢٠٠٠ ل١٧٠
ئەحمەد سەیید عەلی بەرزنجی: محەممەد پاشای ڕەواندز- لێکۆڵینەوەیەك لە کەسایەتی و قۆناغی حوکمەکەی... وەزارەتی ڕۆشنبیری، چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی زنجیرە (٢٩٢) چـــــاپخانەی شـــــڤان ٢٠٠٤ ل١٧ - ١٨٢
((وەرگێڕ))

## ● (داڤیت)ی هەواڵدەر

لەگەڵ ئەوەی ئەو بەڵگانەی کە جاسووسەکان دەیاندا و زانیاریە هەوڵگریەکانی ئەرمەنیش، بەڵام دەوڵەت بە تەواوی ڕادەی خۆئامادەکردن بۆ شۆڕشەکەی نەدەزانی چۆنە، حوکمەتەکەی (عەبدولحەمیدی دووەم) کە زەندەقی لە شۆڕشگێڕان چووبوو، ئەو پێکاچوونە بەردەوامانە و کاری یاخیبوونانەی لە هەرێمی پەتلیسدا بەمەترسیداری دادەنا، بەتایبەت لە سونگەی دیپلۆماتیەوە چونکە دەستێوەردان و قسەی دەرەوەی دەهێنانە سەر، هیچ بەڵگەیەك نییە کە بیچەسپێنێ گوایە عوسمانێکان بەتەواوی پەییان بە ڕادەی ئامادەکاری تاشناقێکان بردووە بۆ هەستانیان بە شۆڕشێکی گەورە، ئەم چیرۆکە هەر قابیلی ڕۆماننووسەکانە تا بیخەنە چوارچێوەی ڕۆمانێکەوە، چونکە تۆکمەیی ئامادەکاریەکانی تاشناقێکان پیشان دەدات:

داڤیت کە بە (داڤۆ - داڤید)یش دەناسرا، لەدەستەی شۆڕشگێڕانی تاشناق لە ڤان ئەندامبوو، شەیدای کچێکبوو بەناوی (فاتان)و تەمایاربوو بیخوازێ[١٧٣]. بەڵام ئارامیش خولیای ئەو کچە لە کەللەی دابوو، بیروباوەڕە شۆڕشگێڕەکانی ڕێی ئەوەیان لێ نەگرتبوو کە پلەوپایە حیزبیەکەی بڕەخسێنێ بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆی.

بۆ ئەمە نەیهێشت داڤیت و فاتاك بۆ یەك ببن، بەڵام داڤیت ملی بۆ ئەم ئەمری واقیعە نەدا، دەشیزانی کە پیاو ماقووڵانی ئەرمەن لە شارەکەدا هەرگیز لایەنی ئەم ناگرن، ڕووەو تەفلیس بۆوە هەتا ڕەزامەندی هاوسەرگیری لە بەرپرسانی باڵای لیژنەی تاشناقەوە وەرگرێ، کەچی داماوە بەدەستی بەتاڵ گەڕایەوە، لەو هەلەدا ئارام توانی فاتان بەوە ڤایلکات کە واز لە داڤیت بهێنێ.

جیا لە تۆڵەی ئەم کاردەدا داڤیت چووە لای عەلی ڕەزای حاکم و چی

دەزانی لەبارەی تاشناقەوە بۆی هەڵڕشت. بەپێی زانیاریەکانی داڤیت لە مانگی شوبات /فەبرایری ١٩٠٨ فەرماندار کەوتە ئەنجامدانی زنجیرەیە پەلامار، داڤیت خۆی پێش سەربازەکان دەکەوت بۆ عەمباری چەکەکان، لە ٥ی شوبات/ فەبرایردا ٢٠٠ تاقم و فیشەکدان لە دەیری (سورب گریگۆر) کە هەشت میل لە ڤانەوە دووربوو دۆزرایەوە، لە عەینی ڕۆژدا سەربازەکان نزیکەی ٢٠٠ تاقم و فیشەکدان وزەخیرەی تریان گرت لەگەڵ ٥٠٠ دەمانچە لە گەڕەکی گاردن، بۆ سبەی هەڵمەتی پشکنین بووە هۆی دەستگرتن بەسەر ٢٠٠ گورزە دینامێتدا، ئیتر لەمەوە یاخیبووان لە گاردندا لە ماڵەکانەوە دەستیان لە سەربازەکان کردەوە، لە شەڕێکی کورتخایەنی ناو کۆڵانەکاندا حەڤە سەرباز و پۆلیسی کوژراو و برینداری لێکەوتەوە، ئەنجامی ئەمە عوسمانێکان وایان مەزندە کرد کە نێزیکەی ٢٠٠٠ هەزار پارچە چەك و ٥٠٠٠ هەزار نارنجۆك و سەدان هەزار فیشەك و کەل و پەلی سەربازیان گرتبێ[١٧٣].

ئەو بەرپرسانە سەرسامبوون لەو بڕە زۆرە چەك و تفاقە سەربازیەی کەبەشی کەتیبەیە سەربازی دەکرد، زوربەشی لەو چەکە باشانە بوو کە دەوڵەت خۆی نەیبوو، ئەمە ئەوەی دەردەخست کە قاچاغچێتی و ئامەیوکردنی چەك و جبەخانەکان سەرکەوتووبوون، حوکمەت لە ڤاندا بارکرابوو بەڵام بەخۆی نەزانیبوو.

سەرەڕای دەستبەسەراگرتنی ئەو چەکانە، هیچ کام لە ئەندامانی لیژنەی شۆڕشگێڕان دەستگیرنەکران و عەمباری گەورەی چەکی واش مابوو کە نەدۆزرابۆوە، شۆڕشگێڕان لەژێر ماڵە ئەرمەنەکاندا نەفەق و دالان (دهلیز)ی وایان لێدابوو، دوای شەڕێکی کورتی سەر جادە لەگەڵ سەرباز و پۆلیسەکاندا توانیان لەو نەفەق و دەلانانەوە کە دەچوونەوە سەر زێراب و ئاوڕۆ کۆنەکانی شار بۆی دەرچن و وەك بەرزەکی بانان قوتاربن[١٧٤].

داڤیت هاتە سەر ئەوەی کە ژیانی وا لەمەترسیدا، لە ماڵی (ئەحمەد

بەگ) کە ڕائیدێکی پۆلیسبوو، لە گەڕەکی (هامامونو) لە ناوەڕاستی گاردندا بە حیمایەوە[١٧٥] مایەوە، ڕێگە چارەیەکی دی کە زامنبێ بۆ مانەوەی لە ژیانیدا ئەوەبوو کە ببێ بە ئیسلام، ئەمەیشی کرد و ناوی خۆیشی گۆڕی بۆ (محەممەد - مەمەد). بیریش لەوە کرایەوە کە بکرێتە سەرباز و بچێتە ناو سوپاوە تا بپارێزرێ، بەلام وەرسی و تەنیایی هەراسانیان کرد و ڕووەو لەناوچوونیان دەبرد، کە ماوەی مانگێ لە مالی ڕائید ئەحمەددا وەك دەستبەسەر ماویەوە، لە ٢٢ ئادار /مارسدا سەرێکی لە بازاڕی (حاجی بوغان)دا، نێزیك بەو مالەی لێیبوو، ئەفسەرێك و دوو پۆلیسیش پاسەوانی بوون[١٧٦].

(داکات تیرلیمازیان) یان (تیرلیماسیان) کە ئەندامێکی تاشناق بوو، گورج ئەمەی بەهەل زانی، یان دەبێ زوتر بە فەرمانێ بووبێ، لە بازاڕەکەدا دانیە بەر ڕێژنەی گولله. داڤیت و چەند ڕێبوارێ پێکران و بریندار بوون، ئەوەی داڤیت کاریگەربوو و بووە هۆی مردنی[١٧٨]. هەشت کەسی تر لە بازاڕەکەدا پێوەبوون و کوژران (داکات)بۆی دەرچوو.[١٧٩]

لەسەرەتای مانگەوە موسولمانانی شاری ڤان لە بارێکی گرژی و ناڕەحەتدا بوون (یانی لەو حەلەوە کە عەمباری چەك و جبەخانەکان ئاشکرا کران و دەستیان بەسەردا گیرا و حەڤدە سەربازەکەش کوژران)، (داڤیت)یش وەك پالەوان و گیانفیدایە ڕێزی لێگیرا. هەر ڕاستەوخۆ دوای تیرۆرکردنی ئەو دەستکرا بە پەلامار و دەستدرێژیکردنە سەر ئەرمەنەکان، ئاژاوەگێڕان کە ژمارەیە پۆلیسیش خۆیان تێهاویشتبوون لە بازاڕ و ئەو شەقامانەی دەچوونەوە سەر گاردن ئەرمەنیان دەستگیر دەکرد و دایان دەپلۆستن. دەولەت ژمارەی ئەو ئەرمەنانەی کە لە سەروبەندی ئەو ڕوداوانەدا سەریان تیاچوو بە ٢٠ بۆ ٣٠ کەسی دادەنان، بەلام کونسولی بەریتانیا دەیگوت گوایە ژمارەی کوژراوان خۆی لە چل کەس داوە[١٨٠].

هەریەك لە حاکم و لایەنی سەربازی شاریش لای خۆیان کاریان بۆ هێورکردنەوە و پاراستنی گیانی ئەرمەنەکان دەکرد، بەڵام دەوری سەرەکی لەمەدا ئەوەبوو کە فەریق (مەحموود پاشا) پێی هەستا لە تەك کۆلۆنێل (تایەر بەگ) بەرپرسی سەرکردەیی ئەسپ سواران، چونکە ئەگەر ئەم دووانە نەهاتنایە ناوەوە لە مەسەلەکەدا، ئەوا بارو ڕەوشی شارەکە هێجگار پیس دەشێوا و تێکدەچوو.

عەلی ڕەزا بۆ هێورکردنەوە دەستوبرد سەربازی نارد بۆ شوێنی ئاڵۆزی و گرژیەکە، هەوڵی ئارامکردنەوەی شۆڕشگێڕە موسوڵمانەکان و ڕێگرەکانی دەدا، ئەوانەی بەقسەی خۆش دانەمرکانەوە بەتوندی و هێزەوە مامەڵەی لەتەکدا دەکردن. بۆخۆی سەردانی ئەو کەس و ناودارە ئەرمەنانەی دەکرد کە لە ڕوداوەکەوە نەگلابوون، تا سوپاسی هەڵوێستیان بکات و پێزانینی دەوڵەتیان پێ ڕابگەیەنێ.

ترسی ئەوەشی هەبوو کە ئەو هێزەی وا لەبەردەستیدا بەشی دامرکاندنەوەی ئەو ناژاوەیە نەکات، بۆیە فەرمانیدا بۆ ناردنی کەتیبەی چواری سەر بە بەتالیۆنی ٣٦ بۆ ناو شارەکە، گرنگتر لەمە نەیهێشت هێزەکانی سوارەی حەمیدییەی عەشایر، کە لە هەر مەترسییەکی یاخیبوونی بەرفراواندا بانگ دەکران، بێنە ناو شارەوە.

هەر کە هەواڵی تەقەکردن لە دەڤێت بڵاوبۆوە، ئەو ئەرمەنانەی ماڵەکانیان بە پاڵ ماڵی موسوڵمانەکانەوەبوو چۆڵیان کرد و خۆیان لە گەڕەکەکانی ناوچەی گاردن حەشاردا، بازاڕە سەرەکیەکە کە زۆری بەدەست ئەرمەنەکانەوە بوو هەڵگیرا و چۆڵبوو، تا بەر لە ٢ نیسان/ ئەپریل بازاڕیان نەکردەوە، بەمجۆرە وردە وردە برسێتی چنگی لە بینە قاقای خەڵکی شار گیر دەکرد، ئەوانەی هەموو هیوایەکیان بە بازاڕەکە بوو کە شمەك و زەخیرە و خۆراکیان لێ دەکڕی و دەهینا.

عەلی ڕەزاش کارو تەرتیباتی پێویستی دەکرد تا خۆراك و خواردن بە یەکسانی بگەیەنێ بە موسوڵمان و ئەرمەنەکان. سەربازەکان پارێزگاری گەڕەکە ئەرمەنیەکانیان دەرکرد هەڵکوتانە سەری موسوڵمانەکانیان لێ دوردەوە دەخستن[۱۸۱]. ئەو پڕوپاگەندە و دەنگۆیانەی کە خەڵکی شار بە ڕاستیان دەزانی، ببوونە چەکێك دژ بە سیستمە مەدەنیە حوکمەتیەکە، هەریەك لە کونسوڵەکانی ڕووسیا و بەریتانیا و فرانسا دەستخۆشیان لەو ڕێوشوێنانە دەکرد کە دەوڵەت گرتبوویە بەر و پیادەی دەکردن.[۱۸۲] بەڵام لە کونسوڵی ڕووسیاوە قسەی لاوەکی (نارەسمی) سەبارەت بە مەترسی ئەوەی کوشتارێکی چاوەڕوانکراو لە ئەرمەن بقەومێ بڵاودەکرایەوە[۱۸۳]. بەڵام خۆ دەنگۆکان بەبێ ئەویش هەر بڵاودەکرانەوە و لەناوا هەبوو، بەپێی ئەو قسە و ویتەویتانە دانیشتوانە موسوڵمانەکەی شارەکە دەچنە پاڵ یەکە سەربازیە یەدەگەکان بۆ ئەنجامدانی کوشتوبڕێکی سەرتاسەری لە گەڕەکە مەسیحیەکاندا، ئەم قسەڵۆکانە لە نێوەندی ئەرمەنەکاندا زیاتر تەشەنەی دەکرد و تا دەگەیشتە بەرگوێی بەرپرسان لە دەوڵەتانی ئەوروپا.

لەلایەکی ترەوە پۆلیسیش باوەڕی بە چەند ڕاپۆرتێ کردبوو سەبارەت بە ئەگەری هێرش و پەلامارێکی ئەرمەن بە سەرکردەیی لیژنەکە بۆ سەر گەڕەکی موسوڵمانەکان. جا بە تێوەگلانی ئەرمەنەکان خۆیان بە کوشتارەوە[۱۸۴]. وە بۆ دورخستنەوەی هەردوو ئەگەرەکە سەربازێکی زۆرتر لە هەرێمەکانی ترەوە نێرران بۆ ڤان، بەمە توانرا شارەکە جڵەوگیر کرێ و لەژێر دەستدابێ.[۱۸۵]

وا دەردەکەوت کە شۆڕشگێڕان بڕیاریان دابوو بەرلە هەمووشتێ هەروەك ساڵی ۱۸۹٦ گەڕەکە ئەرمەنەکان بەهێز و قایم کەن، سەرەڕای لەگیسچوونی ئەو بڕە زۆرەی چەك و تفاقی شەڕیان، بەڵام ئەوەی کە مابۆوە بەشی یاخیبوونێکی ڕاستەقینەی دەکرد. لە نێران لەسەر سنوور

شۆڕشــگێڕان گردبیونـــەوە، موســـوڵمانەکانیش لــە گەڕەکــە ئەرمەنـــەکان و دەوروبــەری ڕاپانــدەکرد، بەیــەکجاری شــارەکەیان دەکــرد بــە دوو کەرتــەوە، لـــەژێر دەســـتی ئەرمـــەن و ئیســـلامدا، بـــەڵام پیاومـــاقووڵانی ئەرمـــەن یاخیبووانیان قایل کرد بەوەی کە لە شارەکە بچنە دەرەوە و دەستبەرداری نەخشەکانیان ببن[٨٦].

کەچــی ســـەرکردە تاشـــناقیەکان خۆیـــان ون کـــرد، ســـەرەتا (نـــارام) و ئەوانیدی لە شارا نەمان، بەڵام ئەوەندەی پێنەچوو بـە نهێنی گەڕانـەوە نـاو گـاردن، لــە ١٩ ئــەیار/ مــایۆ هــەر کــە شــار ئــارامبۆوە، ســەربازەکان ئابلوقــەی گاردنیــان دا، دەســتیان گــردە پشــکنین بــەدوی ســەرکردەو عــەمباری چــەکدا، دەوری ناوچــەکە و ئــەو ناوچــانەی ترســیان لێیــان هــەبوو کــە موســـوڵمانە تونــدڕەوەکان پــەلاماری ئەرمەنــەکان بــدەن، دابــوو. جگــە لــە ١٢ ســـەرکردە نارامیشـیان دۆزیـەوە و (داکـات)یش لـە حەشـارگەیەکی ژێرزەمیـدا دەسـتگیر کرا، بۆ ڕۆژانی داویی سەربازەکان یاخیبووی تر و چەکێکی زۆر و نارنجۆك و دینامیت و دەیان هەزار فیشەکیان گرت[٨٧].

هەر یەك لە کونسوڵەکەکانی فرانسا و ڕووس و بەریتانیا لە ڤان لەگەڵ بـاڵیۆزی وڵاتەکـەیان لـە ئەسـتەموول داوای لێبـوردنێکی گشـتیان دەکـرد بـۆ ئەرمەنەکان. ئەوانەی لە حەشـاردانی چـەك یـان لـە تیرۆرکردنـی (داڤێت) و ئەوانیـــدی لـــە مەســـیحیەکان تێـــوە گلابـــوون، وە داوای داگـــەییکردنی ئـــەو موسوڵمانانەیان دەکـرد کـە ئەرمـەنیان کوشـتووە یـان هەڕەشـەیان لێکـردوون، بەو بەرپرسانەشەوە کـە دەسـتیان لەگەڵـدا تێکـەڵکردبوون، وە دەبـێ ئەمانـە سزا بدرێن[٨٨].

سەرباری گشت ئەو ڕووداو و نسکۆیانە، ئیدارەکـەی عـەلی ڕەزا بـەلای کەمـــەوە، یەکـــەم هـــەنگاوی ڕووە و باشـــکردنی ڕەوشـــی ڤاننـــا، دەوڵـــەت لـــە هەرکاتێکی تر باشتر بە ورەیەکی زیاتردوە کاروبارەکانی گرتـە دەسـت، بـەڵام

ڕوداوەكانی شۆڕشی ۱۹۰۸ و دەستێوەردانە ئەوروپاییەكان دەستی تەقەللا چاكسازییەكانی عەلی ڕەزایان گرت.

ئەو ڕوداوانەی كە لە ئەوروپای عوسمانی و ئەستەموولدا ڕویاندەدا، تارمایی خۆیان دەخستە سەر ڤانیش، لە دەستپێكی ۱۹۰۷ەوە ئەندامانی (سوپای سێ) لە مەكەدۆنیا شۆڕشەكەیان دەستدایە و ڕووەو شاخەكان بوونەوە، لە ساڵی ۱۹۰۸ شارەكانی مەكەدۆنیا ئاژاوەیان تێكەوت شۆڕش تەنیەوە بۆ ناو ڕیزەكانی ئەو سوپای سێیە. بەرلەوەی شۆڕشەكە زیاتر پەرەبستێنێ سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم یاخیبووانی بەوە داچڵەكاند كە دەستووری هەموار كرد و داوای هەڵبژاردنێكی پەرلەمانی كرد (لە ۲۳ تەمموز/ یۆلیۆ ۱۹۰۸ بەڕەسمی ئەمە ڕاگەیەنرا). یاخیبووەكان بە ڕەسمی دەستەڵاتیان نەگرتە دەست، بەڵام هەر زوو لە گشت لای هەرێمەكانەوە ئەوە ئاشكرا بوو كە دەوڵەت گۆڕانكاری گەورە بەخۆوە دەبینێ، لەنێو هێز و لایەنە موحافیزكارەكانەوە، ئەوانەی لەوەبەر پاڵپشتی سوڵتان بوون، پشێوی و نارەحەتی كەوتە ناویانەوە، بەڵام یاخیبووان لە ئیدارە سەربازی و هەرێمایەتیەكاندا، دەمێكبوو ئەوانە ناچاربوون وەلا و لاگیری خۆیان دەشاردەوە، ئیتر هاتنە دەرەوە و دەستی خۆیان خستەڕوو، ئەو حاكمانەی سەر بە ئیدارە كۆنەكەبوون وەك عەلی ڕەزا، نفوزی زۆریان نەما، شۆڕشگێڕانی ئەرمەن پەیوەندیەكی توندوتۆڵیان بەباڵەكانی ناو كۆمەڵەی (ئیتیحاد و تەرەقی) شۆڕشگێڕەوە هەبوو[۸۹]. لە شەو و ڕۆژێكدا شۆڕشگێڕانی ئەرمەن لە كۆمەڵێكی ڕاووەدونراوی یاخی لە ڤانوونەوە كە دەركەوت خۆیان موهەییادەكرد بۆ شۆڕش و فەرتەنە، بوونە خاوەن نفوز و هاوپەیمانی (پیاوە تازەكان) كە ها ئەمڕۆ یان سبەی حوكم دەگرنە دەست.

لە ڤان كار و ئەركی ڕاستەوخۆی شۆڕش ئازادكردنی ئەو یاخیبووانە بوو كە زۆر نەبوو گیرابوون، لێبوردنی گشتیش ڕاگەیەنرا، ئارام و برادەرانی

هەتا بەرلەوەی دادگەییکردنەکەیان تەواوبێ ئازادکران، ئەو یاخیبووانەی هێشتا خۆیان شاردبۆوە دەرکەوتن و خۆیان ئاشکرا کرد.

(دکتۆر و سەرکیس) و هاوەڵانیان خۆیان دا بەدەستی حوکمەتەوە و گورج ئازادیش کران، لقی کۆمەڵەی (ئیتیحاد و تەرەقی) لە ڤان کە بە پلەی یەکەم لە ئەفسەرە سەربازیەکان پێکهاتبوو، رایگەیاند کە پشتی ئەرمەن وا دەگرێ هەروەك رِوداوەکانی ئەم دوایە هەر روپانئەدابێ[190]. (دوای لەکارلابردنی عەلی رِەزا لە پلە وەزیفیەکەی فەرمانداری تازە – مەحموود بەگ - وای هەستدەکرد کە شۆرِشگێران هێشتا هەر مەترسین، بۆیە دەیویست ئەو سەرکردانەی کە لە رِووسیاوە هاتبوون بیاننێرِنەوە، بەڵام کونسوڵی بەریتانیا پەشیمانی کردەوە.[191])

بەدنە و پاڵپشتی کونسوڵە ئەوروپاییەکان، شۆرِشگێران و سەرکردەکانی کۆمەڵەی (ئیتیحاد و تەرەقی) لە ڤان، کەوتنە نارِەزایی دەربرِین لە بەرامبەر لەکارلابردنی عەلی رِەزا، هەتا هەندێ لە عەسکەریەکان پەلاماری ماڵی حاکمیان داو برِێ پارە و شمەك و چەکیان بەتاڵان برد، عەلی رِەزایان وەك حاکمێ بۆ (کاستامۆنۆ)[192] گێرِرایەوە. کابرا چەند لەلای زۆر نێوەندی شارەکەوە خۆشەویستبوو، ئەوەندەش خەڵکەکە بێزابوون لە ئەندامانی (ئیتیحاد و تەرەقی)و شۆرِشگێرانی ئەرمەن، دانیشتوان بروسکەیەکیان بۆ ئەستەمووڵ نارد، داوای گێرِانەوەی عەلی رِەزایان دەکرد بۆ حاکمیەتی شارەکە، بەڵام لەوێوە تەنیا گفتی ئەوەیان دانێ کە یەکێکی باشتر لە عەلی رِەزایان بۆ دادەنرێ[193].

## • تیرۆرکردنی عەلی رِەزا پاشا

عەلی رِەزا خۆی دەرکی بەوە کردبوو، دڵی خەبەری دابوو کە ئەگەر رِێگەی ئاسایی نێوان (مووش و سیواس) بگرێتەبەر رِووە و(کاستامۆنۆ)

توشی بەڵای کوشتن دەبێتەوە، بەدەستی تاقمە شۆڕشگێڕە ئەرمەنەکان. دەیزانی کە حاکمێکی پێشوتر لە ڤان (بەحری پاشا) لە (تەرابزون) پەلامار درابوو و ویستبوویان بیکوژن. جا بینا لەسەر ئەمانە وای بەباش زانی کە ئەو ڕێیەی دەیگرێ نهێنیبێت و کەس نەیزانێ.

ماڵاوایی لە دانیشتوانەکەی ڤان کرد، ئەوانەی ساڵ و نیوێك لە خزمەتیاندابوو، بۆ ئەوەی لە شۆڕشگێڕان هەڵبێ و ڕێگەونیان لێ بکات، عەلی ڕەزا ڕێگەیەکی چاوەڕواننەکراوی گرتە بەر کە بە (ئەرزڕۆم و باتووم)دا دەڕۆی لەوێوە سەربکەوێتە سەر کەشتیەك بەرەو (سینۆپ) یان (ئینیبۆلۆ)[195]. یەك لە شۆڕشگێڕانی ئەرمەن بەناوی (ئەلیف باشیان)[196] لەو کاتەی ئەو کەشتیەی عەلی ڕەزای لەسەر بوو خەریکبوو بەرەو (باتووم) دەجووڵا، پەلاماری داو کوشتی.

ئەرمەکەی عەلی ڕەزا لە باخچەی (سەیید بیلال کامی ) لە سینۆپ بە خاك سپێردرا.

## • پەراوێزەکان

١- ڤایز دیمیر ئۆغلو: Turk Kulturu Arastirma ئەنکەرە Ermeni mazalimi ١٨٩٥ -١٩٢٠

٢- فایلی ٦٩٥٨/٨٨١ لە گراڤیز بۆ کوری، ئەرزڕۆم ٢٨ ئەیار /مایۆ ١٨٩٧ دەربارەی چاکسازیەکان و پێویستی کۆمەك، وە بڕوانە فایلی ٦٩٥٧/٨٨١ لە ویلیامز بۆ کوری، ڤان ٢٤ تشرینی دوو/ نۆڤامبر ١٨٩٦

٣- فایلی ١٩٨/٤٢٤ لە مونسل بۆ ئۆکۆنر، ڤان ٧ کانوونی یەك /دیسامبر ١٨٩٨

٤- نرخی نانێك لە ڤان ٦٠ پارە بووە، ئەمەش نرخێکی زۆرە و کاری کردبووە سەر چینە هەژارەکان، هۆکەی ئەوەبوو ئەرمەنەکان وا ڕاهاتبوون

پارەکانیان دەدا بە گەنم و عەمباریان دەکرد تا لە بازاڕدا گەنم نەدەما ئینجا بە گران دەیان فرۆشتەوە، دیارە گوێیان بەو خەڵکە نەدەدا، کابرایەکی ترکی خێرخواز (جەمال بەگ) فرنێکی کردەوە و نانێکی دەدا بە ٤٥ پارە، هیچ نەبێ بۆ هەرزانکردنی خۆراك، بەڵام کارێکی تاکە کەسی ئاوها هێندکاریگەریەکی ئەوتۆی نەبوو.

(فایلی ٢٠١٢/١٩٥ لە مونسل بۆ کونور، ڤان ٢ ئەیار/ مایۆ ١٩٠٠)

٥- لە گشت نووسینەکاندا ناوی ئەم پیاوانەی ئەمن نەبراوە، بەڵام کونسوڵ تیریل دەڵێ: ئەوانە لە ساڵی ١٩٠٣ ئامادەبوون. (فایلی ٢١٤٧/١٩٥ لە تیریل بۆ ئۆکۆنر، ڤان ٢ نیسان/ ئەپریل ١٩٠٣)

٦- فایلی ١٨٨/٤٢٤ لە ویلیامز بۆ هێربرت، ڤان ٧ حوزەیران/یۆنیۆ ١٨٩٦. کە پشکنەرە ئەرمەنەکانی پەتلیس و ئەرزڕۆم لە کاردابوون، ئەستەموول موچەکانیانی دەدا، بەڵام بەبێ ئەوەی مووچەی ئەوانەی ڤان بدات، ئەمەش هەقیقەی شوێنی ڤان دەردەخات لە ڕێڕەوی بیری ئیمپریالیزمیدا، بەهاتنی ساڵی ١٨٩٧ تەنیا شەست دەرەك لە پەتلیسدابوون، ساڵی ١٨٩٨ بوون بە حەفتا، زۆری نەبرد رق و کینە پەیدابوو، چونکە دەرەکە مەسیحیەکان مووچەکانیان وەردەگرت بەڵام لە موسوڵمانەکانیان دەبڕی، فایلی ٦٩٥٨/٨٨١ لە مۆناهان بۆ کوری، پەتلیس ١٦ کانوونی دوو/ ئەکتۆبەر ١٨٩٨، کە ژمارەیەکی زۆرتری لە دەرەکە ئەرمەنەکان ڕەزکردووە (نەوەد کەس).

٧- هەر فایلی پێشوو لە ئیلیوت بۆ کوری ، ڤان ١٠ ئەیار/مایۆ ١٨٩٧,

٨- فایلی ١٩٩/٤٢٤ لە مۆنسل بۆ ئۆکۆنر، ڤان ٢٠ حوزەیران/ یۆنیۆ ١٨٩٩ وە هەر ئەو فایلە لە مۆنسل بۆ ئۆکۆنر ڤان ٧ تەمموز/ یۆلیۆ ١٨٩٩ سەبارەت بە ململانێی نێوان تایەر پاشا و زەکی پاشا، ئەو دوو سەرکردە سەربازیەی سوارەی حەمیدییە.

٩- فایلی ٩٢٠٥/٨٨١ لە دگسن بۆ ئۆکۆنر، ڤان ٤ ئاب/ ئاغستۆس ١٩٠٧،

کونسوڵ (برترام دیکسن) وای هەست دەکرد کە حاکم زیادەڕۆیی کردووە، بەڵام بێگومان ڕەوشی دارایی خراپبووە، بڕوانە فایلی ١٩١/٤٢٤ لە ویلیامز بۆ کوری، ڤان ٢٤ کانوونی دوو/ یەنایر ١٨٩٩، دەبێ ئاماژەش بەوە بدرێ کە کاپتن(دکسن) کە کونسوڵی بەریتانیا بووە لە ڤان سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراو بوو، بۆخۆی بەدووی ڕوداوەکانەوە بوو، بەچاوی خۆی دەیبینین، لە ڤان زانیاری چاکی دەستدەکەوت، کەمتر لە لادێکان، لە کاتی تردا لەوە دەچێ پشتی بەو زانیاریانە بەستبێ کە لە ئەرمەن و نێردراوەکانەوە پێی دەگەیشت. خۆ کە هەوڵی ئەرمەن و عوسمانیەکان پێچەوانەی یەکتر دەبوون، وای دادەنا کە بەرپرسان درۆ دەکەن، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە هاوسۆزی شۆڕشگێران بووە، هەرچەندە پەیوەندی شەخسی زۆریش لە تەکیاندا بووە، هەر بۆ پەیدا کردنی نموونەیەکی باش دەربارەی حوکمە پێش وەختەکانی دکسن دەکرێ بڕواننە فایلی ٢٢٨٤/١٩٥ لە دکسن بۆ لوزر، ڤان ١٣ ئاب/ ئاغستۆس لە بارەی پشێویەکانی ناوچەی (جاتاك) کە کورد و ئەرمەن پەلاماری یەکتریان دەدا، ئینجا دیکسن بە هاوڕێیەتی (ئارنۆڵدز) کە نێردراوێکی ئامریکایی بووە، چوونەتە ناوچەکە و ئەرمەنەکان چیان دەگوت وەری دەگرت، بەهەندێ سەرژمێری خەیاڵیشەوە (وەك ڕاونانی ١٥٠٠ کورد بەدەستی ٣٨ ئەرمەن) وەچیش کوردەکان بە ڕەسمی گوتبوویان پشتگوێی خستبوو، دیکسن دەیگوت: کوردەکان ویستوویانە شاری جاتاك تاڵانکەن و خەڵکەکەی سەربڕن، بەڵام ئەوە باسناکات کە بۆچی خەیاڵی وا دەکاتەوە و مەزندەی ئاوا بە بیریدا دێ، بە توندی وادەزانێ کە ئامادەبوونی خۆی بووە هۆی سەرنەگرتنی پیلانی کوردەکان.

١٠- فایلی ١٩١/٤٢٤ لە ویلیامز بۆ کوری، ١٠ ئەیار/ مایۆ ١٨٩٧. وە بۆ دەستخستنی سەرپێچیەکانی باج وەرگرتن بڕوانە: فایلی ٦٩٥٨/٨٨١ لە کرو بۆ کوری، پەتلیس ١٤ ئاب/ ئاغستۆس ١٨٩٧

١١- هەر ئەو فایلە لە تیریل بۆ ئۆکۆنر، ڤان ٨ کانوونی دوو/ یەنایر ١٩٠٤ بڕیارێك بەدەستەبەرکردن و ئامادەکردنی سەربازانی حەمیدییە لە ١٩٠٧ لە ڕوی پۆشاك و پارەوە، ئەوەش بەهۆی نەبوونی خەرجی پێویست: فایلی ٩٣٠٥/٨٨١ لە ئۆکۆنر بۆ گرای ، قوستەنتەنیە ٥ ئەیلوول/ سەپتامبر ١٩٠٧

١٢- فایلی ٩٠٥٠/٤٢٤ لە سافرستیان بۆ شیبلی، بەتلیس ١١ ئەیار/ مایۆ ١٩٠٧. بۆ نەگبەتی پلەی جێگری کونسوڵی بەریتانیا لە بەتلیس فۆرخکرابوو بۆ سافرستیان کە لە ١٩٠٢دا لە تەمەنی ١٩ ساڵیدل وەك تەرجومانێك دانرا بەڵام دوایی دایکوتا و جڵەوی گرتە دەست، ئەویش کە بەریتانیەکان دیپلۆماتکارێکی تەقلیدیان ناردە بەتلیس، ڕاپۆرتەکانی سافرستیانیش ئەوە پیشان دەدەن کە لاگیری وا تێدا و شارەزایی لە کارەکەیدا کەمە.

١٣- (تایەر پاشا) ئەم سیستمەی دانا، باجگری بەزۆری پشتی بە سیستمی باجی کشتوکاڵ بوو، کە تیایدا کەسانێك دەچنە زیادکردنێکەوە بۆ دەستخستنی ماف گردکردنەوەی باج لەچەند ناوچەیەك، جا سەرەك عەشایرەکان فێربوون کە لەو زیاد کردنەدا هەرخۆیان سەرکەون. فایلی ٢٠٦٢/١٩٥ لە مۆنسل بۆ ئۆکۆنر، ڤان ١٠ نیسان/ ئەپریل ١٨٩٩. حوکمەتەکەی هەرێم ویستی پلانێك پیادە بکات کە هەرکەس بەشدار بێت لە کردنەوەی ڕێگەو بانێکدا چاوپۆشی لە باجەکانی بکرێ، بەڵام ئەمە سەری نەگرت چونکە کەس حەزی بەو کارە گرانە نەدەکرد، کە لەوانەیە ئەمەش کێشەیەکی تر قوتکاتەوە. فایلی ٢١٤٧/١٩٥ لە تیریل بۆ ئۆکۆنر، ڤان یەکی تەمموز/ یۆلیۆ ١٩٠٢،

١٤- فایلی ٤٢٤ - ١٩١ لە ویلیامز بۆ کوری، ڤان ٢٤ کانوونی دوو /یەنایر١٨٩٧

١٥- فایلی سەرەوە لە ویلیامز بۆ کوری، ڤان ٢٢ شوبات/ فەرایر ١٨٩٧

١٦- هەر ئەو فایلە لە ویلیامز بۆ کوری، ڤان ١٣ ئادار/ مارس ١٨٩٧

١٧- فایلی ٩٣٠٥/٨٨١ لە هیرد بۆ ئۆکۆنر، بەتلیس ٢٥ ئاب /ئاغستۆس ١٩٠٧

١٨- فـايلى ٢٠٨٢/١٩٥ لـە مۆنسل بـۆ ئۆكۆنر، ڤـان ٢٣ ئـەيار/ مـايۆ ١٩٠٠ . مۆنسل دەلێ: ئەو عەشايرە كوردانە (هەركى و زرێبارى)شيان تێدابووە.

١٩- فايلى ٢١٤٧/١٩٥ لە تيريل بۆ ئۆكۆنر، ڤان ٣١ ئادار /مارس ١٩٠٢، ئەو دووانە سەر بەر ڕێبازى سۆفيگەرى نەقشبەندى بوون.

٢٠- فـايلى ١٩٧/٤٢٤ لـە ئـەليوت بـۆ ئۆكـۆنر، ڤـان ١٤ تشـرينى يـەك/ ئەكتۆبەر ١٨٩٨.

٢١- فـايلى ٢٠٠/٤٢٤ لـە سـپرينگ - رايـس بـۆ سـالزبيرى، گولهيـك ٢١ نيسان/ئەپريل ١٩٠٠، دەربارەى ڕەوشى رۆژاواى ئێران بڕوانە: فايلى ٨٢٠٢/٨٨١ لە تيريل بۆ ئۆكۆنر، ڤان يەكى ئەيلوول/سەپتەمبەر ١٩٠٢

٢٢- فايلى ٢٠٨٢/١٩٥ لە مۆنسل بۆ ئۆكۆنر، ڤان ٢٤ تەمموز/ يۆليۆ ١٩٠٠

٢٣- فـايلى ٨٢٠٢/٨٨١ لـە تيريـل بـۆ ئۆكـۆنر ، ڤـان يـەكى ئـەيلوول/ سـەپتەمبەر ١٩٠٣ وە فـايلى ٢١٤٧/١٩٥ لـە تيريـل بـۆ ئۆكـۆنر، ڤـان يـەكى تەمموز/يۆليۆ ١٩٠٣

٢٤- فايلى ٩٤٣٢/٨٨١ لە ئۆكۆنر بۆ گراى، ڤان ٢٤ شوبات /فەبراير ١٩٠٨

٢٥- فايلى ٢١٤٧/١٩٥ لە تيريل بۆ ئۆكۆنر ، ڤان ١٦ ئەيار /مايۆ ١٩٠٣

٢٦- فايلى ٢٠٨٢/١٩٥ لە مۆنسل بۆ ئۆكۆنر، ڤان ٢٤ تەمموز/يۆليۆ ١٩٠٠

٢٧- فايلى ١٩٩/٤٢٤ لە مۆنسل بۆ ئۆكۆنر، ١٠ ئەيلوول/ سەپتەمبەر ١٨٩٩

٢٨- فايلى ٩٤٣٢/٨٨١ لە ئۆكۆنر بۆ گراى، ڤان ٤ شوبات/ فەبراير ١٩٠٨

٢٩- فايلى ٢٠٦٣/١٩٥ لە مۆنسل بۆ ئۆكۆنر، ڤـان ١٠ نيسان/ ئـەپريل ١٨٩٩، مۆنسل ئاماژە دەدا بەوەى كە ئەمە ڕاستى بۆچوونى دەوڵەتى دەرخست كـە ناڕازيبوو لەسەرپێچى عەشايرەكان، چونكە شـەريف سـەركردەيەكى فيرقـەى حەميدييە بوو.

٣٠- فـايلى ٢١٤٧/١٩٥ لـە تيريـل بـۆ ئۆكۆنر، ڤـان ٢ نيسان /ئـەپريل ١٩٠٣، تيريل دەڵێ: سەبارەت بە شەريف، پەلامار و ڕوتكردنەوەى كاروانەكان ببووە

ڕوداوێکی ساڵانە، وە سەبارەت بە دەستگیرکردنی موسوڵمانەکان (لە سەرکردە و پیاوە توندڕۆ و ناسراودکانیان) بڕوانە: فایلی ١٩١/٤٢٤ لە مۆناهان بۆ گوری، پەتلیس ٢ نیسان/ ئەپریل ١٨٩٧

٣١- فایلی ٢١٤٧/١٩٥ لە تیریل بۆ ئۆکۆنر، ڤان ١٣ ئەیار /مایۆ ١٩٠٣، لەمبارەیەوە بڕوانە بەشی شەشەم، وە بۆ دەستخستنی لیستێ بەناوی گوندی ئەرمەنەکان کە عەشایری کورد لە قەزای (ئیرلیج) داگیریان کردبوو بڕوانە: فایلی ١٩١/٤٢٤ لە ویلیامز بۆ گوری، ڤان ١٢ ئادار/ مارس ١٨٩٧، بۆ ئەمە ویلیامز هیچ سەرچاوەیەك پیشاننادات، بەڵام وادیارە پشتی بەسەرچاوەیەکی ئەرمەنی بەستووە، بڕواکردنیش بە ڕاستگۆیی ئەم جۆرە سەرچاوانە و ئەوانەی وەك ئەوەن شتێکی مەحاڵە.

٣٢- فایلی ١٩٧/٤٢٤ لە ئەلیوت بۆ دوبونسین، ڤان ٢٢ حوزەیران / یۆنیۆ ١٨٩٨

٣٣- فایلی ١٩١/٤٢٤ لە گرو بۆ گوری، پەتلیس ٢٥ ئەیار/ مایۆ ١٨٩٧ وە فایلی ٦٩٥٩/٨٨١ لە گرو بۆ گوری، پەتلیس ٩ ئاب/ئاغستۆس ١٨٩٧

٣٤- فایلی ٨٨١/ ٩٢٠٥ لە هیرد بۆ ئۆکۆنر، پەتلیس ٢٥ ئاب/ ئاغستۆس ١٩٠٧

٣٥- سەبارەت بە (صادق) نووسینە دیپلۆماتیەکان زۆرن، هەر بۆ نموونە بڕوانە: فایلی ١٩٦/٤٢٤ لە ئەلیوت بۆ گوری، تەورێز ١٧ ئەیار/ مایۆ ١٨٩٨ سەرەڕای ئەو سەرچاوەیەی پەیوەندە بە صادقەوە لە بەشی حەوتدا.

٣٦- فایلی ٢٠٨٢/١٩٥ لە مۆنسل بۆ ئۆکۆنر، ڤان ٢ ئادار/ مارس ١٩٠٠

٣٧- فایلی ٢٢٥٠/١٩٥ لە دیکسن بۆ ئۆکۆنر، ڤان ٣١ ئادار /مارس ١٩٠٠

٣٨- دەستەیە جەتەی نەستووری کابرایەکی نێردراوی ئامریکاییان (و.هـ.براون) ڕوتکردەوە، بەمە بەتردریکی نەستووریەکان لەهاتنە کەنیسەی مەحروم کردن. فایلی ١٩٩/٤٢٤ لە مۆنسل بۆ ئۆکۆنر، ٢٧ تشرینی نۆڤامبر

1899,

٣٩- فـايلى ٢٠٦٢/١٩٥ لـه مۆنسـل بـۆ ئۆكـۆنر، ڤـان ٢٩ كـانوونى يـەك/ ديسـامبر ١٨٩٩، دەربـارەى ئـەو ململانـێ خوێناويـە ناوخۆييانـەى نێـوان نەسـتووريەكان، بڕوانـە: فـايلى ٢١٤٧/١٩٥ لـە تيريـل بـۆ ئۆكـۆنر، ڤـان ٢٦ ئاب/ئاغستۆس ١٩٠٢

٤٠- فايلى ٢٠٦٢/١٩٥ لە مۆنسل بۆ ئۆكۆنر، ڤان ٢٩ كانوونى يەك/ديسامبر ١٨٩٩، مۆنسـل دەيگـوت: مەسـيحيە نەسـتووريەكان كەمينەيـەكى بچـووكى گێرەشـێوێنى شـەڕانين، وەك كوردەكـانى دراوسـێيان. غـەرقن لـە كێشـە عەشايريە ناوخۆييەكانياندا و ململانێى خوێناوى پشتاوپشت گۆڵى كوتـاون، فايلى ٢٠٠/٤٢٤ لە مۆنسل بۆ دوبونسين، ڤان ١٨ تشرينى دوو/ نۆڤامبر ١٩٠٠

٤١- بڕوانە ئەو نموونانەى مۆنسل هێناونيەوە لە فايلەكەى سەرەوە.

٤٢- بۆ نموونە بڕوانە فايلى ٢٤٥٨/١٩٥ لە سميس بۆ ماليێ، ڤان ٢٩ ئـەيار /مايۆ ١٩١٤ (لەفتينانت نيبان. م. سميس)

٤٣- فايلى ١٩١/٤٢٤ لە ويليامز بۆ كورى ، ڤان ٨ شوبات /فەبراير ١٨٩٧

٤٤- فـايلى ٦٩٥٩/١٨١ لـە ئـەليوت بـۆ كـورى ، ڤـان ٦ تـەمموز/ يۆليـۆ ١٨٩٧، ئەليوت ئاماژە دەكات بەسـەركردەى كوردەكان: (ئـەو سـەركردەيەى وا نـە — خومارو - دادەنيشێ).

٤٥- فايلى ١٩٩/٤٢٤ لە مۆنسل بـۆ ئۆكۆنر، ڤان ٢٧ تشـرينى دوو/ نۆڤامبر ١٨٩٩، لـەوە دەچـێ نەسـتووريەكان لـە بـۆ بەرژەوەنديـەكانيان لـە ئاكۆكيـە كۆنـەكانى خۆيانـيـان تێپەڕانـدبێ، لـە سـاڵى ١٩٠٨دا داڵـدەى (شـاكير ئاغا)يـان دابـوو كـە كۆنـە دوژمنێكـى خۆيـان بـوو و لـە عەشـرەتى (هـارتوش)بوو، لـە عوسمانێكان ڤاچاغبوو. فايلى ٢٢٨٤/١٩٥ لە ديكسن بۆ لۆدز، ڤـان ٣٠ ئـەيلوول/ سەپتامبر ١٩٠٨.

٤٦- ڤايل ٤٢٤/ ٢٠٢ لـە ساتۆ بـۆ ئۆكۆنر، ڤـان ١١ شـوبات/فەبراير ١٩٠٢ وە

فایلی ۹۳۰۵/۸۸۱ لە دیکسن بۆ ئۆکۆنر، ڤان ۲۹ تشرینی یەك/ ئەکتۆبەر ۱۹۰۷

٤٧- فایلی ۲۲٥۰/۱۹٥ لە دیکسن بۆ ئۆکۆنر، ڤان ۳۱ ئادار/ مارس ۱۹۰۷

٤٨- فایلی ۷۷٤/۳۷۱ لە کۆرگن بۆ لوزر، ڤان ۲ تشرینی یەك /ئەکتۆبەر ۱۹۰۹,

٤٩- لەوە دەچێ لە سنووردکانی دەشتی ورمێ ژمارەیەکی زۆریان بە جارێك بووبن بە ئەرسەدۆکسی ڕووسیایی (فایلی ۲۱٤۷/۱۹٥ لە تیریل بۆ ئۆکۆنر، ڤان یەکی ئەیلوول/سەپتەمبەر ۱۹۰۲) نازانرێ تاگەی لەسەر ئەم باوەڕە تازەیەیان ماونەوە، بەڵام لە دەستپێکی جەنگی یەکەمی جیهانیەوە گەڕانەوە سەر باوەڕە نەستووریە کۆنەکەی خۆیان.

٥٠- لەو جۆرە ڕاپۆرتانە بەدرێژایی سی ساڵی نووسینی دیپلۆماتکاران زۆرن، زۆرتر ئەوەی تیایاندا باس کراوە هەر دەنگۆی ڕوتن. بۆ نموونە بڕوانە: فایلی ۱۳۱٥/۱۹٥ لە کلایتن بۆ ترۆتر، ڤان ۱۱ شوبات/ فەبرایر ۱۸۸۰.

٥١- فایلی ٤۲٤/۲۰۰ لە ئۆکۆنر بۆ سالزبیری، قوستەنتەنیە ٦ حوزەیران / یۆنیۆ۱۹۰۰

٥۲- فایلی ٤۲٤/۱۹٦ لە ئەلیوت بۆ کوری ، تەورێز ٥ ئەیار /مایۆ ۱۸۹۸ پارە کێشانەوە بۆ باربووکردنی شۆڕشی ئەرمەن ببووە نەریتێکی کۆن، بڕوانە فایلی ۱٦۸۸/۱۹٥ لە دیڤی بۆ لوید، ڤان ٦ کانوونی یەك /دیسامبر ۱۸۸۰

٥۳- حسێن نازم پاشا Ermeni olaylari Tarihi کە دوو بەرگە، ئەنقەرە Tc Basbakanlik Devlet Arsivieri Genel Mudurlugu. Osmanli Arsivi Dairi Baskanligi ۱۹۹٤.

٥٤- Tehcire Giden yolda Ermeni Meselesine Bir عەلی کاراکا cozum projesi ve ۱۸۷۸ - ۱۹۱٥ Turkiyyedc Ermeniler Icin (Tarih ve Tabiat Vakfi 2001, pp 9-90

٥٥- بەر لە یاخیبوونەکەی ۱۸۹٦ کارگەرانی تاشناق لە ئێرانەوە سەریان

لە ڤان دەدا، سەرکردە تاشناقێکان لە هەرێمەکەدا هاتن لە ڤان و جاتاکدا گردبوونەوە، (هراتش داسنابیدیان):

History of the Armenian Revolution Federation Dashnakisutiun

وەرگێرانی (براین فلیمینگ) و (ڤاها هابیشیان) کە لەم کتێبەدا بە (مێژووی یەکیەتی شۆڕشگێرانی ئەرمەن) ئاماژەی بۆ کراوە: میلانۆ، خانەی (جیمی) بۆ بلاوکردنەوە ١٨٩٨ ل٥٣، لە کتێبەکەدا ناوی ئەوانەی تێدایە، لەوانە (فارتان، ئەرتشاگ تادیوسیان) کە ئەمەی دوایی ئەندامە لە نووسینگەی یەکەمی تاشناقدا (١٨٩٢ - ٩٦)

٥٦- بەرلەوەی بێتە ڤانەوە، (کیزاگ) لە ئەستەموول مەشقە ئاساییەکەی حیزبی پێکرابوو، دوایی بۆ کەمێ زیندانیش کرابوو، ئینجا چووبووە بولگاریا و قەفقاس، هەروا (شاباز) لەدەستبەسەراگرتنەکەی بانکی عوسمانیدا بەشداری کردبوو، لە تەورێزیش لە کارخانەکانی چەکدا وەك ئارام و ئیشخان کاری کردبوو. (دیرمیناسیان) لە (کاس) مەشقیان پێ کردبوو (کەمێك نەبێ لە ساڵی ١٩٠٥ لە ڤان نەمایەوە)، جێی ئاماژەیە کە (بارسیگیان) کە بە (سەرکیس دحناسرا) لەو کاری پارە کێشانەوەیەدا کە تاشناق دەیکرد بەشداربوو، لەو کەسانەشبوو کە بۆ یەکەمجار لە لقی تاشناقی بولگاریا و قەفقاس و سویسرا خەباتی کردبوو، بۆ ئەمە هەردوو (سەلمان و میۆلیان) کە ئەندام حیزبی ئەرمیناکان بوون سەنگەریان گواستەوە بۆ ناو تاشناق. کتێبی :

The history of the ARF, pp 67,83 . 185-214

ناوی سێ سەرکردەی ناوخۆ (تیۆس، ئەلیس و بانوس) دەبات، بەڵام ئەو زانیاریە کەمەی لە باردیانەوەیە، دەلیلە بۆ ئەوەی کە پلەیەکی بەبایەخی ئەوتۆیان نەبووە.

٥٧- The history of the ARF, p ٨٣

٥٨- ئەو وەسفانەی خوارەوە لەو کتێبەی سەرەوە وەرگیراون، هەروا لە کتێبی (ئەناهید تیر میناسیان) Armenian Van / Vaspurakan لە Van ١٩١٥ چاپی ڕیتشارد.ج.هۆفانیسیان (کۆستامیسا، کالیفۆرنیا: خانەی مازدا بۆ بڵاوکردنەوە ٢٠٠٠ ل ٢٠٩- ٤٤، وە کتێبی (بیرفانت خاتاناسیان):

Two Glossaries for the Assistance of Researchers, Armenian Review 32, no 3

ئەیلوول/ سەپتەمبەر ١٩٧٩ ل ٢٦٧ - ٧٩

٥٩- دیکران میزرۆپ کاڵیحیان:

The Armenian Revolutionary Federation

کە نامەی دکتۆرایە بۆ زانکۆی بۆستن لە ٢٠٠٣ ل ١٨٨ لە ئیشارەیەکیدا بۆ بەڵگەنامەیەکی نووسینگەی (حیزبی تاشناق)ی ڕۆژهەڵات.

٦٠- خاتاناسیان : Two Golssaries لە لەدایکبوونیدا ناوەکەی پێشدەخات گوایە (نیکۆل بۆغۆسیان)ە (تیر میناسیان) ڤان ١٩١٥ ئاماژە دەدا بەوەی کە لە واقیعدا (نیکۆغایۆس بۆغۆسی میکاییلیان)ە.

٦١- هەرچەندە ئەمە لەو سەرچاوانەی وان لەسەرەوە باس نەکراوە بەڵام لە ساڵی ١٩٠٩ (فرامیان) بە ساختە مامەڵەی ڕەگەزنامەی ئامریکایی دروستکردبوو. فایلی ٢٣٨١/١٩٥ لە مۆرگن بۆ لوزر، ڤان ٢٠ تشرینی یەك / ئەکتۆبەر ١٩٠٩

٦٢- (فدائی - فیدایی) وشەیەکی ترکیە لە ئەسڵە عارەبیەکەیەوە، بەمانای (قوربانیدان بە ژیان) دەگەیەنێ. ئەم زاراوەیە بە گشتی بۆ شەڕوانانی ئەرمەن بەکاردەهات، تا ئیستەش باوە و بەکاردێ بۆ دەستەی شەڕوانان لە ڕۆژهەڵاتی ناڤین.

٦٣- فایلی ٩٤٢٣/٨٨١ لە دیکسن بۆ سیرین یاکونر، ڤان ٢ ئادار / مارس ١٩٠٨. وە بڕوانە فایلی ٩٤٢٣/٨٨١ لە دیکسن بۆ ئۆکۆنرا، ڤان ١٧ شوبات/ فەبرایر ١٩٠٨. دەبێ ئیشارەش بەوە بدرێ کە پاش دەستبەسەراگرتنی

چەکەکان دیکسن ئەم هەڵسەنگاندنەی داوە، وە لە ساڵی ۱۹۰۷ وا بۆی چووە کە حیزبی تاشناق ۲۰۰۰ هەزار چەکداری لە ڤاندا بڵاوکردۆتەوە، ئەمە بە پاڵ ئەوەی کە ئیمکانی ئەوەش هەیە کە لە چەند ڕۆژێکدا ۲۰۰۰ هەزاری تر لە لادێکاندا ئامادەکرێ (فایلی ۹۳۰۵/۸۸۱ لە دیکسن بۆ ئۆکۆنر، ڤان ٤ ئاب /ئاغستۆس ۱۹۰۷

٦٤- بڕوانە بەشی هەشتەمی ئەم کتێبە.

٦٥- فایلی ۹۳۰۵/۸۸۱ لە دیکسن بۆ ئۆکۆنر، ڤان ٤ ئاب /ئاغستۆس ۱۹۰۷

٦٦- هەر بۆ نموونە بڕوانە فایلی ۱۸۰٤/۱۹٥ لە دەیڤی بۆفیتزمۆریس، ڤان ۸ کانوونی یەك / دیسامبر ۱۸۹۲

٦٧- لویز نالبەندیان

The Armenian Revolutionary movement

بیرکلی: لە بڵاوکراوەی زانکۆی کالیفۆرنیا ۱۹٦۳ ل ۱۷٤

٦٨- فایلی ۲۰٥۳/۱۹٥ لە مۆنسل بۆ ئۆکۆنر، ڤان ۱٦ حوزەیران/ یۆنیۆ ۱۸۹۹

٦۹- نالبەندیان، پەراوێزی (٦٧) ل ۱۸۳

۷۰- فایلی ۱۹۱/٤۲٤ لە ویلیامز بۆ گوری، ڤان ۲٤ کانوونی دوو/ یەنایر ۱۸۹۷

۷۱- کەنعان سیفلی

Istanbul Ermeni Patrikligi Kurulusve tharihten (gununuze idari (Aziz Andac Yayinlari 2005. p 44

۷۲- فایلی ۲۰۸/٤۲٤ لە تیریل بۆ ئۆکۆنر، ڤان ۱۰ کانوونی دوو/یەنایر ۱۹۰٥ ، ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ ئەوەیە لە کاتێکی دیاریکراودا ئامریکاییەکان هەستیان کرد بەوەی کە (ئەرسبن) هاوکاری شۆڕشگێڕان بووە، (سی. دی. ئەشیر) نامەیەك بەبەرواری ۸ ئاب /ئاغستۆس ۱۹۰٤، لیژنەی ڕێبێدراوە ئامریکاییەکان

Barton , 11.4 (James l.papers, 1877-1943. box 11.2

لەوانەیە ئاماژە بکات بە دووبەرەکیەك لەناو شۆڕشگێڕاندا.

٧٣- حیسامەددین یێلدیرم

Rus - Turk Ermeni munasebetleri ئەنقەرە
(1914 - 1918 (Kok, 1990. p 64

٧٤- سەڵتەنەی عوسمانی،

Aspirations et agissements revolutionairess des comites Armenians avant et apres la proclamation de la .constitution ottomane (Tasnak partisinin Van subesinin حەسەن تۆکتای Istanbul m.p 1917 p263

٧٥- لیژنـەی ڕێ پێـدراوە ئامریکاییـەکان، ٧، ٩،١٦ نێـردراو بـۆ ڕۆژهەڵاتـی تـرکیا ١٩١٠ - ١٩١٩ بەڵگەنامەکان، بەرگی ٢٥.أ. ژمارە ١٢٣

Annual Report of Van station for the year 1911

حیزبـی تاشـناق بەتونـدی نـاڕازیبوو لـە بڵاوکـراوەی ڕێنمـایی (تعالیم)ەکـانی نێـردراوە ئامریکاییـەکان لـەناو گوندەکانـدا و لەمەشـدا سـەرکەوتووبوو، ئامریکاییـەکان ئەوانـەی بۆچـوونی جیاجیایـان هـەبوو دەربارەی قوتابخانـەکان وەك نـەیار تەماشـایان دەکـردن، حیزبـی تاشـناقیش هەڕەشـەی لـە قەشـەکانی نـاوخۆ کـرد و هـەتا لـە شـاری ڤـان نەدەچـوونە کۆبوونەوەی ئەو نێردراوانەوە

بـەدانانی فەرمانـداری تـازە ڕەوشـی سیاسـی کـەمێ گـۆڕرا. بـوونی شۆڕشگێڕان و چالاکیەکانیان وایکردبـوو کـە بارەگە گرژبـێ، بەتایبـەت پـاش ئـەوەی نفوزیـان زیـادی کـرد و لاقی ئـەوەیان لێـدەدا کـە خۆیـان سـەرپەرشـتی گشت ئەرمەنەکانی ناو شارە و لادێکانیش دەکەن. دیـارە کـارێکی ئـاوا و لاف لێـدانێکی وا دەبێتـە ئـاڵۆزکردنی ئەرکـەکانیان ، لەوانەیـە گـەورەترین هەڵەیـەك کـە لـە بـوونی شۆڕشـگێڕەکان لـە تـارادابێ ئـەو نیازەیـانبێ کـە بـە ئاشـکرا دەریـدەبڕن بـۆ بەربـەرەکانیکردن لـە ئـایین و ئـەخلاق. (٩٧ هـەمین

راپۆرتى ساڵانەى رێپێدراوە ئامريكاييەكان بۆ كاروبارى دەرەوە كە دراوە بە كۆنگرەى -كليفلاند - ئۆهايۆ ٩ - ١١ تشرينى يەك/ ئەكتۆبەر ١٩٠٧، بۆستن ليژنەى ئامريكايى ١٩٠٨ ل ٨١)

٧٦- حيزبى هانشاك لەسەرەتاى سەدەى بيستدا هێزێكى بێهێزبوو، بەلأم خۆ لە نەوەدەكانى سەدەى پێشتر (نۆزدە) لەناوچە گوندنشينەكاندا چالاك و بەهێزبوو (بەتايبەت لە زيتون و ساسۆن) كەچى وا دەرناكەوێ كە لەناو لادێكانى ڤاندا سەركەوتنێكى ئەوتۆى بەدەست هێنابێ، رێكخستنى تاشناق بە توندى و چالاكانە لە ناوچەى ساسۆن و مووش لە كاردابوو، ئەمە بەرلەوەى لە ڤان دەستبەكاربێ.

٧٧- (ج.س.رينۆڵدز) ليژنەى رێ پێدراوە ئامريكاييەكان ٧،٩،١٦ نێردراو بۆ رۆژهەڵاتى تركيا ١٩١٠ - ١٩١٩ بەڵگەنامەكان، بەرگى ٢٥ أ ژمارە ١١١

Report of the village work in the van station field,
Eastern Turky Mission 1910

٧٨- فايلى ١٩٦/٤٢٤ لە كورى بۆ سالزبيرى، قوستەنتەنيە ١٥ نيسان / ئەپريل ١٨٩٨

٧٩- فايلى ٩٢٠٥/٨٨١ لە دكسن بۆ ئۆكۆنر، ڤان ٢٩ تشرينى يەك/ ئۆكتۆبەر ١٩٠٧

٨٠- سەرەراى بەكارهێنانى وەسيلەى پارەكێشانەوە لەوەبەر، بەلأم بريارى پەيرەوكردنى پارەكێشانەوە و تيرۆركردن بۆ ترساندن تا پارەى بۆ تاشناق پێ كۆكەنەوە بە رەسمى لە (دەستەى نوێنەرايەتى بەرێوەبردنى ئەندامانى تاشناق)ەوە لە ١٩٠١دا دەرچوو. بروانە:

History of the ARF. Pp 26-63

كە باس لەو بريارە دەكات چۆن ئەو سياسەتە جێبەجێ بكرێ و هەندێ كارى كوشتن ئەنجامدرێ. كتێبەكە ئاماژە دەدا بەوەى كە پەيرەوكردنى ئەو سياسەتە كەڵكى هەبوو و ئيشى خۆى كرد. لە سونگەى پراكتيزەكردنى

پرۆژەکەوە یەکیەتی شۆڕشگێڕانی ئەرمەن هەندێ پیاوی خۆی لە دەستدا، بەڵام لە بەجێهێنانی زنجیرەیە کاری تیرۆردا سەرکەوتوو بوو، ل ٦٢، حیزبی هانشاك لەلای خۆیەوە زنجیرەیە تیرۆرکردنی دەستدایە لە هەراتش داسنابیدیان: The Hanchakian party

وەرگێڕانی: ماریێ ا. ئەراکیلیانس، Armenian Review ١٤ژمارە (٤) زستانی ١٩٨٨ ل (٢٦- ٧٧) ئەڵتان دالیورمان:

Turklere Karsi Ermani Kamitecileri Istanbul Bogazici universites 1975. p 31

کە لیستێکی تێدایە بەناوی ئەو ئەرمەنانەی کوژراون.

٨١- History of the ARF. P ٤٧

٨٢- هەمان سەرچاوە. ل٦٤

٨٣- فایلی ٢٠٦/٤٢٤ لە هیسکوت بۆ ئۆکۆنر، پەتلیس ٢ ئاب/ئاغستۆس ١٩٠٤

٨٤- فایلی ٢٠٨/٤٢٤ لە هیسکوت بۆ ئۆکۆنر، پەتلیس ٤ حوزەیران/ یۆنیۆ ١٩٠٥ وە بۆ وەدەستخستنی نموونەی کۆنتر لەبارەی کوشتنی قەشەکان و کەسانیترەوە بە دەستی شۆڕشگێڕەکان بڕوانە: فایلی ١٨٤/٤٢٤ لە کامیرباتش بۆ کوری، ئەرزڕۆم ٢١ تشرینی یەك/ ئۆکتۆبەر ١٨٩٥. کە لەو حەلەدا پیاو کوشتن گەیشتبووە لووتکە، یەك لە شۆڕشگێڕان ساڵی ١٩٠٣ ویستی (مالاشیا ئۆرمانیان) بەترەریکی ئەرمەن لە قوستەنتەنیە لە کاتی قودداسدا لەناو کڵێسا بکوژێ، بەڵام کابرا بە بریناری ڕزگاری بوو، ئەوان ئەو بەترەریکەیان بەکەسێك دادەنا کە هەردەم مێچکە مێچکەی بۆ دەوڵەت دەکرد و دەیویست ڕازیانکات. (فایلی ٨٢٠٢/٨٨١ لە واینبرید بۆ لاندزدون، ٢٦ کانوونی دوو/ یەنایر ١٩٠٣

٨٥- فایلی ٢١٤٧/١٩٥ لە تیریل بۆ ئۆکۆنر، ڤان ٢ نیسان/ ئەپریل ١٩٠٣

٨٦- فایلی ٩٢٠٥/٨٨١ لە دکسن بۆ ئۆکۆنر، ڤان ٤ ئاب/ئاغستۆس ١٩٠٧

٨٧- فایلی ٢١٤٧/١٩٥ لە تیریل بۆ ئۆکۆنر، ڤان ٢ نیسان/ ئەپریل ١٩٠٣

٨٨- فایلی ٢٢٨٣/١٩٥ لە دکسن بۆ ئۆکۆنر، ڤان ٢ ئادار/مارس ١٨٩٨

٨٩- کەمەکێ کە لە بەرچاو بێ و شۆڕشگێڕان بۆ گوندنشینە ئەرمەنەکانیان کردبێ تەنیا جاروبار دەکەوتنە فریایان لە پەلاماردانی کوردەکاندا بۆ سەریان، بۆ نموونە بڕوانە کونسوڵ دیکسن دەربارەی پشێویەکانی ناوچەی (جاتاك) لە ساڵی ١٩٠٨، ئەم ڕاپۆرتە سەرتاپا لەدەمی ئەو کەسانەوە وەرگیراوە کە ئەرمەن و نێردراوی بیانی بوون لەسەروبەرندی ڕوداوەکاندا، بۆیە تەنیا قسە و بۆچوونی لایەنێکە، بەڵام لەبەرامبەردا ئاماژە دەکات بۆ ئەوەی کە گیانفیداکان بەپاڵ گوندیە ئەرمەنەکانەوە لە شەڕەکاندا بەشداربوون: فایلی ٢٢٨٤/١٩٥ لە دیکسن بۆ لۆدز، ڤان ١٨ ئاب /ئاغستۆس ١٩٠٨

٩٠- فایلی ١٩١/٤٢٤ لەویلیامز بۆ کوری، ڤان ٣٤ کانوونی دوو/ یەنایر ١٨٩٧

٩١- بڕوانە (حەسەن ئۆکتای)

Ermeniler ve van Ihtilal orgutu 1896- 1915 Ermeni Arastirmalar Dergisi 5 (2002) p 87

٩٢- (ئەشیر) ١٠ ئەیلوول /سەپتامبر ١٩٠٤ لیژنەی ڕێپێدراوە ئامریکاییەکان

Barton, James l., papers, 11, 4. 1877-1943. box : 2

٩٣- لە ئاماژەیەکدا بۆ ڕوداوێکی نموونەیی، بڕوانە: فایلی ٢٠٨/٤٢٤ لە هیشکوت بۆ ئۆکۆنر، بەتلیس ١٤ ئەیار /مایۆ ١٩٠٥ کە باس لە شەڕێکی ڕاخیبووەکان دەکات کە لە گوندێك خۆیان حەشارداوە لەگەڵ سەربازەکاندا، لەمەدا ٧ شۆڕشگێڕ کە لە ڕووسیاوە هاتبوون و ١٦ گوندنشین و ١٢ سەرباز کوژران، گوندەکە نەستوتێنرا بەڵام کوردەکان تاڵانیان کردبوو.

٩٤- پەراوێزی ٨١، ل٤٩

٩٥- ڕێی تێدەچێ کە جاروبار حوکمەتی ڕووس شۆڕشگێڕانی بەچەك یارمەتی دابێ، بەتایبەت پاش جەنگی یەکەمی جیهانی، بەڵام لەمبارەیەوە

بەڵگەیەکی تەواو بەدەستەوە نییە، کونسوڵ دیکسن وای بۆ دەچوو کە ئەو چەکانەی ئامدیوی سەڵتەنەکە دەکران لە عەمبارەکانی رووسیاوە دەهاتن یان لێی دەدزران، جا لەمەوە باسی ڕوداوێك دەکات کە تاشناق ملیۆنێ فیشەکدانی لە عەمباری (ئەلکساندرۆ بۆل) دزی، ئەوەش بەدەمچەورکردنی هەندێ پاسەوان و بێهۆشکردنی هەندێکی تریان. (فایلی ٩٤٢٣/٨٨١ لە دیکسن بۆ سێر .ن. ئۆکۆنر، ڤان ٢ ئادار /مارس ١٩٠٨) ئەم ڕوداوە دیسان لە کتێبی: History of the ARF. P ٦٩ باسی لێوە کراوە .

٩٦- فایلی ١٩٦/٤٢٤ ژمارە ١٧ لە ئەلیوت بۆ گوری، تەورێز ٢ ئەیار /مایۆ ١٨٩٨ ئالبەندیان The Armenian Revolutionary movement p ١٧٤-١٧٣

٩٧- بۆ نموونە: لە ساڵی ١٩٠٨ لە سێ سەرکردەی عەشایری دووانیان (حسێن و ئەمین) دوژمن بە شۆڕشگێڕان بوون، بەڵام سێیەمیان (محەممەد) هاوپەیمانیان بوو.

٩٨- (عەلی کاراکا)، چاپی Anadolu Islahati ve ahmet sakir pasa ئەستەموول ، ئیرین، ١٩٩٣ ل١٣٠، وە بڕوانە فایلی ٢١٤٧/١٩٥ لە فریمان بۆ ئۆکۆنر، پەتلیس ١٠ کانوونی دوو/یەنایر ١٩٠٢

٩٩- هەر بۆ نموونە عەمباری (کاجان) کە باسی لێوە دەکرێ لەسەرو ڕێگەی یەکەمەوە بوو.

١٠٠- کتێبی: مێژووی ARF ل ٦٥ - ٦٦ باس لە ڕێگەیەك دەکات لە (قارس)ەوە ویەکێکی دی لە (باتوم)ەوە دەڕوا بۆ (ئەرزڕۆم). لەساڵی ١٩١٣ تفەنگەکان لە باکوورەوە گەیشتن و لەوانەشە بەم ڕێگەیەدا هاتبن، بڕوانە کتێبی: Rebellion in the city of Van بەشی هەشتەم.

١٠١- فایلی ٢٢٨٤/١٩٥ لە دکسن بۆ لوزر، ڤان ٢٢ ئەیلوول /سەپتامبر ١٩٠٨ (کوپ مهمت)یش لەڕووی سیاسیەوە هاوکاری شۆڕشگێڕانبوو، دوای شۆڕشی

١٩٠٨ لە تەقەللایەکدا پێکەوە بۆ لابردنی قایمقامی شاری (سارای) سیفدیت بەگ کە شۆڕشگێڕانی ئەرمەن و عەشایرە کوردەکان بە کابرایەکی کارا و چالاکیان دادەنا (فایلی ١٩٥/٢٣٨٤ لە دیکسن بۆ لوزر، ڤان ٢٠ ئەیلوول/ سەپتامبر ١٩٠٨ ل١٠٢) گیانفیداکان هەردوو شاری (دیلمان و سەلماس)یان کرد بووە بنکەی ئاودیوکردنی چەك و جەنگاوەران بۆناو ترکیا، لەوێکانی لیژنەیەکی کارایان هەبوو بەسەرۆکایەتی کابرایەك بەناوی (موگردیتش) ، پێشتر پەیوەندیەکی خراپیان لەتەك دراوسێ کوردەکانیاندا هەبوو، بەلام ئەمساڵ دۆستایەتیەکی زۆر توند هەردوولای کۆکردبۆوە (فایلی ٣٧١/٥٤٠ لە دیکسن بۆ ئۆکۆنر، ڤان ٣١ کانوونی دوو/ یەنایر ١٩٠٨)

١٠٣- (ملخاس. یان: ئەرداشیز هۆفیزیان) ، سەرکردەیەکی بەدەستەلاتبوو لە ڤان، بڕوانە ئەو بەشەی لەسەرەوە کە باس لە (شۆڕشگێڕانی ئەرمەن)دەکات.

١٠٤- (ملهاس) Yasantilar, Hayarenik Aylik Dergi ٢(١٩٢٦) پاشکۆی ژمارە ٦٨ فایلی ٨٨١/٨٢٠٢ لە فریمان بۆ ئۆکۆنر، پەتلیس ٢٤ کانوونی دوو/ یەنایر ١٩٠٢

١٠٥- فایلی ١٩٦/٤٢٤ ژمارە ١٧ لە ئەلیوت بۆ کوری، تەوریز ٢ ئەیار /مایۆ ١٨٩٨

١٠٦- بڕوانە کتێبەکەی (ئۆنال): Sadettin pasa`nin Anila. P- ١٦٣ دەنگۆیەکی لاواز بلاوبۆوە گوایە سەربازەکان تفەنگەکانیان لە ساڵی ١٩١١وە دەفرۆشت بە یاخیبووەکان، بڕوانە فایلی ١٩٥/٢٣٧٥ لە مولنۆ - سیل بۆ لوزر، ڤان ٨ نیسان/ئەپریل ١٩١١

١٠٧- فایلی ٤٢٤/٢٠٦ لە تیریل بۆ ئۆکۆنر، مووش ٤ ئاب /ئاغاستۆس ١٩٠٤

١٠٨- فایلی سەرەوە

١٠٩- کتێبی مێژووی JARF ل٤٦ - ٤٧، بەهۆی سنورداری چاپکردنەکە و

ئەو کارلێکە کەمەیشی کە هەیبووە لەسەر یاخیبوونەکە لە هەرێمی ڤاندا، ناکرێ بنسی یاخیبوونەکەی ساسۆن لەم کتێبەدا بکەین. جا بۆ زانیاری بەدەستهێنان لەبارەیەوە، بڕوانە ئاماژەکانی فایلی ٢٠٢/٤٢٤ لە مونسۆل بۆ ئۆکۆنر، ڤان ١٦ حوزەیران /یونیۆ ١٨٩٩وە فایلی ٢٠٦٢/١٩٥ لە هۆکواغلو بۆ غورون، هەروا فایلی ٢٠٦٢/١٩٥ لە مونسل بۆ ئۆکۆنر، پەتلیس ٢١ ئەیار/ مایۆ ١٨٩٩. نێردراوە ئامریکاییەکان دەیانگوت: لەبەر ئەوەی وێستگەی ڤان هێند دور نییە لە سنووری ڕووسیا و ئێرانەوە، بەهۆی گردەوەکانی شۆڕشگێرانەوە لە بارێکی ئاڵۆز و گرژدایە، ئەو یاخیبووانەی کە وێڵی هێنانەدی تەنیا یەك ئامانجن ئەویش بەرپاکردنی پشێوی و ئاژاوەیە لە نێو ئەرمەنەکاندا (٧ تەمموز/یۆلیۆ ١٩٠٤، ڕاپۆرتی نهێنی سەبارەت بە وێستگەی ڤان، ڕاپۆرتی نەوەدوچوار ساڵانەی لیژنەی ڕێ پێدراوە ئامریکاییەکان بۆ کاروباری دەرەوە کە دراوەتە کۆنگرەی گرینیل لە ئەیەوا، لە ١١ - ١٢ تشرینی یەك / ئەکتۆبەر ١٩٠٤) بۆستن، لیژنەی ئامریکایی ١٩٠٥ ل ٦٩.

١١٠- ڕاپۆرتەکان دەربارەی کارە یاخیبووەکانی ئەرمەن هێند زۆر بوون بە ڕادەیە لە گشت نووسینە دیپلۆماتیە جۆراوجۆرەکاندا باسکراوە، بۆ نموونە بڕوانە:

فایلی ١٩٦/٤٢٤ لە ئەلیوت بۆ کوری، تەورێز ١٧ ئەیار /مایۆ ١٨٩٨وە فایلی ٢٠٠/٤٢٤ لە مونسل بۆ ئۆکۆنر، ڤان ٢٦ نیسان /ئەپریل ١٩٠٠ وە فایلی ٨٢٠٢/٨٨١ لە تیریل بۆ ئۆکۆنر، ڤان ٢٧ تشرینی یەك /ئەکتۆبەر ١٩٠٢.

١١١- شەڕەکان زۆربوون و ناکرێ باس لە هەریەکەیان بکرێ، بۆ دەستخستنی نموونە لێیانەوە بڕوانە: فایلی ١٩٧/٤٢٤ لە ئۆکۆنر بۆ سالیزبیری، قوستەنتەنیە ٢٢ تشرینی دوو/ نۆڤامبر ١٨٩٨ وە فایلی ١٩٩/٤٢٤ لە لامپ بۆ ئۆکۆنر، ئەرزڕۆم ٩ تشرینی دوو/ نۆڤامبر ١٨٩٩. کتێبەکەی History of the ARFوەسفێکی کورتی هەندێ لەو شەڕانەی تێدایە وەك لە ل ٦٧ - ٦٩

دا هاتووە، بەریتانیەکان ئیشارە بەوە دەکەن کە عوسمانیەکان ئەوپەڕی هەوڵیانداوە بۆ پاریزگاری ئەرمەنە لادێییەکانی سەر سنوور لە پەلاماردان و دەستدرێژیکردنە سەریان، بەڵام هەمیشە هەوڵەکانیان بەبادەچوو (فایلی ١٩٩/٤٢٤ لە ئۆکۆنر بۆ سالزبیری، قوستەنتەنیە ١٢ تەموز/یۆلیۆ ١٨٩٩)

١١٢- هەر بۆ نموونە بڕوانە: فایلەکەی پێشوو، لە لامپ بۆ ئۆکۆنر، ئەرزڕۆم ١٣ تشرینی دو/ نۆڤامبر ١٨٩٩، وە فایلی ٢٠٥/٤٢٤ لە هامبسۆن بۆ ئۆکۆنر، ئەرزڕۆم ١٣ تشرینی یەك/ ئەکتۆبەر ١٩٠٣، جگە لە تفەنگ یاخیبووەکان بڕێکی زۆر لە دینامێتیشیان لە تەك خۆیاندا هاوردبوو، فایلی ٢٠٥/٤٢٤ لە هامبسۆن بۆ ئۆکۆنر، ئەرزڕۆم ٢ ئەیلوول/ سەپتامبر ١٩٠٣

١١٣- نموونە زۆرە تا باسیانکەین، بەڵام بڕوانە فایلی ٢٠٢/٤٢٤ لە دوبونسین بۆ لانسدزداون، قوستەنتینیە ٢٣ تشرینی دوو/ نۆڤامبر ١٩٠١ کە سەبارەت بە شەڕێکە شۆڕشگێڕان دەیری (ئەراخ)یان گرت، بەڵام عوسمانیەکان دەرحەقەت نەهاتن و نەیانتوانی نەهێڵن تەقە لە دەیرەکە بکرێ کە منالێکی زۆر خۆیان تیا شاردبۆوە و پەنایان بۆ بردبوو.

١١٤- حوکمەتی ئێران رازیبوو بەوەی بەرتیل وەرگرێ و ئیتر ڕێگە بۆ یاخیبووان ئاچووغبێ بە ئارەزووی خۆیان چیان بوێ بیکەن، بڕوانە فایلی ١٩٦/٤٢٤ لە ئەلیوت بۆ کوری، ١٧ ئەیار/مایۆ ١٨٩٨

١١٥- بڕوانە فایلی ١٩٦/٤٢٤ لە ئەلیوت بۆ کوری، ڤان ١٢ ئادار/ مارس ١٨٩٨، وە فایلی ٦٩٥٨/٨٨١ لە کوری بۆ سالیزبیری، ٣ حوزەیران/ یونیۆ ١٨٩٧ ، وە هەر ئەو فایلە لە ویلیامز بۆ کوری، ٥ نیسان/ ئەپریل ١٨٩٧

١١٦- هەر بۆ نموونە بڕوانە: فایلی ٢٠٢/٤٢٤ لە ئۆکۆنر بۆ لاندزداون، قوستەنتینیە ١٧ کانونی یەك/ دیسامبر ١٩٠٢، وەفایلی ٢٠٦/٤٢٤ لە تیریل بۆ ئۆکۆنر، ڤان ٧ ئەیار/ مایۆ ١٩٠٤

١١٧- فایلی ١٠٧/٤٢٤ لە ئۆکۆنر بۆ سالیزبیری، ٢٨ ئەیلوول/ سەپتامبر

١٨٩٨، وە فـایلی ١٩٧/٤٢٤ لـە گرایفـز بـۆ دوبونسـین، ئـەرزڕۆم ٢٩ ئـەیلوول/ سەپتامبر ١٨٩٨

١١٨- فایلی ٨٢٠٢/٨٨١ لە هامسون بۆ ئۆکۆنر، ئەرزڕۆم ٥ تشرینی یەک/ ئەکتۆبەر ١٩٠٣، وە هەر ئەو فایلە لە شیبلی بۆ ئۆکۆنر، ئەرزڕۆم ٤ تشرینی دوو/ نۆڤامبر ١٩٠٣

١١٩- فـایلی ٢٠٣/٤٢٤ لـە مۆنسڵ بـۆ ئۆکـۆنر، قوستەنتەینیە ١٢ شوبات/ فەبرایر ١٩٠٢

١٢٠- فـایلی ٢٠٤/٤٢٤ لـە مۆنسـل بـۆ ئۆکـۆنر، ڤـان ٢٧ تشـرینی یـەک/ ئەکتۆبەر ١٩٠٢، دەنگ بڵاوبوو گوایە ئەرمەنەکان خـراپ مامەڵەیان دەرهـەق سەربازەکان دەکرد هەروا لەگەڵ خـەڵکانی تـریش، بـەڵام لـە بەدواداچـوون و کۆڵینەوەی کۆنسلگەریە ئەوروپاییەکاندا دەرکەوت ئەوە راست نییە، بۆ ئەمە تەماشای فایلی١٦١٧/١٩٦ بکـە بروسـکەیە لـە دەیڤـی یـەوە، ڤـان ٢٩ ئـەیار/مایۆ ١٨٩٠، وە فـایلی ٢١٠/٤٢٤ لـە هاگۆبیـان بـۆ وەزارەتـی دەرەوە ٢٦ ئـەیلوول/ سەپتامبر ١٩٠٦

١٢١- فایلی ٢١٤٧/١٩٥ لە تیریل بۆ ئۆکۆنر، ڤان ٢٧ تشرینی یەک/ ئۆکتۆبەر ١٩٠٣

١٢٢- فـایلی ٢٠٨٢/١٩٥ لـە مونسـل بـۆ ئۆکـۆنر، ڤـان ١٩ کـانوونی یـەک/ دیسامبر ١٨٩٩

١٢٣- فایلی ٢٠٥/٤٢٤ لە هامبسون بۆ ئۆکۆنر، ١٩ تشرینی یەک/ئۆکتۆبەر ١٩٠٣

وە بـۆ پەیـداکردنی خەمڵانـدنێکی کـەمتر بڕوانـە هـەر ئـەو فایلـە لـە شیبلی بۆ ئۆکۆنر، ئەرزڕۆم ١٦ تشرینی دوو/ نۆڤامبر ١٩٠٢

١٢٤- فـایلی ١٩٧/٤٢٤ لـە مۆهـاتن بـۆ ئۆکـۆنر، پـەتلیس ١٣ تشـرینی یـەک/ ئۆکتۆبەر ١٨٩٨

١٢٥- يەك لە كونسوڵەكانى بەريتانيا واى خەملاندبوو كە ٥٠٠٠ بۆ ٦٠٠٠ گيانفيداى چەكدارى مەشقپێكراوى ڕێكوپێك بە باشترين شێوە هەن (لە هامبسون بۆ ئۆكۆنر، ئەرزڕۆم ١٩ تشرينى يەك/ ئەكتۆبەر ١٩٠٢). بەڵام مەزندەيەكى تر واى بۆ دەچوو كە تەنيا ٥٠٠ كەسێك دەبن (لە مۆنسل بۆ ئۆكۆنر، قوستەنتەنيە ٦ تشرينى دوو/نۆڤامبر ١٩٠٢). هەر كام لەو دووبۆچوونە لە ڕاستيەوە دوربوون كە لە شەڕەكاندا دەبينران، ژمارەى ڕاست بە زۆرى لە نێوان ئەو دوو جۆرە خەملاندنەدا بوو، كە لەوانەيە لە خەملاندنى عوسمانيەكانەوە نێزيكتر بێ كە وايان دانابوو لە نێوان ٨٠٠ بۆ ١٥٠٠ گيانفيدا بن، ئەمەش ئاژاوەكانى ساسۆن ناگرێتەوە، چونكە بە وردى لە فايلى ٢١٧٢/١٩٥دا باسكراوە.

١٢٦- فايلى ٢٠٦/٤٢٤ لە ئۆكۆنر بۆ لاندزداون، قوستەنتەنيە يەكى ئادار/ مارس ١٩٠٤. هيس كوت بۆ ئۆكۆنر، پەتليس ١٣ شوبات /فەبراير ١٩٠٤وە هيس كوت بۆ ئۆكۆنر، پەتليس ٢٠ شوبات/ فەبراير ١٩٠٤

١٢٧- فايلى ٢٠٦/٤٢٤ لە شيبلى بۆ ئۆكۆنر، ئەرزڕۆم ١٢ ئادار/ مارس ١٩٠٤

١٢٨- لە باتى ئەمە دەوڵەت ناونووسى ئەو خانووە سوتاوانە و موسوڵمانە كۆژراوەكانى كرد، بڕوانە:

BOA,HR.SYS (political) 2865/ 11 Hariciye Nezaretine 27 Haziran 1904, no 187

لە باليۆزەوە لە پاريس بۆ وەزارەتى ناوخۆ ٢٥/٦٧٣BOA.A.MKT.MHM.

وە ئەو بروسكەيەى كە فەرماندارى پەتليس (فەريد) ناردويە بۆ سەرەك وەزيران. لە ٨ حوزەيران/ يۆنيۆ ١٩٠٥

١٢٩- فايلى ٢٠٦/٤٢٤ لە ئۆكۆنر بۆ لاندزداون، قوستەنتەنيە ٩ ئايار/ مايۆ ١٩٠٤، بيرخەرەوەكەى بەڕێز لامب (لە فايلى ٢٠٦/٤٢٤ ئۆكۆنر ، قوستەنتەنيە ٢٤ ئەيار/ مايۆ ١٩٠٤، ٢٠ حوزەيران /يۆنيۆ ١٩٠٤)

١٣٠- فایلی ٢٠٦/٤٢٤ لە ئۆکۆنر بۆ لانسدزداون، قوستەنتەنیە ٩ تەمو/یۆلیۆ ١٩٠٤

١٣١- چەتەکانی ئەنترانیك زۆربوون و بڵاویشبوونەوە، لە ساڵی ١٩٠٢ دەبری (ئەراخ) کە نێزیك بە مووش بوو داگیریان کرد و کەسەربازەکانیش هاتنە سەریان هەڵاتن ( فایلی ٢٠٢/٤٢٤ لە فریمان بۆ ئۆکۆنر، پەتلیس ٧کانوونی دوو/ یەنایر ١٩٠٢

١٣٢- فایلی ٩٠٥٠/٨٨١ لە ئۆکۆنر بۆ گرای، قوستەنتەنیە ٧ ئەیار/مایۆ ١٩٠٧

نامەیە لە بابی عالیەوە. لیژنەی ڕێپێدراوە ئامریکاییەکان

Barton, 11.4 James L, papers, 1877 - 1943, Box 11:2

لە ساڵی ١٩٠٤ بوومەلەرزەیەك لەوان ڕویدا، بەڵام لەچاو بایەخی ئەو ڕوداوەدا کاریگەریەکی زۆری پێوەنرابوو، کەچی فەرماندار توانی ڕەوشەکە کۆنترۆڵکات (١٣ ئەیلوول/ سەپتامبر ١٩٠٤، لیژنەی ڕێپێدراوە ئامریکاییەکان...)

١٣٣- فایلی ٢٠٦/٤٢٤ لە تیریل بۆ ئۆکۆنر ، ڤان ١٧ تشرینی یەك/ ئەکتۆبەر ,١٩٠٤

١٣٤- سەبارەت بە مێژووی ئەرمەن لە ئیمپراتۆریەتی ڕووسیادا، بڕوانە کتێبی (ڕۆناڵد گریگۆر سونی):

The Armenian people from ancient لە Eatern armenia under Tsarist rule to Modern Times

چاپی (ریتشارد.ج. هۆڤانیزیان) نیویۆرك: بالگراف/ ساینت مارتن ١٩٩٧ کتێبی دووەم. ل١٠٩ - ٣٧

١٣٥- هەر ئەو (شەریف)ە کە بەم نێزیکانە بۆ ئاودیوکردنی چەك بۆ ناو ڤان دەبێتە هاوپەیمانی یاخیبوود ئەرمەنەکان، ئەمەش باشترین دەلیلە بۆ

ئەو ڕەوشە ناجێگیرەی کە لە هەرێمەکەدا بووە.

١٣٦- فایلی ٢٠٦٣/١٩٥ لە مۆنسل بۆ ئۆکۆنر (بروسکە)، ڤان ٢٣ تەمموز /یۆلیۆ ١٨٩٩.

١٣٧- گرتنی ئەم خانە ناکۆکیەکی توندی نایەوە لە نێوان ئەرمەن و ڕووسەکاندا ، بووە هۆی ئاژاوە و نارەزایی بەرپاکردن، بڕوانە فایلی ٤٢٤/٢٠٥ لە ستیڤنز بۆ لاندزداون، باتووم، چەند بوسکەیەك لە ئەیلوول/ سەپتەمبر وە تشرینی یەك/ ئەکتۆبەر ١٩٠٢، وە کتێبی: History of the ARF. ٧٠P

لەوە بەرتریش ئەو خانە گیرا بوو، بۆ تێڕوانینێکی سەرانسەری ڕوداوەکە تەماشای کتێبەکەی ئەناهید تیرمیناسیان بکە:

Nationalism and socialism in the Armenian Revolutionary Movement

وەرگێڕانی: أ.م. بیریت. زانکۆی کامبریدج لە (ماساتشوستس) زوریان ١٩٨٤. ل ٣٢،٣١،٤٧. هەروا کتێبی (سانی):

Estern Armenia under Tsarist Rule, pp ١٣١-٣٧

١٣٨- بڕوانە کتێبی: History of the ARF. Pp ٦٩ -٧٠

١٣٩- (ئار.ئۆ.گرایفز)ی کونسوڵ هەستی بەوە کردبوو کە شۆڕشگێڕان هاوکاریان لەو ئەرمەنانەی ناو لەشکری ڕووسەوە بۆ هاتووە: ئەرمەنەکان ڕێژەیەکی زۆریان پێکدەهێنا لە بەرپرسە بچووکەکانی قەفقاس و هاوسۆزیشبوون لەگەڵ بزوتنەوە شۆڕشگێڕیەکەی ترکیا (فایلی ٤٢٤/١٩٧ قوستەنتەنیە ٢ کانوونی یەك/ دیسامبر ١٨٩٨، قسە لەسەر ئەو بیرخەرەوەیە کە (ئەلیوت) دابوویە (کوری) لە ٣٠ تشرینی دوو/ نۆڤامبر ١٨٩٨.

١٤٠- فایلی ٤٢٤/١٩٦ لە ئەلیوت بۆ کوری، تەورێز ٥ ئەیار/ مایۆ ١٨٩٨

١٤١- بڕوانە بەشی حەوتی ئەم کتێبە.

١٤٢- بەریتانیەکان گرنگی و تایبەتیان دەدایە وەرگێڕان لە مەزەب یان

لە مەزهەب وەرگەڕانی مەسیحیەکان بۆیە نێردراوە بەریتانێکان لەناوچەکانی نەستووریەکان بایەخی زۆریان هەبوو، جا ئەوەی پەیوەندی بێ بەو برە زۆرە بەڵگەنامە و دیکۆمێنتانەی لەبابەت ململانێ مەدەنی و ئاینی و هەواڵگرانی رووسەکانەوە یە لەناو نەستووریەکاندا، بۆ ئەمانە تەماشای فایلی ٤٢٤/٢٠٠ بکە لە مۆنسل بۆ ئۆکۆنر، ١٣ تشرینی دوو/نۆڤامبر ١٨٩٩ وە فایلی ناوبراو بەڵام لە لامب بۆ ئۆکۆنر، ئەرزرۆم ٢٤ شوبات/ فەبرایر ١٩٠٠.

١٤٣- فایلی ١٩٥/٢٠٦٣ لە مۆنسل بۆ ئۆکۆنر، ڤان ٢٠ ئادار/مارس ١٨٩٩، مۆنسل دەربارەی ئەم سێ کەسە هیچ زانیاریەکی پتر و شەخسی نەداوە، هەروا کە گەیشتوونەتە رووسیاش ئیتر چارەنووسیانی نەزانیوە. بەڵام ئەو دوو یاخیبووە (ئەرشاغ و فارتان) دوایی باس دەکرێن، لەگەڵ ئەوەی کە ناسراویشبوون بۆیە مەحاڵە کە ئەمان ئەو دووانەبن کە باسکران. هاووڵاتیانی رووس هەرخۆیان شۆڕشگێڕانیان نەدەپاراست، کاتێکیش (ئەرشاغ فارمیان) کە یەک لە سەرکردە ئەرمەنەکان بوو لە ١٩٠٩دا بانگکرایە بەردەم داواکاری گشتی، دەرکەوت کە ناوبراو رەگەزنامەی ئامریکایی هاپێ و بەوپێیە نابێ لێپرسینەوەی لەگەڵدا بکرێ و کەواتە دەستەڵاتی قانوونی عوسمانی نایگرێتەوە، بڕوانە (فایلی ١٩٥/ ٢٣٨١ لە مورغان بۆ لۆدز، ڤان ٢٠ تشرینی یەک/ ئەکتۆبەر ١٩٠٩.

١٤٤- پەراوێزی ١٢٨ ل٧٧-٧٩

١٤٥- لیژنەی رێ پێدراوە ئامریکاییەکان

Barton, James L, papers, 1877- 1943, Box 11:4

راگەیاندنی نهێنی، هەردوو ئەیالەتی پەتلیس و ڤان، ٧ حوزەیران/ یۆنیۆ ١٩٠٤، وە بڕوانە (ئەشیر) ١٢ ئەیلوول/ سەپتامبر ١٩٠٤ هەمان لیژنە.

١٤٦- فایلی ٤٢٤/٢١٠ لە گیری بۆ ئۆکۆنر، ٢٦ کانوونی یەک/ دیسامبر ١٩٠٥

١٤٧- بڕوانە کتێبەکەی جاستن ماکارسی:

Death and Ecile: The Ethnic cleansing of ottoman

Muslims

(بریستۆن: داروین ١٩٩٥ ل ١٢٣-٢٦)

١٤٨- فایلی ٢٠٦/٤٢٤ لە تیریل بۆ ئۆکۆنر، ڤان ٨ نیسان /ئەپریل ١٩٠٤

١٤٩- فایلی ٢١٠/٤٢٤ لە ئۆکۆنر بۆ گرای، قوستەنتەنیە ٢٩ ئەیار/ مایۆ ١٩٠٦

١٥٠- فایلی ٢١٤٧/١٩٥ لە فریمان بۆ ئۆکۆنر، پەتلیس ١٠ کانوونی دوو/ یەنایر ١٩٠٢

١٥١- بڕوانە سەر باسی (گوزەرانێکی خراپ لەپاڵ ئێراندا) لە بەشی چوارەمی ئەم کتێبەدا.

١٥٢- لە ژیان و ئێوەندە بیرۆکراتیەکەدا ناو و ناوبانگێکی عەلی ڕەزا وا ڕۆیشتبوو کە پیاوێکی بە توانا و بەهێزە لە چارەسەرکردنی ئەرکە قورسەکاندا، جا لە جێی (محەممەد صادق) کرابووە قایمقامی شەمدینان و هەروا لە شاری (سارای) سەر سنووری پڕ لە سەرێشە و مەترسی (نزرگەی لە دایکبوونی سمایلاغای سمکۆ) ، (بڕوانە بەشی حەوتی ئەم کتێبە). خۆ کە بۆ شاری سارای دانرا، عەشایرە کوردەکان لە توندوتیژی ئەم پیاوە هەراسان بوون. (فایلی ٢١٤٧/١٩٥ لە تیریل بۆ ئۆکۆنر، ڤان ٣١ کانوونی دوو/ یەنایر ١٩٠٣).

١٥٣- فایلی ٩٣٠٥/٨٨١ لە سبوردون بۆ سیبلی، ڤان ٢٤ حوزەیران/ یۆنیۆ ١٩٠٧

١٥٤- BOA Irade-I Dahiliye (وەزارەتی ناوخۆ) ١٤، ٢٢، ٢٥

١٥٥- سەرچاوەکەی پێشوو ٤٦/١، لە واقیعدا لیژنەکە هەڵنەوەشایەوە، هەتا دوای یاخیبوونەکەی ساڵی ١٩٠٨، تایەر پاشا هەر حاکمی ئەرزڕۆم بوو (فایلی ٢٢٨٤/١٩٥ لە دیکسن بۆ لۆدز، ٢٠ ئەیلوول/ سەپتامبر ١٩٠٨).

١٥٦- BOA Irade-I hiliye ٤٦/١Iradr - I ٤٦/٢

١٥٧- Huseyin cilil Gorenlerin Gozuyle van, da Ermeni mezalimi (Van: Yuzuncu Yil universitesi 1996) p. 77

١٥٨- پەراوێزی ١٥٤

١٥٩- فایلی ١٩٥/٢٢٥٠ لە دیکسن بۆ لۆدز، ڤان ٢٦ ئادار/ مارس ١٩٠٧

١٦٠- کتێبی:

Ermeni komitelcrinin amal ve Harekat-I Ihilaliesi (Istanbul: Matbaa-i Amire 1332) p 256 demiroglu, van`da Ermeni mezalimi 1895 - 1929, p 35

وە فایلی ١٩٥/٢٢٥٠ لە دیکسن بۆ ئۆکۆنر، ڤان ٣١ ئاب/ مارس ١٩٠٧

١٦١- هەر ئەو فایلەی سەرەوە : لە دیکسن بۆ ئۆکۆنر ...

١٦٢- Demiroglu Van`da Ermeni mezalimi ١٨٩٥ -١٩٢٠ p ٥٣.

١٦٣- هەر ئەو فایلەی پەراوێزی (١٦١)

١٦٤- هەر ئەو فایلە: ١ حوزەیران /یۆنیۆ ١٩٠٧

١٦٥- عەلی ڕەزا چەند جارێ هەڕەشەی کوشتنی لێ دەکرا (فایلی ٩٣٠٥/٨٨١ لە دیکسن بۆ لۆدز، ڤان ٤ ئاب/ ئاغستۆس ١٩٠٧

١٦٦- سەرچاوەی پەڕاوێزی (١٦٢) ل٥٤

١٦٧- سەرچاوەی پەراوێزی (١٥٦) ژمارە (٥٥)، دیکسن ڕای بەرامبەر (ئەرماراك) خراپ بوو (فایلی ٩٣٠٥/٨٨١ لە دیکسن بۆ ئۆکۆنر، ڤان ٤ ئاب/ ئاغستۆس ١٩٠٧

١٦٨- سەرچاوەی سەرەوە.

١٦٩- سەرچاوەی سەرەوە ژمارە (٢)

١٧٠- سەرچاوەی سەرەوە ژمارە (١ - ٧٢)

١٧١- بڕوانە پاشکۆی ژمارە (٢)

١٧٢- باس و وەسفی ئەم ڕوداوانە لە ئەرشیفی سەڵتەنەی عوسمانیدایە (وەك ئاماژەی پێدراوە) وە لە فایلی ٩٤٢٢/٨٨١ لە دیکسن بۆ ئۆکۆنر، ڤان ٩ شوبات/فەبرایر ١٩٠٨ وە فایلی ٩٤٢٢/٨٨١ لە بارکلی بۆ گرای، قوستەنتەنیە ٢٧ ئادار ١٩٠٨

Cilek gorenlerin Gozuyle van`da Ermeni mezualimi p. 78: Demiroglu van`da... 1895-1920. pp 55-565 Ergunoz Akcora, Yasayanlarin Diliyle van ve Cevresinde Yakin Tarihimiz de van uluslararasi ...Sempozyumu

باس ئەوەش دەکرێ کە دەقی جیا لەم ڕیوایەتەش هەیە، لەوانەیە ئەوەی زیاتر باوە و دەیگێڕنەوە ئەوەبێ کە ئەو ئەرمەنانە دەیگێڕنەوە کە نەیاری تاشناقێکانن، ئەوانە وایان داناوە کە ئارام ئەتکی فاتانی کردووە و داڤیتیش تۆڵەی ئەو دەستدرێژیەی کردۆتەوە. (بڕوانە کتێبەکەی: ك.س. پاپازیان بەناوی:

Patriotism perverted (Boston, Baikar press 1934. p69

١٧٣- کونسوڵی بەریتانیا لەو ڕاپۆرتەیدا کە بە ناونیشانی (لیستێکی مەزندەکراوی چەك و تفاقی گیانفیداکان کە دەوڵەت لە ڤان دەستی بەسەردا گرتوون هەتا بەرواری ٢٠ حوزەیران/ یۆنیۆ ١٩٠٨) دابووی کەمتری خەملاندووە:

| | |
|---|---|
| تفەنگ | ١٢٠٠ دانە |
| فیشەك | ٤٥٠٠٠٠ دانە |
| دەمانچەی ماوزەر | ٥٠ دانە |
| باروت | ١٢٠ ڕەتڵ |
| دینامیت | ٨٠٠ ڕەتڵ |
| نارنجۆك | ١٩ دانە |

بۆمبای کاولکار ۲ دانە
ئامرازی هەمە چەشنەی شەڕکردن + پیل و باتری کارەبا
ئامێری هەڵکۆڵینی پارە + قاڵب
بڕێکی زۆر لە ماددەی فورفوشم و کیمیایی هەمەجۆر
ئامێری پەستان بۆ چاپکردن، ئەرشیف، نامە و نامەی هاتوو
ئاڵای شۆڕشگێڕانە و لافیتە
مۆری لیژنەکە

فایلی ۲۲۸۳/۱۹۵ لە دیکسن بۆ بارکلی ، ڤان ۲۹ حوزەیران/ یۆنیۆ ۱۹۰۸، وە بڕوانە فایلی ۹٤۳۳/۸۸۱ لە دیکسن بۆ ئۆکۆنر، ڤان ۹ شوبات/فەبرایر ۱۹۰۸، وە بۆ دەستخستنی ئەو (سوپاس و پێ زانین)ەی کە بە عەلی ڕەزا دراوە بەهۆی چارەسەرکردنی ئەو ڕەوشە و بەڕێوەبردنی، بڕوانە فایلی ۹٤۳۲/۸۸۱ لە دیکسن بۆ ئۆکۆنر، ڤان ۱۷ شوبات/ فەبرایر ۱۹۰۸. وە بۆ دەستخستنی گێڕانەوەیکی درێژ و خەیاڵاوی ڕوداوەکان لە ڕۆژنامەکەی حیزبی تاشناقەوە لە پاریس (برو ئەرمینیا)، بڕوانە کتێبەکەی (ئیکوت کانسۆ):
The Revolution of 1908 in Turkey (Leiden Brill 1997 p. 61

چونکە ئەم کتێبە باسێکی جەدەلی دەگێڕێتەوە گوایە شۆڕشگێڕەکان بریتیبوون لە هەزار شۆڕشگێڕی تورك (!) و دوو تۆپیان پێبووە، گیانفیداکانیش ئەندامی لیژنەی (ئیتیحاد و تەرەقی) بوون. هەروا کانسۆ لە سەرچاوەکانیدا کۆمەڵێ تۆماری بەریتانیەکان ڕیز دەکات کە پەیوەندیدارن بە مەسەلەکەوە، بەڵام وەك دەردەکەوێ نەخوێندونیەتەوە و سووكو ئاسانیش خستوونیە لاوە و گوێی پێ نەداون.

۱۷٤- فایلی ۹٤۳۳/۸۸۱ لە دیکسن بۆ بارکلی، ۲٤ ئەیار/ مایۆ ۱۹۰۸ وە فایلی ۲۲۸۳/۱۹۵ لە دیکسن بۆ ئۆکۆنر، ڤان ۹ شوبات/فەبرایر ۱۹۰۸

۱۷۵- سەرچاوەی پەراوێزی (۱۵٦) ژمارە (٤)

۱۷٦- لە دوری سێ میل لە شارە کۆنەکەوە، دووریانێکی گەورەیە و بازارێکی بچووکیشی لێیە، ئەو شوێنە ناوی (هاتش بوغان)ە بەمانا (دووریان) کە نێزیکیشە لە (گاردن سیتی)، لە ڕاستیشدا ڕۆژاوای هاتش بوغان گەڕەکێکی موسوڵمانە و ڕۆژهەڵاتەکەشی مەسیحین، دانیشتوانە ڕەسەنەکانی ڤان بەبێ پەڕینەوە لە ڕێگاکان دەتوانن هاتوچۆ بکەن بەناو گاردن سیتیدا.

بەناو ئەو کەلەبەر و دەلاقانەدا دەڕۆیشتن کە لە دیوارەکاندا هەبوون، هەرچەندە سەربازەکان هەمیشە لە شەقامەکانیشدا بوون. (فایلی ۲۲۸۳/۱۹٥ لە دیکس بۆ ئۆکۆنر، ڤان ۹ شوبات/ فەبرایر ۱۹۰۸).

۱۷۷- حیزبی تاشناق ڕەتیکردەوە کە هیچ دەستێکی لەو تیرۆرکردنەدا بووبێ. بەپێی سەرچاوەکانی ناوخۆش، ئارام کە دەترسا ڕەنجی چەند ساڵەی بەباچێ، ئەندامانی لیژنەی حیزبی بانگکرد بۆ کۆبوونەوەیەکی بە پەلە و لەوەدا ناوی (داڤیت) بە نیشانەی خاچێکی ڕەش مۆر کرا ( یانی نیشانە تەقلیدیەکەی خۆیان بە مانای تیرۆرکردنی دەگەیەنێ) بۆ ئەمە گەنجێکیان دەستنیشان کرد کە لە ئاسنگەریدا وەستابوو، ناوی (داکات) بوو. کوشتنەکەی داڤیت بەو سپێردرا.

۱۷۸- BOA.Y.MTV ۱۲٥/۳۰۷ lef ۲، فایلی ۹٤۳۲/۸۸۱ لە بارکلی بۆ گرای، ڤوستەنتەنیە ۲۷ ئادار/ مارس ۱۹۰۸

۱۷۹- سەرچاوەی پێشوو: ۲lef

۱۸۰- سەرچاوەی پێشوو: ٤lef فایلی ۹٤۳۲/۸۸۱ لە دیکسن بۆ بارکلی، ڤان ٦ نیسان /ئەپریل ۱۹۰۲، کونسوڵ (دیکسن) دەیگێڕێتەوە کە شۆڕشگێڕان ئەو چەکانەی مابۆوە دابەشیان کرد بەسەر لاوانی ئەرمەندا و پیلانیان بۆ یاخیبوونێکی سەرتاسەری دارشت: لیژنەی گیانفیدایان بڕیاریاندا کە ئەم بەردەوامیەی دەستبەسەراگرتنە ڕووبەڕوو بوونەوەیەکی توندی پێویستە و

بەدویدا خۆتەیارکردنی گشت توانا و کەرەستەیەکی پێویست کە هەیە لە تركيا و ئێران و ڕووسیا بۆ ئامادەبوون بۆ یاخیبوونێکی سەرتاسەری (فایلی ٢٢٨٤/١٩٥ لە دیکسن بۆ لۆدز، ڤان ٧ ئەیلوول/ سەپتەمبەر ١٩٠٨

٢/٣٠٨. BOA. Y. MTV ١, LFE ١٦٤/٢٠٧BOA.Y.MTV, -١٨١

فایلی ٩٤٢٣/٨٨١ لە بارکلی بۆ گرای، قوستەنتەنیە ٥ نیسان /ئەپریل ١٩٠٨ پوختەی بروسکەیەکە فەرمانداری گشتی ئەیالەتی ڤان ناردویە بۆ سەرۆکی وەزیران. هەروا فایلی ٩٤٢٣/٨٨١ لە دیکسن بۆ بارکلی، ڤان ٦ نیسان / ئەپریل ١٩٠٢. زیاتر لە مانگێ بازاڕ بەتەواوی نەکراوەتەوە.

١. lef ١٥٢/ ٢٠٧ BOA.Y.MTV, -١٨٢

١٨٣- هەر ئەو سەرچاوەیە LEF ٢

١٨٤- هەر ئەو سەرچاوەیە.

١٨٥- هەر ئەو سەرچاوەیە .

١٨٦- فایلی ٩٤٢٣/٨٨١ لە دیکسن بۆ بارکلی، ڤان ٦ نیسان /ئەپریل ١٩٠٢ هەندێ بروسکە لە فەرمانداری ڤانەوە.

١٨٧- لەو دووانزە کەسەی گیرابوون، ئارامیان تێدابوو، کە سەرکردەی باڵای گیانفیدایانبوو، وە (سیۆس)ی سەرکردەی بە دەستەڵات و خاوەن نفوز و ترسناک، دەتوانرا بە سەرۆکی بەشی هەولگری ناوبرێ، وە (تیرلیمازین) بکوژەکەی داڤیتی ناپاك، کە کوشتنەکەی بووە هۆی ڕودانی ئەو کوشتارەی ڕۆژی ٢٣ ئادار/مارس. وە (گریگۆر) کە لەگەڵ سیۆسدا پێکەوە پار (ئەرمیناکە فەنی)یان کوشت، وە (میلۆیان) مامۆستای باڵا لە قوتابخانەی ئەرمەن لە ڤان و دوو گیانفیدا وهەندێ لە دانیشتوانە ڕەسەنەکانی ڤان کە شتێکی ئەوتۆیان لەسەر نەبوو و پێگەیەکی واشیان نەبوو لە حیزب و یاخیبووندا. (فایلی ٩٤٢٣/٨٨١ لە دیکسن بۆ بارکلی، ڤان ٢٤ ئەیار/ مایۆ ١٩٠٨. دیکسن وای دەزانی کە یەك لە هەواڵدەرەکان ناپاکی لەگەڵ سەرکردەکانی

تاشناقدا کردووە. (فایلی ۲۲۸۳/۱۹۵ بروسکەیە لە دیکسن بۆ بارکلی، ڤان ۲۰ ئەیار/ مایۆ ۱۹۰۸. کونسوڵی ڕووس داوای ڕاسپاردەی لە باڵیۆزی وڵاتەکەی کردبوو، چونکە ئارام و کەسانێکی تر هاوڵاتی ڕووسبوون (ئەرشیفی وەزارەتی دەرەوەی رووسیا، بەشی سیاسی، ژمارە ۱۱۲،۷/ ۲۰ ئەیار /مایۆ ۱۹۰۸ ل ۵۱. لە کتێبەکەی (یووسف هالکوغلو)وە :

Ermeni Tehciri ve Gercekler / 1914- 1918 (Ankara: (Turk Tarih Kurumu 2001. p 37

۱۸۸- فایلی ۹٤۳۲/۸۸۱ لە بارکلی بۆ گرای ، بیرا ۱۰ ئەیار/مایۆ ۱۹۰۸ وە فایلی ناوبراو لە دکسن بۆ بارکلی ، ڤان ۱۰ ئەیار /مایۆ ۱۹۰۲

۱۸۹- بڕوانە بەشی شەشەمی ئەم کتێبە، هەندێ شۆڕشگێڕی ترك لە ڤان دەستیان لەگەڵ تاشناقدا تێکەڵ کرد دژ بە عەلی ڕەزا و ئەوان بەرپرسبوون لەوەی کە لەسەر کار لابرا (سەیید شوکر و هانی نۆغلۆ:

Perparation for Revolution: (oxford: oxford univerdity press 2001) p. The young Turks. Pp 1902 - 1908

بە ئاماژەیەکیش بۆ سەرچاوە ئەرمەنی و ئاڵمانیەکان دەربارەی ئەو هاوکاریە. )

۱۹۰- (ئیکۆت کانسۆ) ۱۹۰۸ Devrimi (Istanbul: Iletisim ۱۹۹۵ .

p۷۹ ئاماژەدانێك بۆ ئەو ڕەوشەی کە بووە، سەرکردە ناوخۆییەکان و هەندێ لە ئەفسەران و سەربازان ئامادەی ئەو قوداسە بوون کە بۆ گیانی ئەو قوربانیانە ڕێکخرابوو کە لە ڕووداوەکانی ئەم دواییەدا تیاچووبوون.

۱۹۱- فایلی ۲۲۸٤/۱۹۵ لە دیکسن بۆ لۆدز، ۳ تشرینی دوو/ نۆڤامبر ۱۹۰۸

۱۹۲- هەر ئەو فایلە، ۷ ئەیلوول /سایتەمبر ۱۹۰۸

Akcora, Yasayanlarin Diliyle van ve Cevresinde Ermeni mezalimi, p157

۱۹۳- Demiroglu, van`da Ermeni mezalimi - ۱۹۲۰ p ٥٤.

سەرەڕای ئەو قسانەی پێشوو بۆ پاڵپشتیكردنی، ڕای كونسوڵ دیكسن ئەرێنی نەبوو بەرامبەر عەلی ڕەزا، بڕوانە فایلی ٩٤٣٢/٨٨١ لە دیكسن بۆ باركلی ٢٤ ئەیار/ مایۆ ١٩٠٨

١٩٤- ئەوەی ئەو سەردەمەی بیركەوێتەوە دەڵێ ماتەمینی باڵی بەسەر دانیشتوانی ڤاندا كێشابوو.

Celik, Gorenlerin Gozuyle van`da Ermeni )
Mazalimi p. 77, Akcora, Yasayanlarin Diliyle van ve
(Cevresinde ermeni mezalimi, p 157

Cumhuriyetin ellinci Yilinda van (Istanbul: n.p -١٩٥
١١٦) p ١٩٧٣

Aydin talay, yikilun bir shirin anatomisi (Vam: -١٩٦
١٢٠) p. ١٩٩٦van belediye basanligi,

Huseyin celik, ali pasayi Vurdular in van -١٩٧
, ٥٩) p. ١٩٩٨Turizm ve is Rehberi (Istanbul: Ihlal Finans,
.٢٣٦Lef ١٥٢/١٣١/٢٦BOA YEE,

## بەشی شەشەم
## کۆمەڵەی " ئیتیحاد و تەرەقی" و ئەرمەنەکان
## ١٩٠٨ - ١٩١٢

ساڵەکانی ١٩٠٧و ١٩٠٨ گۆڕانێکی بنەڕەتیان سەبارەت بە شۆڕشی ئەرمەن لە قاندا بەخۆوە دی. بەر لەمە، شۆڕشگێڕان تەنیا پلانێکی بنەڕەتیان هەبوو، بریتیبوو لە پەلاماردانی موسوڵمان و وروژاندنی کاردانەوەی تۆڵەکردنەوەیەکی وا کە ببێتە هۆی دەستێوەردانی ئەوروپایان بەڵکو نێیان بێتە جواب، لەمەدا بولگاریا ببووە نموونەیەك تا بە پێوشوێنیدا بچن، چونکە ئەم سیناریۆیە بەگشت وردەکاریەکانیەوە هاتە دی و ئاقیبەش بولگاریایەکی سەربەخۆ دروستبوو.

بەڵام لە رۆژەلاتی ئەنەدۆل ئەمە بۆ شۆڕشگێڕان نەلوابوو، ڕاستە کە کوشتاری موسوڵمانەکان لەهەردوو یاخیبوونەکانی ساڵانی نەوەدەکانی سەدەی نۆزدە و سەرەتای بیستدا بەبێ چەن و چوون بووە هۆی کوشتار لە ئەرمەن، بەڵام لایەن و هێزە ئەوروپاییەکان دەستیان تێوەرنەدا و دەخڵیان بەسەرەوە نەبوو، لە پاش ١٩٠٨ پلانی شۆڕش هاتەسەر ئەوەی لەگەڵ رووسدا بەنامانجی داگیرکردنی رۆژەلاتی ئەنەدۆڵ، هاوکاربن. بەو هیوایەی کە ئەمە دەرویەکێ و بەرووی ئۆتۆنۆمیەکدا بکرێتەوە. جا سیاسەی لایەن و هێزەگەورەکان بە پاڵ کاروباری ناوخۆی هەرێمەکەوە ڕۆڵێکی بنەڕەتیان بینی لە گۆڕینی پلانەکەیاندا.

ڕێکەوتنی ڕووس و ئینگلیز لەساڵی ۱۹۰۷ کاری زۆری کردە سەر ڕەوشی شاری ڤان و سەر پلانەکانی شۆڕشگێڕان، چونکە هاوسەنگی هێزەکانی ناو ئەورووپای هەڵگێڕایەوە، لەم ڕێکەوتنەدا ڕووس و ئینگلیز بڕیاریاندا چاو لەو بەرژەوەندیە پێچەوانانەی هەدوو لایان لە ڕۆژەڵاتی ناڤیندا بپۆشن و چن بۆ دابەشکردنی ئێران (ناوچەی نفوز و دەستەڵات). بۆیە بڕیاردرا کە بەریتانیا دەستگرێ بەسەر باشووری ڕۆژاوای ئێراندا، چونکە بەرژەوەندی پەرەسەندوی نەوتی خۆی تێدابوو. ڕووسیش دەستگرێ بەسەر باکووری وڵاتەکەدا، بەمانا ئەو دەڤەرانەی دەکەونە ڕۆژەڵاتی بەشی ئەنەدۆڵی عوسمانیەوە. ئیتر ئاوا هەرێمی ڤان سەرتاپا دەکەوێتە سەر سنووری ناوچەی نفوزی ڕووسەوە، ئەوەبوو بەرهەڵستی ئینگلیز لەبۆ کارەکانی ڕووس لە ڕۆژاوای ئێراندا ڤرۆقەپی لێ کرا، ئەو بەرهەڵستیەی کە لەوەبەر ببووە هۆی ئەوەی نەهێڵێ ڕووسیا خێر لەو دەستەڵاتە ڕەهایەی خۆی لە ناوچەکەدا ببینێ.

ڕووسەکان لە ۱۹۰۹ سوپایان نارده باکووری ڕۆژاوای ئێران، بەسەرزاری بۆ ئەوە بوو کۆتایی بەو حوکمەتە دەستووریەی تەورێز بێنن، کە بوود ۱۹۱۰ هەشت گەتیبەی پیادە و بەشێك لە قۆزاقەکان و سەرباری ۲٤ تۆپ لە ڕۆژاوای ئێراندا جێگیر بوون، ئەمانە لە تەورێز، ورمێ، خۆی، دیلمان، ماکۆ، مەراغە و سابلاغ – مەهاباد[1] – دابەش بوون. بەپێچەوانەی فارسەکانەوە ڕووسەکان توانیان دەستەڵاتێکی تەواویان بەسەر ڕۆژاوای ئێراندا ببێ.

بەلام ئەرمەنە یاخیبووەکان، حاڵیان حاڵی چاودێرانی ژیر و ئاقڵ ددانیان نا بە دەستەڵاتی ڕووس لە ڕۆژەڵات، لە سەدەی نۆزدەدا ڕووسەکان لە گشت شەڕەکانیاندا عوسمانیەکانیان ڕاونابوو وە شکستیان دەرخوارد دابوون. هەرچەندە شوێنی ستراتیژی ڕووس لەو شەڕانەدا نالەبار و خراپتر بوو لەودی کە لە ۱۹۱۰ هەیانبوو، ئەو حەلەی بوونە مەترسیەك بۆ سەر بەشی

عوسمانی لە ئەنەدۆڵ لە باکوور و رۆژهەڵاتەوە، ڕۆژێ لە ڕۆژان ڕووس لە پێگەیەکی وا باشدا نەبووە کە هەڵێنێ بۆ پەلاماردانی سەڵتەنەکە. لە جەنگی (قرم)دا بەریتانیا لەگەڵ عوسمانیاندا شانبەشانبوو، لەجەنگی ۱۸۷۷ - ۷۸ بەلانی کەم پاڵپشتێکی دیپلۆماتی بوو بۆی، بەڵام ئێستە وا بۆتە پاڵپشتێ بۆ دوژمنەکەی، جا بە دەستووری چاودێرانی ئاقڵ ئەرمەنەکان پێشبینی قەبارەی ئەو پاڵپشتیەی ئایندەی ئاڵمانیان نەدەکرد کە لە عوسمانیانی دەکات. واش دیاربوو عوسمانیان هیچ پاڵپشتێکی ڕاستەقینەیان نەبێ، بەلای شۆرشگێرانەوە ڕەوشەکە ڕونبوو:

ئەرگەری سەرکەوتنی ڕووس زۆرە جا باشترین وەسیلەیەك بۆ سەرخستنی دۆزی ئەرمەن لەوەدایە کە دەستخرێتە ناو دەستی ئەوانەوە.[٢]

سەبارەت بە حوکمەت وموسوڵمانەکانیش لە ڤان و گشت هەرێمەکە، ساڵی ۱۹۰۸ ببووە ساڵی پەیبردن بە شتەکان و گۆران، دەستبەسەراگرتنی هەزارا تفەنگ و سەدان هەزار فیشەك و سەدان ڕەتڵ دینامیت بەلای گشت کەسێکی وریا و بە ئاگاوە ئامازەیەکبوو بۆ ئەوەی کە ئامانجی شۆڕشگێران تەنیا لە بەرگری کردن لە خۆدا نەدەوەستا ، بەڵام بۆ ئەگبەتی حوکمەتە تازەکەی (ئیتیحاد و تەرەقی) ئاگای لە خۆی نەبوو (وەك دوایی دەردەکەوێت). سەرکەوتنی شۆڕشگێرە عوسمانێکان لە ڤان ببووە هۆکاری یەکلاییکەرەوە لە دابەشکردنی ئەرمەن و موسوڵمانەکاندا بۆ دوو بەرەی دژ بە یەك.

نەدەکرا تەنیا شۆڕشگێران یان گشت ئەرمەنەکان بەمەترسیەك بۆ دەوڵەت و موسوڵمانەکان دانرێن، وەك حوکمێکی پێشوەخت یا مەزندەیەکی ناڕاست ئەمە نەدەشیا، لە ڤان ئەرمەنەکان کەوتنە یەکخستنی ڕیزەکانی خۆیان بۆ بەربەرەکانی عوسمانی و موسوڵمانەکان. کارە لەسەرخۆ و بەئاگاکانی شۆڕشگێران لەناو شار و لادێکاندا سەرکەوتوو بوون. بەڵام ئەو

ئەرمەنەی لەگەڵ شۆڕشگێران نەبوو ئەوا ئەمڕۆ بێ یا سبەی بێدەنگبەکی نەخوازراو چاوەڕوانی بوو، تەنیا ئەو ئازا و جەربەزانە دوایی لە پشت عوسمانێکانەوە ڕیزیان بەست کە پاشان بوونە هۆی دەرەنجامی خراپ بۆ سەر ئەرمەن.[٣]

هاوکاری ئەرمەن لەگەڵ شۆڕشگێران تەنیا لە ترسا نەبوو، زۆر لەوانە و لەوانەشە زوربەیان حەزیان بە دەوڵەتێکی ئەرمەنی دەکرد، نموونەی نەتەوەیی لە ئەوروپا هۆش و گۆشی ئەوانی بەتەواوی کێش کردبوو، وەك چۆن لەوەوبەر صرب و بولگار و یۆنانێکانی موبتەلا کردبوو، خۆ ئەگەر ئەرمەنەکان سەرپشك بکرابان ئەوا زوربەیان ژیانێکی هێمن و ئاسوودەیان لەژێر حوکمی عوسمانیدا دەخواست نەك شەڕێکی ماڵ وێرانکەر بەناوی نەتەوەییەوە.

ئەم جۆرە ئاواتە خوازیانە نەدەهێڵرا بدرێ بە گوێیاندا.

وا بڕیار بوو شۆڕشگێران بکەونە پەلاماری موسوڵمانەکان و وروژاندنی کاردانەوەی تۆڵە کردنەوە دژ بە بێتاوانی ئەرمەن، ئەرمەنەکان زوربەیان لەوە گومانیان نەبوو کە ڕوداوەکان بەڕێوەن و دڵنیا بوون لەوەی کە سەرەنجام رووسەکانیش هێرش دەکەن و سەردەکەون. جا بۆ دورکەوتنەوە لەو نەهامەتیانە وایان بەباش زانی کە شێوازی باشتر ئەوەیە لە ڕێی یارمەتیدانی شۆڕشگێران و دانەپاڵیان سەرکەوتن بۆ خۆیان زامنکەن.

## ● شۆڕشگێرانی ئەرمەن و کۆمەڵەی "ئیتیحاد و تەرەقی"

لە ئەوەدەکانی سەدەی نۆزدەوە دیاردەکانی شەراکەی بزوتنەوەی شۆڕشگێرانی ئەرمەن و کۆمەڵەی ( ئیتیحاد و تەرەقی) سەری هەڵدەدا و بەدیاردەکەوتن،[٤] هەردوولا لەناو خۆیاندا ئامانجێك ببووە کۆلکەی هاوبەشیان کە لادانی سوڵتان (عەبدولحەمید)ی دووەم بوو، هەردوولاش

بەشێکبوون لەو شەپۆلە شۆڕشگێڕیە توندەی سەدەی نۆزدەی ئەوروپا.

لە سەرەتادا هاوکاری نێوان ئەم دووانە سنوورداربوو، بەگشتی هاتبووە سەر دەربڕینی بەرژەوەندی هاوبەش لە نێوانیاندا، ئەرمەنەکان، بەتایبەت تاشناقێکانیان لە ئەوروپا، زیاتر بایەخیان بەجۆرە هاوکاریکردنێك دەدا و مەیلی نزیکبوونەوەیان هەبوو[٥]، بەڵام زوربەی (ئیتیحاد و تەرەقی)یەکان بەرهەڵستی هەر جۆرە هاوکاری و نێزیکبوونەوەیەکبوون لەگەڵ ئەرمەنەکاندا، چونکە لاگیری پاراستنی یەکیەتی سەڵتەنەکە بوون، بەڵام لەسایەی حوکمێکی دەستووری و بەهاوڵاتیبوونێکی هاوبەش، کەچی لیژنەکانی ناو ئەرمەن گشت توانای خۆیان چڕکردبۆوە لەپێناو هێنانەدی ئۆتۆنۆمی یان تۆ بڵێ سەربەخۆییەکی تەواوی ئەرمەن.

کۆمەڵەی (ئیتیحاد و تەرەقی) لەسەر بنەمای تێکەڵەیەك لە ئیدۆلۆژی جیا و دژ بەیەك دامەزرابوو، ئەندامانی یەك لە دەستەکانیان پشتگیریان لە بیرۆکەی دامەزراندنی سەڵتەنەیەك دەکرد کە هەرێمەکان تێیدا خاوەنی ئۆتۆنۆمی تایبەتی خۆیانبن. بەم جۆرە پاڵپشتی هاوکاریکردنیان دەکرد لەگەڵ ئەرمەندا[٦]. چونکە هەستیان دەکرد کە بەریتانێکان پشتگیری دۆزی ئەرمەن دەکەن و لەمەدا تا ڕادەیەکی زۆر هەقیانە، هاوپەیمانیکردن لەگەڵ ئەرمەندا لەوانەیە ببێتە بەدەستهێنانی پشتگیری بەریتانێکان لە کۆمەڵەی (ئیتیحاد و تەرەقی)ش[٧]. ئەوەبوو سەرەتا هەوادارانی ئەم ئۆتۆنۆمی و (لامەرکەزی)یە بەنهێنی کەوتنە وتووێژەوە لەگەڵ لیژنەی حیزبی تاشناق، لێشیان ڕوونبوو کە زۆرینەی ئەندامانی کۆمەڵە پشتگیریان دەکەن، ئینجا کەوتنە بڵاوکردنەوەی نامە و نووسراوی ئاشکرا بۆ پێشنیارکردنی جۆرە هاوپەیمانیەك لەنیوان هەردوولادا.

هەردوو لیژنەی (تاشناق و هانشاك) پێکەوە بڕیاریاندا کە بەشداری کۆنگرەی کۆمەڵ و لایەنە بەرهەڵستکارەکانی عوسمانی بکەن، کە (ئیتیحاد و

تـەرەقی) ١٩٠٢ لـە پـاریس بانگەشـەی بـۆ کردبـوو، بـەڵام بەمـەرجێ کـە لەسەرەتاوە ڕازی ببن بە ئۆتۆنۆمی ئەرمەن[٨].

ئەنـدامانی ئـەو شاندەی کـە ئامـادەی کۆنگرەکـە دەبـوون بەهەڵبـژاردن نـەبوو، بـە پلـەی یەکـەم ئەوانـە دانـران کـە پشتگیری ئۆتۆنۆمیـان دەکـرد، زوربـەی ئەنـدامانی شـاندەکانیش وەك چـاوەڕوان دەکـرا بـە مەرجـدکانی ئەرمەنەکان ڕازی بوون. لەسـەروبەندی کۆنگرەکـە و دوای چـەند ڕۆژێـك لـە مشتومڕ و ناکۆکی، زوربەی شاندەکان لەسەر چەمکێك ڕێکەوتن کـە ئـەوەی دەگەیانـد گوایـە ئـەو شـەش هەرێمـەی ( ناسـراو بـە ئـەرمینیا) ڕەوشـێکی تایبـەتیان دەبـێ[٩] و ئۆتۆنـۆمیش. وە تێکـڕا کۆکبـوون لەسـەر سـوودەکانی دەستێوەردانی ئەوروپا لەپێناو ڕامالێنی سیستەمەکە.

بەڵام کەمینەیەکی گرنگی شاندەکان بەرهەڵستی گشت ئـەم خاڵانـەیان دەکـرد، ئـەم کەمینـەیە لەلایـەن (ئەحمـەد رەزا)وە پشتگیری دەکـرا، نـاوبراو یەك لە کۆنە پارێزەرانی کۆمەڵەی (ئیتیحـاد و تـەرەقی) بـوو کـە لایـەنگری حوکمێکی مەرکەزی بوو لە سەڵتەنەکەدا[١٠]. لە واقیعیشدا وا دەردەکەوێت کـە ئـەم کەمینـەیە لـە کۆنگرەکـەدا نوێنـەری زۆرینەکـەی کۆمـەڵی (ئیتیحـاد و تەرەقی) بووبن، چونکە هەوادارانی (لامەرکەزی) خۆیان زوربـەی ئەنـدامانی شاندەکانیان هەڵبـژاردبوو، جـا زۆرێـك لـە لایـەنگرانی (مەرکـەزی) دەسـتیان کـرد بـە هێنانـە پێشـەوەی چـەند نموونەیـەکی جیاجیـای نەتـەوەیی ترکـی، بـەڵام بیـانووی نـەڕازیبوونی سـەرەکیان ئـەوەبوو کـە دژی دەسـتە و تاقمـە شۆڕشـگێڕەکانی وەك مەکـەدۆنێکان و ئەرمـەن بـوون، ئەوانـە سـەربەخۆیان گەرەکبوو نەك سەڵتەنەیەکی عوسمانی پینەکراوی هەموارکراو[١١].

لـــەنێوان ئـــەم دوو تـــەرەف هەڵوێســـت وبۆچـــوونەدا ململانێکـــان بەردەوامبوون، هەتا ئەو کاتەی لە ١٩٠٨دا شۆڕشگێڕانی عوسمانی سـەرکەوتن و دوای ئەمـــەش هـــەروا مایـــەوە. لـــەو کۆنگردیـــەی پاریســـدا لـــە ١٩٠٧

(هاوپەیمانیەکی تەکتیکی) لەنێوان تاشناق و شۆڕشگێڕانی عوسمانیدا هاتە ئاراوە، بە ئامانجی لادانی سوڵتان (عەبدولحەمید)ی دووەم و گێڕانەوەی دەستووری عوسمانی، بەڵام هەتا بەسەر ناکۆکیە ڕاستەقینەکاندا زاڵ نەبوون ئەمە نەهاتەدی[٣].

کۆمەڵەی (ئیتیحاد و تەرەقی ) هێشتا ئەوانەی تێدابوون کە ئۆتۆنۆمیەکی ئەرمەنیان بەلاوە قەبووڵبوو، جگە لە دەستەی تر و ئەوانەش کە هەواداری یەکپارچەیی خاکی سەڵتەنەکە بوون.

ئەوەی پەیوەندی هەبوو بە دوا کاریگەری ئەو هاوکاریەی نێوان تاشناق و کۆمەڵە لەسەر مەسەلەی ئەرمەن، ئەوەبوو کە گرنگترینیان قەبووڵکردنی کۆمەڵە بوو کە تاشناق نوێنەرایەتی ئەرمەن دەکات لە سەڵتەنەکەدا، وە قەبووڵکردنی ئەو پەیوەندیە سیاسیەی کە لە نێوان هەردوولادا پەرەی سەندبوو[١٢].

پاش شۆڕشیش هاوپەیمانیەکەی نێوان ئەو دووانە زیاتر بە گوێرەی سیاسەتە ڕوتەکانی ڕۆژبوو نەك بە گوێرەی ئیدۆلۆژی، چونکە بە ئاسانی دەتوانرێ بگوترێ کە تاشتناق هۆکارێکی بنەڕەتی بوو کە بەو هاوپەیمانیە لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا بووە هۆی ئەوەی کۆمەڵەی (ئیتیحاد و تەرەقی ) لە دەستەڵاتدا بمێنێتەوە.

هەتا ئەوەی دژی لامەرکەزیشبوو ئامادەبوو کە تاشناقی قەبووڵبێ بەو مەبەستەی کە لە دەستەڵاتدا بمێنێتەوە. پاڵپشتی ئەوروپایەکانیش بۆ ئەرمەنەکان هۆکارێکی بنەڕەتی تربوو لە چەسپاندی نفوزی سیاسی حیزبی تاشناقدا. سەڵتەنەی عوسمانیش لە لێواری کەندەلانەکەدا بوو، پاڵپشتە بەریتانیە تەقلیدیەکەشی لەبەردەم نیاز و مەبەستەکانی ڕووسیادا تواویەوە، پشتگیری ئاڵمانیش بۆ عوسمانیەکان هێشتا ئەوەڵی بوو، هێزە ئەوروپایەکانیش هەڵوێستی خۆیان پاراست، ئەمەش داچوڕایەوە ناو

گیتەڵەکەی بەرژەوەندیەکانی ئەرمەنەوە.

وا دەردەکەوت کە هاوپەیمانیبەستن لەگەڵ لایەنە سیاسیە ئەرمەنە دەستڕۆیشتووەکاندا یەك لەو چارەسەرانە بوو کە زامنی ئەوە بکات کە ئەوروپاییەکان جارێ دابەشکردنەکەی سەڵتەنە لەنێوخۆیاندا دوابخەن تا کاتێکی تری لەبار.

## ● کۆمەڵەی "ئیتیحاد و تەرەقی" و "تاشناق" لە "ڤان"

وا دیارە سەرەتای پەیوەندیەکانی نێوان کۆمەڵەی (ئیتیحاد و تەرەقی) و تاشناق دەچێتەوە بۆ ساڵی ١٩٠٧، وەك مەعلوومیشە ئەم دوو کۆمەڵە شۆڕشگێڕە لەژێرەوە ڕێککەوتبوون و لە شارەکەدا بە نهێنی کۆببوونەوە[٤].

دوای شۆڕش، کۆمەڵە توانی دەستبگرێ بەسەر حوکمەتەکەی ڤاندا، هەرچەندەش هێشتا کۆمەڵە بەشێك نەبوو لە ئامێرە ئیداری و قانوونیەکەی دەوڵەت. لە تشرینی دوو/نۆڤامبر ١٩٠٨دا ڕائید (وەهیب) کە لە کۆمەڵەی (ئیتیحاد و تەرەقی) (سالۆنیك)بوو، سەردانی ڤانی کرد و سەرلەنوێ کۆمەڵەکەی لەو شارە ڕێکخستەوە، وە بەرپرسانی دەوڵەتیش، کە دادەنرێن، دیاری کردن و ئەوانەش کە دوردەخرێنەوە. (کۆمەڵەیەکی نهێنی)شی دامەزراند ■ ببێتە چاودێر بەسەر بەرپرسانەوە■ ئەندامانی ئەم کۆمەڵەیە لە نوێنەرانی سوپا و موسوڵمانان و ئەرمەنەکانی ناوخۆ هەڵبژێرران، بەمەش کۆمەڵەیەکی چالاکی بەرپرسی پێکهێنا، ناو و شوناسی ئەندامەکانی لەنێو خۆیان و تەنیا لای کونسوڵی بەریتانیاش نەبێ کەس نەیدەزانی [٥].

ئیتر ڤان بووە نزرگەیەکی ئاشکرای کۆبوونەوەکانی شۆڕشگێڕان، دوای شۆڕش هەر لێرە کەسانی سەر بە کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەرەقی لەگەڵ شۆڕشگێڕانی ئەرمەن و ڕووس و فارس ـەکیان دەبینی و کۆدەبوونەوە[٦]. سێ

لە ئەندامە گەورەکانی ئەو کۆمەڵەیە لە ١٩١١دا هاتنە ڤان، نێزیکەی مانگێ مانەوە ، زنجیرەیە کۆنگرە و کۆنفراسیان لەگەڵ ئەوەی ناویانابوو بە (حیزبە سیاسیە ئەرمەنە هەمەچەشنەکان)گرێ دا[٧٧].

کە عەلی ڕەزاش لە کارەکەی لابرا و سیستمی تازە هاتە ناو ناوانەوە، شۆڕشگێڕانی ئەرمەن خۆیان دەرخست و هاتنەدەر، حیزبی تاشناق گورج خۆی کرد.ە هێزێکی سیاسی ئاشکرا بە سەرکردەیی (ئارام، ئیشخان، دکتۆر و سەرکیس) کە بوونە سیاسەتوانانی ڕۆژ. وتاردان بە ئاشکرا و بڵاوکراوەی پڕ لە تۆمەتبارکردنی دەوڵەت ژیانی سیاسی ئەرمەنی هەرێمەکەیان دەبر بەرێوە[٧٨].

سێ حیزبە ئەرمەنەکەی (تاشناق، هانشاك و ئەرمیناکان) هەروا سووك و باریك ناکۆکیەکانی نێوانیان نەمنا بەلاوە، ڕاستەوخۆ بەر لە پیرۆزی شۆڕشی ١٩٠٨، ئەم حیزبانە کۆبوونەوە ئاشکراکانی خۆیان وەك ململانێی یەکدی دەبەست و شەڕ و دەمەقاڵێی نێوانیشیان بەم ڕۆژگارە بە پوولێ. بەلام بە هاتنی مانگی ئادار /مارسی ١٩٠٨ تاشناق بە ئاسانی لە ڤان دەستەلاتی خۆی چەسپاند، هانشاك چووە ژێر سایەی تاشناقەوە، کەچی ئەرمیناکان گۆڕانێکی بنەڕەتی بەسەرداهات و زیاتر بووە دەنگێکی موحافیزکارانەی چینی بازرگانەکان، بووە بزاڤێکی بەرهەڵستی بێ دەستەلات[٧٩].

لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٠٨دا حیزبی تاشناق دوای ئەوەی لەگەڵ هانشاکدا هاوپەیمانبوون دەستی گرت بەسەر پرۆسەی هەڵبژاردنەکاندا و لە کۆمەڵەی (ئیتیحاد و تەرەقی)شەوە پشتگیری لێ دەکرا، گرنگترین سەکۆیەکی میللی ئەو حیزبەش داواکەی بریتیبوو لە (لێخۆشبوون لەو یاخیانەی کە دواکەوتوون و تا ئێستە نەدراون)[٨٠]. سەبارەت بە دەوڵەتێکی نابووتی ئەدارایشەوە ئەمە مومکین نەبوو، هەرچەندەش دەکەوتە نێو بازنەی سیاسە

سوودبەخشەکانەوە.

بەدوو قۆناغ هەڵبژاردنەکان ئەنجام دەدران، ئەوانەی بۆ (دەستەی هەڵبژاردن) ڕەوانە کرابوون نوێنەرە پەرلەمانیەکانیان هەڵبژارد، تاشناق ناوی پاڵێوراوەکانی خۆیی بۆ دەستەی هەڵبژاردن ئاشکرا کرد، لەگەڵ پاڵاوتنی دکتۆر (فاهان پاپازیان) بۆ (کورسی ئەرمەن) لە پەرلەمان. حیزب دەستی لە هەڕەشە و چاو سوورکردنەوەش نەدەپاراست تا پاڵێوراوەکەی خۆی سەرخات[٢١].

ئەمە لە کاتێکدا کە هەڵبژاردنی دکتۆر پاڵپشتێکی جەماوەری ئەرمەنی بەرفراوانی هەبوو و پێویستی بەو چاو سوورکردنەوانە نەددەکرد، بە هاتنی ساڵی ١٩٠٨ کڵێسای ئەرمەن کە یەکە ڕکابەری شۆڕشگێڕانبوو لە ناو جەماودری ڤان، ئەویش کەوتە ژێر ڕکێفی تاشناقەوە و ئیتر لەوێشەوە هەڵمەتی پروپاگەندەی هەڵبژاردن دەکرا، بۆ تاشناق و پاپازیانی پاڵێوراوی[٢٢].

حیزبی ئەرمیناکان هەر لە ئەساسەوە لەلایەن توێژاڵی بازرگانە دەوڵەمەندەکانەوە پشتی لێ دەگیرا، بۆیە لەناو جەماوەری هەژارانی ئەرمەندا نفوزی زۆر لاواز بوو، پاڵێوراوەکەی (تیرزیباشیان) بە خراپ باس دەکراو لەو کۆبوونەوانەی کە پاڵێوراوی ئەرمەنی تیا دەستنیشان دەکرا بە ئاسانی شکستی هێنا.[٢٣]

هەتا هەندێ لە عەشایرە کوردەکان، کە زۆریش نەبوون، بەهۆی نفوز و بەدەستەڵاتی تاشناقەوە، بۆ ماوەیەکی کاتی لە ڕووی سیاسیەوە پشتی ئەرمەنەکانیان دەگرت.[٢٤]

هەر لەسەرەتای سەردەمی نوێوە سوودەکانی هاوپەیمانیکردن لەگەڵ کۆمەڵەی (ئیتیحاد و تەرەقی)دا بەلای حیزبی تاشناقەوە دیاربوو، لە هەڵبژاردنەکانی یەکەمجاری پەرلەمانی تازەی عوسمانیدا، پاش تەواوبوونی گشت کاروبارەکانی هەڵبژاردنەکە، دوو موسوڵمان لە هەرێمی ڤان هەڵبژێران.

ئەرمەنەکان دەیانگوت گوایە لە قەزای (ئێرکیش) گزی و دەستێوەردانی تێدا کراوە، جا لەباتی ئەوەی پەنا بەرنە بەر قانوون چوونە لای کۆمەڵەی (ئیتیحاد و تەرەقی) کە بڕیاری دووبارەکردنەوەی هەڵبژاردنەکەی داو کۆلۆنێل (تایەر) کە سەرۆکی ناوخۆی کۆمەڵەکە بوو، ناردیان تا بگەنە ئەنجامێکی باشتر لەوەی پێشوو، ئەمجارە (ڤاهان پاپازیان) سەرکەوت[٣٥].

لە کاتێکیشدا لیژنەکەی تاشناق لەدانانە بیرۆکراتەکاندا ماڤ ڤیتۆی بەدەست نەبوو، بەڵام توانی ئەو بەرپرسە ناحەزانەی خۆی لابات. لە قۆناغێکدا (نازم بەگ) کە بە حاکمی ڤان دانرابوو، لابرا. بەهۆی هەندێ سکالاَ و شکاتی تاشناقەوە. ئەمانە سەرباری گشت ئەو نارەزاییانەی کە بە تایبەت لە عەسکەرەوە، پێشکەش دەکران دەربارەی سازندەیی‌و ملکەچی دەوڵەت لە ئاست داوا و پاڵەپەستۆکانی تاشناق و لابردنی ئەو سەرکدە لێهاتووە.

حیزبی تاشناق سەرەڕای بەشداربوونی لە هەڵبژاردنەکەدا، کەچی ڕۆژێ لە ڕۆژان باسی هەڵوەشادنەوەی دەستە و کۆمەڵە شۆڕشگێڕیەکانی و ڕاگرتنی قاچاغچێتی چەك و ئامەدیوکردنی لە ئارادا نەبوو و نەکرا، سەرکردەی تاشناق لە ڤان کە ئیشخان بوو ئەم بیرۆکەیەی زۆر بە قەتعی و توندی ڕەتکردەوە[٣٦].

ئامـاژەش بـەوە دەدرێ کـە ئـەو ئازادییانـەی سیسـتمە تازەکـە رەخساندبووی هانی ئەم جۆرە چالاکیانەی دەدا و دیاریشبوو ئەوەی ئەو کارانەی دەکرد سەرکردەکانی تاشناق هیچ سزایەك نەدەدران، وە ئەو سیاسەتانەی کە بوونە هۆی ئەوەی ئەوانەی لە ١٩٠٨دا چەکیان عەمبار کردبوو ئازاد بکرێن، زامنبوو بۆ ئەوانەیش کە سەرلەنوی دەستیان دەکردەوە بە قاچاغچێتی چەك. ئیتر لەو ڕەوشەدا شەڕوانان لە ڕووسیا و ئێرانەوە دەردەپەڕینە ناو ڤانەوە. ئامادەکاریەکانی ئەرمەن بۆ یاخیبوون و

چەك هاوردن بەردەوامبوو[38].

چەندەها هەوڵ و تەقەللای فاشیل دەهاتە پێش بۆ دەستگیرکردنی ئەو یاخیبووانەی بە ڕەهایی شوێنیان لێهەڵگێشابوو، کۆمەڵەی (ئیتیحاد و تەرەقی) و کونسوڵگەری ڕووس زامنبوون بۆ مەرەخەسکردنی ئەو یاخیبووانە[39]. لە کەشوهەوایەکی ئاوهاشدا شتێکی سروشتی بوو کە ( پرۆسەی نەخشە بۆکێشراوی چەك هێنان) وەك بەریتانییەکان وەسفیان دەکرد، بەردەوامبێ.

(دیکسن)ی کونسۆڵ دەنووسێ: لەسەرەتای ساڵی ١٩٠٩ سەدان پارچە چەك بە قاچاغی بۆ ئەرمەنەکانی ڤان هاتووە. پاش داگیرکردنی ڕۆژاوای ئێران لەلایەن ڕووسەکانەوە ساڵی ١٩٠٩، ڕێگەی ئێران بۆ ئاودیوکردنی زیاتر ئاسوودە و ئەمینتر بوو، لەو ڕۆژانەدا لە گشت کات زیاتر دیوی ئێران ببووە قەڵایەکی شۆڕشگێڕان. حوکمەتی عوسمانی وای دادەنا کە یاخیبووەکان لەو دەڤەرەدا چوار بەتالیۆنیان تەشکیل کردووە، کە بریتین لە ٤٠٠ کەس و سەرکردەکانیش پلەکانیان لە نێوان (عەریف)ەوەیە تا (ڕائید)[32]. دیارە ڕوخساری تازەی بەربەرەکانی ئەرمەنی وردە وردە دەنەخشا و دەکەوتە ڕوو، لە تەموز/یۆلیۆی ١٩١٢ ئەرمەنەکانی (فویزیم) لە تەرەق (موکس) لە ڕۆژەلاتی (جاتاك)ەوە پەلاماری کوردەکانیان داو شەڕ دوو ڕۆژ بەردەوامبوو تا سەربازەکان گەیشتنێ و شەڕەکەیان وەستاند.[33]

ئازادییە تازەکان کەشوهەوایەکی لەباری بۆ ڕێکخستنی شۆڕشگێڕی ڕەخساند، لەکاتێکدا ئەم ڕێکخستنە لەوەبەر لە لادێکاندا قانوونی نەبوو، بە نهێنی کاریان دەکرد، لەم سەردەمە بووە هەڵمەتێکی سیاسی پەسەند و بەڵکو هانیش دەدرا. ئیتر چالاکی ئاشناق لە لادێکاندا پەرەی سەند، ئەمە دڵەڕاوکێی لە دڵی موسوڵمانەکاندا دروستکرد و بەزارەیانی زیاد کرد.

لە ساڵی ١٩١١ کونسوڵی بەریتانیا (ج. مۆلینۆ - سیل) شیکردنەوەیکی بۆ

باری حیزبی تاشناق لە ڤاندا کرد، بەهیچ کلۆجیکیش لە عوسمانیانەوە نێزیك نەبوو و بەوەش تاوانبار دەکرا کە گوایە بە هەڤیانەت مامەڵە لەگەڵ مەسەلەی هەڤی موڵکایەتی ئەرمەندا ناکا و بەڕاستیش سزای عەشرەتە کوردەکان نادات، بەڵام ئەم وای دادەنا کە شۆڕشگێرانی ئەرمەن هۆکاری سەرەکی گرژی و ئاڵۆزیەکانی ناو هەرێمەکەن:

(( بەپێی ئەوەی کە لە زۆر جێی وڵاتدا کە سەردانم کردوون و بینیومە، وام لێهاتووە کە لە هەرکاتێکی تر زیاتر قایلبم بەوەی کە کاریگەری لیژنە شوومەکەی تاشناق بۆسەر خۆشگوزەرانی ئەرمەن و لەسەر ئەم بەشەی ترکیا بەشێوەیەکی گشتیە. چاوپۆشیکردن لە واقیعێك کە گومانی تێدا نییە مەحاڵە، ئەویش ئەوەیە کە ئەو شوێنەی هیچ ڕێکخستنێکی سیاسی ئەرمەنی تێدا نییە، یان ڕێکخستنێکی ئەرمەنی خراپی تێدایە، ئەرمەنەکان لە کەشوهەواویەکی ڕێکوپێك و تەبادا لەگەڵ ترك و کورددا ژیان بەسەردەبەن[٣٤].))

کونسوڵەکە وای دادەنا کە لەو ناوچانەی چالاکی شۆڕشگێرانی تێدایە سنووری گیروگرفتەکانیان تێ پەڕاندووە بۆ کارەسات و ئاشووبێك کە شۆڕشگێران خۆیان دەینێنەوە، وە وایشی دەبینێ کە حوکمەت لەو ناوچانەدا بێتواناترە لەوەی چارەسەری سکاڵا ڕاستەقینەکانی ئەرمەنەکان بکات، ئەو کێشە و سکاڵایانەش دەباتەوە بۆ دنە و هاندانەکانی تاشناق، (مۆلینۆ – سیل) دەڵێ یاخیبووەکان دانیشتوانە ئەرمەنەکانیان لە حاڵێکی ئامادەباشیدا گیرداوە ( سا بەڕاستبێ یا درۆ) ئەمەش بۆ چەسپاندنی دۆزەکەیان و فرۆشتنی چەك و دەستکەوتنی قازانج (هەر تفەنگێ بە ١٠ جونەیی ئیستەرلینی دەکڕن کەچی لادێییەکانیش ناچار دەکەن کە بە ٢٠ جونەی بیکڕنەوە[٣٥].)

## ● مەسیحیەکانی ڤان چۆن سوودمەند دەبوون؟

گۆڕانکاریەکانی دوای شۆڕشەکەی ۱۹۰۸ لە شاری ڤان تەنیا لە بواری سیاسیدا نەبوو، مەسیحیەکانی ئەم شارە بە شێوەیەکی بەرجەستەکراو سودیان لە حوکمەتەکەی کۆمەڵەی (ئیتیحاد و تەرەقی) بینی، بۆ ئەوەی بشزانرێ وەزع و گوزەرانی باشیان لە سایەی تاشناقەوە بوو، ئەو ئەفسەرە سوپاییانەی کە بەشێکیان لە کۆمەڵەی (ئیتیحاد و تەرەقی) پێکدەهێنا، لە دوی چارەسەرێکی سەربازی دەگەڕان تا تەنگژەکانی رۆژهەڵاتی پێ یەکلایی کەنەوە.

بەڵام سیاسیەکانی ئەم کۆمەڵەیە پەیوەندیەکی چاکیان هەبوو لەتەك شۆڕشگێڕە ئەرمەنەکاندا، جا هێزە سەربازیەکە تەنیا بۆ گیانی کوردەکان بوو، ئەو گوندە ئەرمەنیانەی کاتیخۆی کوردەکان داگیریان کردبوو بە زەبری هێزی ئەو سەربازانە بۆ خاوەنەکانیان گێڕانەوە،[٦] بۆ بە گژاچوونەوەی چەتە و رێگرە کوردەکان سەربازیان رەوانە دەکرد تا دەستگیریانکەن، هەرچەندە ئەم تەقەللایەش هێند سەرنەکەوت[٧]. جارێکیان: قەشەی ئەرمەنەکان راپۆتێکی بۆ موتەسەریفی (بشکاله) بەرزکردەوە تیایدا دەڵێ، لەچەند ناوچەیەکی (هەکاری - سانکاك)دا عەشایرە کوردەکان هەڕەشە لە مەسیحەکان دەکەن، موتەسەریفیش دوو دەستە سەربازی بۆ پاراستنیان رەوانە کرد[٨]. هەڵمەتێکی فراوانیش بۆ چەککردنی فیرقەکانی حەمیدیەی کوردی هاتە ئاراوە، تەنیا لە ساڵی ۱۹۰۸دا دوو هەزار تفەنگ لەو کوردانە کۆکرایەوە[٩]. سوارەی حەمیدیە هەڵوەشایەوە بەڵام بوونە میلیشیا و لەسەر بنەمایەکی جوگرافی نەك عەشایری ئەمجارە خۆیان رێکخست. هەروا سوپا دەستی دەکێشایە ناو ئەو ململانێ و بەیەکادانانەی کە بەردەوام لەنێوان کورد و نەستووریەکاندا دەقەوما، دیارە لەلایەنگری لە نەستووریەکان. بۆ

ئەم لووتتێژەنینە هەندێ کەڕەت سەربازەکان تۆپیشیان لەگەڵ خۆیاندا دەبرد بۆ پەلاماردانی کوردە هێرشبەرەکان.[10]

ڕۆژێك، عەشیرەی (جیرکیلی) کە کوردبوون، هێرشیان کردە سەر گوندی (ئەشیتا)ی ئەستووری، دە کەسیان لێ کوشتن و ڕانە مەڕەکەنیشیان بە تالانی برد، حاکمی ڤان سێ بەتالیۆنی نارد بەدوی ئەو کوردانەدا، ئابلۆوقەیان دان و ڕانەمەڕەکەشیان لێ سەندنەوە و دایانەوە بە خاوەنەکانیان، سەرکردەکانی ئەو عەشرەتەشیان گرت[41]. هەندێ سەرکردەی کوردی خاوەن دەستەڵات هێنرانە ڤان، جاروبار بە دەستبەسەری، هەر بۆ سەلماندنی دەستەڵاتی دەوڵەت بەسەریانا، بەڵام ئەورووپاییەکان گوێیان پە وەزعی موسوڵمانەکان نەدەدا لەژێر سایەی سەرکردەکاندا، ئەمەیان بە هەنگاوێ دادەنا بۆ رزگارکردنی وەزعی ئەرمەن[42].

گشت ئەو ئۆپەراسیۆنانە، ئەگەرەکو لەیەك تەرەفیشەوە بوون بەڵام ئاسایشی هەرێمەکەیان دەپاراست.

## • ئەنجامی هاوپەیمانێتیەکە

هەرچی چەندە ئەو هاوپەیمانیەی بۆ هەڵبژاردنەکەی نێوان کۆمەڵەی (ئیتیحاد و تەرەقی) و (حیزبی تاشناق) لە ساڵی ١٩١٢دا بەردەوامبوو، بەڵام بە فیعلی کەوتە ئەوەی درز و کەلێنی تێبکەوێ. ئەندامێکی تاشناق (ئەرشاك فرامیان) لە ساڵی ١٩١٢دا وەك نوێنەری شاری ڤان هەڵبژێررا، بەڵام زۆر لە تاشناقێکان لەو هەوڵ و تەقەللایەیان نیگەرانبوون کە کۆمەڵە دەیدا بۆ یارمەتیدانی هەڵبژاردنی نوێنەرانی تاشناق لەناوچەکانی دی سەڵتەنەکە[43].

لە پێنجی ئاب/ئاغستۆس ١٩١٢ نفوزی کۆمەڵە لە ئەستەموول هاتە کزبوون. دەستەڵات کەوتە دەست (یەکیەتی لیبرال) کە لەژێر ناوی (چەند حیزبێکی جیاواز)دا بوو و لایەکی ئەساسی ئۆپۆزسیۆنی کۆمەڵە بوو،

لیبراڵێکان پێیان باشتر بوو کە لەتەك ئەو دەستە و تاقمە ئەرمەنیانەدا هاوپەیمان بن کە زیاتر موحافیزکارن. لەتەك تاشناقدا پەیوەندیان باش نەبوو، بەڵام بەهۆی ئەو ڕەوشە سیاسیەی کە لە ڤاندا هەبوو هەروا لە پلەکانی خۆیاندا مانەوە، لە قۆناغی حوکمی لیبراڵەکاندا کە نزیکەی شەش مانگێکی خایاند، سەرقاڵی بە فیرۆدانی شەڕی (تەڕابلوس) و شەڕی یەکەمی (بەلکان) بوون، بۆیە زۆر گوێیان بە ڕۆژهەڵاتی وڵات نەدەدا، هاوپەیمانە تەقلیدیەکانیان لە کۆمەڵەی (ئیتیحاد و تەرەقی) یەکەم کەسێکبوون کە پرسی هاوپەیمانێتیان لەگەڵ تاشناقێکاندا هێنایە گۆڕێ.

کۆمەڵــە بــەهۆی کودەتاکــەی ٢٣ کــانوونی دوو/ یــەنایری ١٩١٣ەوە دەستەڵاتی گرتەوە دەست، زۆری پێنەچوو خۆی پێ ڕانەگیرا و لە ئاست جووڵانەوە جودا خوازیە شۆڕشگێڕەکان ئۆقرەی لێ برا، ئەو سێ کوچکەیەی کە حوکمیان دەکرد (تەلعەت، ئەنوەر و کەمال) پیاوانێکی واقیعی بوون، هەرچی بۆیان دەکرا دریغیان نەکرد بۆ هێشتنەوە و ڕزگارکردنی ئەوەی لە سەڵتەنەکە مابۆوە. سەرکردەکانی کۆمەڵە کەوتنە خۆدورخستنەوە لە تاشناق[٤٤].

کۆتایی هاوپەیمانیەکەی کۆمەڵە و تاشناق کاتێ ڕووی دا کە لە ڤان وەخت تێپەڕیبوو، ئەو کاتە هاوپەیمانیەکە کاریگەریەکی دوو لۆنەیی هێنابووە ئاراوە، لەلایە هێزی شۆڕشگێڕانی ئەرمەنی زیاتر چەسپاندبوو و موسوڵمانەکانیشی لاواز کردبوو، لەلایەکی ترەوە و ئاقیبەی ڕەفتارەکانی دەوڵەت بوونە هۆی بەرپابوونی شۆڕشێکی کوردی[٤٥]. بەڵام بەداخەوە لەوەیان دەکرد کە ئەم کارانە هەرگیز لە تەمووحە شۆڕشگێڕیەکانی ئەرمەنی کەم نەکردبێتەوە.

هاوپەیمانیەکەی نێوان کۆمەڵە و تاشناق لووتکەی هەڵکشانێکی هێمنانە و لەسەرخۆی تاشناق بوو لە ڤان، بووە نوێنەری شەرعی گشت ئەرمەنەکان،

هەتا بەر لەوەیش کە کۆمەڵە لە ئەستەمووڵ حوکم بگرێتە دەست، ئەمەش بەسایەی ئەو ڕێکخستنە شۆڕشگێڕیە و توانای ئاشکرایان لە بەجێهێنانی بێبەزەییانەی ئیرادەیاندا. سەرەڕای تەشەنەکردنی بیری نەتەوەیی لە نێوەندە ئەرمەنەکاندا.

لە ٢٦ ئادار/ مارس ١٩٠٨ هەردوابەودوای ئاژاوەکانی ساڵی ١٩٠٨ لە ڤان، کونسۆڵ (ئەلیوت) لەگەڵ هەندێ لە پیاوماقووڵانو بازرگان و کەسایەتی ناوداری ئەرمەن کە لە ڤان دوورەپەرێزبوون لە شۆڕشەوە، کۆبۆوە. ئەوەی لەو دانیشتنەدا درا بە گوێیدا بەوە قایلی کرد کە ئەوانەی لە ڕابوردوودا دژ بە شۆڕشگێڕان بوون ئیستە ئەرمەن بە (ئۆمەتێك)ی جیاواز دادەنێن لە بەرامبەر عوسمانیدا:

(( هەتا ئەم ئەرمەنە ڕۆشنبیرترانە وای مەزنە دەکەن کە لەم ململانێیەی ئیستەیاندا لەگەڵ ترکەکان هەمان ئەو مافانەیان هەیە کە هێزێك لە جەنگدا دەبێت بیبێت، ئەمانە باوەڕێکی توندیان هەیە کە گیانفیداکان سوپایەکی ئەرمەنیە و وا لەشەڕدا دژ بە سەڵتەنەی عوسمانی، لەبەر ئەمە هەرچەندە ترکەکان ماڧ بەکارهێنانی هێزیان هەس دژ بە فیداکارە ئاشکراکان (هەندێ ددانی بەمەشدا نەنایوو)، بەڵام ماڧ ئەوەیان نییە کە ئەرمەنە مەدەنیەکان لەسەر هاوکاریان سەغڵەتکەن، جا ئەو هاوکاریەی کە بە سوپای چالاکی دەکەن هەرچی چۆنێکبێ، بەداڵدەدانبێ یان پێدانی زانیاری و شتی تر.

لە چاوپێکەوتنەکانیشمدا لەگەڵ سەرکردەکانی گیانفیداکان ئەوەم بۆ دەرکەوت کە ئەوانیش هەر ئەو بۆچوونە سەخیفەیان وابەلاوە، لەوەش دەچێ ئەوانی تریش لەمانیان وەرگرتبێ. دیارە منیش پێم گوتوون کە (کۆمەڵەکان) هێزی سەربەخۆ نین ئەوپەڕەکەی کۆمەڵێکی یاخیبووی ددانپیانراوە لە دەوڵەت، هەچ دەوڵەتێکیش کە ببینێ داڵدەی تاوانباران و

پاخیبووەکانی دەدری، ئەمە بە جینایەت دادەنێ. بۆ ئەمە جەختم لەسەر ئەوە کردەوە کە گیانفیداکان بە ئاشکرا قانوونەکانی شەرێکی سەردەمیانە و شارستانی دەبەزێنن.

جارێ ئەوانە یەك جۆرە جل لەبەر ناکەن و هەر کە هەلیان بۆ برەخسێ وەك مەدەنیەکی سەرکز و بێوەی خۆیان پیشان دەدەن، بەتەبیعەتی حاڵ گشت تەقەللا و کردەوە و کۆشەکانم بۆ قاپلکردنیان سەری نەگرت و بەباچوو[16].))

ئاخری و ئاقیبەت دۆزینەوەی عەمبارە چەکەکانی تاشناق و سەرباری قوتاربوونی جینایەتکاری تیرۆرکردنی (داڤیت) لە سزا، ئەمانە بوونە چەسپبوونی نفوزی شۆڕشگێران لە ڤان، پیاوکوژان نەك تەنیا لە سزادان قوتاربوون بەڵکو بۆ نوێنەریش لە پەرلەماندا هەڵبژێرران، پەیوەندیەکانی نێوان تاشناق و حوکمەتە تازەکە بووە هۆی دەستبەسەراگرتنی دەستەڵاتی نوێ بەسەر شاری ڤاندا، لەوەپێش ئەو خەڵکە کەمەی کە لەگەڵ تاشناق نەبوون، بێگومان ئەگەر لەژێر لێویشەوە بووبێ لایەنگیری دەوڵەتبوون، بەلام ئیستە وا دەوڵەت بووە بە هاوپەیمانی تاشناق.

چاودێرە بیانیەکان وایان دادەنا کە (ئیکلیرۆسی) ئەرمەنی وا بووە هاوپەیمانی شۆڕشگێڕان، ئەوەی لەوەبەر لەهەرچی شتێکدابوو بەرهەڵستیان دەکرد[17]. بۆیە دوژمنانی شۆڕشگێڕانی ئەرمەن هیچ پەناپەکیان شك نەدەبرد داڵدەیان بدات[18].

لەسەروبەندی ١٩٠٨ هەریەك لە موسوڵمان و ئەرمەنەکان حیزبی تاشناقیان بە تاقە نوێنەری ئەرمەن دادەنا، حوکمەتەکەی (ئیتیحاد و تەرەقیش) هەر ئەم هەڵوێستەی پەیرەو دەکرد. بیرۆکە کۆنەکەی کە لەباتی وەلاو لاگیری تایەفی و نەتەوەیی بانگەشەی بۆ دامەزراندنی نەتەوەیەکی عوسمانی دەکرد، هەرنەبێ لە هەرێمەکەی ڤاندا مایەپووچ بوو و سەری

نەگرت. لە سیستمی (میللە)ی گوندا ئەرمەنەکان لەبەردەم (ئیکلیرۆس)دا سکالا و داخوازیەکانیان بەرزدەکردەوە، یان لە (سەرەتای ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەوە) لەبەردەم توێژاڵی بازرگانەکاندا کە دەستی بەسەر کۆمەڵدا گرتبوو. بەڵام حاڵی حازر دەبێت سکالا و داخوازیەکانیان بخەنە بەردەم تاشناق، ئەمە بە جوانی لەکاتی ڕوداوێکدا دەرکەوت کە لە (سارای) هاتە پێش، لە ڕاپۆرتەکەی (دیکسن)ی کونسوڵدا وا هاتووە کە:

(( کۆمەڵێ گیانفیدا کە لە ڕووسیاوە هاتبوون، سنووریان بڕی و بەمدیودا هاتن، بەڕۆژی نیوەڕۆ بە چەك و خۆنواندنەوە بەناو گوندی کوردەکاندا تێدەپەڕین، ئینجا بە شارۆچکەی سارای و بەرەو شاری ڤان، کوردەکانی سارای بەمە هەراسان و قوشقی بوون، دەمەقاڵێی نێوان ئەرمەن و ترکێکیان کردە بیانوو و بەهەلیانزانی دەرسێکی باشیان دادەن، دوایی پەلاماری دوکانی ئەرمەنیەکانیان داو دوکاندارەکانیشیان دایە بەر شەق، لەسەر ئەمە پیاوانی ئەرمەن لە سارای ماڵ و مناڵەکانیان جێهێشت و گشتیان چوون تا لە ڤان سکالا ببەنە بەر فیداکاران. نەك دەوڵەت[29]. ))

موسوڵمانەکانی ڤان بە (دانانی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم) و دامەزراندنی سیستمی دەستووری کەیفخۆش نەبوون، زۆر کەس بە ئاشکرا باوەڕیان وابوو کە ئەم حوکمەتە تازەیە لە ڤان لایەنی شۆڕشگێڕانی ئەرمەن دەگرێ، بە تایبەت کە لەم دواییانەدا نیەتەکانیشیان دەرکەوتبوو، ئەوان وایان دادەنا کە هەر کار و کردەوە و دیاردەیەك جوداخوازی ئەرمەن بچەسپێنێ نەفرەتێکە و لێیان دەکەوێ، سەرەڕای ئەمەش شۆڕشگێڕەکان هیچیان نەدەکرد تا ئەو ترسەی زۆرینەی خەڵکەکە بڕەوێننەوە.

لە ڕاپۆرتی کونسوڵەکاندا ئەوە هاتووە کە:

سەرکردە تاشناقێکان کە نفوزێکی تازەیان پەیداکردبوو، بەدەعیە و لووتبەرزیەکەوە هەڵسوکەوتیان بەرامبەر بە موسوڵمانەکان دەکرد،

پاڵەپەستۆ و زۆریشیان بۆ سەرکردە و موسوڵمان و عەشایرەکان دەهێنا، هەڕەشەیان دەکرد ئەگەرەکو گوێڕایەڵی فەرمانەکانیان نەبن سزا دەدرێن[50]. ئاشکراش بوو کە سەرۆك خێڵ و موسوڵمانەکانیش ئەوانەی لە شارەکەدابوون وایان هەست دەکرد کە تاشناق لە ڤاندا دەستەڵاتێکی تازەیان دامەزراندووە» هەتا (دیکسن)ی کونسوڵ وای ڕاگەیاندبوو کە (زۆرێك لە ئاغا کوردەکان لەلایەن حاکمەوە بانگکرابوونە ڤان بۆ لێپرسینەوەیان لە هەڵسوکەوتی نابەجێیان، ئەمانە چووبووشنە لای ئارام (یەك لەسەرکردەکانی تاشناق) پرسی ئەو مەرجانەیان کردبوو کە چۆناهی لێیان دەبووری[51].

لەوانەیە ئەمە ئەوە پیشاندات کە تا چ ئاستێك ئەو سەرکردە و ئاغا کوردانە توانای ئەوەیان هەبووە کە بەپێی گۆڕانکاریەکان خۆیان بگونجێنن و لەتەکیا بسازێن. بەڵام بێگومان زۆریش لە ڕەوشەکە بێزار بوون. موسوڵمانانی شارەکان نارەزایی و تووڕەیی خۆیان بەو لافیتانە دەردەبڕی کە دژ بە ئەرمەن بە دیوارەکانی شاری ڤانەوەیان دەکرد، ئەمە لەکاتێکدا لەوەبەر لافیتە هەڵواسین تەنیا کاری ئەرمەنەکانبوو. ئەو دوو بەرەیە لە گشت کات زیاتر لەیەك دابڕابوون.

## ● پەراوێزەکان

١- W.E.D, Alen and paul muratoff, Coucasian Battlefields (cambridge: Cambridge university press ٢٣٠) p. ١٩٥٢

٢- ئەوەی پەیوەندیی بەو ئاڵوگۆڕانەی کە بەسەر حیساباتی حیزبی تاشناقا هات، بچۆرەوە سەر کتێبەکەی (ئەناهید تیرمیناسیان) :
Nationaltism and Socialism in the armenian Revolutionary movement
کە (أ.م.بیریت) وەری گێڕاوە (کامبریدج، ماساتشوستس) زوریان ل ٤٥ - ٤٧. تیرمیناسیان و ئەکادیمە ئەرمەنەکانی تریش بەدەگمەن بەلای هاوکاریکردنی ئەرمەن و ڕووسدا چوون و باسیان کردووە.

٣- لەبەشی حەوتەمدا بچۆرە سەر مەسەلەکەی (بیدروس کاباماجیان)

٤- ڕیکخراوە شۆڕشگێڕە ئەرمەنە زۆرەکان بۆ (کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەرەقی) ناوی جیاجیایان داناوە، زۆر جاریش لەنێو خۆیاندا لەسەر ناوەکە تێکدەچوون، لەم سنوورانەدا زاراوەی (کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەرەقی) بۆ مانا ئەسڵیەکەی بەکارهێنراوە، چونکە وەك (شوکرۆ هانیۆغلۆ) بە درێژی لە دوو کتێبدا باسی دەکات کە دیاریکردنەکەی لەچەند بەشێکی کەمدا مەحاڵە، جا ئەو کورتەیەی لێرەدایە جیاوازیە گەورەکان یەکدەخات بەلام لە چوارچێوەیەکی ئیدۆلۆژی.

٥- بەرێز (شوکرۆ هانیۆغلۆ) :
The young Turks in oppostion (oxford: oxford university press 1995) pp 86-87, 90, 107, 116

٦- ئەو کوتلەیە جگە لە ئەمیر (صەباحەددین) داماد (مەحمود پاشا)یشی گرتبووە خۆی کە ئەو کاتە پلەی سەرکردەی لیژنەی ئیتیحاد و

ئەرمەنی هەبوو.

٧- ئەو هەوڵەی درا بۆ كێشكردنی پاڵپشتیەكی ڕەسمی بەریتانیا، سەری نەگرت.

٨- حیزبی (هانشاك) لەساڵی ١٨٩٦دا بوو بەدوو كەرتی دژ بەیەك (هانشاك) و (چاكخوازانی هانشاك)، دوایش ئەمانەش دابەش و دووكەرتبوون. (هراتش داسنابیدیان) : The Hanchakian party

كە (مارینی .أ. ئەراكیلیانز) وەری گێڕاوە:

Armenian Review 41, no (witer 1981) The Armenian Rivewlutionary movement (Berkeley: لویز نالبەندیان pp 32. 34 university of california press, 1963, pp 128-31

٩- ڤان، ئەرزڕۆم، بەتلیس، جەزیرە (مەعمورەی عەزیز)، دیاربەكر، سیواس

١٠- هانیۆغلۆ: The young Turks in opposition. Pp ١١٦-١٩٧

هەروا بڕوانە كتێبەكەی (هراتش داسنابیدیان) :

History of the Armenian Revolution Federation Dashnaktsutiun

كە (براین فلیمینگ) و (ڤاها هابیشیان) وەریان گێڕاوە (میلانۆ، خانەی جێمی بۆ بلاوكردنەوە ١٩٨٩. كە لێرەدا بەم شێوەیە ئیشارەی پێ دراوە:

History of the ARF. P ٥٦

١١- شوكرو هانیۆغلۆ:

Preparation for a Revolution: The young Turks 1902 - 1908 (oxford: university press, 1990. pp 191 - 24

١٢- هانیۆغلۆ بە دروستی باس لەو هاوپەیمانیە تەكتیكیەی نێوان شۆڕشگێڕانی ترك و ئەرمەن دەكات كە ڕاستەوخۆ كەمێ بەر لە شۆڕش

هاتبووه دی و دەڵێ: (هاوپەیمانیەکی ئەوتۆ بوو کە هیچ نرخێکی نەبوو) لەسەروبەندی ڕامالینی خێرای سیستمە کۆنەکەدا. (بڕوانە کتێبەکەی : Preparation for a Revolution ، وە لەو ڕوداوانەی جێی گومان نییە ئەوەیە کە یاخیبووانی ئەرمەن بەهیچ شێوەیە بەشدار نەبوون، لەو سەرکەوتنەی لە شۆڕشەکەی ساڵی ۱۹۰۸دا بەدەستهات.

١٤- فایلی ۹۳۰۵/۸۸۱ لە هیرد بۆ نۆکۆنر، پەتلیس ۲۵ ئاب/ئاغستۆس ۱۹۰۷ وە فایلی پێشوو لە دیکسن بۆ نۆکۆنر، ٤ ئاب /ئاغستۆس ۱۹۰۷، بەڵام لەبارەی بەڕاوبۆچوونی تاشناقەوە سەبارەت بەو هاوپەیمانیە، بچۆرەوە سەر کتێبەکەی (دیکران مازروب کالیحیان) :

The Armenian Revolutionary Federation under ottoman constitutional Rule, 1908-1914

کە نامەیەکی دکتۆرایە بۆ زانکۆی بۆستن ۲۰۰۲.

١٥- فایلی ۲۲۸٤/۱۹٥ لە دیکسن بۆ لۆدز، ڤان ۲ تشرینی دوو/ نۆڤامبر ۱۹۰۸

١٦- هەر ئەو فایلە لە دیکسن بۆ لۆدز، ڤان ۲۰ ئەیلوول /سەپتامبر ۱۹۰۸

١٧- فایلی ۲٤۷٥/۱۹٥ لە مۆلینۆ-سیل بۆ مارلینگ، ڤان ۹ کانوونی دوو/یەنایر ۱۹۱۱

١٨- دیکسنی کونسۆڵ موجامەلەی نەدەزانی، هەست و ڕاوبۆچوونەکانی خۆیی نەدەپێچایەوە لە وشە و زاراوەی جوانکاریەوە، قسە لە ڕووبوو، جارێکیان دەیگوت: (ئەرمەن بوونەتە تەقلیدێکی هەراسانکەری ناشرینی قوماربازی خراپترین سیاسەتوانانێك کە هەبن. ) بڕوانە فایلی ۲۲۸٤/۱۹٥ لە دیکسن بۆ بۆ لۆدز، ڤان ۳۱ ئەیلوول/ سەپتامبر ۱۹۰۸

١٩- فایلی ۹٥۳۲/۸۸۱ لە دیکسن بۆ لۆدز، ڤان ۳۱ ئادار/مارس ۱۹۰۸

٢٠- فایلی ۲۲۸٤/۱۹٥ لە دیکسن بۆ لۆدز، ڤان ۲ تشرینی دوو/ نۆڤامبر ۱۹۰۸

٢١- لە هەڵمەتی یەکەمجاردا بۆ هەڵبژاردنی ئەندامێکی تاشناق لە کۆمەڵگەی هەڵبژاردنەکەدا، لەباتی هەڵبژاردنی هەر ئەرمەنیەکی تر یا

موسـوڵمانێ، تاشـناقیێکان توانیـان لـە ڕێـی مسـۆگەرکردنی هەڵبـژاردنی پاڵێوراوەکانیانـەوە سـەرکەوتن بەدەسـتبهێنن. ئـەم ئەنجامـەش بەلایـەك لەلایەکاندا دەدرێتە پاڵ ئەو هەڕەشە و چاوسوورکرنەوانەی کە بەبێ پەروا و بەبێ دەستخستنە ڕێگەیان، لە خەڵکیان دەکرد. (فایلی ٢٢٨٤/١٩٥ لە دیکسن بۆ لۆدز، ڤان ٢٠ ئەیلوول/سەپتامبر ١٩٠٨).

٢٢- فایلی ٢٣٤٧/١٩٥ لە مۆرگان بۆ لۆدز، ڤان ٢١ تەمموز/ یۆلیۆ ١٩٠٩

٢٣- قانوونەکانی هەڵبژاردن هیچ شتێکی تێدا نەبوو لەبارەی پشکێکەوە بەپێی ئایین، بەڵام لە واقیعدا و ئەوەی لەبارەی ئەرمەنـەوە بـوو دەرهاوێژی ئەو هاوپەیمانیەی نێوان تاشناق و (ئیتیحاد و تەرەقی) بوو وەك لە خوارەوە خراوەتە ڕوو.

٢٤- فایلی ٢٢٨٤/١٩٥ لە دیکسن بۆ لۆدز، ڤـان ٢٠ ئـەیلوول/ سـەپتامبر ١٩٠٨ وە ئـەوەی پەیوەنـدە بـە چـالاکی و ڕووکارەکـانی حیزبـی تاشـناقەوە لـەو ماوەیەدا، ئەوا بڕوانە هەر ئەو فایلە لە ٣ تشرینی دوو /نۆڤامبر ١٩٠٨. ئەوەی پالاوتنی ئەرمەنی دەچەسپاند ئـەو ڕێسایە بـوو کـە دەنگـدان بـۆ هەڵبـژاردن تەنیا بۆ ئەوانە بوو کەدەبوو باجیان بدایە، ئینجا ئـەو دەسـتەیەی پـالاوتنی هەڵبـژاردنی نوێنـەرە لـە پەرلەمانیـەکانیان دەستنیشـان دەکـرد، ئەمـەش ڕێسـایەکی وایـە کـە مـەجال دەدا بـە پاڵەپەسـتۆ خسـتنێکی زۆر بـۆ سـەر دەنگدەرە بێلایەنەکان و ئەوانەی پابەند نـین بـەهیچ لایەکـەوە کە دەنگیـان بۆ بدەن، بۆ ئەمە بڕوانە کتێبی (حەسەن کایالی) :

Election and the Eletoral process in the ottoman Empire 1876 - 1919, International Journal of middel East studies 27, no. 3 (August 1995) pp 265 - 86

٢٥- فایلی ٩٥٣٢/٨٨١ لە دیکسن بۆ لۆدز، ڤان ٣١ ئادار/مارس ١٩٠٨

٢٦- فـایلی ٢٣٧٥/١٩٥ لـە مۆلینـۆسـیل بـۆ لـودز، ڤـان ٢٢ تشـرینی دوو/ نۆڤامبر ١٩١١

٢٧- دوای ڕاگەیاندنی دەرچوونی دەستووری عوسمانی، ڤانا ئیشخان وازی لە پلە و پایەکەی خۆی نەهێنا و هەڵوەشاندنەوەی تەشکیلاتی فیداکارانیشی ڕەتکردەوە. بڕوانە: History of the ARF. P ٢٠٢

٢٨- فایلی ٣٧١/٥٦٠/٢٧٦٨٩ لە دیکسن بۆ لۆدز، ڤان ٣٠ ئەیلوول/ ساپتەمبر ١٩٠٨، لە کتێبەکەی (صەلاح صۆفیا) وە وەرگیراوە:

The Turco - Armenian adana Incidents in the Light of secret British Decoments, Belleren 201 (December (1987

٢٩- فایلی ١٩٥/٢٢١٨ لە مۆرگان بۆ لودز، ڤان ٢٠ تشرینی یەك/ ئەکتۆبەر ١٩٠٩

٣٠- فایلی ٣٧١/٧٧٤ لە شیپلی بۆ لۆدز، ئەرزڕۆم یەکی نیسان/ ئەپریل ١٩٠٩

هەروا فایلی ١٩٥/٢٢٧٥ لە مۆلینۆ-سیل بۆ لۆدز، ڤان ٩ تشرینی یەك/ ئەکتۆبەر ١٩١١

٣١- فایلی ٣٧١/٧٧٤/١٥٥٨٤ لە لۆدز بۆ گرای بروسکەیەکی نهێنی، ئەستەموول، ٢٠ ئادار/مارس ١٩٠٩ لەتەك بروسکەیەکدا کە لە کابتن برترام دیکسنەوە نێردراوە ، ڤان ٢ ئادار/مارس ١٩٠٩

٣٢- کە لە کتێبی Anadolu, Islahati، چاپی ali karaka
BOA, Yee, A/22 - 11/22- a - 131. ve Ahmet sakir pasa (Istanbul: Eren 1993) p. 129

٣٣- فایلی ٨٨١/١٠١٦٤ لە مۆلینۆ-سیل بۆ لۆدز، ڤان ١٠ تەمموز/یۆلیۆ ١٩١٢

مۆلینۆ-سیل دەیگوت: گشت ئەم ئەرمەنانەی لایەنگری حیزبی تاشناقن، بەباشیش پڕ چەك کراون.

٣٤- فایلی ١٩٥/٢٢٧٥ لە مۆلینۆ-سیل بۆ لۆدز، ڤان ٩ تشرینی یەك/ ئەکتۆبەر ١٩١١

٣٥- هەر ئەو فایلە، ڤان ٩ تشرینی یەك/ ئەکتۆبەر ١٩١١

٣٦- فایلی ٩٧٤٦/٨٨١ لە مۆلینۆ-سیل بۆ لۆدز، ڤان ١٢ حوزەیران/ یۆنیۆ ١٩١٠، وە بۆ زیاتر شارەزابوون بەو چاکسازیە هاوشێوانەی ئەرمەنەکان بڕوانە فایلی ٩٦١٨/٨٨١ لە سافرستیان بۆ شیبلی، پەتلیس ٩ ئەیلوول/ساپتەمبر ١٩٠٩، هیچ کات سوپا بەوە رازی نەبوو، کەم جار سوپا و حوکمەت هاوسۆزیان هەبوو بەرامبەر داواکاریەکانی ئەرمەن بۆ گێڕانەوەی زەویەکانیان، موشیر (عوسمان پاشا) چاوی بە نوێنەرانی گوندی (هاسکۆی)کەوت کە خەڵکەکەی لە دەوڵەت یاخی ببوون و هەڵهاتبوونە ناو رووسیاوە، موشیر پێی گوتن کە هەر نەبێ ئەو کوردانە ڕۆژێ لە دەوڵەت یاخینەبوون، بەڵام ئەرمەن (لەو گوندەدا گشتیان لە گیانفیدا کۆنەکانن) کە یاخیبوونێکی چەکدارانەشیان ئەنجامدا ڕایان کردە ناو ڕووسیاوە لە ترسی سزای ڕەفتارەکەیان، کە گەڕاشنەوە کوردەکان دەستیان گرتبوو بەسەر زەویوزارەکانیاندا، ئینجا ڤیژدو هاواریان لێبەرزبۆوە و داوای زەویەکانیان دەکەنەوە (فایلی ١٢٦٣/٢٧١ لە مۆلینۆ-سیل بۆ لۆدز، ڤان ٩ تشرینی یەك/ ئەکتۆبەر ١٩١١) وە ڕاپۆرتی ٩٩ساڵانەی لیژنەی ڕێ پێدراوە ئامریکاییەکان بۆ کاروباری دەرەوە کە دراوە بە کۆنگرەی (مینا بۆلیس) لە (مینیسوتا) ١٣ - ١٥ تشرینی یەك/ ئەکتۆبەری ١٩٠٩ (بۆستن: لیژنەی ئامریکایی ١٩١٠) ل٧٩

٣٧- فایلی١٩٥/٢٣٦٨ ڕاپۆرتی مورگان ڤان ٢ تشرینی یەك/ ئەکتۆبەر ١٩٠٩

٣٨- فایلی ٩٧٤٤/٨٨١ لە لۆدز بۆ گرای، قوستەنتەنیە ٢٠ نیسان/ ئەپریل ١٩١٠

٣٩- فایلی ٩٥٢٣/٨٨١ لە دیکسن بۆ لۆدز، ڤان ٣١ ئادار/ مارس ١٩٠٨ وە فایلی ٢٣٤٧/١٩٥ لە مۆرگان بۆ لۆدز، ڤان ١٧ تشرینی دوو/ نۆڤامبر ١٩٠٩

٤٠- فایلی ٢٣٦٨/١٩٥ لە مۆرگان بۆ لۆدز، ڤان ٢٧ تشرینی یەك/ ئەکتۆبەر ١٩٠٩

٤١ فایلی ١٠٠٧/٨٨١ لە مۆلینۆ-سیل بۆ لۆدز، ڤان ٢١ ئەیلوول/ ساپتەمبر ١٩١١

٤٢- فایلی٢٢٨٤/١٩٥ لە دیکسن بۆ لۆدز، ڤان ٢ تشرینی دو/نۆڤامبر ١٩٠٨، سەبارەت بە ئاستەنگەکانی پەیوەند بە مۆڵکایەتی زەویەوە بڕوانە کتێبەکەی (جانیت کلاین):

Power in the periphery: The Hamidiya LightCavalry and the Struggle over Ottoman Kurdistan

کەنامەیەکی دکتۆرایە بۆ زانکۆی (برینستۆن ٢٠٠٢) ل ٣٠٥ - ٢٨

٤٣- کالیجیان:

The Armenian Revolutionary Federationunder Ottoman Constitutional Rule 1904-1914 PP 192-99

٤٤- فایلی ١٠٣٧٦/٨٨١ لە لۆدز بۆ گرای، قوستەنتەنیە ٦ ئەیار/ مایۆ ١٩١٢

٤٥- سەعید بەگ کە گوندەکانی لێ سەندرایەوە گێڕایانەوە بۆ ئەرمەنەکان، بووە دوژمنێکی کاڵە لە پێی دەوڵەت، دوایی بۆخۆی یاخیبوو. (فایلی ٢٣٧٥/١٩٥ لە مۆلینۆ-سیل بۆ مارلینگ، ڤان ٣٠ کانوونی دوو/یەنایر ١٩١١. بچۆرەوە سەر بەشی حەوتەمی ئەم کتێبە، پەلامارەکانی کوردەکان بۆ سەر سوپای ترك نامازەبوون بۆ دوژمنایەتیەکی ئاشکرا لەو دەڤەرەی کەوتبووە رۆژاوای دەریاچەی ڤانەوە (فایلی ٩٩٢٣/٨٨١ لە سافرستیان بۆ ماکگریگۆر، پەتلیس ١٦ کانونی یەك/ دیسامبر ١٩١٠

٤٦- فایلی ٢٢٨٣/١٩٥ لە دیکسن بۆ بارکلی، ڤان ٦ نیسان/ئەپریل ١٩٠٨

٤٧- دەنگی ئەوە هەبوو گوایە قەشە ئەرمەنیەکەی پەتلیس ڕێگە خۆشدەکات بۆ کردنەوەی قوتابخانەیەك بە کۆمەکی حیزبی تاشناق، فایلی ٩٦١٨/٨٨١ لە سافرستیان بۆ سیبلی، ٩ ئەیلوول/ ساپتەمبر ١٩٠٩. ئەو عەیامە دەنگوباسی زۆر لە پەتلیسەوە دەهات، بەڵام بۆ ئەگبەتی بەریتانیا

نوێنەرێکی خۆیی تیادانەنابوو، تەنیا تەرجومانێکیان لەوێکانێ بوو ناوی (ئەرشاك سافرستیان) کە ئەویش هەواداری حیزبی تاشناق بوو، جا بۆ دەستخستنی رێنماییەکانی بڕوانە (فایلی ٩٩٣١/٨٨١ لە سافرستیان بۆ ماکگریگۆر، پەتلیس ٢٤ شوبات/ فەبرایر ١٩١١) لەوەشدەچێ کە بەریتانیایەکان ئەو رێنماییانەی ئەویان بە هێند وەرگرتبێ، چونکە لە زۆر بۆنەدا ئاماژە دەدەن بە لاگیریە ئاشکراکەی ناو راپۆرتەکان.

٤٨- بڕوانە سەرنج و ئاماژەکانی کونسوڵ مۆرگان لەناو فایلی ٣٢١٨/١٩٥ راپۆرتی مورگان، ڤان ٢ تشرینی یەك/ئەکتۆبەر ١٩٠٩

٤٩- فایلی ٣٢٨٤/١٩٥ لە دیکسن بۆ لۆدز، ڤان ٢٠ ئەیلوول/ سایتمبر ١٩٠٨

٥٠- کونسوڵ دیکسن وا وەسفی هەڵسوکەوتی حیزبی تاشناق دەکات کە شەرانگێز و بوغرا و خۆبەزلزانێکی رەهایە (فایلی ٥٦٠/١٩٧ لە دیکسن بۆ لۆدز، ڤان ٩ ئەیلوول /سایتمبر ١٩٠٨) کە لە کتێبەکەی (صۆنیال)دا باس کراوە:

The Turco - Armenian mana Incidents in the Light (of Secret British Decoments, p 1296

٥١- بەریتانیای مەزن، ئەرشیفی نیشتمانی ٣٧/٩٥/١٣٧ GABلە دیکسن بۆ لۆدز، ڤان ٣٠ ئەیلوول/ سایتمبر ١٩٠٨ وە لە کتێبەکەی کلایندا باسکراوە:

٣١٥Power in the periphery, p

# بەشى حەوتەم

# شۆڕشەكانى كورد و پشكنەريەكان *

## ١٩١٢ - ١٩١٤

لە رۆژهەلاتى ئەنەدۆلْدا حوكمەتى عوسمانى خۆى لە بارێكى زۆر ناهەمواردا دەديەوە، بەشێكى كەمى ئەمەش دەدرايە پالْ ئەو هاوپەيمانيەى كە لەنێوان كۆمەلّەى (ئيتيحاد و تەرەقى) و حيزبى تاشناقدا بوو، وە بۆ ئەو روداوە سياسى و عەسكەريانەش، ئيتر بە چاوپۆشى لەوانەى ناو هەرێمەكەى ڤان.

بەشداريكردنى ئەرمەن لەكارى سياسى و باشبوونى رەوشى گوزەرانى رۆژانەيان لە رۆژهەلاّتدا واى لە شۆڕشگێڕان نەكرد كە دەستبەردارى ياخيبوونە غەيرە نيزاميەكەيان ببن وميان هاوردەكردن و ئامديوكردنى چەك راگرن، يان ئەو هەلْمەتە راگەياندنەى خۆيان دژ بە عوسمانيەكان كە لە ئەوروپا دەستيان دابوويە بوەستێنن. عوسمانێكان هەرچێكيان بكردبا بۆ باشتركردنى بارى ژيانى ئەرمەن بەلاى ئەوروپاييەكانەوە بەسنەبوو، بەلْكو داواكاريەكانى ئەوان گەيشتە رادەيەك كە سەربەخۆيى بوو بۆ ئەرمەن، ئەمە لە كاتێكدابوو كە ژيان و گوزەرانى ئەرمەن و دانيشتووە كوردەكان لە رۆژهەلاّتدا لە هەر رۆژێ لە رۆژان لەباشتر بوو.

لەو سالاّنەدا كە راستەوخۆ بەر لە هەلْگيرسانى شەڕەكە بوون، بارى

---

* پشكنەريەكان: المفتشيات ((وەرگێڕ))

ژیان و گوزەرانی ئەرمەن و دانیشتووە کوردەکان لە ڕۆژهەڵاتدا بەبێ چەند و چۆن لە جارانیان باشتر بوو، گەچی عەشایرە کوردەکان هێشتا پەکیان دەخوارد و دەستیان لە خوێنی یەکتردا بوو[1]. خۆ بەهۆی ئەو سەربازە زۆرانەی کە لە دەفەرەکەدا بوون، کەمتر لە جاران بەیەکیاندا دەدا. بەڵام کێشەیەك کە زیاتر لە گۆڕێدابوو، ئەو کوشتنە تاکو تەراپانە بوو کە بەبێ جیاوازی چ لە ئەرمەن و چ لە کورد دەکرا، هەرکام لەم دوو تەرەفە یان لەخۆیان یان لەوی تریان دەکوشت، بەپێی پێوەرەکانی سەدەی بیست و یەك ژمارەی ئەو کوژراوانە هیچی وانەبوو کەمبوون، بەتایبەت لە گوندە ئەرمەنەکان، بەڵام کەمبێ و زۆربێ خۆ هەمیشە تاوان و جینایەتەکان پەرە بە ئاڵۆزی دەدەن و ئاگری ئاژاوە خۆش دەکەن[2].

لە ڤاندا چاکسازیەکی زۆر بەدەستی (تەحسین)بەگی حاکمی هەرێمەکەوە هاتە دی: نەهێشتنی ئاڵۆزی ناو عەشایرە کوردەکان،[3] دەستکردن بە هەڵمەتی سزادانی سەرکردە یاخیبووەکان و کۆکردنەوەی باج لێیان بەبێ چاوپۆشی[4]، سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی هەیکەلی نیداری دەفەرەکان لە هەرێمەکەدا، پێکهێنانی لیژنەیەکی نیداری بۆ لێکۆڵینەوە چاکسازیە داراییەکان و دامەزراندن و کردنەوەی قوتابخانەی کوردی، پێکهێنانی لیژنە بۆ یەکلاییکردنەوەی کێشەی زەویوزار لەنێوان کورد و ئەرمەن دا، سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی دەزگەی هێزی دەرەك و دانانی پاسەوان و دەوریە بۆ گشت گەڕەکەکانی شار و ڕووناککردنەوەی شەقامەکانی ناوشار لە شەودا، ئەمانە و زۆر کاری چاکسازی تر.

حوکمەتەکەی (ئیتیحاد و تەرەقی) شەیدای بەجێهێنانی ئەم جۆرە چاکسازیانەبوو تا دەستی پێش ئەو داخوازی چاکسازیانەکەوێ کە لایەنە ئەوروپاییەکان داوایان دەکرد (لە ئاقیبەدا ئەم تەقەللایانەش سەریان نەگرت) نجا تەحسین بەگ پشتگیریەکی سیاسی باش کرا، ئەوانەی سەر بە

شەخسی خۆیبوون و جێی متمانە بوون کردنیە بەرپرس، لەمەش گرنگتر ئەمانە ناسیاو و دۆستی سەرانی دەستەڵاتبوون لە ئەستەموول. هەر بۆ نموونە: (خەلیل بەگ) — کە دوایی نازناوی پاشایان دایە - ئەمە (ئەنوەر پاشا)*ی وەزیری جەنگ بوو دوایی، کردیە بەرپرس لە هێزی دەرەکدا[٥].

کەم کەرەت، مەگەر چلۆنها، کونسوڵەکان بە باڵای دەوڵەت و کارەکانیدا لە هەرێمەکەدا هەڵیان داوە. کەچی ئەم کەرەتە کەوتنە ستایشکردن و پیاهەڵدان[٦]. هەتا نێردراوە ئامریکاییەکانیش قسەیان لەوەدا کۆکبوو کە بارو رەوشەکە لە هەرکاتێکی دی باشترە[٧]. بەڵام ئەمانە گشتیان بە عەفوات چوون، چونکە تەنگژەی زۆر گەورەتر بەم نێزیکانە دەدا بەسەر هەرێمی ڤاندا.

هەرچەندە لە هەرێمە عوسمانیەکاندا چاکسازیەکان زۆربن، بری ئەو نەهامەتی و کارەساتە زیانبەخشانە ناکەون کە لە شەڕی یەکەمی بەلکاندا بەر دەوڵەت کەوت. لەساڵی ١٩١٢ لەشکرەکانی عوسمانی بەددەستی یۆنان و وبولگار و صربیا و شاخە ڕەش (مۆنتی نیگرۆ) دووچاری شکست و کارەساتێکی مەزن بوونەوە، وەك زانراویشە لەوەبەر ئەم وڵاتانە بەشێکبوون لە دەوڵەتی عوسمانی، جا بەپێی ئەو چاودێرانەی ناوەوە و دەرەوەی دەوڵەت، شکستەکەی سەڵتەنە بە ئەندازەیە نابڕوبەرانەبوو کە نە لە بەردەم لەشکری رووسدا و نە لەبەردەم زلهێزێکی تردا ناوای بەسەر نەهاتبوو، بەڵکو لەبەردەم چەند پارچەیەکی دەوڵەتەکە خۆی.

کە عوسمانیەکان بەشێکی بچووکی خاکی بولگارستانیان گرتەوە، کە لە دووەم شەڕی بەلکاندا دۆڕاندبوویان، ئەمە هیچ دادێکی نەدان، تەنیا لە

---

* دەقــــە عەرەبیەکـــــە بـــــە (ئیـــــنفر) نـــــاوی بـــــردووە. ((وەرگێڕ))

** لــە ڕاســتیدا عوسمانێکــان خۆیــان داگیرکــەری ئــەو وڵات و نەتەواتــە بــوون. ((وەرگێڕ))

گێڕانەوەی متمانەیەكی زۆر كەم نەبێ بۆناو ڕیزەكانی لەشكرەكانیان، ئەمەش ئەگەر بولگارەكان خۆیان پەیوەندیان لەگەڵ هاوپەیمانەكانی جارانیان نەبڕیایە ئەم سەركەوتنە بچووكەش نەدەهاتەدی، ئەو دابڕانەی بولگار بۆ عوسمانیان بووە هەلێك تا ڕۆژهەڵاتی (تركیا) سەرلەنوێ داگیركەنەوە. لەمەش خراپتر ئەوەبوو كە عوسمانیەكان نەیانتوانی موسوڵمانەكانی ئەورووپای عوسمانی لە داگیركارە مەسیحیەكان [7] بپارێزن، ئەمەش بووە خاڵێكی زۆر گرنگ و كاریگەر بەلای موسوڵمانانی ڕۆژهەڵاتی سەڵتەنەوە.

لەهەردوو شەڕەكانی بەلكاندا ٣٧٪ی موسوڵمانانی ئەورووپای عوسمانی كوژران و ١٨٪شیان گورج هەڵاتنە ڕۆژاوای ئەنەدۆڵەوە، ئەوەیشی مایەوە چوون بۆ ئەورووپای عوسمانی[8](ئەو چكە كەمەی كە بەدەستیانەوە مابۆوە).

دانیشتوانی ڕۆژهەڵات ئەو پەندانەی كە لەو دوو شەڕەی بەلكانەوە بەدەستهاتبوو نەیانهێشت هەروا بە ئاسانی لەدەستیانچێ، لە ئاستی سەربازیدا عوسمانێكان لاوازبوون، هەمووان موسوڵمان و مەسیحی چاوەڕوانی پەلامارێكی سەركەوتووی ڕووسەكانیان دەكرد، سەبارەت بە شۆڕشگێڕانی ئەرمەنیش ئەمە مانای ئەوەبوو كە هەلەو بۆ دەستودەشاندنەكەیان خوا ناردویە. جا بە ڕاوێژ لەگەڵ ڕووسەكاندا پلانی ئەوەیان دادەڕشت كە ئیتر سنوورێكی كۆتایی دانێن بۆ حوكمی ئالی عوسمان بەسەر خاكەكەیانەوە.

عەشایری كوردیش هەروا كەوتنە پلاندانان، هەندێكیان وای بۆ دەچوو كە دەبێ لەگەڵ ڕووسدا تەگبیرو ڕا بكرێ، هەندێكی دی وایان دەبینی كە ڕووس هەرگیز ڕازی نابن بە هیچ جۆرە سەربەخۆییەكی خودموختاری كوردی، بۆیە دەبێ بەربەرەكانیان بكرێ، هەتا ئەگەر پێویست بكات هەماهەنگی و هاریكاریەكی توندوتۆڵی دەوڵەتی عەلیەی عوسمانی بكرێ.

هەر ئەم عەشایرە كوردانە گریمانەی ئەوەشیان هەبوو كە هەر

سەرکەوتنێکی ڕووس مانای سەرکەوتنی ئەرمەن و تا ڕادەیە تێکشکانی کوردە. هەشیانبوو هەڵوێستێکی وریای وەرگرتبوو، خۆی ئامادە و موهەیپا کردبوو تا بداتە پاڵ براوە.

## * وتووێژی دیپلۆماسیانە بۆ کۆتایی هێنانی دەستەڵاتی عوسمانی بەسەر رۆژهەڵاتدا

بەجوانی دیاربوو کە ئەو سیستمە سیاسی و کۆمەڵایەتیەی لە سەدان ساڵەوە لە رۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵدا پەیڕەو دەکرا مەحاڵە لە شەو و ڕۆژێکدا بگۆڕێ، بەڵام ئەوروپاییەکان پەیدەر پەی داوای ئەمەیان دەکرد، هەتا لە کۆتاییدا هەڕەشەی هەڵوەشاندنەوەی سەڵتەنەکەیان دەکرد، ئەگەرەکو عوسمانێکان واز لەو دەستەڵاتەی خۆیان نەهێن بەسەر رۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵدا چەند دەفەرێکی ئەوروپایی ئاسا نەهێننە دی کە خود موختاریەکی ئەوتۆیان هەبێ خزمەت بە ئەرمەن بکات.

ئەگەر یەکەم جەنگەکەی جیهانی نەقەومایە شۆڕشگێرە ئەرمەنەکان بێ تەقە بە ئاواتی خۆیان گەیشتبوون و رۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵ لە سەڵتەنەکە جیاببۆوە. ئەو کاتە مەسیحیەکان حوکمی زۆرینەی موسوڵمانەکانیان دەکرد، هەتا ئەگەرەکو ئەم مەسیحیانە لە کۆتایشدا لە ئیمپریالیەکەی ڕووسیشبوونایە. جا بۆ ئەگبەتی سەرکەوتنەکە لە دەستێوەردانێکی ئەوروپایی هاوشێوە وە بەدەستهات و بووە بناغە بۆ پلانە شۆڕشگێڕیە ئەرمەنیەکان تا ساڵی ١٩٠٧ - ١٩١٨

پێشتر یاخیبووەکان وایان پیلانبوو کە هێرش بەرنە سەر موسوڵمانەکان و وایان بورووژێنن تا ئەوانیش بکەونە تۆڵەسێنی و پاشان دەستێوەردانی ئەوروپا بۆ خۆیان گردکەنەوە، بەڵام ئێستە هیچ پێویست بە کوشت و کوشتاری بەرامبەر نییە، چونکە بەبێ هیچ دنەدان و هەڵنانێ

ئەوروپاییەکان خۆیان دەستێوەردەدەن.

لەسەروبەندی ئەو دوو شەڕەی بەلکاندا، ڕووسیا هەلمەتێکی بۆ گۆڕینی ڕەوشی ڕۆژهەلاتی عوسمانی دەستدایە، یەکەم هاندەر بۆ ئەم گۆڕانە (بۆگۆس نۆبار[٩]) بوو، جێگری بەترمریکی ئەرمەنی لە (ئیشمیادزین). بۆگۆس نۆبار لە پارەگەکەی خۆیەوە لە پاریس دەستیکردە پەیوەندیکردن بە هێزە ئەوروپاییەکانەوە، پلانێکی دەخستە بەردەمیان بۆ دامەزراندنی (ئەرمینیا) یەك کە لەو شەش هەرێمەی کەوتۆتە ڕۆژهەلاتی عوسمانییەوە، ئۆتۆنۆمیەکیان هەبی، هەرچەندە سەرزارەکی ئینکاری ئەوەی دەکرد کە ئەم هەرێمانە لە سەلتەنەکە دابـبڕێن و جیایـان کاتـەوە، بـەلام لەگـەل بەترەریکـدا ئـەو پێشنیارەیان پێشکەش کرد کە ناوەڕۆکەکەی ئەو دابـڕان و جیابوونەوەیـەی لێ دەکەوتەوە.

لـەو کاتـەی نۆبـار لـە پاریسـەوە ئـەم مەبەسـتە باشـانەی بەرامبـەر سەلتەنەکە ئاشکرا کرد، لەولاشەوە بەترمریك پێشنیاری بۆ قەیسەر کـرد کـە هەرێمـەکانی ڕۆژهەلاتـی ئەنـەدۆل بخرێنـە ژێـر دەسـتەلاتی ڕاسـتەوخۆی ڕووسیاوە.

بڕوانکردن بەوەی کە ئـەم بەترمریکە ئەلقـە لـە گوێی ڕووس ئـەبووە و هەروا لە خۆیەوە ئەم داوایەی بەبێ ئاگایی ڕووس کردووە، مە حالە. بۆگۆس نۆبار ددانی بـەوەدا دەنـا کـە ئەرمەنـەکان گشت هیـوا و ئەمـەلێکیان ناوەتـە سـەر پشـتگیری ڕووس و ئامادەشـن کـە بـەپێی موچـیاری و ڕێنماییـەکانی حوکمەتی ڕووس کاربکەن.[١٠]

حوکمـەتی عوسمـانی هەسـتی کـرد کـەوا لـە مەترسـیدا، هـەتا بـەر لـە هـەردوو شـەڕەکانی بـەلکان و ئـەو خەسـارەتبارییەی تووشـی هـات. بـەلام نەیـدەتوانی لەبـەردەم پالەپەسـتۆ و گەلەکۆمـەکی ڕووس و بـاقی دەولـەتانی ئەوروپاوە خۆی ڕاگیرکات. تەنیا هیوای بەوە بوو کـە ئـەو یەکبوونـەی هێـزە

ئەوروپاییەکان شەق و پەقی تێبکەوێ، بۆیە ئەمانیش پلانێکی چاکسازی تایبەت بەخۆیانیان پێشنیار کرد، لەرێی باڵیۆزی عوسمانیەوە لە لەندەن (تۆفیق پاشا) بەریتانیەکانیان لێ ئاگادار کردەوە. داواشیان لە بەریتانیا کرد کە حەفدە راوێژکاریان بۆ رەوانە بکات تا سەرۆکاری جێبەجێکردنی ئەو چاکسازیانە بکەن لە گشت لایەکی سەڵتەنەکەدا، بەمەش بەوریاییەوە، قوماربازانە، مەبەدەنی مامەڵکردنی رۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵیان جیا لەگشت ناوچەکانی تری وڵات رەتکردەوە.

ئەم کۆمەڵە راوێژکارە دەبوو سەرپەرشتیاریان تێدا بووایە لە بوارەکانی خۆجێیەتی وەك: قەزایی، جیهازی دەرەك، کاروباری گشتی، کشت وکاڵ. لەمەش گرنگتر دەبوو پشکنەرێکی گشتی بەریتانی دانرایە بۆ لێپێچینەوە لە چۆنێتی کردن و ئەنجامدانی ئەو چاکسازیە پێویستانە. حوکمەتی عوسمانی پەیمانیش دەدا کە پێشنیارەکانی ئەو پشکنەرە گشتیە جێبەجێ بکات[11].

هەرچەندە بەریتانیا هەوپەیمانی رووسبوو بەڵام رووس پلانێکی لەو چەشنەی رەتکردەوە کە بەریتانیا تیا لە پێشتر بێ و خۆیان لێی بەدەر بن، ئەمە ناکۆکیەکی دیپلۆماسی هێنایە ئاراوە، رووسەکان وایان پێشنیارکرد کە: رووس بەهاوبەشی هەردوو شەریکەکانی لە (هاوپەیمانیە سێ لایەنەکەدا - فرانسا و بەریتانیا) ئەو چاکسازیانە دیاری بکەن کە نیاز وایە بکرێن. بەڵام ئاڵمان کە سەرەتای ئەوەبوو ببێتە تاکە هاوپەیمانێکی ئەوروپایی بۆ سەڵتەنەکە، ئەم پێشنیارەی وا دایە قەڵەم کە قەبووڵ نییە.

چارەنووسی پلانی چاکسازی لەنێو ئەو کۆبوونەوانەدا یەکلایی کرایەوە کە باڵیۆزەکانی ئەوروپا لە ئەستەموولی پایتەخت، لە حوزەیران/ یۆنیۆی ۱۹۱۰ دەیانکرد.

ئاڵمانەکان پێشنیاری ئەوەیانکرد کە با دەوڵەتی عوسمانیش نوێنەری خۆیی هەبێ لەو کۆبوونەوانەدا، ئەمە لە لایەنەکانی تردوە بەرهەڵستیەکی

توند کرا و ئیتر لێی بێدەنگ بوون. دەبوو هێزە ئەوروپاییەکان بڕیارەکان بدەن و ئینجا بیسەپێنن بەسەر عوسمانیەکاندا بەڵام بەبێ ئەوەی بڕیار لەسەر هیچ کامیان بدەن.

ڕووسیا پێشنیاری کرد کە هەر شەش هەرێمەکەی ڕۆژهەڵات (ئەرزڕۆم، ڤان، دیاربەکر - ئامەد، بەتلیس، مەعمورەی عەزیز — جەزیرە - و سیواس) بکرێنە یەك هەرێم، حاکمێکی مەسیحی عوسمانی یان ئەوروپایی بیبات بەڕێوە، ئەو حاکمە دەسەڵاتی بەڕێوەبردن و دەرەك و سوپایش، ئەگەر پێویستبوو، هەبێ، لیژنەیەکیشی بۆ دانرێ کە هەرکام لە مەسیحی و موسوڵمانەکان تیایدا وەك یەك نوێنەریان هەبێ.

دوای گفتوگۆ و مشتومڕێکی زۆری نێوان ئەم هێزە ئەوروپاییانە دواجار گەیشتنە ئەوەی بەرنامەیەك دانێن بەڵام بە دەستکاریکردنێکی کەمەوە، دەوڵەتی عوسمانی چی لە توانایدابوو کردی بۆ هەموارکردنی ئەو بەرنامەیە و دەستکاریکردنی، پێشنیاری کرد کە لە باتی حاکمێکی مەسیحی یان ئەوروپایی با چەند ڕاوێژکارێکی ئەوروپایی بۆ حاکمێکی عوسمانی دانرێ، بەڵام ئەوروپاییەکان لە ئاست ویستی عوسمانیدا خۆیان گێل کرد.

▪ ٢٥ حوزەیران/یۆنیۆی ١٩١٣ دەوڵەتەکەی (سەعید حەلیم پاشا) لەسەر (بەڵگەنامەیەك) ڕەزامەندی پیشاندا کە بریتیبوو لە ١٦ خاڵ سەبارەت پرۆژەی چاکسازی ڕۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵ. ڕوس لەو خاڵانە ناڕازی بوو بەڵام دوایی لە ٨ شوبات/ فەبرایری ١٩١٤ پەسەندی کردن. بەرنامە کۆتاییەکە بەشێوەیەکی بنەڕەتی دەقاودەقی ئەوەبوو کە پێشتر ڕووس پێشنیاری کردبوو، هەموارکردنە بنەڕەتیەکان بەوە دەشکایەوە کە هەرێمی (تەرابزون) بخرێتە سەر ئەو شەش هەرێمەی تر و دابەشکردنی ڕۆژهەڵاتی عوسمانی بۆ دوو بەشی (پشکنەری). ئەمەش بە پێچەوانەی یەك پشکنەری کە ڕووسیا وێنای دەکرد.

پشکنەری یەکەم (ئەرزڕۆم) دەکاتە بنکەی خۆی، کە: ئەرزرۆم، سیواس و تەرابزون دەگرێتەوە. پشکنەری دووەم (ڤان) دەکاتە بنکەی خۆی، کە: ڤان، بەتلیس، مەعمورەی عەزیز – جەزیرە - و دیاربەکر – ئامەد - دەگرێتەوە. بەرنامەکە گۆڕانکاریەکی تەواوی لە شێوەی حوکمی عوسمانیدا تێدابوو کە ئەو دوو پشکنەریانە پەیڕەوی بکەن:

- پشکنیارێکی ئەوروپایی دادەنرێ بۆ حوکمکردنی ئەو دوو هەرێمە تازەیە، حاکمەکە ئەوروپایی دەبێ، بەپێی ئەو لیستانە دادەنرێ کە دەوڵەتە ئەوروپاییەکان پێشکەشی دەوڵەتی عوسمانی دەکەن.
- پشکنیارەکان ڕێکخستنی ئیداری و مالیەتی (بەڕێوەچوونی) قەزایی و پۆلیس و دەرەك لە پشکنەریەکانیاندا بەڕێوەدەبەن. ئەمانە ڕێگەپێدراون کە لە بارەی حاکمان و کاربەدەستانی دەوڵەتەوە لێپێچینەوە بکەن، دەستەلاتیشیان دراوەتێ بۆ لابردنی بەرپرسان.
- ئەم پشکنەریانە لەو ناکۆکیانە دەکۆڵنەوە کە دەربارەی زەویوزارن و ئەرمەنەکان دەڵێن لێیان زەوت کراوە.
- بەیانە ڕەسمی و ئاگاداریەکان بە زمانە ناوخۆییەکان بڵاودەکرێنەوە، بۆ گشت هاوڵاتیان هەیە لە دادگە و فەرمانگە ڕەسمیەکاندا زمانی خۆیان بەکاربێنن
- ئەگەر پێویست بکات، هێزەکانی سوپا دەخرێنە ژێر فەرماندەیی پشکنەرەکەوە، گشت هاوڵاتیان بۆیان هەیە کە لەناو سنووری ئەو پشکنەریەی تیا دەژین خزمەتی سەربازی بکەن. بەتالیۆنەکانی سوارەی حەمیدییە دەکرێنە یەکەی یەدەگی سوارە بەڵام دەبێ چەکەکانیان لە عەمبار و جبەخانەکاندا بێ، لە پێویستدا نەبێ چەکیان نادرێتێ.
- بۆ پێکهێنانی کۆمەڵەیەکی گشتی لەهەر پشکنەریەك هەڵبژاردنێك ئەنجام دەدرێ، نیوەی ئەو کۆمەڵە گشتیە لە موسوڵمانان و ئەو نیوەکەی تری لە مەسیحیەکان دەبێ.

- دامەزراندنی بیرۆکراتەکان و فەرمانبەرانی ئیدارە بە گوێرەی هاوسەنگی دەبێ لەنێوان هەردوو تایەفەکەدا، نیوەیان لە موسوڵمانان و ئەو نیوەکەی تر لە مەسیحیەکان دەبێ.

ئەگەرەکو سیستمی پشکنەریەکان جێبەجێ بکرابا، سنوورێکی بۆ دەستبەسەراگرتنی عوسمانیان دادەنا لە رۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵدا. چونکە دەوڵەتی عوسمانی لە گشت دەستەڵاتێکی فەرمانڕەوایی دادەماڵێ، چ لە شێوە و چ لە ناوەڕۆکیشیدا. هێزەکانی دەرەك و سوپا، و بەڕێوەبردن و قەزا، یان با بگوترێ دیارترین دامەزراوەکانی حوکم، دەکەوتنە دەستی بیانیو کەسانی نامۆ، لەمەش گرنگتر فەرمانڕەوایی زوربەی دەخرایە لاوە. بەرپرسانی ئەوروپایی و رۆژنامەکانیان ئەم پرۆژە چاکسازیەیان بە (چاکسازیە ئەرمەنیەکان) وەسف دەکرد، جا واقیعیش هەروابوو.

لە هەڵبژاردنی ئەندامانی کۆمەڵەکاندا، هەر دەنگێکی مەسیحی یەکسان بوو بە سێ دەنگی موسوڵمان (خشتەی ۱ - ۷).

هیچ کام لە ئەرمەن و موسوڵمان یا ئەوروپاییەکان لەوە گومانیان نەبوو کە ئەم دوو پشکنریانە هەنگاوی یەکەمن بۆ یەکالاکردنەوەی ئەنەدۆڵی عوسمانی. پرۆژەی چاکسازی رۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵ لە جەوهەردا هیچ جیاوازیەکی تری نەبوو لەگەڵ ئەو پرۆژە هاوشێوانەدا کە لە رۆژهەڵاتی رۆمیلیا ( باشووری بولگارستان) و ناوچەی (جبل لوبنان) و دورگەی (کریت) جێبەجێ کران، لە گشت ئەم شوێنانەدا ئەوروپاییەکان عوسمانیەکانیان ناچار دەکرد کە (چاکسازیەکانیان) قەبوولبێ و پەسەندی کەن. وە ئۆتۆنۆمیەکی فرەوانتر بدەنە دانیشتوانی ناوچەکە، دواییش سەڵتەنەکە ئەو خاکانەی لە دەستدەچوو.

ئاخری و ئاقیبەش بولگاریا رۆژهەڵاتی رۆمیلیای خستە سەر خاکەکەی خۆی، یۆنانیش دورگەی کریتی برد بۆ خۆی، بەڵام جەبەل لوبنان سەربەخۆ بوو. رێکەوتننامەی (پشکنیارەکان) رێگەی تەختدەکرد بۆ ئەوەی

عوسمانێکان ناوچەیەکی تریان لە کیسچێ.

خشتەی ١ - ٧ دانیشتوان و نوێنەرایەتیان لە هەردوو پشکنیارەکەدا (موسوڵمانەکان):

| هەرێم | ژمارەی موسوڵمانان | کۆی دانیشتوان | ڕێژەی سەدی موسڵمان | ڕێژەکەیان لە کۆمەڵەی گشتیدا | ڕێژەکەیان لە بیرۆکراتیەکەدا |
|---|---|---|---|---|---|
| تەرابزون | ١,١٧٨,٦٥٥ | ١,٥٠٥,٤٩٠ | ٧٨ | ٥٠ | ٥٠ |
| سیواس | ١,١٩٦,٣٠٠ | ١,٤٧٢,٨٣٨ | ٨١ | ٥٠ | ٥٠ |
| ئەرزرۆم | ٨٠٤,٢٨٨ | ٩٧٤,١٩٦ | ٨٣ | ٥٠ | ٥٠ |
| کۆی پشکنەری باکوور | ٣,١٧٩,٢٤٣ | ٣,٩٥٢,٥٢٤ | ٨٠ | ٥٠ | ٥٠ |
| ڤان | ٣١٣,٣٢٢ | ٥٠٩,٧١٧ | ٦١ | ٥٠ | ٥٠ |
| بەتلیس | ٤٠٨,٧٠٣ | ٦١١,٣٩١ | ٦٧ | ٥٠ | ٥٠ |
| مەعمورە - جەزیرە | ٥٦٤,١٦٤ | ٦٨٠,٢٤١ | ٨٣ | ٥٠ | ٥٠ |
| دیاربەکر - ئامەد | ٦٩٨,٩٨٥ | ٧٥٤,٤٥١ | ٧٩ | ٥٠ | ٥٠ |
| کۆی پشکنەری باشوور | ١,٨٨٥,١٧٤ | ٢,٥٥٥,٨٠٠ | ٧٤ | ٥٠ | ٥٠ |
| کۆی گشتی | ٥,٠٦٤,٥١٧ | ٦,٥٠٨,٣٢٤ | ٧٨ | ٥٠ | ٥٠ |

سەرچاوە: Justin Mc carthy, Muslims and minorities (New York university press ١٩٨٣). p ١١٢

## • کاردانەوەی کوردەکان

زۆربەی دانیشتوە کوردەکان دەشێ بێ سەواد و بێ ئاگابووبن لە سیاسەی نێودەوڵەتی، بەڵام سەرەك خێڵەکان زۆرزان و بەباشی لەوەی لە دەوروبەریان ڕویدابوو گەیشتبوون، دەرگیان بەوە کردبوو کە ئەوە نابووتی عوسمانیکانە وا دەوڵەتی ناچارکردووە ئاوها سیستمێکی قەبووڵبێ کە ببێتە هۆی کەمکردنەوە یا وێرانکردنی دەستەڵات خۆی و سەرەك خێڵەکانیش.

ئەم سەرەك خێڵانە هیچیان بۆ نەمابۆوە، لە بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان، جگە لە بەرهەڵستیکردنی ئەو گۆڕانکاریانەی کە سەپێنرابوون بەسەر دەوڵەتدا. بەڵام سوودە شەخسیەکانیان تەنیا هۆکار نەبوو بۆ بەرهەڵستی کوردەکان. هاوڵاتیە کوردە ئاساییەکان لە هەرێمێکی وەك ڤاندا و لەو گۆڕانکاریانەی تیا ڕوویان دەدا ئەوەیان دەبینیەوە کە زنجیرەیە ڕوداوەو لە کۆتاییدا دەبێتە هۆی ماڵ کاولییان:

دەستەڵات چۆتە دەست حوکمەتێکی (کافر) کە لە کۆمەڵەی (ئیتیحاد و تەرەقی) پێکهاتووە.

• ئەم حوکمە تازەیە ئەرمەنیەکانی لا لەپێشترە، بەتایبەت ئاشناقێك کە دوژمن بە کوردە.

• دەوڵەت گەلێ ڕێوشوێنی توندی دژ بە کورد گرتۆتە بەر، کەچی ئەمەی بەرامبەر بە یاخیبووە ئەرمەنەکان پەیڕەو نەکردووە.

• ئەو گۆڕانکاریانەی لە دەوڵەتدا هاتوونەتە دی هەڵوێست و پێگەی عوسمانیەکانیان کز کردووە، ئەمانە بەهۆی شەڕکردن لەگەڵ هەوادارە کۆنەکانیان گەلێ زەویوزاری باشیان لەدەستخۆیان دا، ئەم کارەش هەرگیز لەسەردەمی سوڵتان (عەبدولحەمید)دا ڕوی نەدەدا.

• ئەوروپاییەکان دەوڵەتیان ناچار دەکرد کە ئەو دەستەڵاتەی هەیەتی

بەسەر کوردەوە تەسلیم بە ئەوروپایی و ئەرمەنەکانی بکات (یانی کوردەکان بخاتە ژێر دەستی ئەوانەوە. )

لەوانەیە لە رۆژەلاتدا کوردەکان لەو ئالیە سیاسی و دیپلۆماتیە نەگەن کە ببووە هۆی ئەو کارەساتەی بەسەر عوسمانیەکاندا هاتبوو، بەلام شوێنەوارە ناهەموارەکانی ئەو کارەساتەیان لە هەرێمەکانی خۆیاندا بەچاو دەدی، هەرچەندە لە رەوشی خۆیشیان نەدەگەیشتن بەلام هەندێ لە پروپاگەندەچیە کوردەکان دەهاتن و تێیان دەگەیاندن[٣].

## ● عەشایرەکان و دەولەتەکەی کۆمەلەی (ئیتیحاد و تەرەقی)

هەرچەندە سەرکردەکانی عەشایرە کوردەکان هەرگیز پشتگیری حوکمەتی مەرکەزییان نەکردووە، بەلام بەتایبەت لەو حوکمەتە تازەیەی کۆمەلەی (ئیتیحاد و تەرەقی) نیگەرانبوون، یەك لەو هۆکارانە ئایینیەکی روتبوو، سەرکردە ترکە تازەکانیان بە ئاییندار دانەدەنا، زۆر کەرەت کوردەکان ئەوانەیان بە (کافر) ناو دەبرد، چونکە نموونەیەکی ئەوروپاییان هێناوەتە ناوناوانەوە و بەلای ئەو کوردانەوە ئەوانە دەستبەرداری (موسولمانیەتێکی راستەقینە) بوون و لە دین وەرگەراون[٤].

لە سونگەی بۆچونێکی عەمەلی زیاترەوە، ئەم سەرکردانە بەرهەلستی ئەو کارانەی حوکمەتی کۆمەلەیان دەکرد کە بەو ئامانجە بوو دەستەلات بخەنە دەستی دەولەتەوە. بەلای سەرکردە عەشایرەکانەوە حوکمەتێکی نموونەیی ئەوەیە کە رازیبێ بەوەی واز لە سەرکردە و سەرەك خێلەکان بێنێ کە چۆن حوکم دەکەن بابیکەن، دەستیان بەرەللاکات، بەبێ هیچ یاخیبوونێك.

بەلام ئەم جۆرە حوکمە ماوەیەکبوو لە رۆژەلاتدا باوی نەمابوو، هەتا بەر لە پێکهێنانی حوکمەتە دەستووریە تازەکەش.

لەسایەی حوکمی کۆمەڵەی (ئیتیحاد و تەرەقی)یەوە گۆڕانکاریەکان بە گورجی بەرەو شێوازی نوێ دەچوون، بەڵام ئێستە حوکمەت نیازی وایە حوکم تەسلیم بکات [٥].

چەند بەتالیۆنێ نێررانە ڤان و ئەرزرۆم و مووسڵ، لەمانەشەوە بەرەو ناوچە گوندنشینەکان، ئەمەش بەمەبەستی گەیاندنی دەستەڵاتی دەوڵەت بەو جێگە دورەدەستانە، لە کەسیش نهێنی نەبوو کە باجگرەکانی دەوڵەت زوو بە زوو دوی ئەو هێزانە دەکەون.

سەرکردەکان وایان دەدایە قەڵەم کە ئەو گۆڕانکاریانەی لە هەیکەلی فیرقەکانی سوارەی حەمیدییەدا هاتوونەتە دی، ئامازەن بۆ ئەو گۆڕانانەی کە نفوز و دەستەڵاتیانی دامالیوە. سوڵتان (عەبدولحەمیدی دووەم) ئەو فیرقانەی پێکهێنا، ئەمەش بۆ ڕێکوپێککردنی سوارە کوردەکان تا ببنە یەکەیەکی ئەسپسواری هاوشێوە بەسەربازە قۆزاقەکانی ناو سوپای ڕووس، هەریەك لەو ٦٦ بەتالیۆنەی کە لێی پێکهاتبوو ڕەنگدانەوەیەکی ئەو عەشرەتەی خۆیبوو کە لێوەی دروستببوو.

ئەرکی ئەم بەتالیۆنانە لە ئەرکی فیرقە چەکدارەکانی حوکمەت دەچوو کە سەر بە نفوزی سەرکردەکانیان بن لەگەڵ ئەرکی فیرقەیەکی ئەسپسواری ڕێکوپێك. ئەو تفەنگانەی بەسەر ئەفرادەکانی سوارەی حەمیدییەدا دابەش کرابوون، چەك و جبەخانەی ناو عەشایرەکانی تازە کردەوە، سەرەڕای ئەمە ئەو نازناو و لەقەبە سەربازیە عوسمانیانەی کە بە سەرکردەکانیان دەدرا ئاستێکی بەرز و برێ قەدر و حورمەت و شەرمەفمەندی و ڕێزی دەدانێ.

خۆ هەتا ئەوانەش کە چووبوونە سەر بیروباوەڕی شۆڕشگێڕان ڕێزیان لەو دەستکەوتانە دەگرت کە سوڵتان/ خەلیفە دابووینێ. لەگەڵ ئەمەشدا ڕێکخستنی سەربازی لەناو ئەو بەتالیۆنانەدا زۆر لاوازبوو، حوکمەتە تازەکە بە حەق و هەقیانەت بەشێکی زۆری ئەم لاوازیەی حەمیدییەی دەدایە پاڵ

ئەو ڕواڵەت و سیما عەشایریەی کە پێیانەوە بوو. ویستی سەرلەنوێ ڕێکیان خاتەوە تا ببنە ٢٤ بەتالیۆن و بەپێی ناوچەکانیشیان دەستنیشانیانکەن، وە چەسپاندن و گردکردنەوەی یەکە عەشایریە بچووکەکانیش لەژێر سەرکردەیەکی تازەدا. ئەمە سەرکردەکانی ئەو یەکە عەشایرانەی نیگەران کرد و هاوکاریکردنی سیستمە تازەکەیان ڕەتکردەوە، ئەو سیستمەی کە بە کردەوە سوارەی حەمیدییەی مەحووکردەوە.

لە ئەنجامی هەڵوەشاندنەوەی ئەو ڕێکخستنە غەیرە نیزامیەدا ئەو سەرکردانە بەشێکی گەورەی دەستەڵاتە قانوونیەکەی خۆیان لەدەستچوو، بێجگە لە هەندێ لەو گەنجینە چەکانەی لەلایان عەمبارکرابوو، جارێکی دی وایان لێکدایەوە کە حوکمەت هەڵوێستێکی دوژمنکارانەی بەرامبەر بە دەستەڵات و نەریتە عەشایریەکانیان وەرگرتووە[٦]. جا لەوانەیە یەك لە هۆکارەکانی شێتگیری کوردەکان و ڕاپەڕینیان لەوەدا بووبێ کە حوکمەت بەرگریشی لە مافەکانی ئەرمەن دەکرد.

حوکمەتە تازەکە کەوتە پیشاندانی نارەزاییەکی توند بەرامبەر زەوتکردنی زەویوزاری ئەرمەنەکان لەلایەن عەشایرەکانەوە، لەهەندێ جاردا، ئەو زەویانە لە باتی قەرز و قۆڵە دەستیان بەسەردا گیرابوو، هەر کام لە سەرۆك خێڵەکان و دەوڵەمەندە موسوڵمانەکان و ئەرمەنیش داوای ئەو قەرزانەیان دەکرد[٧]. بەڵام زورێکی ئەو زەویانە لە ڕێی ناشەرعیەوە زەوتکرابوون، کوردەکان وایان دادەنا کە زەوتکردنی ئەو زەویانەی خاوەنەکانیان هەڵاتوون بۆناو ڕووس و شوێنانی تر، لەسەروەختی شۆڕش و هەراکانی ساڵانی نەوەدەکاندا، کارێکی شەرعی و دادپەروەرانەیە، چونکە ئەو خاوەن موڵکانە بە (خائین) دەژمێررێن سا (بە هەقبێ یان ناهەق).

سەربازان و دەرەکی عوسمانی دەستیان کرد بە داگیرکردنەوەی ئەو موڵکانەی لەودبەر کوردەکان داگیریان کردبوو، بە زەبری هێز گێڕانیانەوە

بۆ خاوەنە ئەسڵیە ئەرمەنیەکانیان. هەتا بەهێزترین عەشرەتێکی کوردی وەك ( حەیدەرانلی) ناچار کرا کە ئەو گوندانەی زەوتی کردبوو و ئەوانەش کە لە هەراکانی ئەوەدەکاندا زەوتیان کردبوو بیانگێڕێتەوە[18]. (سەعید بەگ) مەجبورکرا کە ژمارەیە لەو موڵکانەی دەستی بەسەردا گرتبوو بیانگێڕێتەوە، ئەمە بووە هۆی یاخیبوونی[19].

بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ژمارەیەکی زۆری زەوی هەر بەدەست سەرەك خێڵەکانەوە مایەوە، بە ڕوونیش دیاربوو کە دەوڵەت دەستی کردووە بە گۆڕینی (ماف) سەرکردە تەقلیدیەکان لەوەی کە چیان بوێ بە ئارەزووی خۆیان بیکەن لە داگیرکردن و زەوتکردنی زەوی ئەم و ئەو.

لە ١٠ کانوونی دوو/ یەنایری ١٩١٤ (سمیس)ی کونسوڵ ڕەوشی ڤان لە ڕۆژانی (تەحسین بەگ)دا ، کە حاکمێکی پێش هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەرمەنەکانبوو، ئاوا باس دەکات:

(( لەوەتەی – تەحسین بەگ - ئەم والیەی نیستە، هاتووە، ڕێوشوێنی زۆر توندی بەرامبەر چەتە و ڕێگرە کوردەکان گرتۆتەبەر، ئەمەش بۆ ئەوەی بیانووی ئەرمەنەکان ببڕێ بۆ سکاڵاکردن (بیانووی زەوتکردنی موڵك و ماڵ و ئازەڵ) ، لەوە دەچێ سیاسەتی والی بەرامبەر ئەرمەنەکان دادپەروەرانەبێ، کەچی ئەوان لەڕێی توانج و لاقرتێ دوژمنکارانەکانیانەوە، ڕەخنە تفت و تاڵەکانیانەوە لەناو ڕۆژنامەکاندا ئەرکەکانی سەخت و گران دەکەن. لە جەولەیەکی ئەم دواییەیدا بۆ (هەکاری - سانکاك) مەسەلەی کوردەکانی (مانهوران) ژمارەیان خۆی دەدا لە دوو هەزار و بۆ چوار مانگ دەچێ لە ئێرانەوە هاتوون و لە گوندە ئەرمەنەکاندا نیشتەجێ بوون. ئەو گوندانەی پێ چۆڵکرد ن و بەسەر ئەو گوندە کوردانەی سەر سنووردا دابەشی کردن[20].))

ئەو سەرکردە خێڵەکیانە، ڕێوشوێنەکانی دەوڵەت کە دەیگرتنەبەر و لە

قازانجی ئەرمەنـەکانبوو، وەك خۆیـان نـەدەدی کـە تـەنیا لەدەستچوونێکی سادەی چەند زەویوزارێ بوو، بەڵکو وایان لێکدەدایـەوە کـە ئـەوە سـەلمێنەرێکە لەبۆ ئـەوەی کـە ئەرمـەن، بـە سـەرکردەیی شۆڕشگێڕەکان، بـوون بـە لایـەنی دەستەڵاتدار.

بـە داهـاتنی سـاڵی ١٩١٢ زۆر لـەو عەشـایرانە بوونـە خـاوەن سـەرکردەی ڕۆشـنبیری وا کـە خوێنـدن و زانسـتەکانیان لـە ئەسـتەموونێ و شـوێنانی دی وەرگرتبـوو، لـەباتی پیـاوانێکی لادێیـی سـادەی نەخوێنـدەواری ئەشـارەزا لـە سیاسەی جیهانیدا، ئەوانە لە شیکردنەوەکانیاندا بۆ ڕەوشی سیاسی ڕاستیان دەبێکـا: دەرکپێکردنـی خاڵــە لاوازەکــانی عوسمانیــەکان وا پاڵیــان بــە ئەوروپاییەکانەوە دەنا کە جۆرە سیستمێ بسەپێنن بە سەریاندا کـە لاگیربـێ بە ئەرمەنەکان لە ڕۆژهەڵاتدا، لەوانەشە بەرەو ئۆتۆنـۆمی یـان سـەربەخۆییان بەری.

ئەو سەرکردانە پەییان پەوەش برد کە لـە گشت ئـەم گەمانـەدا چ لایـە زەرەرمەنـدە.

## ● شۆڕشەکانی کورد

لەوانەیە یاخیبوونەکەی (سەعی بەگ) نموونەیەکبێ لەو کۆسـپانەی کـە عوسمانێکان لەکاتێکدا دەیانویست چارەسـەری مەسـەلەی زەوتکردنـی زەوی ئەرمەنـەکان بکـەن، تووشـیان هـات. ئەمـە لەلایـە، گێڕانـەوەی زەویـەکان بـۆ ئەرمـەن دەستخۆشـی ئەوروپاییـەکان و ئەرمـەنی لـێ کەوتـەوە. هەرچـەندە تاشناق ڕۆژێ نەبوو کە نەڵێ: دەوڵەت کارێکی ئـەوتۆ ناکات بـۆ یارمەتیـدانی ئەرمەنەکان. لەلایەکی ترەوە ، ئەو کارانەی دەوڵەت دوژمنایەتیـەکی ئێجگار توندی دەهێنایە کایەوە، گێڕانـەوەی مولکـە داگیرکراوەکـان بێگومـان کـارێکی شـەرعی و ئـەخلاقی بـوو، بـەڵام سـەرکردەی عەشـایرە کوردەکـانو ئـەو

موڵکدارانــەی موڵکــەکانیان لەدەســتدابوو بــەو جــۆرە لــە مەســەلەکەیان نەدەڕوانی. کوردەکان تەنیا سەرنجی ئەوەیان دەدا کە تاقە کێشەیە کە چارە کرابــێ مەســەلەی گێڕانــەوەی زەویەکانــە بــۆ ئەرمــەن، بــەڵام ئەوانــەی لــە کوردەکان زەوتکرابوو، نەگێڕدرابوونــەوە. هــەروا بە وردی ســەرنجی ئــەوەیان دەدا کــە دەســتەلاتی سیاسی ســەرکردە تاشــناقێکان و ســەرکەوتنەکانیان ڕۆژ لــەدوای ڕۆژ پــەرە دەســێنێ، ئەمــە بــە پــاڵ دەســتێوەردانی ئــەوروپاوە تــا دەســتەڵاتەکە بــۆ ئەرمــەن زامنکــات، ئەمانــە بوونــە هــۆی یــاخیبوون و تەشەنەکردنی هەڵمەتی پڕوپاگەندەی دژ بــە حوکمــەت و ئەرمــەنیش، گشت لایەکی گەلی کوردیش، نەك تەنیا سەرکردە کوردەکان، بەبیر ئەمــەوە چــوون و پێیان خۆشبوو.

ئەو کاری دزی و یاخیبوونەی کە (ســەعی بــەگ) دەیکــرد دەرەنجامێکی ڕاســتەوخۆی سیاســەی دەوڵــەتبوو کــە بریتیبــوو لــە گێڕانــەوەی موڵکــە داگیرکراوەکان. کە دەرەکەکان هاتنە بارەگەکەی لە (ئیرجیك) تا فەرمانی پێ بکەن بۆ گێڕانەوەی زەویەکان بۆ ئەرمەن، سەعی بەگ بەرگری کــرد و دوو پۆلیسیشی لێ کوشتن، لەباتی ئەوەی چاوەڕوانی سزا بێــت هــەڵاتو خــۆی ون کرد، ئینجا هەر خۆی سەرکردەیی پەنجا بۆ حەفتا پیاوی دەکــرد و هێزیشــی لە (یوسف حەیدەرانلی) دۆستیەوە و (سمایل) کــە خزمــی (ســەعی) خۆیبــوو، بۆ هات. جگە لە هێزی ڕێگرێکی تر بە ناوی (میر میهی) .

هێزەکــانی ســەعی بــەگ بــەردەوام پــەلاماری گونــدی مەســیحی و موسوڵمانەکانیان دەدا و باج و سەرانەیان لێ دەسەندن. کــەڕەتێك هێرشــێکی کردە سەر شارێکی گەورەی وەك (غیفاش)، سەربازەکان ئابڵووقەیانــدا، بــەڵام توانی هەڵبێ[٣١] .

لە ساڵی ١٩١٤ هێزەکانی عوسمانی سەعی بەگ و چەن چــەکدارێکیان لــە باکووری ڕۆژاوای ئێراندا، نێزیك بە سنووری ترك، کوشت[٣٢] .

بە ئاسانی ناتوانرێ سەعی بەگ وەك ناوێکی تر بۆ لیستی ئەو چەتە و ڕێگرانەی تر زیادکرێ. ئەم هەر دز و جەردەیەك نەبوو بەڵکو کەسێکی یاخیبوو لە دەوڵەت و دژ بە حوکم.

دیسان هەروا بە ئاسانی نازانرێ ئایا ئەو زەویانەی کە حوکمەت لە سەعی بەگی زەوت کردبوو بەڕاستی لە ئەرمەنی دزیبوو؟، ئەو وای دادەنا کە ئەو یەکێکە لەوانەی بوونەتە قوربانی دەستی سیاسەتێکی دوو فاقی لەپێناو و بۆ ئارامکردنەوەی ئەرمەن بەڵام لەسەر حیسابی کورد. هێرش و پەلامارەکانی هەماهەنگبوون لەتەك هەڵمەتێکی ڕاگەیاندنی بەردەوامدا دژ بە دەوڵەت، زۆر کەرەتیش ئەو هەڵمەتە لەلایەن خەڵکەوە گوێی لێ دەگیرا.

کوردەکان، بەتایبەت تاکی عەشایرەکانیان، وایان هەستدەکرد کە دەوڵەت لە دژی ئەمان پاڵی داوە بە پاڵ ئەرمەنەوە، بۆیە (سەعی بەگ) جۆرە بۆچوونێکی دەردەبڕی کە زۆری تریش هەمان بۆچوونیان هەبوو. بێگومان هەندێ لەو یاخیبووانە ئامادەبوون کە لاوازیەکەی عوسمانیەکان بڕەخسێنن بۆ بەرژەوەندی خۆیان، ئەو سەرکردە عەشایرانەی کە تێدەکۆشان بۆ ئۆتۆنۆمی و فراوانکردنی پانتایی دەستەڵاتیان، دیاردەیەکی دەگمەنیان پێك نەهێنابوو، بەڵام ئەوەی بەر لە هەڵگیرسانی یەکەم جەنگی جیهانی گۆڕابوو ئەو پاڵپشتی و کۆمەکیەی ڕووسەکانبوو لە ڕۆژاوای ئێراندا کەلەوێ ناوچەیەکی بێ ترس و ئەمینی بۆ ئەو یاخیبووانە هێنابووە دی، تیایدا دەیانتوانی ڕیزەکانی خۆیان ڕێکخەن و هەڕەشەش بن بۆسەر سەڵتەنەکە.

بەر لە هێرشەکەی ڕووس بۆ سەر ئێران لە ١٩٠٩، عوسمانیەکان هەندێ جار دوی یاخیبووەکان دەکەوتن بۆناو خاکی ئێران، لە (ڕاونانێکی خوێناویدا)، حوکمەتی فارسیش (بەدەگمەن) یاخیبووانی لای خۆیی ڕاودەناو دەیشکاندن. دەوڵەتی فارس بە فیعلی چووبووە ژێر دەستی ڕووسەوە،

عوسمانێکانیش نەیان دەتوانی سنووری ئێران وەك جاران ببەزێنن، تا لەگەڵ ڕووسەکان لووتیان نەبێت بە لووتەوە و نەکەونە شەڕەوە.

(سمایلی سمکۆ) سەرکردەیەکی عەشایری شوکاکەکانبوو و هەروا ڕابەری شوکاکی ناو ئێرانبوو، زەویوزارەکانیان سنووری تێپەڕاندبوو بۆ ناو (سارای)[٢٣]. لە ساڵی ١٩١١ سمکۆ و پیاوەکانی شەڕێکی قورسیان دژ بە سەربازە عوسمانێکان کرد، ئەفرادەکانی عەشرەتەکەی دەیانویست بە ڕێگەی (خۆی - سارای)دا سنوور ببڕن و پەلاماری ڤان بدەن، ناچارکران بگەڕێنەوە، بەلام هەردوولا زیانێکی ئێجگار زۆریان لێ کەوت.

لە ساڵی ١٩١٣ دیسان سمکۆ پیاوەکانی بەمەبەستی هێرشێکی گەورە کۆکردەوە، بەلام تەقەللاکەی ئەمجارەشی بەرەنگاربە هێزێکی گەورەی عوسمانێکان بۆوە، عوسمانیەکان گلەیی ئەوەیان دەکرد گوایە ڕووسەکان کە ڕۆژاوای ئێرانیان گرتبوو، پشتگیری سمکۆ دەکەن[٢٤]. شتێکی بەلگەنەویستبوو، کە ئەوانیش لەم باسەیدا متەقیان لەخۆ بڕیبوو[٢٥].

تەماحەکانی سمکۆ ئەو سنوورەشی تێپەڕاندبوو کە تەنیا سەرکەوتنە ڕوتەکانی وەك سەرکردەیەکی تەقلیدی بەئەنجام بگەیەنێ، بەلکو پلانەکەی کە دەیان ساڵبوو کاری لە پێناودا دەکرد، بریتیبوو لە یەکخستنی گشت عەشرەتە کوردەکان بە ڕابەرایەتی خۆی و ئینجا بەرەوڕووبوونەوەی هەردوو دەوڵەتی فارس و عوسمانی.

ناتوانرێ پەی بەوە ببرێ کە ئاخۆ نیازی دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی بووە یاننا، بەلام جێی گومان نییە کە دەیویست دەستەلاتێك بگرێتە دەست.

سمکۆ ئامادەیی ئەوەی تێدابوو کە پشتگیری ڕووس بڕەخسێنێ بۆ هێنانەدی مەبەستەکانی. لەکاتی شۆڕشەکەی ئێراندا سەرەتا دایە پاڵ شۆڕشگێڕان دژ بە دەوڵەت بەلام زۆری نەبرد سەنگەری گواستەوە و چووە

لای ڕووسەکان، ڕووسەکانیش هەر یارمەتی سمکۆیان نەدەدا، بەڵکو هەندێ پلەی ئیداریشیان پێ سپارد بارەگەی یەکەمی لە (قوتور) بوو، بەلام لە ساڵی ١٩١٢دا ڕووسەکان داوەتی (تەفلیس)یان کرد، لەوێ نیشانە و مەدالیای سوپاسگوزاری و ئافەرینیان بەرامبەر خزمەتەکانی کە بۆ ڕووسیای کردبوو، پێ بەخشی. دواییش لە (شاری) پلەیەکی ڕەسمیان دایە و خۆی و پیاوەکانی چوونە ئەوێکانێ، براکەشی لە قوتور لە جێگەکەی دانیشت[٣٦].

پاش ئەو هەوڵەی بۆ هێرشکردن لە ساڵی ١٩١٣ و سەرنەگرتنی، بەلام سمکۆ هەر مەترسیەکی سەر سنوور بوو بۆسەر دەوڵەتی عوسمانی، کەمجاریش شەڕی ڕاستەوخۆی دەکرد (ڕووسەکانیش کەمجار هاوکارییان دەکرد) *بەلام هەواداران و پیاوەکانی پەلاماریان دەدا و شەڕەکان تەواو دەیان کرد، کەچی لە یاخیبوونی خەڵکانی تردا بەشداریان نەدەکرد. لەوانەیە گەورەترین ئاسەوارێکی خراپ لە کارەکانی سمکۆدا بۆسەر ڕێکخستنی سیاسی عوسمانی لەوەدابووبێ کە ببووە نموونەیەکی سەرکەوتوو تا چاوی لێ بکرێ لە سونگەی ئەو هاوکاریەیەوە لەگەڵ ڕووسەکان و دواییش تەقەللادانی بۆ ئەوەی نەهێڵێ شوکاکەکان لەجەنگدا یارمەتی عوسمانیان بدەن.[٣٧]

(شێخ تەها) کە سەربەماڵباتی (شەمدینان)ە لە بەرەبابێکی سەرەك عەشایری ئەوتۆیە کە بەردەوام ڕێز و ویقارێکی ئایینیان هەبووە، بەلام باپیرە گەورەی (شێخ تەهای نێری) لە سام و هەیبەتدا هیچی لەم کەمتر نەبووە، ڕابەری دەروێشە موسوڵمانەکانی (نەخشی)بوو، دەورێکی باڵای هەبووە لە بلاوکردنەوەی ڕێبازی نەخشیدا لە باشووری ڕۆژهەلاتی ئەنەدۆڵ.[٣٨]

(شێخ عوبێدوڵلا)ی باپیری هەر لە دەریاچەی ڤانەوە تا دەریاچەی ورمێ خاوەنی هەوادارانێکی بنکە فرەوانبوو، زوربەی دانیشتوانی ڕۆژاوای

---

* ئەمە بە پێچەوانەی ئەوەیە کە پێشتر باسکرا. ((وەرگێڕ))

ئێرانی کردبووە خۆی، جگە لە شوێنکەوتوانی لە ناو سەڵتەنەی عوسمانیدا. بەڵام لە ئاخری لە ١٨٨١دا بەدەستی فارسەکان شکستی هێناو ئینجا عوسمانێکانیش دەستگیریان کرد[٢٩].

(محەممەد سادق) کە کوڕی (عوبەیدوللا)بوو، بەدرێژایی ساڵان ببووە سەرچاوەی گیروگرفت بۆ عوسمانیەکان، پەلاماری نەستووریەکانی دەدا و هاوکاری قاچاغچیە ئەرمەنەکانی دەکرد لە ئامدیوکردنی چەکدا و بەردەوامیش پەلاماری دانیشتوانی دەدا.

کە (محەممەد سادق) لە ساڵی ١٩٠٧دا مرد، (تەها)ی کوڕی لەجێی خۆی دانا، بەڵام سەرەتا دەبوو تەها شەڕ و ناخۆشیەکانی ناو بنەماڵەکەیان لەسەر سەرکردەیی یەکلاکاتەوە، بۆیە تا نەبووە سەرکردەی هەقەتی شۆڕشەکەی دژ بە عوسمانیەکان بەرپانەرکرد، دوایی سەربازەکان بەگیریان هێناو ناچار رووی لە ئێران کرد.

لە نیسان /ئەپریلی ١٩١٢ گەیشتە (ورمێ) کە ئەوکات لەژێر دەستی رووسەکاندا بوو، دەڵێن گوایە سی بۆ چل هەزار چەکداری کوردی لەتەکدا بووە و ئامادەی فەرمانی ئەوبوون. دیارە ئەم ژمارە قەبەیە پێوەی نراوە و زیادەڕۆییە، بەڵام ئەوەی جێی دوو دڵی نییە ئەوەیە کە گاڵتە بە هێز و توانای نەدەکرا. عوسمانێکان لێبوردنیان بۆ دەرکرد، بەڵام ئەو هەر لە ئێراندا مایەوە و لە شۆڕشەکەیدا بەردەوامبوو[٣٠].

گشت هەوڵ و کۆششەکانی عوسمانێکان بۆ گێڕانەوەی شێخ تەها بۆ باوەشی سەڵتەنە و گەیشتن بە ئاشتییەك لەگەڵیدا بەباچوو، شاند و نێردراوەکانی دەوڵەت لە هاتوچۆدا بوون، بەڵام بێ سەمەر. دەڵێن گوایە رووسەکان یارمەتی عوسمانیەکانیان نەدەدا لەبۆ هێورکردنەوەی رەوشەکە و ئاوکردن بە ئاگرەکەدا[٣١].

عەشرەتی (بارزان) زۆر گەورە نەبوو، بەڵام وەزن و بایەخی لە جێگە و پێگەی سەرۆکەگەیانەوە بوو، شێخێکی رێزدار و بەویقار، سەرۆکاری کۆمەڵێ

لە هەوادارانی (نەقشبەندی)ی دەکرد.[٣٣]

لە واقیعدا ژمارەیەکی زۆر لە ئەندامانی عەشرەتی بارزان لەو کوردانە بوون کە لە چلەکانی سەدەی نۆزدەدا دەهاتنە بارزان بۆ زیارەتکردن، ئەو ناوبانگە ئایینی و رێزە وزۆرەی بە (شێخ عەبولرەحمان)ەوە بوو، یەکەم شێخیان، ئەو موریدانەی کێش دەکرد.

کە عوسمانێکان سەربەخۆیی میرنشینە کوردەکانیان کۆتایی پێ هێنا، لەنێو کوردەکاندا دەستەڵات کەوتە دەست سەرکردە گەلێکی وەك بنەماڵەی (بارزان)، کە ئەوانیش هەردوو پلە و ئاستی ئایینی و حیکمەی سیاسیان پێکڤە گونجاند و رێکیان خست.

(شێخ عەبدوسسەلام) کە لە ١٩١٠دا شێخی بارزان بوو، شوێنکەوتوانی بەسەرکردەیەکی ئایینی و سیاسی دەڤەرەکەی خۆیانیان دادەنا، ئەو دەڤەرەی کەوتبووە رۆژهەڵاتی (ئامێدی)یەوە لەسەر سنووری نێوان هەردوو هەرێمی (موسڵ) و (ڤان). پەیوەندیەکی توندوتۆڵ و بەرفرەوان (شێخ عەبدوسسەلام) و دەوروبەرەکەی بەستیۆوە بە کورد و مەسیحیەکانی ئەو ناوچەیەوە، ساوەك هاوپەیمان و دۆست یان وەك دوژمن.

بەهۆی سروشتی سەخت و دژواری ناوچەکەوە دەوڵەت دووچاری نارەحەتیەکی زۆر ببوو لەو هەوڵانەیدا بۆ دەستبەسەراگرتنی ناوچەکە، بە بزنەرێگەیەکی تەسك و تروسکەوە گوندەکان بەیەك دەگەیشتن. بەر لە هەردوو شەرەکانی بەڵکان شێخ عەبدوسسەلام دەستی پێ کرد، سەرزارەکی شێخ دژ بەو عەلمانیەتەی حوکمەتەکەی (ئیتیحاد و تەرەقی) وەستایەوە، هەرچەندە فرەوانکردنی پانتایی دەستەڵاتی دەوڵەت و سنووری باج سەندنی دەوڵەت ناوچەی نفوزی ئەویشی دەگرتەوە. جا ئەمە دوو هۆکاری بنەرەتی بوون بۆ بەرپاکردنی شۆرشەکەی. ئیتر ملکەچکردنی بۆ دەستەڵات رەتکردەوە و لە ١٩١٠دا باجی نەدەدا بە دەوڵەت.

لە موسڵەوە هێزەکانی عوسمانی بۆ هێرش بردنە سەر شێخ دەستیان بە

جووڵەکرد، بەڵام ئەو و پیاوەکانی پەنایان برد بۆ نەستووریەکان لە (تیاری) کە نیمچە حوکمێکی فروانی خۆیانیان هەبوو لەسنووری دەڤەرەکەیاندا. چونکە هێزە عوسمانیەکان نەیان دەویست یان تۆ بڵێ نەیان دەتوانی، رووبەرووی هێزی نەستووری و بارزانیەکان ببنەوە[٣٣]. جا وەستان تا لە مانگی نادار /مارسی ١٩١٣دا هێرشێکی تریان دژ بە شێخ دەستپێکرد، ئەدەیان زیاتر لەوەی پێشتر سەرکەوتوتر بوو، یەك فیرقەی سەرباز کە لە ڤانەوە هاتبوو، بریتیبوو لە بیست ئەسپ سوار، کەتیبەی یەك و دوو لە لیوای ٩٧ پاڵپشت بە دوو تۆپی شاخ و دوو رەشاش.

یەکە سەربازیەکان لەوە بچووکتر بوون کە بە رواڵەت دەیان نواند، ئەمانە دووچاری شیرزەییەکی ناهەموار بوونەوە، نەخۆشی و درمیش بەپەتاوە لەناویاندا بلاوبۆوە. سەربازەکان بەگشتی ژمارەیان لە ٥٠٠ کەس تێ نەدەپەڕی[٣٤]. بەڵام ئەم هێزە بە پاڵپشتی ئەو کوردانە بوو کە دژ بە شێخ بوون.

لە راستیشدا کوردەکانی ناو سوپا عوسمانیەکە لە هەردوو پەلامارەکەدا توانیان پێشڕەوی بکەن، لە شەڕێکی گوێ ڕوباری (زێ)دا شێخی بارزان شکستی هێنا و بە هەوادارانێکی زوریەوە بەرەو ئێران هەڵات، ئێرانێك کە ئەو کات لەژێر دەستەڵاتی رووسەکاندا بوو[٣٥].

شێخ ماوەیە لە (تەفلیس) پایتەختی قۆزاقە رووسەکاندا مایەوە، سەرەنجام گەڕایەوە ئێران. لە ساڵی ١٩١٤ شێخ عەبدوسسەلام لەلایەن شوکاکە نەیارەکانیانەوە دەستگیر کرا و دایانە دەست دەوڵەتی عوسمانی تا ئیعدام کرا[٣٦].*

---

* بۆ زیاتر زانین لەبارەی شۆڕشەکەی شێخ عەبدوسسەلام و ئاکامەکەی بڕوانە: پیر رەش: بارزان و حركة الوعي القومي الكردي ١٨٢٦-١٩١٤ (بەبێ شوێن و جێی چاپکردنی) ١٩٨٠ (وەرگێڕ)

## ● ئایین و یاخیبوونی کورد

حوکمەتەکەی کۆمەڵەی (ئیتیحاد و تەرەقی) لەگەڵ ئەوەی بە کۆمەڵێ (کافر و مولحید) دادەنران، ئامێرێکیشبوو بەدەستی مەسیحیەکانەوە یانی بەدەستی ئەوروپایی و ئەرمەنەکانەوە. پێگەی (شێخ تەها) و (شێخ عەبدوسسەلام) بە پلەوپایە ئایینیەکەیانەوە قایم بوون، جا کە لەگەڵ چەند شێخێکی تردا شۆڕشیان بەرپاکرد، هەر تەنیا هەڵوێستێکی سیاسیان بۆ خۆیان تۆمار نەکرد، بەڵکو زێر بە زێر وەلە هەندێ کاتدا بە ئاشکرا رایاندەگەیاند کە سوڵتان /خەلیفە نوێنەرێکی گونجاو و موناسیب نییە بۆ ئیسلام، شێخە گەورەکانی وەك (تەها و عەبدوسسەلام) جگە لە نوێنەرێکی دیار و ئاشکرای ئەو جۆرە ڕاوبۆچوونانە دژ بە دەوڵەت، لە کاردابوون و لەناو تۆڕێکی ئایینی فرەوانی سۆفیگەریدا لەخواری رۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵدا پەلوپۆیان بڵاو ببۆوە و تەشەنەیان کردبوو. ئەمە لە کاتێکدا بوو کە گوێ بەو دەنگانەش دەدرا کە بانگەشەیان بۆ یەکبوونێکی کورد دەکرد.

بەکردەوەش ئەمە هاتە دی، بانگەشەی ئەم شێخە ڕێزدارانە بۆ یەکبوونی موسوڵمانان دژ بە حوکمەتە مولحیدەکەی (ئیتیحاد و تەرەقی) لەلایەن خەڵکەوە گوێی بۆ ڕادەگیرا و بەقسەیان دەکردن و کاریشیان بۆ دەکرد، یانی بە پیریەوە دەچوون[٣٧].

ئەم شێخانە دەیانتوانی هەر لە ڕیزی عەشایرەکانەوە هەوادار لەخۆیان گردکەنەوە، ( شێخ سەعید عەلی) لەناوچەی (هیزان - پیران) هەر شتێکی وای دەویست، کە لە (دهۆك) کۆبوونەوەیەکی ڕێکخست بۆ پلانداناني بەرهەڵستیکردنی دەوڵەت[٣٨]. سەرکردەیەکی ئایینی دی (مەلا سەلیم) لە بەتلیس شۆڕشێکی شێخەکانی هەڵگیرسان.

هەرێمی بەتلیس مێژوویەکی دەوڵەمەندی هەیە لە شۆڕش و

ڕاپەڕینەکانـدا، لەوانەیـە دیـارترین و پـڕ مەترسـیترینیان ئـەو شۆڕشـانەی ئەرمەنەکان بووبن کە لە ناوچەی (ساسۆن - مووش) هەڵیان گیرسانن. بـەڵام کوردەکان لـە سـاڵی ١٩٠٧ لـە کارێکی نیمچە یاخیبوونـەوە گـلان، سـەرکردەی ڕێبازە سۆفیگەریەکەی نـاو پـەتلیس دەستڕۆیشتو و خـاوەن نفـوزێکی گـەورە بـوون، لـە ١٩٠٧دا بـەرەو ڕووی کـارە چاکسـازیەکانی دەوڵـەت وەسـتانەوە، کوردەکـان دەسـتیان بەسـەر شـاری پەتلیسـدا گـرت و بینـا و فەرمانگـەکانی دەوڵـەتیان خسـتە ژێـر دەسـتی خۆیـان، بـە سـەرکردەیی شـێخەکانیان لـە ماڵەکەی خۆیـدا پـەلاماری (فەریـد پاشـا)ی حـاکمی شاریان داو بریناریشیان کرد، ماڵیان تاڵان کرد و سەرۆکی پۆلیسیشیان کوشت.

بۆ جڵەوگیری یاخیبووەکان حوکمەتی ناوەنـدی حـاکمێکی تـری بـۆ شـار دانا و گەنمەشامیەکی زۆریشی کڕی و دابەشی کـرد بەسـەر خەڵکەکـەدا[٣٩]. لـە ساڵی ١٩١٣ شێخەکانی پەتلیس داوای خۆپیشاندانێکی گـەورەیان کـرد دژ بـەو کاردی بەرپرسان کـە دەرەکـەکانی ئـەو وڵاتـە ئەوروپاییانـەیان هێنـابووە نـاو شـارەکەوە کـە لـە بەڵکانـدا لەدەسـتیان چـوو بـوو، گوایـە (ئەمانـە کـافر و بیانیشن) بەڵام پاسەوان و دەوریەکانی پۆلیس توانیان ڕایانگرن[٤٠].

لـە بـەهاری ١٩١٤ دەوڵـەت زانیـاری پیلانێکـی پـێ گەیشـت دەربـارەی شۆڕشێکی گەورەتر لە پەتلیسدا، بەفەرمانی قایمقامی جاتاك، (مـەلا سـەلیم) کـە سـەرکردەی ئـەو بزافـەی دەکـرد، گرتیـان. بـەڵام بـە بـەرتیل و دەم چەورکردنی بەرپرسان توانی دەربازبێ، کـە لـە سـەرەتای ئـادار /مارسـی ١٩١٤ گەیشتە ناو شاری پەتلیس یەکەم هەوڵی دا بۆ هەڵگیرسـانی شۆڕشێ، بنکـەی سەرکردەییەکەی خۆی بە پەنا کونسۆلگەری ڕووس و دەیرێکی ئەرمەنیـەوە دامەزراند، شتەکە گتوپڕ نەبوو، کە حاکمی پـەتلیس مـەلا سـەلیمی بـانگکرد بـۆ تـاوتوێکردنی ڕەوشـەکە و گفتوگۆ، مـەلا سـەلیم هەسـتی کـرد هێزەکـەی کەمە و بەشناکات، لەوانەیە ئەو پاڵپشتانەی کە دەبێ فریای کـەون و بگـەن،

تا ئەو حەلە نەگەیشتبوون. جا شاری جیهێشت تا لە شێخەکانی دەوروبەر هێز کۆکاتەوە، نەگەڕایەوە تا (شێخ سەعید عەلی) لە (هیزان-پیران) و چەند شێخێکی تری لە (غیڤاش، کارجیکان، متکی و ڤارتۆ) چاو پێکەوت و دڵنیابوو لەوەی کە هاوکاری دەکەن.

یاخیبووان توانیان لەو فیرقە سەربازە خۆیان دەربازکەن کە نێررا بوو بۆ بەرەنگاربوونەوەیان، لە ۱۹ ئادار/مارسی ۱۹۱٤ بە هێزێکی دوو هەزار کەسی عەشایرەوە هاتنە ناو شار، دیسان لەلای کونسوڵگەری ڕووسیا و دەیرە مەسیحیەکەوە گردبوونەوە[٤١].

پلانی یاخیبووەکان، کە ئەمایاری ئەوەبوون سەرەتا دەستبگرن بەسەر بینا و دەزگە دەوڵەتیەکانی ناوەڕاستی شاردا، بەوە پێشی لێ گیرا کە (موستەفا عەبدولخالق بەگ)ی حاکمی شار[٤٢]، هەر زوو ئەمەی پێشبینی کردبوو، جا هێزی زیاتری لە (ڤان، سیرت، مووش،تەرابزون)دوە بۆ بەرەنگاربوونەوەیان هاوردبوو.

عەبدولخالق بۆخۆی شانبەشانی ڕائید (کازم - نوزناڵپ)[٤٣] کە سەرکردەی دەرەك بوو لە ڤان، دەورێکی سەرەکیان بینی لەسەرپەرشتیکردنی بەرگری کردنەکەدا. لە ۱۹ ئادار/ مارسەوە بەردەوامبوو هەتا ۲۱ ئەو مانگە، یاخیبووان نەیانتوانی بە ئامانجەکانیان بگەن، کە بینا و فەرمانگەکانی ناو شار بوو، نووسینگەی پۆستە و بروسکە، بەندیخانە و شوێنی دی. لە ۲۱ ئادار /مارسدا یاخیبووان بڵاوەیان لێکرد ، مەلا سەلیم و سێ هاوڕێی پەنایان بردە بەر کونسوڵگەری ڕووس و دەیانگوت نیازیانە ببنە هاووڵاتی ڕووس، هێزە عوسمانیەکان ژمارەیەکیان لە یاخیبووەکان، کە لەوەدابوون بەرەو ڕووسیا لە سنوور بپەڕنەوە، دەستگیرکرد[٤٥].

ئەوەی مابۆوە لە سەرکردەکان درانە دادگەیەکی سەربازی بەپێی قانوونێکی سەربازی، پانزەیان حوکمی ئیعدام دران و ئیعدام کران، نزیکەی

سەد کەسیشیان بەند کران یان بۆ (حەیفا) و (یەمەن) دورخرانەوە. بەڵام مەلاسەلیم و هاوڕێکانی لە پەنا گونسوڵگەری ڕووسدا مانەوە، بە (غیابی) فەرمانی ئیعدامیان بۆ دەرچوو، هەتا سەرەتای جەنگی یەکەمی جیهانی لەوێدامانەوە، لە تشرینی دوو/ نۆڤامبری ١٩١٥ کە دەستگیرکران، ئەوانیش لە سێدارە دران.

## * چوونە پاڵ ڕووس

پشتگیری عەشایری کورد لە دەوڵەتی عوسمانی تەمومژاوی و نادیاربوو، لە زوروبەی قۆناغەکانی مێژووی عوسمانیدا دیارترین سەرکردەکانی کورد سەربەخۆییەکی فرەوانیان هەبووە، زوربەی کەرەتیش عوسمانیەکان ڕووبەڕووی کێشەو گرفتی ئەوتۆ دەبوونەوە کە لە کاروباری عەشایریدا کوردەکان لەپێشتربوون.

(ئیبان.م.سمیس) کە کونسوڵێکی بەریتانیا بووە لە ڤان لەم ڕووەوە دەڵێ: بەهۆی ئەو دوژمنایەتیە هەمیشەییەی سەردك هۆزەکان لەگەڵ یەکتردا، ئەوان هەر جەنجاڵ و سەرقاڵی ململانێ عەشایریەکانی ناو خۆیان بوون و نەدەپەرژانە سەر ئەوەی کێشەی تازە بۆ دەوڵەت بخولقێنن. بەهۆی نەبوونی ئەو هۆکارانەیش کە وابکەن باج لە وڵاتدا بسەپێنێ، دەوڵەتیش دەستی نەدەخستە کاروبارەکانیانەوە[٤٩].

لە شەڕەکانی ئەوسا لەگەڵ ڕووسدا، زوربەی سەرۆك هۆزەکان پابەندبوونی خۆیانیان بەمەسەلەی عوسمانیەوە هێشتەوە، سەبارەت بە هەندێکیان دەگرێ وای دانێین کە هاوکاری موسوڵمانەتی و ئیسلامیەتەکە هۆکاری گرنگ بوو لە لاگیری و وەلای سیاسیدا. لەتەك تێڕوانینێکی لۆژیکی ئاڵۆزدا دەشێ ئەمە جوتبێ و ڕێکەوێ لەناست مەبەست و نیازە دووربینەکانی ڕووس و سەرەڕای ئیمانیشیان بەوەی کە چوونە پاڵ ترك

زیاتر لە خزمەتی بەرژەوەندیەکانیاندایە، وەك لەوەی بچنە پاڵ ڕووس. کەچی سەرەڕای ئەمەش هەندێ سەرەك خێڵ ئامادەبوون کە یارمەتی ڕووس بدەن، ئەگەرەکو ئەمە خزمەت بە بەرژەوەندی خۆیان و هۆزەکەیان بکات.

کە عوسمانیەکان لەهەردوو شەڕەکەی بەلکاندا تێشکان ئیتر بیرکردنەوە لەچوونە پاڵ ڕووسیا زیار بووە شتێکی ئاسایی، هەندێ لەو سەرۆك هۆزانە وایاندەزانی کە تەنیا بژاردەیەکی لۆژیکی هەر ئەوەیە کە لەگەڵ ڕووسدا مامەڵە بکرێ، چونکە وا دەردەکەوت کە ڕووس ئامادەیە و لە ڤان و ساتدایە بۆ پامالکردنی رۆژەلاتی ئەنەدۆل، خۆ ئەسڵەن ئەوان رۆژاوای ئێرانیان وا بەدەستەوە. ئیتر کونسوڵە ڕووسەکان کەوتنە کرانەوە بەڕووی سەرۆك عەشرەتە کوردەکاندا. باشتریش وایە پیاو بەلای براوەدا بابداتەوە، هەرواشبوو، هەندێ سەرۆك عەشرەت وابیریان دەکردەوە. بەلام مەحالە ئەوە بزانرێ کە ئاخۆ سەرکردە یاخیبووەکانی تر کە یارمەتی و کۆمەکی ڕووسیان وەرگرتبوو هەر بەم جۆرە بیریان دەکردەوە و بەم مەبدەئە ڕازیبوون یان نا؟ چونکە هیچ تۆمار و دیکۆمێنتێکیان دەربارەی ئەو کۆبوونەوانەی خۆیان و ئەوان کە دەیانکرد بۆ پلان دانان بۆ سیاسەتەکانیان، جێنەهێشتووە. بەلام دەشێ هاوکاریکردن لەتەك ڕووسدا شێوازێکی باشبێ بۆ ئەوەی نەهێڵن رۆژەلاتی ئەنەدۆل نەکەوێتە ژێر چنگی ئەرمەنەوە.

سەبارەت بە ڕووس لەوانەیە واباشتربێ کە ناوچەکە بگیرێ و دابەشکرێ و لێ بگەڕێن کە پارسەنگی کوردیش هاوتابێ بە ئەرمەن، چونکە ئاخری و ئاقیبەت ڕووسیا ڕۆژێ لە ڕۆژان حەزی بەوەنەکردووە کە ڕێ بدرێ نفوزێکی سیاسی ئەرمەن لەهیچ کام لەم شوێنانەدا بێ کەوان بەدەستیەوە.

بنەماڵەی بەدرخانیان مێژوویەکی کۆنیان لە یاخیبووندا هەبوو، لە چلەکانی سەدەی نۆزدەدا بەدرخان دەستی کێشایە سەر ناوچەیەکی گەورە و

نایە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە، بنکەی سەرەکیش لە شاری (سیزرەر) بوو، هەتا ساڵی ١٨٤٧ لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا دەجەنگا، بەلام بەهۆی هەڵگەڕانەوەی کەسانی ناو بنەماڵەکەیەوە نەبووایە پشتی لە عەرد نەدەدرا و نەدەشکا[٧]. عوسمانییان کاری یاخیبوونەکەیان سەرکوتکرد و بەلام ڕازیشبوون بەوەی بنەماڵە هەربە سەرۆکایەتی عەشرەتەکەیان و لەجێی خۆیاندا بمێننەوە، جێیەکی فرەوانی پانوپۆڕی ئەوتۆ کە بەزەحمەت دەیگەیشتنێ و عوسمانیانیش حوکمکردنی ئەو ناوەیان بەلاوە سەخت و پڕ چەڵەمە بوو، بێجگە لەوەی کە خێرێکی ئەوتۆشی بۆ دەوڵەت نەدەدایەوە.

لە ساڵی ١٩١٣، (حسێن) سەرۆکی عەشرەتی بەدرخانیان لە دەوڵەت یاخیبوو، بەدرخانێکان تەکتیکێکیان بەلاوە بوو کە بریتیبوو لە تێکدان و شێواندنی باری ئاسایش، وەك پەلاماردانی کەشتیەکانی ناو (دیجلە) و کوشتنی سەرنشینەکانی. حسێن خۆی بەناوچە شاخاویەکانی ناوچەی مووسڵدا و هەرێمەکانی باشووری پەتلیس و ئامەددا، بۆ بەدەستخستنی پشتگیری سەرەك خێڵەکانی تر جەولەیەکی کرد. هەتا دەشڵێن گوایە خەریکبووە لەگەڵ (مار شەمعون)ی سەرکردەی ئەستووریەکاندا ڕێکەوێ و پەیمانێك ببەستن.

حسێن مژدەی سەربەخۆیی بە سەرکردەکانی تر دابوو، بەلام لەمەدا بەتەواوی نەیپێکا. چونکە هێزەکانی بەدرخان هێجگار وا بەهێز نەبوون تا بەشی ئەوە بکات هێرش بەرنە سەر شارەکان و بەهەقەتیش هەڕەشەبن بۆ سەر دەوڵەت، بەلام خۆ بوونە هۆی پشێوی و ئاژاوە لە ناوچەکەدا.[٤٨]

شۆڕشی بەدرخانیان بۆخۆی مەترسیەکی سادەبوو لەسەر عوسمانێکان، چونکە لەناوچەیەکی دورە دەستەوە سەری هەڵدابوو، دەوڵەتیش ئەوەندەی هێز و توانا هەبوو تا یاخیبووان ڕاونێ. بەلام مەترسیەکە کاتێ پەرەی سەند کە (عەبدولڕەززاق) کە نوێنەری حسێن بوو، دەنگی دایە پاڵ دەنگی (شێخ

تەها) و هێزەكانى بەدرخانى ناردە سنوورى ئێران، ئینجا هەركام لەم دووانە دەستيان نايە ناو دەستى ڕووسەكان، بەمە شۆڕشەكەيان مەترسيەكى ڕاستەقينەى بۆسەر سنوورى عوسمانى هێنايە گۆڕێ. سەرەڕاى ئەمەش (عەبدولڕەززاق) تێڕوانينێكى تايبەتى هەبوو لەبۆ يەكخستنى كورد و سەربەخۆييان لەژێر سايە و حوكمێكى ڕووسيايدا، ئەمەش مەترسيەكبوو كە گشت سنوورەكانى هەر شۆڕشێكى عەشايرى ترى بەزلندبوو. بگرە لێيانى تێپەڕاندبوو. لەوەش دەچوو كە تاكە ياخيبوويەكى كوردبووبێ كە پلان و بەرنامەيەكى كاركردنى هەبوو.

(عەبدولڕەززاق) ويستى پەيامێكى مەقاوەمە ئاڕاستەى ئەرمەن و ئەوروپاييەكان بكات، چونكە واى هەستدەكرد كە وا خەريكن دەستبگرن بەسەر ڕۆژهەلاتى عوسمانيدا و چەكيش لەشانى كورد دامالن، زەوى و زارەكانيشيان بدەنە دەست ئەرمەن و كورد بەگشتى بكەنە كۆيلەى خۆيان.

لە بەيانێكى ڕەسميدا بۆ كوردەكان، ئاشكراى كرد كە سەڵتەنەى عوسمانى بەتەواوى ملكەچى ئەوروپاييەكان بووە، بەشێوەيەك كە سوڵتان ناچار بووە مافەكانى كورد بگۆڕێتەوە بە بەردەوامى و مانەوەى سەڵتەنەكەى. لەبەرەو ڕووبوونەوەى ئەمەدا تەنيا هيوايەكى كوردەكان مقاوەمەيەكى سەربازى چەكدارانەى سەرتاسەريە[٥]. ئەم بەرهەڵستيكردنە ڕاستەوخۆ بەرەو ئەوروپاييەكان ئاڕاستە نەكرابوو، كورد بەرامبەر ئەوروپا چى پێ دەكرێ؟ وە دەيانتوانى بۆ قايلكردنى دەوڵەتى عوسمانى تا لە چوارچێوەى مامەڵەكردنيدا لەگەڵ ئەوروپاييەكان جێگە و سەنگێكيش بۆ كورد دانێ، چى بكەن؟ نەخێر، تەنيا هيواى كورد بەلاى عەبدولڕەززاقەوە ئەوەبوو كە عوسمانيەكان لە ڕۆژهەلاتدا وەدەرنێ.

دەكرێ عەبدولڕەززاق بەپياوێكى واقيعبين دانێين، لەو بڕوايەدا بوو كە چارەنووسى سەڵتەنە هەر بە لەدەستچوونى ڕۆژهەلاتى لەنەدۆڵ دەبێ، بەلام

پرسەکە لەوەدایە کە بزانرێ ئاخۆ چ ماف و نەریتێکی کورد بەردەوام دەبێ و ئاخۆ ئەرمەنەکان کورد توقم ناکەن. ئەو دەیگوت: ئەگەر کورد نەیەوێ رووس و ئەورووپاییە ئەرمەنەکان وا دەست بەرەڵڵا بن و جڵەوی دەستەڵاتی حوکمی کوردیان بکەوێتە دەست، ئەوا پێویستە لەسەری کەیەك بگرێ و بۆ ئەورووپای دەرخات کە لەناوبردنیان کارێکی ئەستەمە و دژ بە بەرژەوەندیەکانی ئەوروپا خۆیشیەتی.

بە پێچەوانەی ئەردەمەنەکانەوە (عەبدولرەززاق ) دەدانی بەوەدا دەنا کە رووسەکان نەیاندەویست دەوڵەتێکی ئەرمەنی دامەزرێنن. بەپێی پلانەکەشی دەبێ کوردەکان سەروەری روسیایان بەسەرەوە قەبووڵبێ بەڵام دەبێ سەربەخۆییان پارێزراو بێ و چۆن دەیانەوێ ئاوا بژین، ئەو کارانەش کە بانگەشەی بۆ دەکردن بریتی بوون لە شۆرش و دەستخستنە ناو دەستی داگیرکەرانی رووسەوە، ئەمانەش لە جەوهەردا هەر عەینی ئەو کارانەن کەلە پلانی شۆرشگێرانی ئەرمەندا بوون[51].

جا بەهۆی کاریگەری رووسەوە بۆ سەر شۆرشگێرانی ئەرمەن و یاخیبووانی کوردەوە، ئەوا ئەم شتە کت و پرنەبوو، شیکردنەوەکەی (عەبدولرەززاق ) بۆ رەوشی کورد ژیرانە و لێزانانە بوو، ئەگەر بوار بدرایە بە پشکنەرەکانی رۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵ کاری خۆیان بکردایە (بڕوانە خوارتر) ئەوا بەزۆری دەبووە هۆی ئۆتۆنۆمیەك بۆ ئەرمەن و دەستبەسەراگرتنێکی رووسیش بەسەر رۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵدا.

کە ساڵی ١٩١٠ هاتە بەرەوە، عەبدولرەززاق گەیشتە ئێران و هۆزە کوردەکانی ناوچە سنووریەکانی گردکردبۆوە تا بیانخاتە سەر دۆزەکەی، هەرچەندە کارەکانی، بەر لە تێکشکانی عوسمانیەکان لەیەکەم شەری بەلکاندا، زۆر گرنگ نەبوون. لە مانگی نیسان /ئەپریلی ١٩١٣ و بەسەرپەرشتی کونسوڵەکانی رووس و ئێران، عەبدولرەززاق شوێنکەوتوانی

ڕێکەخست و هەڵمەتێکی ڕاگەیاندنی دژ بە عوسمانێکانی ڕابەرایەتی دەکرد[52].

لەشانسی عوسمانێکان عەبدولڕەززاق ئەوەی سەلماند کە لە فەلسەفەی شۆڕشگێڕیدا زیاتر شارەزا و لێزانترە وەك لە دەستخستنی پشتگیری سەرکردەکانی تردا یان لە بەگژاچوونەوەی عوسمانیەکاندا. ڕووسەکان توانیان ئەوانیدی ڤایلکەن کە بچنە هاوپەیمانیەکی ڕەسمیەوە لەگەڵ عەبدولڕەززاق، بەڵام بەبێ هاوکاری سەربازی. هەرچەندە ئەوانەی کەلە ژێر دەستیدا دەجەنگان هەمیشە شەڕوانەکانی هێزی بەدرخانیەکان بوون، بەڵام کاتێ کە (حسێن) لە ١٩١٣ کۆچی دوایی کرد، بەشێکی زۆری پاڵپشتی کردنەکەی بنەماڵەی بەدرخانیانی لەکیسچوو، جێگرەوەکەی حسێن ڕێککەوتنامەیەکی ئاشتی لەگەڵ دەوڵەتدا مۆرکرد[53].

شۆڕشەکەی عەدولڕەززاقیش هەتا دوا هەفتەی مانگی ئەیار/ مایۆ ١٩١٤ بەشێوەیەکی ناڕێکوپێك بەردەوامبوو، عوسمانێکان لەدواشەڕدا لە نێزیك (سیرت) شەڕوانانی عەبدولڕەزاقیان شکاند، ئەندامانی بنەماڵەی بەدرخان دەستگیر کران[54]. عەبدولڕەززاق و چەند کەسێك لە هەوادارانی هەڵاتنە ئێرانەوە بۆ پەنا ڕووسەکان. لەکۆتایدا لەسەروبەندی یەکەم جەنگی جیهانیدا ڕووسەکان لەسەر ئەو خزمەتانەی کە هەیبوو کردیانە فەرمانداری هەرێمی (پەتلیس) کە داگیریان کردبوو[55].

## ● شکستی کارە یاخیبووەکان

لەوانەیە ئەو هۆکارە بنەڕەتیانە کە شکستیان بە یاخیبوونی سەرکردە کوردەکان هێنا، نەبوونی پاڵپشتیەکی بەردەوام و پەرتەوازەیی یاخیبووان لەناو خۆیاندا بووبێ. سەرباری ئەو ڕێککەوتنەی کە بەهۆی ڕووسەکانەوە بۆ هاوکاریکردن لەگەڵ گشت یاخیبوواندا، کەچی هەرگیز هەوادارانی (بەدرخان

و بارزان) هێزەکانی خۆیانیان یەکنەخست بۆ پاڵپشتی یەکدی.

ماوەیەکی دور و درێژ سمکۆ هەرخۆی بە تەنیا لە ساحەکەدا بوو، ئەماحی شەخسی و دوژمنایەتی عەشایری و ملکەچی بۆ دەوڵەتی ئیسلام، ئەمانە گشتیان بوونە هۆی ناتەبایی و یەکنەگرتنی کوردەکان بەرووی دەوڵەتدا، لەکاتێکدا عەشایری تر هەبوو وەك (حەیدەرانلی) کە تەریکبوون و گۆشەگیر بەشداری ڕوداوەکانیان نەدەکرد، سەرکردە ناپینیە یاخیبووەکانی (پەتلیس)یش بەبێ هاوکاری و پشتیوانیەکی عەشایرەکانی دی کاری خۆیان دەکرد، سەرباری گشت ئەو ئەسبابانەی بوونە هۆکار بۆ بەرهەڵستی لە دەوڵەتی عوسمانی یان بۆ لایەنگیری و دەست تێکەڵاوکردن لەگەڵ رووس، وە لەگەڵ ئەو هەموو یاخیبوونانەی کە ڕویاندا، دەبێ جەخت لەسەر ئەوە بکرێتەوە کە کورد بەگشتی وەلا و ملکەچبوونی خۆیان بۆ دەوڵەتی عوسمانی هێشتەوە، کەمێك لەو سەرۆك هۆزە گەورانە لێی یاخیبوون و لێی هەلگەڕانەوە، ئەو شێخانەی کە هەستان و دەستیان دایە شۆڕش کردن نەیاندەتوانی ژمارەیەکی ئەوتۆ لە شوێنکەوتوان لە خۆیان کۆکەنەوە تا بگەنە ڕادەی مەترسیەکی ڕاستەقینە، هەرچەندە بە بێ دوو دڵی تەنگژە و سەرێشەیان هەر دروست دەکرد. کوردەکان زوربەیان ڕەعیەتێکی بەوەفا بوون و بگرە زیاتریش.

سەرەڕای شکستی کارە یاخیبووەکانی کورد، بەڵام کارێکی ئەرێنی گەورەی کردە سەر هەرێمی ڤان و دەستەڵاتی عوسمانی، زوربەی ساڵانی ١٩١٣ - ١٩١٤ یاخیبووە کوردەکان بوونەهۆی نائەوەی ناژاوە لە بەشێکی زۆری خواروی ڕۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵدا، شەڕەکان لەنێوان سەربازانی عوسمانی و یاخیبووانی کوردا وە لەنێوان عەشایرەکان خۆیاندا هەماهەنگبوو لەگەڵ تەقەللای ئەوروپاییەکان بۆ یەکلاییکردنەوەی مەسەلەی پشکنەرەکان و دیاریکردنی چارەنووسی ڕۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵ، ئەمە کاری کردە سەر ئەوەی کە

تێــڕوانینی ئەوروپاییــەکان ســەبارەت بــەتوانای عوسمانیــەکان بگــۆڕێ لــە دابینکردن و مسۆگەرکردنی ئاشتی لەنێو خەڵکەکەدا.

هەر جارێـك شـەڕیان بکردایـە عوسمانێکان یاخیبووانیـان دەشـکاند، لـە گوێ ڕووباری (زێ) (شێخ عەبدوسسەلام)یان شکاند و (شێخ سەعید)یشیان لە باکووری ڕۆژاوای ئێراندا ڕاونا و (عەبدولڕەززاق)یش لە نێزیك (سیرت)و (مــەلا ســەلیم و ســەعید عــەلی)یش لــە پــەتلیس. بــەڵام ڕۆژێ لــە ڕۆژان نەیانتوانیوە کە یاخیبووەگان بنبڕکەن و نەیانهێڵن، هەریەك لە (سمکۆ، شێخ تــەها، عەبدوسســەلام و عــەدولڕەززاق) لــە ئێرانــدا مانــەوە و ڕووس پــەنای دابوون، بەر لەیەکەم جەنگی جیهانی و لەکاتی جەنگەکەشدا توانا و کـردە و کۆشــە و دیپلۆماتکــاری عوسمانێکــان تــەرخان بــوو بــۆ بەرەوڕوووبوونــەوەی مەترسـیەکی چـاوەڕوان کـراو کـە هـا نـەمڕۆ یـا سـبەی ڕوبـدات، ئـەویش یــاخیبوونی کوردەکــانبوو. کــە جەنگەکــەش قــەوما عوسمانێکــان پشــتگیری ژمارەیەکی ئێجگار زۆر عەشایرە کوردەکانیـان لەدەسـتخۆیاندا کـەدەبوو لـەو جەنگەدا پاڵپشتیان بوونایە.

## ● ڕووسەکان و کورد

پاش هەردوو شەڕەکانی بەلکان، وەك پێشـتر وتـرا، ڕووسـەکان هەسـتیان بەلاوازی عوسمانیەکان دەکرد، لە سونگەی دیپلۆماتیەوە لـە ڕەوشـی فەشـەلی سەڵتەنەکە سوودیان وەرگرت، بەوەی لـەژێر سـایەی پشـکنەرەکاندا کاربکـەن بۆ هەڵوەشاندنەوەی دەستەڵاتی عوسمانی لە ڕۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵدا، جـا چـیـان پێ دەکرا بۆ لاوازکردنی لەو ناوەدا درێغیان نەدەکرد.

ڕووسەکان دەمێکبوو پاڵپشتی شۆڕشگێڕە ئەرمەنـەکانبوون (ئەگـەر چـی بە درێژایی ڕۆژگارەکە ئەو پاڵپشتیە لە هەڵکشان و داکشاندابوو) بەڵام ئیستە واسـەریان کردۆتـە سـەر کوردەکـان و ئاوڕێکیشـیان لـەوانیش داوەتـەوە.

کونسوڵەکانیان لەهەردوو دیوی عوسمانی و ئێرانیدا بەئاشکرا پشتگیری خۆیان بۆ یاخیبووە کوردەکان پیشان دەدا، پەناگەی ئەمینیان لە ڕۆژاوای ئێراندا بۆ سەرۆك و عەشرەتەکانیان دەستەبەر دەکرد، لەڕێی میوانداریکردنیانەوە لە کونسوڵگەریەکانیاندا (وەك ئەوەی پەتلیس) لە قانوونیش دەیانپاراستن. بۆ یەکخستنیان دژ بە عوسمانیەکان لەلای خۆیان کۆیان دەکردنەوە، سەیر لەوەدا بوو لەعەینی کاتدا پشتگیری شۆڕشگێڕانی ئەرمەنیشیان دەکرد، کە ئەم دووانە بە دوژمنی سەختی یەکتر دادەنران، بەڵام لەمەدا دەبوو مەبەستی ڕووس بەهەند وەرگیرێ ، بەتایبەت ئەوان هەرگیز بەتەمای ئەوە نەبوون کە شۆڕشی کورد سەرکەوێ بەڵام هەرچۆنێکبێ ئاژاوە و پشێویە کە بە پاڵ شۆڕشێکی تردوەبێ دەبێ هەر قازانجێکی تێدابێ بۆ ڕووس خۆی، چونکە عوسمانێکان هەرچی توانا و وزەیانە دەیخەنە کار بۆ سەرکوتکردنی ئەو شۆڕشە.

وەلا و ملکەچبوونە زەلیلیەکەی سەرکردە کوردەکان بۆ سەڵتەنە و ئەو ململانێیەی لەناو خۆیاندابوو جار لەدوای جار سەرکردە و ڕابەری ئایینی ڕێزدار و بەحورمەتی بەتومەتی خیانەت تیا ئیعدام دەکرا، لە گەرمەی ئەو ئاژاوەی شەڕی ناوخۆیەدا مەسیحیەکانیش تووشی کێشە و تەنگوچەڵەمە دەبوون. بەمە دەستێوەردانی ڕووسیا بە بیانووی هێورکردنەوەی بارودۆخی دەڤەرەکە ئاسانتر دەبێ. بۆیە هەتا ئاژاوە و تەنگژەکانی ڕۆژهەڵاتی عوسمانی ڕوو لە زیادبوون بکەن یان هەرشتێ ببێتە هۆی لاوازبوونی دەستەڵات، ڕێگە ئاوەڵا دەکات بۆ پەلامار و ڕاماڵکردنێکی ڕووسیاییانە.

بێگومان ڕووسەکان لەبەرێکی جیاوازەوە تەماشای یاخیبوونی کوردەکانیان دەکرد، هەر نەبێ لە دووتوێی دنەدانیانەوەو هیچی تر. ڕووسیا کارێکی وای کردبوو کە دەوڵەتە ئازەربایجانە فارسیەکەی ملکەچی دەستەڵاتیبوو، مووچەی ڕێکوپێکی دەدایە (شێخ تەها) لە شەمدینان و

(سمایلاغای سمکۆ) و لەوانەیە بەکەسانی تریش[٥٧].

وەك پێشتر باسمانکرد، سمکۆ بۆ ماوەیە پلەی ڕەسمی لەلای ڕووسەکانەوە پێدرابوو، هەریەك لە (عەبدولڕەززاق بەدرخان و سمکۆ) نیشانەی ڕێزلێنانی ڕووسیایان لەبەرامبەر ئەو خزمەتە باشانەیان بۆ مەسەلەی ڕووسیا، پێوەگرا.[٥٨]

دەوڵەتی عوسمانی ڕووسیای بە پاڵپشتیکردنی یاخیبوونی کوردەکان توومەتبار دەکرد، باڵیۆزی بەریتانیا لەمەدا هاوڕابوو لەگەڵیانا و دەڵێ:

(( ئەو ئیمتیازاتانەی کە دراوە بە – عەبدولڕەززاق و سمکۆ - و ئەم پەیوەندیە باشەی کە ئەم سێ پیلانگێڕە و دەستەڵاتی فارسی لە ئازەربایجان (کە ئاشکرایە پاشکۆی ڕووسیایە) پێکەوە گرێدەدات، وەك پێشتر دەرکەوت و لەو پێشوازیە گەرمەی ئەو دەستەڵاتە دەرکەوت بۆ ئەو کوردانەی لەدەست ترکیا هەڵاتبوون، وەك شێخی بارزان.

گشتیان نیشانەن بۆ سەلماندنی ڕاستیی ڕاوبۆچوونی ترکەکان، ئەوانەی وای دادەنێن کە هەندێ کینە لە دڵی ترك لایەنی ڕووس دەگرن و بەلایدا بادەدەنەوە.))[٥٩]

ڕووسەکان لە خۆشکردنی ئاگری یاخیبوونەکەدا پیرۆزیان بەدەستهێنا و بوونە هۆکاری شڵەژان و نا ئارامی. بەڵام لەم ئاستەدا کارەکانیان وێستا، بە ئامانجی تێکشکاندنی حوکمەتە کە دەبوو سەرگردەکانی گشت باڵە کوردەکان یەکگرن، بەڵام سەرەڕای بەرژەوەندیە هاوبەشەکانیان و پەیوەندیە شەخسیەکانی نێوانیان، سەلماندیان کە ناتوانن یەکبگرن[٦٠]. وە ڕێکخستنێکی یەکگرتووی نێوانیان بەبێ یارمەتی ڕووس نایەتەدی.

لە مانگی ئەیار/ مایۆی ١٩١٤ کونسوڵی ڕووسیا لە (خۆی) (م.شاریکۆڤ) کۆبوونەوەیەکی فرەوانی ڕێکخست لەنێوانی:

سمکۆ، سەعید عەلی، عەبدولڕەززاق، میسیت - یەك لە پیاوانی شێخ

تەها و ئەرسانلی* حەسەن اغا. ئەمانە نوێنەری زوربەی لایەنە یاخیبووە دیارەکانی کوردەکان بوون، لەسەر یەکخستنی تەفەللاکانیان و دەستکردن بە پەلاماردان ڕێکەوتن بە مەبەستی تێکدان و کاولکاری لە ناو سەڵتەنەکەدا.

لە ڕاپۆرتەکاندا ئەوەش هاتووە کە ئەمانە ٥٠٠ تفەنگیان لە عەمبارەکای رووس لە ئێراندا وەرگرتووە[٦١]، بەڵام بەهۆی ئەو ناتەبایی و ناحەزیە شەخسیانەی نێوانیانەوە، هەوڵەکانی ڕووس بۆ یەکخستنەوەی کوردەکان بەفیڕۆچوو، خۆ هەر نەبێ دەیتوانی دەرەتانێکی نا جێگیر و ناسەقامگیری و مەترسیدار لە رۆژەلاتی عوسمانیدا بێنێتە ئاراوە، لە کاتێکدا ئەوروپاییەکان هاواری ئەوەیان بوو کە ئاشتی لە دەڤەرەکەدا بەبێ حوکمێکی ئەوروپایی بەرپانابێت.

## ● شۆڕشگێڕانی ئەرمەن

پاش ئەو شکستە ئابڕوبەرەی یەکەم شەڕی بەلکان، ئەرمەنەکانی ڤان وایان چاوەڕوان دەکرد کە نیتر ئەمە سەرەمەرگی سەڵتەنەکەیە و بە ئاشکرا پێشوازیان لە هەردەسهێنانەکەی دەکرد. کونسۆڵ (ج. مۆلینۆ-سیل) دەڵێ: زوربەی ئەرمەن لە هەرێمی ڤان کۆتایی حوکمی عوسمانیان گەرەکبوو نەك چاکسازی. وە دەیگوت: ئەرمەنەکان گشت ڕواڵەتێکی وەلا و ملکەچیان بۆ دەوڵەت توور هەڵداوەتە ئەولاوە، ئەو ڕواڵەتانەی کە ڕۆژێ لە ڕۆژان هەرخۆیان دایانهێنابوون و دروستیان کردبوون. وایان لێهاتووە بە ئاشکرا پێشوازی لە پاماڵکردن و هەر جۆرە داگیرکردنێکی ڕووسیایی دەکەن لە ئەیالەتە ئەرمەنەکاندا[٦٢]. شاندێکی ئەرمەن بەشداریکردنی لە ئەنجوومەنی

---

* ئەم دوو ناوە دەبێ ئاوابن: میسیت – مستەفا، ئەرسانلی . ئەرسەلان بوو بن. ((وەرگێڕ))

هەرێمایەتی ڤاندا ڕەتکردەوە، دەشێ بەهۆی پاڵنەری باوەڕبوونەوە بووبێ یان لە ترسدا[63].

دەستەڵات و نفوزی سەرەکی لەناو کۆمەڵێ ئەرمەندا حیزبی تاشناق بوو، ئەم حیزبە دەستی بەسەر کڵێسای ئەرمەن و قوتابخانە ئەرمەنیەکانی هەرێمەکەدا گرتبوو و بەسەر گشت شێوە بەرهەڵستیەکیشدا زاڵبوو کە بەرەورووی دەبۆوە. قوتابخانە فرانسیە دۆمینیکانیەکانی ڤان، کە لە نێوەندە ئەرمەنەکەدا ناوبانگێکی باشی هەبوو، زوربەی قوتابیەکانی خۆی لەدەستدا، چونکە قەشەکانی ناچارکران (لەوانەشە فەرمانێکی دەوڵەت بووبێ) کە مامۆستایەك لە تاشناقیەکان دەرکەن. تاشناقیش دابڕانێکی سەپاندە سەر قوتابخانەکە[64]. کونسوڵی بەریتانیا لە ئەرزرۆم لە سەردانێکیدا بۆ ڤان سەرنجی دا کە دەستەڵاتی فیعلی تاشناق لە دەستەڵاتەکەی دەوڵەت زیاترە، دەیگوت: بە دەستەڵاتترین پیاو لە ڤان (نیشان)ە، ئەو کابرایەی سەرۆکاری فیرقەکانی دەکرد و کارە تیرۆریەکانیشی لەناو تاشناقدا بەڕێوەدەبرد، زۆر جار کاپتن (سیل) و کاپتن (دکسن) هەردوو کونسوڵ لە ڤان و ئەختمار، باسی ئەو کابرایەیان دەکرد: (ئارام) ناوێکی عیلمانی بۆخۆی کردبووە هاوکار، ئەو ئارامە بە ڕواڵەت سالانێکبوو کورسی (کاسۆلیکۆس)ی بەدەستەوە بوو[65].

شۆڕشگێرانی ئەرمەن، بەر لەیەکەم جەنگی جیهانی و لەم ساڵانەی دواییدا، بە پیلان دانان و خۆ پڕچەککردنەوە خەریکبوون، تاشناقیش کاری بەبایەخترى گرتبووە خۆی و دەیکرد[66]، بەڵام (هانشاك) لە ڤان بوونی خۆیی دەپاراست و بەوسیفەتەش نەبێ کە بەشێکە لە هاوپەیمانییە شۆڕشگێڕیەکە لەگەڵ تاشناقدا ئەگین بەشداری دەستەڵاتی نەدەکرد.

هەڵگیرسانی یەکەم شەڕی بەڵکان هاوکاتبوو لەگەڵ پەرەسەندنی بڵاوبوونەوەی چەك لە هەرێمەکەدا، نێردراوە ئامریکاییەکان ئاماژە بەوە دەدەن کە: شۆڕشگێڕە ئەرمەنەکان دیسان خەڵك ناچار دەکەن کە بە

نرخێكی گران چەك بكڕن. هەر بۆ نموونە، تفەنگی ڕووسی بە ١٨ لیرە و نیوی تركی دەفرۆشرا، ئەوان ڕایان وابوو كە بەشێكی كەم لەو چەكانەی لە ئێرانەوە نامدیودەگران دەستەڵات دەیتوانی دەستیان بەسەردا بگرێ[٦٨]، لە شوبات/ فەبرایری ١٩١٣ حیزبی تاشناق بەڕەسمی دەستی كردەوە بە كڕین و دابەشكردنی چەك، لەناو ئەرمەنەكانی شارەكانی ئەنەدۆڵ و قەفقاس و ئەیالەتە یەكگرتووەكانی ئامریكادا هەڵمەتێكی پارە كۆكردنەوەی بۆ كڕینی چەك دەستدایە[٦٩]. لیژنە ناوەندیەكانی حیزب وایان دەبینیەوە كە كاتەكە لەبارە بۆ كڕینی چەك چونكە نرخەكانیان دابەزیوە، هەردوو شەڕەكانی بەلكان برێكی زۆری چەك و ئەسبابی شەڕیان لەناواندا خستبۆوە و كەوتبووە دەست ئەم و ئەو، گومانیشی تێدا نەبوو كە پاش ئەوەی دەكرران دەگوێزرانەوە بۆ ڕۆژهەڵاتی عوسمانی، تاشناقیش ڕایدەگەیاند كە ئەو بارە چەكانە گشتیان دەگەنە جێی مەبەست. ئەمە ڕاست نەبوو، بەڵام ڕوداوەكانی دوایی سەلماندیان كە زوربەی چەكەكان دەگەیشتنە ڤان و جێگەی تریش لە ڕۆژهەڵاتدا[٧٠].

كونسوڵ (مولینو-سیل) ڕایدەگەیەنێ كە:

(( ئیستە ئەندامانی تاشناق سەرقاڵی پڕچەككردنی دانیشتوانە ئەرمەنەكەی ولایەتەكانن و گوندنشینەكانیش دەڵێن گوایە تركەكان لە تۆڵەی لەدەستدانی هەرێمەكانی ئەوروپایان كوشتارێكی سەرتاسەری لە مەسیحیەكان دەكەن، بۆیە دەبێ ماڵ و سامان و خێزانەكانی خۆیان بپارێزن. زوربەی ئەو چەكانەی دابەشكراون دەمانچەی ئۆتۆماتیكیە*، دە فیشەك دەخوا و لەجۆری (ماوزەر)ە، نرخی ئەم جۆرە دەمانچانە ١٢ پاوەندە، ئەو كارە بازرگانیە تاشناق دەیكات و لە ڕووسیاوە نامدیویان دەكات، چونكە

---

* دەمانچە كۆنەكان تاك تاك فیشەكیان دەتەقاند، ئەمانە ڕیزیان دەكرد. ((وەرگێڕ

قازانج و خێرێکی چاکی تێدایە، زۆریش لە لادێییەکان دەکەن تا بیانکڕن.

ئەفسەرێکی دەرەك هەواڵی ئەوەی دامێ کە لەوەدەچێ نموونەیەبێ لەو شێوازانەی تاشناقیەکان بەکاریان دەهێنێ:

بەکرێگیراوێکی تاشناق دەگاتە گوندێك و بە کابرایەکی گوندەکە دەڵێ کە دەبێ دەمانچەیەکی ماوزەر بکڕێ، کابرا دەڵێ پارە شکنابەم، ئەویش پێی دەڵێ دەبێ مانگاکانت بفرۆشی، کابرای داماو دەیەوێ تێی بگەیەنێ کە وەختی جوتکردن نێزیك بۆتەوە و چۆنچۆنی کێڵگەکەی بە دەمانچەیەکی ماوزەر بکێڵێ؟. جا تاشناقێکە هەر بەو دەمانچەیە مانگاکانی کابرا بەرگوللە دەدا و دەڕوا.))[71]

ژمارەیەکی کەم نەبێ لە ئەرمەن، بەتایبەت توێژاڵی بازرگانەکان، کە بۆ دەوڵەت بە ئەمەکبوون و هەرواش مانەوە، چونکە چارەنووسی (بیدروس کاباماسیان) بۆیان بووە پەند و عیبرەت.

## ● تیرۆرکردنی کاباماسیان، موختارەکەی ڤان

(بیدروس کاباماسیان) بازرگانێکی هاوردەکردنی قوماش بوو، یەك لە بەناوێترین بازرگانەکانی شاری ڤان بوو، یەکێکیشبوو لە ئەندامانی ئەنجوومەنی ڕاپەڕاندنی ڤان، دوو گەڕەت بە زورینەی دەنگی ئەرمەن و موسوڵمانەکان بە موختاری ڤان هەڵبژێررایەوە، گەڕەتی یەکەم ساڵی ۱۹۰۹. لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانیدا سەلماندبووی کە شیاوی ئەو جێگەیەیە و بە ویژدانەوە ئیدارەی شار و ئابووری ناوخۆی بە ڕێکوپێکی چاککرد و بەرەو پێشەوەی دەبرد، ئەوەش بەگرتنەبەری چەند ڕێوشوێنێك، بۆ نموونە کەشتیەکانی ناوخۆی بۆ گواستنەوە لە دەریاچەی ڤاندا خستە گەڕەوە. کاباماسیان نوێنەری ئەرمەنەکانبوو بە تایبەت بازرگانەکانیان، کە ئامادەبوون هاوکاری بە هەیکەلبوونی دەستەڵاتی عوسمانی بکەن و پشتگیری چاکسازیەکی هێمنانە و لەسەرخۆیان دەکرد.

هەڵوێستێکی یەکلاکەرەوەی بەلای عوسمانیەکاندا وەرگرتبوو، پاڵپشتی حاکم و حوکمەتە مەرکەزیەکە بوو.

ئەو مەزبەتانەی کە بە هانە هانەی تاشناق نووسرابوون خرابوونە بەردەستی، داوای لابردی حاکمی شاریان دەکرد، ئیمزای نە دەکردن و جگە لەمە بازرگانەکانیشی فایلکرد بەوەی کە لەو هەڵمەتی ئیمزا کۆکردنەوەیە بۆ لابردنی حاکم خۆیان بەدوربگرن و ئیمزای نەکەن.

مەزبەتەکان سەریان نەگرت (بە پێچەوانەی ئەوانی ترەوە کە زۆریان سەریان دەگرت) بە پلەی یەکەم هۆی ئەمە دەدرێتە پاڵ هەڵوێستی کاباماسیان و سەلماندنی ئەوەی کە ئەو داوایانە هیچ ڕەنگدانەوەیەکی ڕای گشتی ئەرمەن نەبوو.

وەك بریکاری دەوڵەت و سیاسەتەکانی، ئەم پیاوە سەرکەوتنی بووە هۆی بەرپابوونی ململانێیەك لەنێوان ئەم و تاشناقدا، لە مانگی نیسان/ئەپریلی ١٩١٢ ئاستی ئەو ناکۆکی و ململانێیە گەیشتە لووتکەی، ئەویش کە زنجیرەیە ناگرکەوتنەوەیە لە ڤان ڕویدا و بووە هۆی کاولبوونی چەند ماڵێکی ئەرمەن. جا هەروەك لەم دەرحتانانەدا ڕوودەدات، دەستی تاوان خرایە سەر موسوڵمانەکان. بەتردریکی ئەرمەن لە ئەستەموول کەوتە دنەدانی باڵیۆزە ئەوروپاییەکان بۆ بەدەنگەوەهاتن و لیژنەیەکی کۆڵینەوەش ڕەوانەکرا بۆ ڤان و گوناهەکە درا بەسەر موسوڵمانەکانی شارەکەدا[٧٣].

لەمەدا کاباماسیانی موختار دژ بە شۆڕشگێڕان و بەتررەیك وێستایەوە، ڕاپۆرتێکی نووسی و تیایدا دەڵێ: ڕوداوەکان لە ڤاندا وەك بەترەریك دەڵێ وانەبوون، بەڵکو ئەندامان لە لیژنەی تاشناق بۆ فیتنەگێڕی و ئاژاوە ئاگرەکانیان بەردایەوە.

بەترەریك و شاندەکەی نەیانتوانی موویەك لە هەڵوێستی موختار بگۆڕن، هەموان دەیانزانی کە ڕاپۆرتێکی ئاوها کە موختارێکی ئەرمەن بیدات بەلای ئەوروپاییەکانەوە کە فێربوون گومانیان لە قسەی عوسمانێکان

هەبوو[74]، بایەخێکی گرنگی دەبێ.

بەلای تاشناقەوە ، تەنیا یەك چارەسەر شیاوبوو: لەناوبردنی موختار و لاخستنی، بۆیە حوکمی ئیعدامی دەرهەق دەرچوو[75].

شۆڕشگێران کە پشتێکیان بەو ململانێیە دەبەست لەنێوان موسوڵمان و ئەرمەندا، کەسایەتیەکی گرنگی ئەرمەنیان بۆ قووتنەدەچوو کە لایەنی دەوڵەت بگرێ و لەناواندا بێ. چەندەها جاریش ترس و هەڕەشە و تۆقاندنیشیان بەرامبەر بەوانەی وەك کاباماسیانبوون لە ئەرمەنەکان بەکارهێناوە[76]. بۆیە پەنایان بردە بەر شێوازی تۆقاندن و دوژمنانی خۆیان لەناو کۆمەڵی ئەرمەندا چاوترسێن دەرکرد، پاشان هەڵمەتێکی پڕوپاگەندەیان دەستدەدایە کە گوایە هێزە ئەمنیە عوسمانیەکان ئەو کەسانەیان تیرۆر کردووە. جا ئەوروپایی و ئامریکاییەکانیش باوەڕیان بەقسەیان دەکرد.

موختارەکەی ڤان بەردەوام هەڕەشەی بۆ دەنێررا، ئەویش کە نەیهێشت ژمارەی پاسەوانەکانی بۆ زیاترکەن بەمە هەڵەیەکی گەورەی دەرهەق بەخۆی کرد، لەوانەیە وای زانیبێ کە بوونی پۆلیس بە هەمیشەیی لە دەوری وای دەردەخات کە متمانەی بە برا ئەرمەنەکانی نییە، بۆیە گوێی بە هەڕەشەکان نەدەدا و وەك جاران دەهاتو دەچوو.

بەیانی دەی کانوونی یەك/ دیسامبری ١٩١٢ کاباماسیان لەگەڵ ژن و کچەکەیدا هاتنە دەر بۆ ماڵی زاواکەی، لەو ئانەی سواری عەرەبانەکەیان دەبوو، گەنجێکی ئەندامی ڕێکخراوی شۆڕشگێڕی ڤان دەستڕێژێکی لێ کرد، موختاری بێ چەك و غافڵ بی پاسەوان دوو گوللە ئامبازی بوو و بەشەست و پێنج ساڵ تەمەنەوە گیانی دەرچوو.[77]

لێکۆڵینەوەیەکی قەزایی لە ڤان بکوژانی کاباماسیانی دیاری کرد، ئەوانە: زێڕنگەرێك بەناوی (کاراکین) و یارمەتیدەرەکانیشی. فەرمانی دەستگیرکردنیا دەرچوو[78]، جینایەتکاران بۆی دەرچووبوون بەلام زۆری

ئەبرد لە گوندی (کارا گوندوز) گیران، ئەمانە بوون: (کاراکین)ی پیاوکوژ، (بوتور) عەرەبانچییەکە و (سراج نوسیب) و سەرگردەیەك لە لیژنەی تاشناق کە ناوەکەی نەدەزانرا. پاش کەمێك کەسانی تریش دەستگیرکران[79].

دەستگیرکردنی جینایەتکاران بەو دەست و بردە شتێکی تازە بوو لە ڤاندا، لەوەبەر ئاوا بە گورجوگۆڵی ڕوی نەدەدا، بەڵام شەعبیەتی کاباماسیان و ترس لەوەی ئەم تاوانە ببێتە هۆی ئاژاوەنانەوەی زیاتر، پاڵی بە هێزە ئەمنیەکانەوە نا تا هەرچی زووترە گرێ کوێرەکانی ئەو تاوانە بڕەوێننەوە.

دانیشتنە بەراییەکانی لێکۆڵینەوە و گوێگرتن لە گوتەکان دەریان خست کە چەند سەرکردەیەکی تاشناق لە پشتەوە دەستیان لەم تاوانەدا هەبووە. لەوانە (فرامیان) و (ئارام مانوکیان) و کەسانی تریش، ئینجا فەرمانی گرتن بۆ ئەمانەش دەرچوو[80].

نووسینگەی حاکم لە جێبەجێکردنی بڕیارە قەزاییەکان بەرپرسبوو، سەرەڕای ئەو داوا و مەزبەتانەی دەدرانە حاکم و دەنێررانە ئەستەموول، پیاوکوژان و سەرکردەکانی تاشناق ئازاد و بەرەڵا مانەوە[81]. ئەمەش ئاماژەیەکە بۆ ئەوەی کە دیسان دەستێوەردانی سیاسی وەك ساڵی ١٩٠٨ دەورێکی گرنگ دەبینێ، ئەو ساڵەی کە گیراوەکانی تاشناق مەرەخەس کران. ئەمجارەش دیسان تاشناقیەکان توانیان وەك بەرزەکی بانان بۆی دەرچن و لە گوێ کاڵتریان پێ نەگوترێ، وە بگرە هۆشداریان دایە ئەوانەی تر لە توێژاڵە بازرگانەکە کە لایەنگری دەوڵەتن کە سەرپێچیکردن لە تاشناق مانای خۆکوژییە.

دوای مردنی کاباماسیان هەرچی پشتگیریەکبوو لە حوکمەت با زۆر ساکار و بچووکیش بووایە، نەما.[82]

ڕێوڕەسمی بەخاکسپاردنی کاباماسیان هێند گەورە و پڕشکۆ بوو کە وادەزانرا زوربەی دانیشتوانی شارەکەی وا لەگەڵدا، ئەو وتارانەی لە ڕێوڕەسمەکەدا دەدران، ستایشیان لە خزمەتە پڕ بایەخەکانی کاباماسیان

دەكرد كە پێشكەش بە شارەكەی كردبوو، هەروا ئەو رێز و خۆشەویستیەی دانیشتوانی موسوڵمان و مەسیحی پیشاندا بۆ ئەو پیاوە. كونسوڵەكانی بەریتانیا و رووسیا و فرانسا لە رێورەسمەكەدا بەشداربوون جگە لە نێردراوانی بیانیش"[٨٣].

لەبەرامبەردا هیچ نوێنەرێكی تاشناق یان هێزەكانی ئاسایش ئامادەنەبوون، بە خاكسپاردنەكە لە قەبرستانی ئەرمەن كە كەوتبووە بەشی (بەگلەر)ەوە بەڕێوە چوو. كە تاریك داهات كاباسیان ئەسپەردەی خاك كرا.

## ● پشكنەریەكان

ئەوروپاییەكان لە دامەزراندنی پشكنەرەكاندا بۆ رۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵ نارەحەتیەكی زۆریان هاتە رێ. هەریەك لەو زلهێزانە بەوە رازی نەدەبوو پشكنەر لەوی تریان بێ، لەبەر ئەمە وا پێك هاتن كە با پشكنەرەكان لە دەوڵەتە بچووكەكان بن. بە ترەریكی ئەرمەن لە ئەستەموول بە باڵیۆزی رووسیای گوت كە وای پێ باشە پشكنەرەكان بۆ هۆلاندو دانیمارك یا نەرویج یان سوید بن، بەڵام نەك لە بەلچیك یان سویسرە بن چونكە ئەم دوو وڵاتە پەیوەندیەكی بازرگانی گرنگیان ها لەتەك سەڵتەنەی عوسمانیدا"[٨٤].

(لویس.ك. ویستینینگ) كە كرابووە پشكنەر بۆ ئەرزرۆم باسی لە چۆنێتی دەستنیشانكردن و دانانی خۆی دەكات، لە یادداشتەكانیدا دەنووسێت:

((چوارشەممە ٤ ئادار /مارس

كەمێ بەر لە ئیستە وەزیری هۆلاندی پێی راگەیاندم كەسێك بەناوی (بوغۆس نۆبار پاشا) كە چالاكوانێكی مەسەلەی ئەرمەنە لەبەردەم گەلێ دەوڵەتی ئەوروپادا، داوای لە (هـ.ی) كردووە كە هۆلاند دوو كەس بپاڵێوێ و دەستنیشانیانكات بۆ پلەی ئەو پشكنەرە گشتیەی كە لەسەرەوە باس كرا. بەم هۆیەوە چۆتە برۆكسلیش، لەوێكانێ ناوی دە پاڵێوراو لە ئارادا بووە.

بەپێی ڕاوبۆچوونەكانی دەوڵەتی ڕووس (نۆبار پاشا) نوێنەری كاسۆلیكۆس لە تەفلیسی (SIC - ڕابەری ڕۆحی ئەرمەن)وە نوێنەری بەترمریك، بەمانا سەركردەی ڕەسمی ئەرمەن لە قوستەنتەنیە وە بەمانایەكی دی نوێنەری ئەرمەنە مەسیحیەكان. نەك نوێنەری تركیا، لەبەر ئەمە، لەو كاتەدا نێردراوی ترك لە لاهای بە شێوەیەكی كاتی لە مەسەلەكە دورخرایەوە، بەڵام ڕووسیا سەرقاڵی ئامادەكاری بوو بۆ چاكسازیەكان و دەوری سەركردەیی خۆیشی تێدا هێشتبۆوە[86].))

(ویستینینگ) كە ئەفسەرێكی وڵاتە داگیركراوەكانی هیندی ڕۆژهەڵاتبوو، دەستنیشان كرا بە پشكنەر لە ئەرزڕۆم، ڕانیدێكی ئەرویژیش بەناوی (نیكۆلاس هۆف)ەوە لە ڤان كرایە پشكنەر (بەدانانی پلەی ئەفسەریەكەی بەرزكرایەوە بۆ- كۆلۆنێل لەفتینانت)[87]. پشكنەرەكان كاتیان بەفیڕۆ نەدا، گورج خۆیان لە شۆڕشگێڕە ئەرمەنەكان نێزیك كردەوە، ویستینینگ كە زانی دانراوە پاش چوار ڕۆژ چاوی بە دكتۆر (زافرییف)ی ئەرمەنی و (باستر ماجیان)ی ئەندازیاری كانەكان كەوت[88]. ئەمەی دواییان نوێنەری پێشووی ئەرزڕۆم و یەك لە سەركردەكانی حیزبی تاشناق بوو.

كێشەو لەك و پۆپەكانی دۆزی ئەرمەنی لەگەڵ ئەم پیاوە وریا و شارستانیانە دایە بەرباس و لێكۆڵینەوە، ئەوانەی ئامادەبوون هەرچی پێویستبێ بیكەن لە پێناو دۆزەكەیاندا، جگە لەمە چەند نووسراوێكیشی لێ وەرگرتن[89]، ویستینینگ بەرلەوەی هۆلاند جێبهێڵێ جارێكی دی بەوانە كۆبۆوە، لە نووسینەكانیشیدا هاوسۆزیەك دەبینرێ بەرامبەر دۆزەكەیان و متمانەیەكی كەمیش بە مەبەستەكانی ئاڵمان. وای بۆ دەچوو كە ڕووسیا، لەبەرامبەردا جگە لە ئاسوودەیی و هێمنی لەسەر سنوورەكەی چیدیكەی ناوێ[90].




نەخشەی ١ - ٧ ڕێگەوبان و هێڵە ئاسنینەکان

(ویستینینگ) لە پاریس چاوی بە (هۆف) کەوت و پێکڤە لەتەك (گاریگین باسترماجیان) و (زافریێف) و (بۆغۆس نۆبار) کۆبوونەوە، ئینجا ڕووە و ئەستەموول بوونەوە. بەر لە چاوپێکەوتنی بەرپرسانی عوسمانی هەندێ گورتە ڕاپۆرتیان لە تاشناق و لێپسراوانی بەترمریکیەکەوە پێگەیی، تاشناق لیستی ئەو ئەرمەنانەش کە پاڵێوراون بۆ دانانیان لە پلە ڕەسمیەکاندا دایە پشکنەرەکان. تاشناق لەنامە ڕەسمیەکانیدا ڕەزامەندی تەواوی خۆی پیشان دەدا بەرامبەر بژاردەی پشکنەرەکان و گەشبینیشی بەرامبەر قۆناغی ئاینده[91].

راپید هۆف لە ١٧ ئاب/ ئاغستۆس گەیشتە ڤان، هەر بە گەیشتنی (سیفدیت بەگ کە پاشان دەبێتە حاکمی ڤان) دەنووسێ: هۆف لەلایەن تەحسین بەگی حاکمی ڤانەوە زۆر بە ساردی پێشوازی کرا[92]، بەلام ئەرمەنەکان زۆر بە گەرمیەوە بە پیریەوە چوون، لەو ناهەنگی پێشوازی و ڕێزگرتنەی کە قەشەی ڤان بۆی ڕێکخستبوو، سەرکردەیەکی تاشناق (ئیشخان) وتارێکی بەخێرهاتنی داو گوتی: تۆ ئەو مەسیحەی کە بە درێژایی پێنج شەش ساڵە لە چاوەڕوانیتداین[94]. بەلام هەر ئەم مەسیحە هەلێکی ئەوتۆی بۆ ئەرەخسا کە کەسێك (هەر کەسێکبێ) ڕزگاری کات. چونکە لە ٢٧ ئاب/ ئاغستۆس ١٩١٤ جەنگی یەکەمی جیهانی هەلگیرسا[95].

(تەلعەت پاشا)ی وەزیری ناوخۆ پاش ڕاگەیاندنی جەنگ هۆق بانگکرد، ویستینینگیش نەیتوانی لە ئەستەموول دەرچێ‌و بچێتە ئەرزرۆم. لەگەڵ هەلگیرسانی شەڕەکەدا دەوڵەتی عوسمانی دەستپێشخەریەکی یەکلایەنەی لای خۆیەوە جێبەجێکرد، ئەویش بەلابردن و هەڵوەشاندنەوەی پشکنەرەکان (لە ٣١ کانووی یەك /دیسامبری ١٩١٤)[96].

## ● ڕەوشەکان لە ساڵی ۱۹۱٤

بەداهاتنی ساڵی ۱۹۱٤، سەڵتەنەی عوسمانی لە شەڕی ئیتاڵیا و هەردوو شەڕی بەلکاندا تووشی شکستبوو و باری داراییشی دارما، بەلام لەمەیانی سیاسەدا لە ئەستەموول پشێوی و بێسەروبەری تەشەنەی کردبوو، ئەو پشێوی و بێسەروبەریە ئاساییەی کە ئەو دەوڵەتانە دووچاریان دەبێ کەوان لە سەرەتای هەنگاوناندا بەردو دیموکراتی لەگەڵ ئەوەشدا کە هەمووان وایان چاوەڕوان دەکرد سەڵتەنەکە ئیتر کۆتاییەتی، کەچی ئەو ڕوداوانەی لە ڕۆژهەلاتی عوسمانیدا ڕاستەوخۆ بەر لە جەنگە جیهانیەکە ڕویاندا، ئەوەیان سەلمان ئەگەر وازی لێ بهێنرایە ئەوا سەڵتەنەکە لەو تەنگژەیە ڕزگار دەبوو.

ئەو یاخیبوونە کوردیەی کە ڕووس لە پشتی بوو و تاڕادەیەکیش بوغرایی چاوەڕوانکراوی ئەرمەنیش کە خۆیان بە زلتر دەزانی ئاگرەکەی خۆشتر دەکرد، بەئاسانی سەرکوت کرا. دەوڵەتە تازە سێ کوچکەییەکەی کۆمەڵەی ( ئیتیحاد و تەرەقی)* ، بەپێچەوانەی ئەوانەی پێشووی ئامادە نەبوو کە لەگەڵ بزوتنەوە شۆڕشگێڕە جوداخوازەکاندا هاریکار بێ یان بسوڵحێ. هەر زوو سەلماندی کە دەتوانێ سەرلەنوێ سوپای عوسمانی بەهێزکاتەوە و بیکاتە هێزێک کە بتوانێ بەئاسانی شکست دەرخواردی یاخیبووەکان بدات. لە ڤان دەوڵەت بەردەوامبوو کە ژیان بەردو باشی بەرێ، بە تایبەت لە بەرەوڕووبوونەوەی ئەو تالان و بڕۆیەی عەشرەتە کوردەکان، شتێکی سروشتیش بوو کە وازیان لە دەوڵەتی عوسمانی نەدەهێنا و نەیاندەهێشت بەدەردی خۆیەوە دانیشێ، پلانی پشکنەرەکان ئەمەی

---

* سێ کوچکە: مەبەستی سەرکردە بالاکانی کۆمەڵەی (ئیتیحاد و تەرەقی)یە: (جەمال و تەلعەت و ئەنوەر). ((وەرگێڕ))

دەسەڵاند، رووسەکان دەستبەرداری ئەو نیازەی خۆیان نەدەبوون بۆ داگیرکردنی رۆژهەڵاتی عوسمانی، ئەمە لەو پشتگیریەیانەدا دەردەکەوت کە لە یاخیبووە کورد و ئەرمەنەکانیان دەکرد و هەروا مەبەستەکانیان بەرامبەر بە پشکنەرەکان.

ئەگەر بەخواستی رووسیا کاردەکان بەڕێوەچوونایە، چاکسازیەکان تەنیا لەیەك هەرێمی رۆژهەڵاتدا دەبوو، ئەویش لەژێر رکێفی رووس خۆیاندا، بەڵام هێزە ئەوروپاییەکانیدی هیچ نەبێ بۆ ماوەیەکی کاتی بەرهەڵستی پرۆژەکەیان دەکرد، لەگەڵ ئەمەشدا رووس هەر ئەو تاکە هێزە بوو کەبەسەر مەرجەکانی رێککەوتنی تایبەت بە پشکنەرەکان و هەڵبژاردنیاندا دەستەڵاتدار بوو.

دوای دابڕکردنی رۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵ لە دەستەڵاتی عوسمانی بەتەواوی، ئیتر نەیتوانی بەتاقی تەنیا خۆی راگرێ، چونکە هەرێمە رۆژهەڵاتیەکان هەرگیز نەیانتوانیوە بەتەواوی بەو بەروبوومانەی ناوخۆیان بەڕێوەچن و ئاشتیەك بۆ ئەهالیەکەشی بەرپاکەن. یا هێڵی ئاسنین راکێشن و هانی پیشەسازی بدەن.

کوردیش هەر وا بەو ئاسانیە ئەوەیان قەبووڵ نەبوو. کە بە هەق و هەقیقە بە دەستبەسەراگرتنێکی ئەرمەنیان دادەنا بەسەر رۆژهەڵاتەوە، کە تەنگەژەکانیش دەگەیشتنە لووتکە، ئەو کاتە رووس ئامادەبوو دەستێوەرداو بێتە ناوەوە.

## ● پەراوێزەکان

١- فـايلى ٢٤٥٠/١٩٥ لـە مۆناهـان بـۆ مـارلينگ، ئـەرزرۆم ٢٩ ئـەيلوول /سـەپتامبر ١٩١٣، وە فايلەكـەى پێشـوو ٢٣ ئـەيلوول/ سـەپتامبر ١٩١٣، ديسـان فايلى ١٠١٦٤/٨٨١ لە مۆلينۆ-سيل بۆ لۆدز، ڤان ١٠ تەمموز/يۆليۆ ,١٩١٢

٢- بۆ نموونە نوسقوڤ پەتليس باس لە كوشتنى نۆ ئەرمـەن دەكات لـە سـاڵى ١٩١٣دا بـەڵام بـاس لـە ژمـارەى كـوژراوانى موسـوڵمان ناكـات (فـايلى ٢٤٥٠/١٩٥ لە مۆناهان بۆ مـارلينگ، ئـەرزرۆم ٢٩ ئـەيلوول/ سـەپتامبر ١٩١٣ كـە ئامـاژە بـە كوشـتنى كـورد بەدەسـتى كـورد خۆيـان دەدات هـەروا بەدەسـتى ئەرمـەنيش وە لـە يـەكتر كوشتنى كورد و ئەرمـەن لـە (كارجيكـان) : فـايلى ١٠٣٣٩/٨٨١ لە مۆلينۆ-سيل بۆ لۆدز، ڤان ٢٢ كانوونى دوو/ يەناير ١٩١٣.

٤- فـايلى ٢٤٥٠/١٩٥ لـە مۆناهـان بـۆ لـۆدز، ئـەرزرۆم، ١٣ تشـرينى يـەك/ ئەكتۆبـەر ١٩١٣ ليژنـەى رێ پێـدراوە ئامريكاييـەكان ١٦،٨،٩ راپـۆرتى ١٠٤ى ليژنەكـە بـۆ كاروبـارى دەرەوە وە راپـۆرتى دانيشـتنى كـۆنگرە لـە ديترويـت، ميشيگان ١٣ - ١٦ تشرينى يـەك/ ئەكتۆبـەر ١٩١٤ (بۆسـتن: ليژنـەى ئامريكـايى ١٩١٥) ل ٨٨ - ٨٩

٥- فايلى ٢٤٥٠/١٩٥ لە مۆلينۆ - سيل بۆ لۆدز، ڤـان ٤ تـەمموز/ يۆليـۆ ١٩١٣ وە بۆ دەستخستنى تێروانينێكى سەرتاسەرى بـۆ ئـەو گۆرانكاريانـەى كـە ڤـان بەخۆيـەوە دى، بروانـە ئـەم فايلـە لـە مۆناهـان بـۆ مـارلينگ، ئـەرزرۆم ٢٩ ئەيلوول/ سابتەمبر ١٩١٣.

٦- فايلى ٢٤٥٠/١٩٥ لە مۆلينۆ-سيل بۆ لۆدز، ڤان تەمموز/يۆليۆ ١٩١٣

٧- ئەشـير، ٢٨ تشـرينى يـەك/ ئەكتۆبـەر ١٩١٣، ليژنـەى رێپێـدراوە ئامريكاييەكان ٧،٩،١٦ نێردراو بۆ رۆژهەڵاتـى تركيـا ١٩١٠-١٩١٩، نامـەكان: T-Z, ٨١e, no ٢٥vol.

٨- کتێبەکەی (جاستن مەکارسی):

Death and Exilr: The Ethnic cleansing of ottoman muslims (princeton: Darwin 1995) pp 161- 64

٩- بۆغۆس نۆبار ١٨٥١-١٩٣٠: کوڕی (بۆغۆس نۆبار پاشا)ی سەرۆکی وەزیرانی پێشووی میسرە، بەرلەوەی سەرقاڵی سیاسەی ئەرمەنی ئەندازیارێکبوو لە کەرتی گشتیدا کاری دەکرد، یەك لە دامەزرێنەری (یەکێتی گشتی خێرخوازانی ئەرمەن)بووە، لە ١٩١٢ەوە کاری بۆ ئەرمەنە کاتۆلیکەکان کردووە، وەك کەسێ بیروڕاکانیانی بڵاودەکردەوە و هەواڵدەرێکی دیپلۆماتیشیان بوو لە پاریس هەروا وەك سەرۆکی یەك لەشاندە ئەرمەنەکانی ناو کۆنگرەی ئاشتی لە پاریسدا لەساڵی ١٩١٩، دامەزرێنەرێکی فەیلەقی ئەرمەنیشبووە کە بەشداری یەکەم جەنگی جیهانی کردووە.

١٠- و.ج. ڤان دیر دوسین:

The question of Armenian Reforms in 1913-1914

١١- خلیل منتشی: ئەستەموول Hurriyet

١٦٨. p ١٩٨٦Vakfi Yayinlari

ڤان دیر دوسین: The question

١٧of Armenian Reform. p

١٢- ئەوەی پەیوەندی بە پشکنەرەکانەوەیە، بڕوانە کتێبەکەی جۆزیف هیلبر :

British policy towards the ottoman Empire (London cass, 1983) pp 107- 11

وە فایلی ٢١٣٧/٣٧١ لە بیۆمۆنت بۆ گرای، قوستەنتەنیە ٤ کانوونی یەك/ دیسامبر ١٩١٤، ١٩١٣ Annual Report ڤان دیر دوسین ل ١١ - ٢٨

١٣- بڕوانە پاشکۆی ژمارە (٦)

١٤- فایلی ٢٤٥٨/١٩٥ لە سمیس بۆ مالیێ، ڤان ١٣ ئادار/ مارس ١٩١٤

١٥- فایلی ٢٤٥٨/١٩٥ لە سمیس بۆ مالیێ، ڤان ٤ نیسان /ئەپریل ١٩١٤ بۆ دەستخستنی نموونەیە لە شێوەی دوژمنایەتی و کاری تیرۆرکردن کە بەرامبەر ئەفسەرانی دەوڵەت دەکران.

١٦- هەرە و فایلەی پێشوو، ١٤ شوبات/ فەبرایر ١٩١٤، (ب.ج.س.ماك گریگۆر)ی کونسۆڵ لە ئەرزرۆم باسی ئەو کۆبوونەوەیە دەکات لەنێوان سەرکردەکاندا بۆ تاوتوێکردنی ئەو گۆرانکاریانەی وا لەپڕ بەسەر فیرقەی حەمیدیەدا هات. فایلی ١٠٠٧٥/٨٨١ لە ماك گریگۆر بۆ لۆدز، ئەرزرۆم ٢٠ کانوونی دوو/یەنایر ١٩١٢

١٧- فایلی ٢١٧٤/١٩٥ لە تیریل بۆ ئۆکۆنر، ڤان ١٢ ئەیار/مایۆ ١٩٠٣

١٨- هەردو فایلە: لە سمیس بۆ مالیێ، ڤان ١٤ شوبات/فەبرایر ١٩١٤

١٩- فایلی پێشوو، ڤان ١١ تەمموز/یۆلیۆ ١٩١٤ وە فایلی ٢١٢٢/٣٧١ لە مالیێ بۆ گرای، قوستەنتەنیە ٦ کانوونی دوو/یەنایر ١٩١٤

٢٠- فایلی ٢١٣٠/٣٧١ لە سمیس بۆ مالیێ، ڤان ١٠ کانوونی دوو/یەنایر ١٩١٤

٢١- فایلی ١٢٦٣/٣٧١ لە مۆلینۆ-سیل بۆ لۆدز، ڤان ١٢ تشرینی یەك/ئەکتۆبەر ١٩١١

٢٢- فایلی ٢٤٥٨/١٩٥ لە سمیس بۆ مالیێ، ڤان ١١ تەمموز/یۆلیۆ ١٩١٤

٢٣- هەرچەندە بۆ ئەگبەتی زانیاری ئەوتۆ لەبارەی سەرەتاکانی سمکۆوە نادا بەدەستەوە، بەڵام (مارتین ڤان برۆنیسین) لە وتارەکەیدا:

Kurdish Tribes and the state of Iran: the case, of The Condlict of Tribe and state in Iran and afganistan .Richard Tapper (New York, st Martins press 1983)چاپی

وەسفێکی نایابی وەزعی گشتی عەشایرەکان دەکات و کردەوەکانی سمکۆش لە دوای جەنگە جیهانیەکە.

٢٤- فایلی ١٢٦٣/٣٧١ لە مۆلینۆ-سیل بۆ لۆدز، ڤان ٣١ تشرینی

یەك/ئەكتۆبەر ١٩١١

٢٥- لە ساڵی ١٩١٢ سەرەتا سمكۆ بڕیاری پاڵپشتیكردنی كوردەكانی ئازەربایجانی دا كە بەرهەڵستی داگیركردنەكەی ڕووسیان دەكرد بۆ ڕۆژاوای ئێران، بەڵام بەمەبەستی خۆنێزیككردنەوە لە ڕووسەكان هەڵوێستەكەی خۆیی گۆڕی، لەبەرامبەر ئەمەشدا ڕووسەكان زۆریان بۆ عەشایرە كوردەكان هێنا تا لایەنگیریی سمكۆ بكەن وەك سەركردەیەكیان:

Van Bruinessen, kurdish Tribes and the state of Iran, p 383

٢٦- فایلی ١٩٥/٢٤٥٠ لە مۆلینۆ-سیل بۆ لۆدز، ڤان ٢٤ ئادار/مارس ١٩١٣.

٢٧- سمكۆ كە پشتی بەڕووسەكانبوو لەتەك عەبدولڕەززاقدا كاریان دەكرد بۆ یاخیبوونێكی كوردی، بەڵام مەبەستی ڕاستەوخۆی لەمەدا قایلكردنی ئەو كوردانەی سەر سنوور بوو (بە زۆرە ملی ئەگەر پێویستی كرد) كە بڕیاریاندابوو لاگیری دەستەڵاتی عوسمانی بن، تا دویكەون و ببنە هەواداری ، فایلی ١٩٥/٢٤٥٠ لە مۆلینۆ-سیل بۆ لۆدز، ڤان ٩ تەمموز/یۆلیۆ ١٩١٢. سمكۆ مێژوو و ڕابوردویەكی دورودرێژی هەبوو لە یاخیبوون و هەڵگەڕانەوەیدا لە دژی عوسمانیانو ئێران و بەریتانێكانیش لە ئێراق، جا لەمبارەیەوە بڕوانە كتێبەكەی (برۆنیسن) بەناوی:

kurdidsh Tribes and the state of Iran

٢٨- بڕوانە كتێبەكەی (هاكان ئوزغلو) :

Kurdish Notables and the ottoman state: Evolving Identities, Competing Loyalties and shifting Bundaries (Albany: state university of New York press, 2004) pp. 72 -77

ئەو وبنەماڵەیەی كە بە شەمدینان ناودەبرێ وای پیشاندەدەن كە (سەیید)ن بەمجۆرە ئەوانەی سەر بەوانن بە سەیید دەناسرێن، مامی (تەها) كە (شێخ عەبدولقادر)ی ناودارە، یەكەم ئەندامی لیژنەی (ئیتیحاد و

تەرەقی)بوو ئینجا ئەندامی پەرلەمانیش.

٢٩- دەمێکبوو دەوڵەتی عوسمانی ڕێزێکی گەورەی لە (عوبێدوڵڵا) دەگرت و مەدالیا و نیشانەی ڕێزی پێوەکردبوو، هەرچەندە بە ڕەسمی وەك یاخیبووی دەرابووە قەڵەم و دەوڵەت ڕێگەی پێ نەدەدا کە بگەڕێتەوە زێدی خۆی، بڕوانە کتێبەکەی (دەیڤید ماکدۆناڵ) :

A moderrn History of the kurds (London: I.B. Tauris, 200) pp 53-59

٣٠- فایلی ١٠٣٧٦/٨٨١ لە مۆلینۆ-سیل بۆ لۆدز، ڤان ٤ نیسان /ئەپریل ١٩١٣،

٣١- فایلی ٢٤٥٠/١٩٥ لە مۆلینۆ-سیل بۆ لۆدز، ڤان ٢٤ ئادار/مارس ١٩١٣ ڕووسەکان هەتا نامەیەکی ڕاسپاردنیشیان ئەدا بە لیژنە عوسمانیەکە بۆلای هێزە ڕووسیاییەکان لە ئێران، ئەندامانی ئەو لیژنەیەیان وا ناچارکرد کە بەبێ حیمایەیەکی ڕەسمی سەفەر بکەن.

٣٢- دیارە لەم ڕووکاردوە هەردوو خانەوادەی بارزان و شەمدینان لەیەك دەچن، یەکەم ڕابەریان لە هەوادارانی (شێخ تەها)ی یەکەم بووە لە نێری (بڕوانە بۆ ئەو گفتوگۆیەی دابێ)، هەروەك خانەوادەی شەمدینان، بارزانیش دیرۆکێکی دورو درێژیان هەبوو لە بەربەرەکانیکردنی دەستەڵاتی عوسمانیدا. ئەم دوو خانەوادەیە پێکڤە زۆریان چەشتووە و ناتەبایەکی بەرامبەریش لەنێوانیاندا هەبووە و لە ململانێیەکی بەردەوامدابوون.

٣٣- ڕووسەکان ئەستووریە مەسیحیەکانیان کە چەکیان هەڵگرتبوو بە ٢٠ هەزار پیاو خەملاندبوو.

٣٤- فایلی ٢٤٥٨/١٩٥ لە سمیس بۆ مالیێ، ڤان ١٣ ئادار/مارس ١٩١٤

٣٥- هەر فایلەکەی پێشوو، ٢٩ ئەیار/مایۆ ١٩١٤

٣٦- تەماشای کتێبی:

Kurdish movement in Kavakas. April 15/28. 1914

بکە، کە لە فایلی ٢٤٥٨/١٩٥ لە مۆناهان بۆ جەنابی باڵیۆز، ئەرزڕۆم ٢٠

حوزەیران /یۆنیۆ ١٩١٤، تەرجەمەکراوە.

٣٧- شێخەکان لە خوارووی ڤان و سەرووی ناوچەی موسڵ هەر لە شۆڕشەکەی لیژنەی (ئیتیحاد و تەرەقی)یەوە لە جەولەدابوون و ئاگاداری ئەو خەڵکەیان دەکردەوە کە ئەگەر بەرەوڕووی نیازەکانی دەوڵەت نەبنەوە ئەوا مەسیحیەکان دەستدەگرن بەسەر موڵك و زەوی کوردەکاندا. (فایلی ٩٥٤٨/٨٨١ لە دیکسن بۆ لۆدز، ڤان ١٥ حوزەیران/ یۆنیۆ ١٩٠٩، پاشکۆی ژمارە (٩) سەرنج و تێبینی سەبارەت بە گەشتی نێوان ڤان و موسڵ.)

٣٨- فایلی ٢٤٤٩/٣٧١ لە مۆلینۆ سیل بۆ لۆدز، ڤان ٨ ئەیار/مایۆ ١٩١٣، دەبێ ئاگاداری ئەوە بین کە ئەو شێخانە پیاوانێکی سادە و سافیلکەی نەکردە نەبوون، بەڵکو دەیانزانی کە یاخیبوونەکەیان ناتوانێ لەبەرامبەر هەر بەرهەڵستیەکی ئەورووپاییدا خۆی بگرێ کە دۆستی ئەرمەنەکانن، جا ئەوە بوو (سەیید عەلی و مەلا سەلیم) وایان لە حیزبی تاشناق پێشنیار کرد کە: با هەمووان بەرووی دەوڵەتدا یەکبگرن. بەڵام ئەم داوایەیان ڕەتکرایەوە، هەتا بەر لەوەی هێزەکانی مەلا سەلیم بچنە ناو بەتلیسەوە، دیسان ئەوەی دووپات کردەوە کە جووڵانەوەکەیان هیچ مەبەستێکی بە ئەرمەن نیە. (ئەهیك غازتسی، ٢٦ ئادار /مارس ١٩١٤ لە کتێبەکەی (بیرم بەیرقدار)ەوە وەرگیراوە:

Besinci Askeri Tarih Semineri Bildirileri I Ankara n.p. لەAyaklanmasi 1996 p.220

٣٩- فایلی ٥٣٧/٣٧١ ڕاپۆرتی ساڵانە ١٩٠٧ لە ئۆکۆنر بۆ گرای ، قوستەنتەنیە ١٣ کانوونی دوو/ یەنایر ١٩٠٨. وە فایلی ٢٤٨/٣٧١ لە سافرستیان بۆ شیبلی، ٢٥ حوزەیران/ یۆنیۆ ١٩٠٧

٤٠- فایلی ٢٤٥٠/١٩٥ لە مۆناهان بۆ مارلینگ، ئەرزڕۆم ٢٩ ئەیلوول/ساپتەمبر ١٩١٣

٤١- ياخيبووەكان لەدەست ئەو سەربازانەى ڕەوانەكرابوون بۆيان توانيـان دەرچن، هەندێ واى دەزانى كە كونسۆلگەرى ڕووس پەناى ياخيبووان دەدا و لەيـەك لـە كڵێساسـاكاندا چـەكيان بـۆ دەشـارێتەوە. بـەڵام هـيچ بەڵگەيـەكى سەلێنەر بۆ ئەمە نيە، هەرچـەندە ڕێـى تێدەچێ كە ئەمـە بـووبێ، چـونكە كونسۆلى ڕووسيا داڵدەيەكى باشـى بـۆ ياخيبووەكـان ئامـادەكرد پـاش ئـەوەى ياخيبوونەكەيان شكستى هاورد و پەلامارەكەيان تێكشكا.

٤٢- مسـتەفا عـەبدولخالق (رنـدا) لـە دواييـدا وەك ئەنـدامێكى ديـار لـە پەرلەماندا و وەك وەزيرێكيش لە حوكمەتى عوسمانيدا بەدياركەوت و نـاوى دەركرد.

٤٣- (كازم - ئوز ئاڵپ) ئەميش لە دواييدا وەك كەسێكى گـرنگ لەوانـەى لە ڤاندا بەرهەڵستى ياخيبووانى ئەرمەنيان دەكرد، ناوى دەركردبوو.

٤٤- كاپتن (ئيدريس) شێخ شەهابەددين و پياوەكانى بەديل گرتن:

يەكى ئايار /مايۆ١٩١٤ ل ٢٢٢ Tanin Gazetesi

٤٥- فايلى ٢٤٥٨/١٩٥ لە سميس بـۆ مـاليێ، ڤـان ٤ نيسـان/ ئـەپريل ١٩١٤ وە فـايلى ٢٤٥٠/١٩٥ لـە موناهـان بـۆ جـەنابى بـاڵوێز، ٢٠ حـوزەيران/ يۆنيـۆ ١٩١٤ ناحاڵيبوونێـك لەبابـەت ژمـارەى ئەوانـەى ئيعـدام كـران هاتۆتـە كايـەوە، بەريتانيـەكان بـاس لـە ئيعـدام كردنـى ١٥ بـۆ ١٨ كـەس دەكـەن، بـەڵام دەشـێ ژمارەكە بە ١١ كەس دانرێ بەوەى كە لە ڕاستيەوە نێزيكترە.

٤٦- فايلى ٢٤٥٨/١٩٥ لە سميس بۆ ماليێ، ڤان ١٣ ئادار/ مارس ١٩١٤

٤٧- بڕوانـە كتێبى : Ozoglu. Kurdish Notable and the ottoman state. Pp ٧٠-٧٢

ئەوەى پەيوەند بێ بە (بيديرخان)ەوە، (ئوزۆغلۆ) پوختەيەكى بـاش لـە بابـەت واقيعـى هاوسـەنگى هێزەكـانى ناوچـەكەوە دەدات، لـە قۆناغـەكانى سەرەتادا، (بەشى ١ - ٣) . هەروا بڕوانە كتێبەكەى (ماكداويل):

A moderm History of the kurds pp 45-47

وە كتێبەكەی (گۆنتر ماكس بهرنتد):

Dei kurdische Nationalismus in der Turkei .kurdologic: studien zur sprache, Geschichte. Gesellschaft and politik kurdistans and der kurdi and kurden (Berlin: Bibliothek Feqiye Teyran 1994) p 83

ئەمەش لەسەر ئەم ماڵپەڕە ئەلەكترۆنیە:

Http://www,turkdunya.de/de/Turkei/ verschiedenes/ sehe. Php3? Site = kurdische-n .ationalismus# fn18

٤٨- فایلی ٢٤٥٠/١٩٥ لە مۆناهان بۆ لۆدز، ئەرزڕۆم ١٨ نیسان/ئەپریل ١٩١٣ وەهەر ئەو فایلە : لە هۆنی بۆ لۆدز، موسڵ ٢ نیسان /ئەپریل ١٩١٣

٤٩- لە سەرەتادا، ناكرێ عەبدولڕەززاق بە پیاوێكی میسالی یان نەتەوەییەكی كارا دانرێ، لە كاتێكدا ئەو كە دەستی پێكرد ئامادەشبوو بگاتە جۆرە ڕێكەوتنێ لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی، هەوڵی دەدا ببێتە موتەسەریف (یان حاكمی ئەیالەتێك)، جا هەتا گشت هەوڵەكانی بۆ گەیشتن بەو پلە و پایەیە شكستیان ئەهێنا پەنای بۆ یاخیبوون ئەبرد. بڕوانە فایلی ٢٤٥٨/١٩٥ لە مۆناهان بۆ جەنابی باڵیۆز، ئەرزڕۆم ٢٠ حوزەیران/یۆنیۆ ١٩١٤. وە فایلی ٢٤٥٠/١٩٥ لە مۆناهان بۆ لۆدز، ئەرزڕۆم ١٦ نیسان/ئەپریل ١٩١٣.

٥٠- بچۆرەوە سەر بەیاننامەكەی عەبدولڕەززاق لە پاشكۆی ژمارە (٦).

٥١- فایلی ٢٤٥٠/١٩٥ لە مۆلینۆ-سیل بۆ لۆدز، ڤان ٩ تەمووز/ یۆلیۆ ١٩١٣ وە هەروەو فایلەی پێشوو، لەدواییدا بەریتانێكان دەیانگوت گوایە عەبدولڕەززاق بەدرخان دۆزەكەی شێخ تەها و شێخ عەبدوسسەلامی گرتۆتەخۆی و كاری بۆ دەكرد (فایلی ٢٤٥٨/١٩٥ لە سمیس بۆ مالێ، ڤان ١٣ ئادار/مارس ١٩١٤ وە هەر ئەو فایلە: ٢٩ ئەیار/مایۆ ١٩١٤).

٥٢- فایلی ١٠٣٧٦/٨٨١ لە مۆلینۆ-سیل بۆ لۆدز، ڤان ٤ نیسان/ئەپریل ١٩١٣،

مۆلینۆ - سیل وەسفی ئەو هەڵمەتە ڕاگەیاندنەی وادەکرد کە بەئامانجی دەستکەوتنی ئۆتۆنۆمیەکە بۆ کورد لەژێر سایەی ڕووسدا.

٥٣- فایلی ٢٤٥٠/١٩٥ لە مۆلینۆ - سیل بۆ هەڵسوڕێنەری کاروبار (هـ.م)، ڤان ٢٣ تەمموز/ یۆلیۆ ١٩١٢، هەردو فایلە : لە مۆناهان بۆ لۆدز، ئەرزڕۆم ١٦ نیسان /ئەپریل ١٩١٢، هەرەو فایلە: لە هۆنی بۆ لۆدز، موسڵ ٣ نیسان/ ئەپریل ١٩١٣.

٥٤- فایلی ٢٤٥٨/١٩٥ لە موناهان بۆ جەنابی باڵیۆز، ئەرزڕۆم ٢٠ حوزەیران /یۆنیۆ ١٩١٤

٥٥- ئەمە هەڵوێستێك بوو یان پلە و پایەیەکبوو بەبێ هیچ دەستەڵاتێکی ڕاستەقینە، ڕووسەکان (کامیل)ی مامیشیان کردە حاکم بەسەر ئەرزڕۆمەوە (ماکداویل، A moderrn History of the kurds)

٥٦- عوسمانیەکان لەو باوەڕەدا بوون کە عەشرەتی بارزان هیچ پەیوەندیەکیان بەو یاخیبوونەی پەتلیسەوە نەبووە بەڵام لەوانەیە خۆشحاڵ بووبن پێی.

٥٧- فایلی ٢١٣٠/٣٧١ لە مالیێ بۆ گرای، ئیرابیا ٢ تەمموز/یۆلیۆ ١٩١٤

٥٨- فایلی ٢٤٥٨/١٩٥ لە سمیس بۆ مالیێ، ڤان ١٤ شوبات/فەبرایر ١٩١٤

٥٩- فایلی ٢١٣٠/٣٧١ لە مالیێ بۆ گرای، ئیرابیا ٢ تەمموز/ یۆلیۆ ١٩١٤ هەروا ئەم فایلەو:

Disitution in Kurdistan ، ڤان ٩ نیسان/ئەپریل ١٩١٤

٦٠- ئەمە ڕاستەرچوو، هەرچەندە هەندێ لەسەرانی یاخیبوونەکان بۆ بەرژەوەندی تایبەت بە خۆیان کۆبوونەوە، سمکۆ زاوای شێخ تەها بوو (مێردی خوشکی بوو) و هاوڕێیەکی نێزیکی عەبدولڕەززاق بەدرخانیش بوو (ڤان برویسین): Kurdish Tribes and the state of Iran .

٦١- (جالدیران) ڕۆژنامەی رەسمی دەوڵەت لە ڤان، ئەیار/مایۆ ١٩١٤ کەلە

فایلی ٢٤٥٨/١٩٥دا تەرجەمەكراوە ، لە سمیس بۆ مالیێ، ڤان ١٤ شوبات/ فەبرایر ١٩١٤. وە بڕوانە فایلی ٢١٣٠/٣٧١ لە مالیێ بۆ گرای، ئیرابیا ٢ تەمموز/ یۆلیۆ ١٩١٤

٦٢- فایلی ١٠٣٧٦/٨٨١ لە مۆلینۆ-سیل بۆ لۆدز، ڤان ٤ نیسان/ ئەپریل ١٩١٣، پێنج هەزار ئەرمەنی داواكاریەكیان نیمزا كرد بۆ دەستێوەردانی هێزە گەورەكانی ئەوروپا لە ڤان، ئەو داوایە گەیشتبووە دەست كونسوڵە ئەوروپاییەكانیش.

٦٣- فایلی ٢٤٥٠/١٩٥ لە مۆلینۆ-سیل بۆ لۆدز، ڤان ١١ حوزەیران/ یۆنیۆ ١٩١٣

٦٤- هەرەو فایلە لە مۆناهان بۆ مارلینگ، ئەرزرۆم ٢٩ ئەیلوول / سەپتەمبەر ١٩١٣

٦٥- هەرەو فایلە

٦٦- بگەڕێوە بۆ كتێبەكەی (ئەشیر) ٢٨ تشرینی یەك/ئەكتۆبەر ١٩١٣ لیژنەی ڕێ پێدراوە ئامریكاییەكان ٧،٩،١٦ . نێردراو بۆ ڕۆژهەڵاتی تركیا ١٩١٠ - ١٩١٩، نامەكان E NO٢٥T - Z,VOL ٨١

٦٧- كتێبەكەی (ئەشیر) ١٧ تشرینی یەك/ئەكتۆبەر ١٩١٣ لیژنەی ڕێپێدراوە ئامریكاییەكان ٧،٩،١٦ نێرراو بۆ ڕۆژهەڵاتی تركیا ١٩١٠ - ١٩١٩، نامەكان: E NO ٢٥ T - Z,VOL ٧٦

٦٨- (ج.س. ڕاینۆڵدز) ٢٢ شوبات/ فەبرایر ١٩١٣، لیژنەی ڕێ پێدراوە ئامریكاییەكان ٧،٩،١٦، ئەرشیفی ڤوستەنتەنیە، جزمی حەوت، نامە بۆ: و.و. پیت ١٩١٣ - ١٩١٤

٦٩- گەلێ بازرگانی ئەرمەن لە میسر و ئەستەموول و شوێنانی تر ملیان بۆ ئەمە نەدا، هەندێ بەهۆی بەرهەڵستیان بۆ شۆڕش و هەندێكیشیان دەترسان لەوەی حیزبی تاشناق هەرایەك بنێتەوە كە جارێ كاتی نەهاتووە،

بەڵام هەندێ کەسانی تری بەناوێ وەك (بوغۆس نۆبار پاشا) سەرکردەی باڵی سیاسی و دیپلۆماتی دۆزی ئەرمەن، پیتاکێکی زۆریان پێشکەش کرد.

٧٠- دیکران میزروب کالیجیان:

The Armenian Revolutionary Federation`under Ottoman Constitutional Rule 1908-1914

(کە نامەیەکی دکتۆرایە بۆ زانکۆی بۆستن لە ٢٠٠٢دا) ل٢٩٦ - ٣٠١،

کالیجیان پەنای بۆ ئەرشیفی یەکیەتی شۆڕشگێڕانی ئەرمەن بردووە لە بۆستن، دەڵێ: چەکەکان بۆ بەرگری کردنبوون لەخۆ، بەهۆی پشێوی وەزعەکەوە لە هەرێمەکەدا. ل٢٩٦ بەڵام لەسەری دەڕوا و دەڵێ: وەزعەکە گەلێ باشبوو ئەم رایەش هی کونسوڵە ئەوروپاییەکانیش بووە. سەیر لەوەدایە کە کالیجیان دەڵێ: تەحسین پاشای والی ڤان، گەلێ چالاکبووە و لەکاردا بووە، بە پێچەوانەی زوربەی ئەوانەی پێش خۆی، لە ئەهێشتنی دزی و ڕاوو ڕوت لەناوچەکەدا، زوربەی ئاژاوەگێڕە ناودارەکانی گرت و بەهۆی جینایەتەکانیانەوە هەندێکی ئیعدام کرد (ل٣٢٣) دیارە مەبەستی کالیجیان لە (ئاژاوەگێڕەکانی ناوخۆ) کورد و عەشایرەکانە.

٧١- فایلی ١٩٥/٢٩٤٩ لە مۆلینۆ-سیل بۆ لۆدز، ڤان ١٧ شوبات/فەبرایر ١٩١٣

) ١٩٩١Teotik Slnamesi (Istanbul: dahiliye nazaret. -٧٢

: Y, cark Turk ١/٢٢/٢-٢٢: BOA DH MUI, number ٢٥٣p

Devleti Hizmetinde Ermerniler (Istanbul: Yeni Matbaa

: M. sadi Kocas Tarihte Eremeniler ve Turk ١٧٥) p ١٩٥٣

١٢٤) p ١٩٩٠Ermeni Hiskileri( Istanbul: Katas

وە ئەوەی پەیوەندە بە سیستمی شاروانیەکانەوە لەناو سەڵتەنەکەدا بڕوانە کتێبی:

Tanzimattan cumhuriyete yerel Ilber ortayli
Yonetim Gelenegi (Istanbul: hil 1985)p 9

وەکتێبی :

Mehm et ali Gokacti Dfimyada ve Turkieyede (Belediyecilik (Istanbul ozan 1996

وە کتێبی:

Ilhan Tekeli Turkiyede Belediyeciligin Gelisimi ((Ankara. N.p 1982

گشت ئەم سەرچاوانە لە کتێبەکەی (حەسەن ئوکتای)دا ناویان براوە:

On the asassination of van mayor Kapamaciyan by the Tashnak committee, Review of Armenian Studies 1, no 1 (2002) p 79 - 89

زۆر لەو سەرچاوە و زانیاریانەی لێرەدا هاتوون و پەیوەستن بە (کاباماسیان)ەوە ، لەم وتارەوە وەرگیراون.

٧٣- BOA DH SYS ١٠٩/٢ - ١

٧٤- هەروەها.

٧٥- هەروەها: ٢ - ١٠٩/٢

٧٦- بگەڕێوە بۆ (بەشی سێ) حیزبە شۆڕشگێڕە ئەرمەنیەکان، وە لە (بەشی چوار)دا: یاخیبوونی ١٨٧٦، وە لە (بەشی پێنج)دا: سەرکردەکانی حیزبی تاشناق. هەروا کتێبی:

Ermeni Komitelerinin Aamal ve Harekut - I (Ihtilaliesi (Istanbul: matbaa - I Amire 1332

٧٧- فایلی ٢٤٤٩/٣٧١ لە مۆلینۆسیل بۆ لۆدز، ڤان ١٣ کانوونی دووو/ یەنایر ١٩٠٩. boa dh sys ١٠٩/٢ - ٢ وە هەرەو فایلە: ٩ کانوونی دوو/یەنایر ١٩١٣، نێردراوە ئامریکاییەکان دەیانگوت کە کوشتنەکەی کاباماسیان یەکێکبووە لە چەندەها کاری کوشتن و تیرۆرکردن کە لەو دواییەدا لە شارەکەدا دەکران (ج.س.ڕاینۆڵدز) ڕاپۆرتی هاوینەی ساڵی ١٩١٣ لیژنەی ڕێپێدراوە ئامریکاییەکان ٧،٩،١٦ نێردراو بۆ ڕۆژهەڵاتی ترکیا ١٩١٠ - ١٩١٩، بەڵگەنامەکان،

جزمی ۲۵ ا، ژمارە ۱۱۲ Report of van station نێردراو بۆ رۆژەلاتی تركیا ۱۹۱۲-۱۹۱۳.

۷۸- BOA DH SYS ۲/۱۰۹ - ۲كوڕەكەی كاباماسیان كە ئەندامبوو لە حیزبی تاشناقدا، یەكێكبوو لەوانەی شایەدیان دا.

۷۹- BOA DH SYS ۲/۱۰۹ - ۱۱ - ۲/۱۰۹ - ۲

۸۰- هەروەها: ۱٦ — ۱۵ - ۱۰۹/۲

۸۱- هەروەها: ۱۱ - ۱۰۹/۲ بۆ زیاتر زانین لەبارەی كاردانەوەكانی ئەو كارە تیرۆریستیە و دادگەیی كردنەكە بەلای ڕای گشتیەوە، بڕوانە: BOA DH SYS ۲/۱۰۹ - ٤

۸۲- هەروەها: ٦ - ۱۰۹/۲

۸۳- هەروەها: ۷۰ - ۱۰۹/۲

۸٤- بۆغۆس نۆبار پالێوراوە بەلژیكیەكانی پێ باشتربوو، چونكە لەو هیوایەدا بوو كە لە ڕێی زاواكەیەوە كە لە ئەنجوومەنی بەلژیكدا پلەی بەڕێوەبەری گشتی هەبوو، كاریكاتە سەریان و ڕایانكێشێ بەلای دۆزەكەیاندا، بەلام پابەند بوو بەو فەرمانانەی كە بۆی دەهات و ئیتر دەگەڕا بۆ پالێوراوی هۆلاندی.

۸۵- (ڤان دیر دۆسن): The Question of Armenian Reforms. P۲۵

۸٦- (ل.س.ویستنیك):

Diary concerning the Armenian Mission, Armenian Review. 39. no I (spring 1986) p30

۸۷- بەیاننامەی وەزیری ناوخۆ، نیسان/ ئەپریلی ۱۳۳۰، وە ۲۸ نیسان/ئەپریلی سالی ۱۹۱٤.

DH.KMS.D: 2 - 2/5 F:20-1 / Dahiliya Nezaretinin 15 nisan 1330 tarhili otama yazisi

هەروەك لە كتێبەكەی (زمكەریا تركمان)دا باسكراوە:

Birinci dunya savasi oncesinde Ittihat ve Turki Hukumetinin Dogu Anadolu Islahat projesi ve uygulamalari Yedinci Askeri Tarihi semoneri Bildirileri, vol 2 (Ankara Genelkurmay Basimevi 2001) p 258

هەر گەمێ پاش دانانیان هەر پشكنەرە و بڕی ٢٠٠ لیرەی بۆ مەسرەفی هاتوچۆ و ڕێگە لە سنووقیكی تایبەت وەرگرت (٢٥ ئەیار/مایۆ ١٩١٤ ڕێكەوتن) ئەم پشكنەرانە بە لێپرسراوی عوسمانی دەژمێرران، بۆیە شوێنی مانەوەیان بۆ دابین كرا، (ویستنیك) بەر لەوەی ئەو شوێنانە ببینێ بە (قەسر - كۆشك) وەسفی كردبوون، هەروا هەركامیان مووچەیەكی مانگانەی ٤٠٠ لیرەیی زێڕی بۆ بڕرابۆوە لەلایەن دەوڵەتی عوسمانیەوە:

.BOA.DH.KMS,D: 23/3 F: 20

I, Dahiliya Nezaretinin 21 Maps 1330 tarihli yazici

هەروەك لە كتێبەكەی (تركمان)دا لە ل٢٥٨دا باسكراوە. ساڵێكیان دەوڵەت بەبەهای ٦٧ كیلۆ و ٧٢٠ گرام زێر مووچەی سەرف كرد، ئەگەر ئەم بڕە بە نرخی ئەمڕۆ داشكێنینەوە ئەوا مووچەی هەر مانگێكی پشكنەرێ بەرامبەرە بە ٢٥٠٠٠٠ هەزار دۆلاری ئامریكایی.

٨٨- ڕێكخراوی ئەرمەن: Garegin (Garo) pasdermadjian

كە بە (ئەرمەن گارۆ)ش دەناسرا لەم دواییەدا، لەیەكەم جەنگی جیهانیدا چەتەكانی دەكردە سەر هێزەكانی عوسمانی و دژیان شەڕی دەكرد.

٨٩- ویستنیك: Diary concerning the Armenian Mission.

٣٧P

٩٠- هەر ئەوەی پێشوو.

٩١- كالیجیان: The Armenian Revolutionary Federation.

٢١٧P

٩٢- هایگ غۆسۆیان:

The Epic story of the self Defense of Armenians in the historic city of Van

(سامۆیل. س. تار بینسیان) تەرجەمەی کردووە،

Detroit: General Society of Vasbouragan, Raven ) publishers - AKA, 1967)p 3

٩٣-ئەناهید میناسیان، ڤان ١٩١٥ کتێبی: Armenian Van/ vaspurakan

چاپی: ریتشارد. ج. هوفانیزیان (کوستامیسا، کالیفۆرنیا: دەزگەی مازدا بۆ بلاوکردنەوە ٢٠٠٠) ل٢١٢، وە کتێبەکەی (غۆسۆیان):

The Epic story of the self Defense.. p 3

٩٤- کتێبەکەی (تیرمیناسیان) ، ڤان ١٩١٥ ل٢١٢

٩٥- کتێبەکەی (غۆسۆیان):

The Epic story. P 3

٩٦- کتێبی: Y.Hiket Boyur, Turk Inkilabi Tarihi جزمی دوو، بەشی سێ: Ankara Turk tarih Kurumu ١٩٨٢ p ١٨٧.

## بەشى هەشتەم
## يەكەم جەنگى جيهانى و ياخيبوونى ئەرمەن لە "ڤان"

(( سەبارەت بە لێپرسراوێتیە سەربازیەكان ، پارتیزانەكان دەبێ قەلاچۆى هێزە بچووكەكانى دوژمن بكەن و هێزە گەورەكانيشى وەڕس و بێهێزكەن، پەلامارى كەناڵەكانى گەياندنى تايبەت بە دوژمن بدەن، بنكەى وا دامەزرێنن كە تواناى پاڵپشتيكردنى هێرشى سەربەخۆى هەبێ لەوديو ريزەكانى دوژمنەوە، تا دوژمن ناچاركرێ هێزەكانى پەرتەوازە كات، گشت ئەم چالاكيانە پێكەوە هەماهەنگبن لەگەڵ چالاكيەكانى لەشكرە نيزاميەكان لەبەرەدوورەكانى شەڕدا.))

ماوتسى تۆنگ

لە بارەى شەڕى پارتيزانيەوە ساڵى ١٩٣٧

### ● ڕەوشى سەربازى ناوچەكە

لەدەستپێكى يەكەم جەنگى جيهانيدا، ڕووسەكان لەناوچەى قەفقاسدا لەهێزى خۆيان زۆر دڵنيا نەبوون، هەروەك جەنگاوەرانى دى، وايان دەزانى كە شەڕەكانى دژ بە ئاڵمان و نەمساييەكان لەنەوروپا چارەنووسى ڕێڕەوى جەنگەكە ديارى دەكەن و ڕووسيش ناچار دەبێ پەنا بباتە بەر تەواوى هێزى خۆى، لەبەرامبەردا هێزى عوسمانيش پەكى لەسەرباز نەكەوتبوو،

بەڵام هەمیشە ڕووسیا لە ڕووی ژمارەی سەربازەوە لەبەرەی ئەنەدۆڵ – قەفقاسدا بەسەر عوسمانیەکاندا زاڵتربوو، کە فەیلەقی دوو و سێی ڕووس لە قەفقاسیاوە ڕەوانەی بەرەی ڕۆژاوایان کرا، جێگەکەیان بە فەیلەقەکانی ترکستان و یەکە قۆزاقیەکان پڕ کرایەوە، کەمێ بەر لەجەنگ ژمارەی هێزەکانی ڕووس لە باشووری قەفقاس نێزیکەی ١٠٠٠٠٠ هەزار سەربازی پیادە و ١٥٠٠٠ هەزار سوارە و ٢٥٦ تۆپ دەبوو، هەروا ١٥٠٠٠٠ هەزاری پەدەگی تریش لەناوچەی قەفقاسەوە کێش کران.

سەرەڕای ئەم باڵادەستیە لە ڕووی ژمارەی سەربازەوە، کەچی وایان هەستدەکرد کە ئەگەر عوسمانیەکان بڕیاری شەڕ بدەن، توانایان سنووردار دەبێ، بۆیە بۆ زامنکردنی بەرگری کردن هێشتنەوەی هێزێکی گەورەیان بە زەرووردتی شەڕەکە دەزانی، ئەمە گەر هاتوو بڕیاری ڕامالْکردنی ئەنەدۆڵیان دا، ئەوا ژمارەی ئەو هێزانەی بەرگریدەکەن زیاتر دەبێ لەوانەی هێرش دەبەن. ئەمەش لەڕووی سەربازیەوە ناگونجێ بۆیان. بۆیە ڕووسەکان پلانی هێرشێکی داگیرکردنی دیاریکراویان بۆ دۆڵی (ئالشکیرت) کە دەکەوێتە دامێنی لاپاڵەکانی خوارووی (بایەزید و دیادین و کاراکیلیس)ەوە، دارشت، ئەمەش بە ئامانجی بەهێزکردنی بەرگری کردن لە سەر سنوور دژ بە عوسمانیە داگیرکەرەکان و دەستگرتن بەسەر ئەو ڕێگە سەرەکیەی کە ڕۆژهەڵات بە ڕۆژاواوە دەگەیەنێ. ئیتر بەر لە تامین کردن و چەسپاندنی سەلامەتی ڕێگەکانی خۆیان هیچ کارێکی دوژمنکارانەیان نەکرد.

بە درێژایی ئەو خاڵە سەرەکیانەی کە دەشێ لە ئەنەدۆڵەوە پەلاماربدرێن، سوپای ڕووس لە قارسەوە تا ئێران خۆی لە وەزعێکی بەرگریدا هێشتەوە، مەترسی مەزنتری ڕووسەکان لەسەر هەرێمی ڤان لە ڕۆژهەلاتەوە خۆی پیشاندەدا، ئەوەش کە لە ١٩٠٨دا پاماڵی ئێرانیان کرد و بەهاتنی ساڵی ١٩١٤ باکووری ڕۆژاوای ئێران بە فیعلی لەژێر باری قورسی

داگیرکردندا دەیتالان.

ئەو ناوچەیەی باسکرا ببووە درێژبوونەوەیەکی دەستەڵاتی سەربازی ئیمپراتۆری ڕووسیایی. هێڵی ئاسنی ڕووس گەیشتە تەورێز، لقێکیشی لێوەی گەیشتە کەناراوی سەرەوەی دەریاچەی ورمێ.

سروشتی تا ڕادەیە تەختایی زەویەکە لە دۆڵی ڕوباری (ئاراس) بۆ ناوەوەی ئێران بۆ سەربازە ڕووسەکان لەباربوو بەتایبەت بۆ گەیاندنی پێویستیەکانیان پێیان، خۆ هەر کە ڕووسەکان لەدەستپێکی شەڕەکەدا دەستگرن بەسەر خاڵەکانی پەڕینەوەدا لە بایەزید، ئیتر ڕێگە سەرەکیەکانی نێوان ڕووسیا و ڕۆژاوای ئێران دەکەوێتە ژێر دەستیانەوە، وە دەشتوانن دەستیش بگرن بەسەر باڵی چەپی عوسمانیدا.[1]

سوپای سێی عوسمانی کە پێك هاتبوو لە ٧٩ - ٨٠ هەزار کەس لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕووبەڕووی سوپای ڕووس بۆوە، لەگەڵ ئەوەی کە پلانی ستراتیژی عوسمانی لە ئەساسدا وەك ئەوەی ڕووسا بەرگریکردن بوو، خۆ ئەگەر ڕووسەکان بڕیاری هێرشکردن بدەن ئەوا سوپای سێ لە دەشتی ئەرزرۆمدا کۆدەبێتەوە و دەتوانێ بۆ بەرەنگاربوونەوە سەربازی تریش لە ڕۆژاواوە کێشکات. بڕیاریش وابوو کە سوپای سێ بۆ پەلاماردانی خوارووی قەفقاس لە ئامادە باشیدابێ، ئەمە لە کاتێکدا ئەگەر ڕووسەکان سستی و لاوازیان نواند، فیرقەیەکی سوارەش کە لە دەربەنی (بارگیری) بوو و فیرقەیەکی دەرەکی گەڕۆك کە لە ڤان جێگیر بوو نێررانە خاڵێکی نێزیك بە سنوور لەگەڵ ئێراندا[2].

فیرقە دەرەکە گەڕۆکەکە پێکهاتبوو لە یەکەی گەڕۆك و پاسەوانی سنوور، هەرچەندە ئەم فیرقەیە و هاوشێوەکانیشی لەوانەی لە هەرێمەکانی ترەوە هێنرابوون سەربازی زۆر وریا و کارامەیان تێدابوو. لە ئاشتیدا دەرەك وەك پۆلیسێکی نیمچە سەرباز لە ناوچەی ناسەقامگیر کاریان دەکرد و

لەحاڵی مەشقکردنێکی بەردەوامیشدا بوون، زیاد لە هەر لایەکی تر لەمەیدانەکەیان دەزانی و لێی شارەزابوون.

بەڵام دوو چەڵەمە بوونە هۆی ئەوەی دەرەك نەکرێتە سەربازی نیزامی: یەکەم کەلوپەلی قورسیان پێ نەبوو (بەتایبەت ڕەشاشی ئۆتۆماتیکی قورس) کە بۆ بەرەنگاربوونەوەی هێزی پڕ چەکی ڕووسی زەرووربوو،[٢] دووەم دەرەك بڕبڕەی پشتی ئاسایشبوو لە هەرێمی ڤان. جا کە دەنێررانە بەرەی شەڕ ئەوا ژمارەی ئەو دەرەکانەی پێویستبوون بۆ تەواوکاری ئەرکی پۆلیس زۆر کەم دەبوونەوە[١]، لەگەڵ ئەمەشدا کەچی چار نەبوو بۆ شەڕەکەش پێویستبوون.

بەبەراورد لەگەڵ ڕووسدا، عوسمانێکان لە ڕووی هۆی گواستنەوە و گەیاندنەوە کز و کەمدەستبوون، بەڵام لە ڕووی جوگرافیەوە، لەوەی دەکرد کە جێگە و پێگەیەکی باشتریان بووبێ و تیا گردببوونەوە، دەریاچەی ورمێ لە ئێران تا دەگاتە دەریای ڕەش هێڵێکی درێژ بوو کە ڕووسەکان تیا بڵاوببوونەوە. جووڵەی سەربازانی ڕووس و هێنانی ئازووقە و خۆراکیان لەو دەوروبەرەدا ئەنجام دەدا، بەڵام عوسمانیەکان پشتیان بە ڕێگە ناوخۆیەکانیان بەستبوو کە بۆ هاتوچۆ کورتتر و خێراتر بوون، کەمیی هێڵی ئاسن لە ڕۆژهەڵاتدا بایەخی ئەم خەسڵەتە باشەشی کەمکردبۆوە، نزیکترین هێڵی ئاسن کە بۆ بەکارهێنان دەشیا و نێزیکبوو لە ڤانەوە بە دووری ٥٠٠ میل کەوتبووە (سیواس)ەوە، هێڵێکی تر هەبوو لەنێزیك شاری ماردین ولە خوارووی ئەنەدۆڵ، ئەمە کەمێ نێزیکتر بوو بەڵام ئەو ڕێگایانەی بەڤانی دەگەیاندن باشنەبوون.

جگە لەمە دەبوو لە نێزیك (نەدەنە)وە کەل وپەلەکان لە لۆریەکانەوە داگیرێ بۆ ئەوانی تر کە بە ڕێی خواوردوە ببرایە، ئەمەش بەهۆی نەبوونی تونێلەوە لە شاخەکاندا.

جگە لەمانەی باس کران، هەرچۆنێکبێ هێڵە ناوخۆییەکان پێگەیەکی باشتریان دابووە عوسمانیەکان، ڕێگەوبانی گەیاندن بۆ ئەمان حاڵی باشتربوو، خزمەتگوزاری تەلەگرافیشیان لە زۆربەی ناوچەکانی رۆژهەڵاتا باشبوو بەڵام دوایی دەرکەوت کە ئەو هێڵە تەلەگرافانەش وەك باقی ڕێگە و بانەکانی تر ببونە ئامانجێکی ئاسان بۆ چەتەکانی ئەرمەن.

لە ڕووی بەرگرییەوە هەردوولا وەك یەك سوودمەندبوون لە سروشتە شاخاویەکەی رۆژهەڵات، سەرباری دەستەڵاتی رووسەکان بەسەر رۆژاوای ئێراندا، بەڵام عوسمانێکان دەستیان بەسەر دەربەند و تەنگەکاندا گرتبوو، هەر لە رۆژاوای ئێرانەوە تا تەنەدۆڵ، جگە لە هەندێ بەشی بچووکی خاکی ئێران کە پێش جەنگەکە داگیریان کردبوو، بەرامبەر ئەمە رووسەکانیش بە توندی دەستیان گرتبوو بە ناوەوەی رووسیا و ناوچەکانی سەر سنوور، لەمەدا سەرکەوتوو بوون، چونکە هەر لە سەرەتای جەنگەوە ئەو ئاژاوەگێڕە موسڵمانانەی کەوا چاوەڕوان دەکرا پشێوی بنێنەوە، لە ناوچە سنووریەکانەوە گواستیاننەوە، ئەمەش یەکەم ڕاگواستنێکی بەکۆمەڵبوو لەو جەنگەدا.

بەڵام عوسمانیەکان تووشی کێشەیەکی دوولۆنەیی ببوون، شۆڕشگێڕانی ئەرمەن و عەشایرە کوردەکان کە بەلایەنی کەمەوە وەلاو پشتگیریەکی بەمەرجیان پیشان دەدا.

لەشکری عوسمانی زیاتر لە لەشکری ڕووس دوچاری دەرد و نەخۆشی دەبۆوە، بە زۆریش هۆی ئەوە دەگەڕایەوە بۆ خراپی پشتبەستن بە ڕێوشوێنە دروستەکان، چونکە داکەوتنی درمی تیفۆس لە زستانی ١٩١٣ - ١٩١٤ لەشکری عوسمانی پەرێشان کرد، ئەو زانیاریانەی کە لەبارەی تەلەفیاتەوە دەخەملێنران ئاماژەیان بەوە دەدا کە درمەکە هێکجار ترسناك بووە (هەر بۆ نموونە ٢٥٠٠ کەس لە هەرێمی ڤان تووشببوون.[٥] . دیسان سەرلەنوێ لە ناو

سوپادا درمەکە لەکاتی گردبوونەوەمیاندا لەسەر سنووری رووسیا ساڵی ١٩١٥ تازە بۆوە، داوبی دەرکەوت کە تیفۆئید و تیفۆس و کۆلێرا گەلێ ترسناکتر و مەترسیدارتربوون لە گوللەی چەکەکانی دوژمن بۆ سەرباز و مەدەنییەکانیش.[٩]

لەگەڵ ئەو خاڵە لاوازانەی عوسمانیەکاندا، رێڕەوی شەڕی رۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵ ئەگەر هەر لە حاڵی بەرگریدا بمایەتەوە، ئەوا بە شێوەیەکی جیاوازتر دەگۆڕرا، لەوانەبوو بتوانن بە ژمارەیە سەربازی کەمەوە ئەو ئەنگە و دەربەنانەی سەرسنووریان لەدەست نەچێ و هەر بەدەست خۆیانەوە بووایە، بگرە بشیانتوانیبا پێشڕەوی بکەنە ناو رۆژاوای ئێرانەوە، رووس ناچارکەن بەوەی لە جێی خۆیان داسەکنێن، ئەم پاڵەوانێتیەش بە توانا و کەرەستەیەکی کەم دەهاتە دی.

بەڵام عوسمانیان لە حاڵی بەرگریەکەیاندا نەمانەوە، چونکە (ئەنوەر پاشا)ی وەزیری جەنگ خەوی بەوەوە دەدی کە لە بەرەوڕووبوونەوەی رووسەکاندا سەرکردەیی هێزەکانی خۆیان بکا و ئەوان بشکێنێ و ئینجا یاخیبوونێکی فرەوانی موسڵمانەکانی خوارووی قەفقاس هەڵگیرسێنێ و بەریانداتە گیانی رووسەکان.

## • سەری قامیش

لە یەکیی تشرینی دوو/ نۆڤامبری ١٩١٤ سەڵتەنەی عوسمانی چووە ناو یەکەم جەنگی جیهانیەوە و تیابەشداربوو، بەپێی ئەو پلانانەی دارێژرابوون شەڕە سەرەتاییەکانی نێوان عوسمانیان و رووس لە بەری رۆژهەڵاتدابوون، رووسەکان هاتنە خواردوە و دۆڵی (ئەلیشکیریت) و شارەکانی (کاراکلیسە، بایەزید و دیادین)یان گرت، کەمێکیش لە بەرامبەر سەربازانی (حەسەن عیززەت پاشا)دا شکان، بەڵام لە بەری خوارووی رۆژهەڵاتەوە بە ناشکرا

دیاربوو کە ژمارەی سەربازە عوسمانیەکان بەشی بەرگریکردنی نەدەکرد.

لە مانگی یەکەمی شەڕەکەدا، لەشکری ڕووس لە نێران (قوتور)ی گرت کە کەوتبووە سەر ئەو ڕێگەیەی (خۆی) دەگەیەنێ بە ڤان، ئیتر لێرە لە شوێنەکانی خۆیاندا مانەوە، (دیر، بشکالە)ش لە کردەیەکی سەربازی لەپڕدا گیران، بەڵام ئەمە بە پاماڵکردنێکی فرەوانی ڕووس دانەدەنرا، ژمارەیەکی باشی سەربازانی عوسمانی بۆ قایمکردنی هێڵەکانی بەرگرییان لەوناوە بوون، لەوانەیە بۆ تێکشکانی هێرشێکی ڕووسیاییش بووبن بەڵام ئەم سەربازانە نێرران بۆ شوێنی تر.

پلانەکانی ئەنوەر پاشا هێند گۆڵی بە بەرگریکردنەوە هەڵنەگرتبوو بایەخی پێ نەدابوو، لە مانگی کانوونی یەك/دیسامبری ١٩١٤ ئەنوەر چەند یەکەیەکی بۆ بەهێزکردنی سوپای سێی بانگکرد[٧]، ئینجا لە هێرشێکی بێ تاماندا ئەم سوپا زەبەللاحەی سێی ڕەوانەی ناو خاکی ڕووسیا کرد.

هێزەکە پێکهاتبوو لە ٩٥٠٠٠ هەزار سەرباز کە زۆر لەباربوو بۆ بەرگریکردن، بەڵام نەدەشیا بۆ بڕینی ئەو تەنگە و دەبەندە سەختە شاخاویانە لە کەشێکی زستانی ئاوادا، بەمەرجێ سەربازەکان لە جلە هاوینەکانیان زیاتر لە بەردا نەبوو، چەکێکی کەمیشیان لەلابوو. کەچی ئەنوەر هیچ گوێی بە موچیاری ژەنەراڵەکانی نەدا و ئەو پیاوانەی بەو شاخ و کێوانەی باکووری ڕۆژەڵاتدا بە پێڵاوی پەڕپووت و بێ پاڵتۆی زستانە و بێ سووتەمەنی ڕەوانە کرد.

پلانەکەی لەوەدا بوو کتوپڕ بدات بەسەر ڕووسدا، لە کاتێکدا ئەوان وایان دانابوو کە هیچ سوپایەك زاتی ئەوەی نییە بەو زەیقەتی زستانە بداتە ئەو شاخ و کێوانە و ئەو بەربەستە بەفراوی و زوقمە ببڕێ. جا ئەوە بوو ڕووسەکان غافڵگیر کران و شتەکە بووە کتوپڕ بەلایانەوە، لەشکری ترکیش بە وردیەکی جێگیرەوە دژ بە سوپای ڕووس و سەرما و زمهەریر دەجەنگا،

زۆربەیان هەر سەرما كوشتنی و ڕەق هەڵاتن، ئینجا ڕووس هاتە پێش بۆ ئەوەی لەو سوپایە مابۆوە و لەو شارۆچكەیە كە پێیان دەگوت (سەری قامیش) توانی ڕایانگرێ.

زیانەكانی كشانەوەی سوپای ترك لە زیانی پەلامارەكەی تێپەڕاند، لەو ٩٥٠٠٠ هەزار سەربازە ٧٥٠٠٠ هەزاریان تیاچوون زۆربەی تۆپەكانیشیان تێكشكێنرا. ئەو سوپای سێی عوسمانیەی كە دەبوو بەرگری لە ڕۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵ بكردبا لە نێوەڕاستی مانگی كانوونی دوو/یەنایری ١٩١٥ تەنیا ١٨٠٠٠ هەزاری مابۆوە، یانی بەرامبەر ٢٠٪ی هێزەكانی بەر لە شكستەكەی (سەری قامیش).

هەرچەندە پاڵپشت و كۆمەكی تری لە گشت عەمبارە سەربازیەكانەوە بە گورجی پێ گەیشت بەڵام تەنیا بەرەنگاری ٣٠٠٠٠ هەزار سەربازی ڕوسیایی لەناوچەكانی باكووری ڕۆژهەڵاتی پێ كرا، ئەمەش بزانە ئەمانە لەچاو ئەوانەی لەسەری قامیشدا تێكشكان زۆر نەكردە و نەشارەزا بوون[٨].

هەتا بەر لەشەڕەكەی سەری قامیش، هێزە بەرگریە عوسمانێكان بە ژمارەی كەم كەم بەدرێژایی بەرەی ڕۆژهەڵات وەك تۆو وەشێنرابوون، یەكە بێ هێزەكانیش كەلە ڕووی چەك و كەل و پەلەوە شتێكی ئەوتۆیان لەلانەبوو، وەك فیرقەی دەرەكی كەرۆكی ڤان، بەرەڵلا كرابوو تا بە تەنیا ڕووبەڕووی پەلامارەكانی ڕووسەكان ببێتەوە، لە بەرامبەردا ئەو هێزانەی كە زەڕووری بوون كۆكرابوونەوە تا ئەو هێرشەی ئەنوەر پاشا بۆ باكوور، كە بە باشی تاوتوێ نەكرابوو و پێویستیشی نەدەكرد، بكەن.

لە ئاسەوارە خراپەكانی شكستەكەی سەری قامیش، نەبوونی سەربازی پێویست بۆ زامنكردنی پاراستنی ئاسایشی ڤان، لەملاشەوە هێزەكانی ڕووس گورج لاوازبوونی عوسمانیەكانیان بە هەل زانی تا بكەونە خۆ و بێنە پێش. لە ٢٩ تشرینی دوو/ نۆڤامبری ١٩١٤ سەركردەی فیرقەی دەرەك (كازم - ئوز

ئاڵپ) بنکەی سوپای سێی بەو ڕاپۆرتە هەواڵگریانە ئاگادارکردەوە کە نووسیبووی: ئەمڕۆ، دوژمن پەلاماری شارۆچکەی (دیر)ی دا، بە تۆپ و ڕەشاشی ئۆتۆماتیکی هێرشیان کرد، هێزی بەرگریمان زۆر کەمە، وای دەبینم کەناچار دەبین بکشێینەوە بۆ (هوشاب) . بەپێی قسەی دوو جاسووس کە گرتومانن، زانیومانە کە لەناو شاری ڤاندا ڕاخیبوونێك لە ئان و ساتدایە، بۆیە وا لەگەڵ یەك لەو کەتیبانەی وان لە (سارای)دا بەرەو هوشاب دەبەینەوە، بەلام لەبەر لاوازی هێزەکانمان ، ئەگەر ڕاخیبوونێك ڕوبدات تووشی نارەحەتیەکی گەورە دەبینەوە، ئەو هێزانەی بەتەماین لە (ریڤانیز)دوە بگەن نەگەیشتوون.[9]

سووپای ڕووس پێشرەویەکەی خۆی بە داگیرکردنی (بشکالە) تەواو کرد، بەلام سوپای عوسمانی لە خوارووی رۆژهەلاتی ڤان و لەسەر سنووری ئێران هەلێکی کورتخایەنی قۆستەوە، ئەویش کە ڕووسەکان زوربەی سەربازەکانیان لە کۆتایی کانوونی یەك/دیسامبری ١٩١٤ کشاندەوە، لەترسی ئەوەی نەك هێرشەکەی سەری قامیش سەربگرێ و سەرکەون، ئینجا هێزە غەیرە نیزامیە عوسمانێکان کە تێکڕایان پێك هاتبوو لە عەشایرە کوردەکان، لە ١٤ کانوونی دوو/ یەنایری ١٩١٥ شاری تەورێزیان گرت. بەلام لە باشوور، عوسمانێکان توانیان هەندێ شوێنی ستراتیژی لەتەنگەی (قوتور) و شارۆچکەی (دیر) بگرنەوە، بەلام لە ٣٠ کانوونی دوو/یەنایر دیسان ڕووسەکان تەورێز و دیلمانیان سەرلەنوێ گرتەوە. عوسمانیەکانیش بە دەستەلاتێکی لەرزۆکەوە (قوتور و دیر و بشکالە) کە گرتبوویان، دەیانپاراستن.[10]

زستانی ساردی ساڵی ١٩١٤ دەستی ڕووسەکانی گرتبوو و گشت پێشەوە چوونێکی خۆیان ڕاگرت، بەفر ڕێگە و بان و تەنگەو دەربەنەکانی گرتبوو، ئەمە بۆ عوسمانیان هەلێکی باشبوو، تا پاڵپشت و کۆمەك لە خوارووی

ڕۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵەوە بێنن، جا لەمەدا توانیان هەندێ هێزی زیاتر بهێننە ناوچەکەوە، بەهاتنی مانگی نادار/مارس ١٩١٥ ژمارەی هێزە نیزامیە عوسمانیەکان گەیشتە ٢٤٠٠٠ هەزار سەرباز جگە لە ژمارەیەکی نەزانراو و سەرژمێرنەکراو لە شەڕکەری غەیرە نیزامی سەر بە سوپای سێ[11].

هێزەکانی هەڵمەتی یەکەم لە ئەستەموول و شوێنانی ترەوە لە کۆتایی کانوونی یەك/دیسامبر ١٩١٤ کۆکرانەوە، تا ئەوانیش بخرێنە پاڵ هێزە عوسمانیەکان لە ڕۆژهەڵات.

بەتوانەوەی بەستەڵەك و بەفرەکەی زستان ڕووسەکان زیانی عوسمانیەکانیان بەهەل زانی، بۆ پەلاماری ئەو بەهارەی ١٩١٥ ڕەخساندیان، ئائومێدی و هیوا بڕان هێشتا لە ڕەوشی ترکدا دیاردی نەدابوو، چونکە هێشتا هەندێ خاڵی بەرگری بەهێزیان بەدەستەوە مابوو. شتێکی باشتریان بۆ خۆیان دەستخست، ئەویش هێڵی گەیاندن و گواستنەوەی کورتتر و خێراتربوو لەناو وڵاتدا. بەڵام ئەم واقیعەش تا سەر نەبوو، یاخیبووە ئەرمەنەکان هەرچی باشترێك هەیە زەوتیان کرد.

## • ئامادەکارییە سیاسیەکان بۆ یاخیبوونەکەی ئەرمەن

نەتەوەییە ئەرمەنەکان جەنگەکانیان بە هەلێك دەزانی بۆ یاخیبوونی خۆیان، (لویز نالبەندیان) کە مێژوو نوسێکی بزوتنەوەی شۆڕشگێڕی ئەرمەنەکانە، دەنووسێ: باشترین کاتێك سەبارەت بە شۆڕشگێڕان بۆ بەرپاکردنی دەرەتانێك بۆ یاخیبوونێکی گشتی بە مەبەستی هێنانەدی ئامانجی ڕاستەوخۆ لەوەدا بوو کە ترکیا بچێتە جەنگەوە[12].

هەروەك چاودێرانی تر، بەلای شۆڕشگێڕانی ئەرمەنەوە تێشکانی عوسمانیەکانیان لە هەردوو شەڕی بەلکاندا ١٩١٢-١٣ باشترین بەلگە بوو بۆ هەرەسی عوسمانی، ڕووسیا لە شەڕی ١٨٧٧-٧٨ کە بەهێزتر بوو، سەڵتەنەکەی

بەزاندبوو ، جا وەك دەردەکەوت یاخیبووەکان بە باوەڕەوە وای بۆ دەچوون کە ڕووسیا گورج ڕۆژەلآتی ئەنەدۆڵ دەگرێ و لەوانەشە تا ئەستەمووڵ نەوەستێتەوە.

هەر لایەکیش لە تێشکانی عوسمانیەکاندا تاکە هەلێکی دەدیەوە بۆ سەربەخۆیی، تەنیا یەك ڕێی لەبەردەمدا بوو، یان یەك بژاردە، ئەویش دەستخستنەناودەستی ڕووسیا، لۆژیکی خەملآندنەکانی شۆڕشگێران لەمەدا حەکیمانە بوو: وا چاوەڕوان دەکرێ ڕووسیا عوسمانیەکان تێکشکێنێ، ئیتر بەبێ گوێدانە ئەوەی کە ئەم دەوڵەتە ج پەیمانێکی داوە بە ئەرمەن لەبارەی چاکسازی و خودموختاری و هەتا سەربەخۆییشەوە. چارەنووسی ئەو پەیمان و وەعد و وەعیدانە ئەوەیە کە ببنە مەرەکەبی سەر کاغەز چونکە سەرکەوتن بۆ عوسمانیان نابێ، بەمانای ڕووسیا خۆی بڕیارە یەکلایی کەرەوەکان لەبارەی چارەنووسی ئەرمەنەوە دەدا.

شتێکی تەبیعی بوو کە پەیوەندی توندوتۆڵ ڕووسیا و شۆڕشگێرانی ئەرمەنی پێکەوە گرێ دابوو، لەم ڕووەوە (دیکسن)ی کونسوڵ لە ڤان، ساڵی ١٩٠٨ دەنووسێ:

((لەم بارەیەوە شایەنی ئاماژەپێدانە کە شۆڕشگێرانی ئەرمەن لە ڤان و سەلماس لە لیژنەکەیانەوە لە تەفلیس ڕێنماییان بۆ هاتووە، ئەوە دەگەیەنێ کە لە کاتی هەڵگیرسانی شەڕدا ئەوەیان لەسەرە پشتگیری ڕووسیا بکەن دژ بە ترکەکان. بەبێ هاوکاری ڕووسیش دەیانتوانی نێزیکەی ٢٥٠٠ نیشانچی دەستەبەرکەن، هەر بۆ سەغڵەتکردنی ترکەکان لەسەر سنوور پچڕان و بڕینی هێڵەکانی بەیەکگەیشتن[١٣].))

ئەگەر ڕوداوەکانی ڕابردوومان بیرکەوێتەوە، زەحمەتە باوەڕ بکرێ بەوەی شۆڕشگێرانی ئەرمەن هێند گێلبن تا ئەو ئاستەی وایان زانیبێ کە ڕووس سەربەخۆییان دەداتێ ودیان جۆرە خودموختاریەکی فرەوان.

ڕووسیا ڕۆژێ لە ڕۆژان و هەرگیز ئەو بزاڤە جودا خوازیە ئەرمەنیانەی لەسەر ئەو خاکانەی کە وا لەژێر دەستیدان قەبووڵ نەبوو، هەتا ئەو ئاستەی ڕووسیا زیاتر لە جارێك ڕێ و شوێنی گرتۆتە بەر دژ بە گشت بزاڤە جودایی خوازەکانی ناو خاکەکەی خۆی، لەگەڵ ئەمەشدا وا دیارە لە ساڵی ۱۹۱٤ ئەرمەنەکان وایان زانیوە کە ڕووس دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئەرمەنی (زبون)ی بەلاوە پەسەندە، لەناوچەیەکدا کە حوکمکردنی زەحمەتە و لەمۆسکۆیشەوە دورە.

هەروا لە ڕووی سۆزداریەوە دەبێ پابەندبونێك بە شۆڕشەوە هەبێ و ئەمەشبوو کە لە بڕیاردانی شۆڕشی ئەرمەندا دەورێکی گرنگی هەبوو: دەمێکبوو هەستی نەتەوەییە ئەرمەنەکان دژ بە عوسمانیەکان ئاڕاستە کرابوو، شۆڕشگێڕان دەشێ باش پەییان بەوە بردبێ کە – سائیتر ئەمە لە هوشیاریانەوە بووبێ یاننا - کە تاکە ناوچەیەك کە زۆرینەیەکی ئەرمەنی تێدایە، یان هەرێمی یەریڤان، لە ئیمپراتۆریەتی ڕووسیادا سەربەخۆیی بەدەستناهێنێ، لەبەر ئەمە هەردوو حیزبەکەی هانشاك و تاشناق و باقی وردە حیزبەکانی تریش بەهەموو توانایانەوە ئەرمەنی بە ئەسڵ ڕووسیایی و ئەرمەنی باشووریان ئاڕاستە دەکرد.

پلان و پەیامی شۆڕشگێڕیان و گشت ئەو کارە یاخیبوونە یەك لەدوای یەکانەی پێشتریشیان، گشت ئەمانە چاویان بڕیبووە ڕۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵ، بەو پێیەی کە ئەوێ خاکی ئەرمینیای ئایندەیە. ئەمەش پابەندبوون و ئیلتیزاماتێکی بەهێز و نەگۆڕبوو کە ئینکاریکردنی گرانە.

دەستەکەی حیزبی تاشناق لە کۆنگرەیەکدا ئاشکرابوو لە حوزەیران/یۆنیۆ- تەمموز/یۆلیۆ ۱۹۱٤دا گیرا، نێردراوان لە ڕووسیاوە و لەناو سەڵتەنەوە ئامادەی ببوون، بە (ڤاهان پاپازیان)یشەوە کە نوێنەری ڤان بوو، دەنگۆی ئەوەش لە ئارادا بوو گوایە ئەندامانیش لە کۆمەڵەی (ئیتیحاد و

تەرەقی)یشەوە ئامادەی کۆنگرەکە ببوون لە بۆ پێشکەشکردنی پرۆژەی خودموختاری لە ڕۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵدا بە حیزبی تاشناق، بەڵام بەو مەرجەی کە ئەندامانی حیزبەکە لە ئیمپراتۆری ڕووسیا و سەڵتەنەی عوسمانی بەشداری بکەن لە شەڕی دژ بە ڕووس.

تاشناق ئەمەی ڕەت کردەوە، لەبارەیەشەوە کە زانیاریەکان پشت بە سەرچاوە ئەرمەنەکان دەبەستێ، بەڵگەیەکی مەلموس نییە بەڵام هەروا بە ئەگەرێك دەمێنێتەوە کە دەشێ وابووبێ. ئەوەی گومانیشی تیا نییە ئەوەیە کە لەو کۆنگرەیەدا ئەرمەنی عوسمانی بڕیاریاندا کە پابەندبن بە ئەرکی نیشتیمانیانەوە. ئەم بڕیارەش جگە لە فێڵێ زیاتر نەبوو، هەروەك لە ڕاپۆرتە هەواڵگریەکانی عوسمانیەکاندا و قسەی یەك لە سەرکردە دیارەکانی تاشناقدا دەردەکەوێت، ئەویش (هۆفهانس کانشازنونی) سەرەك وەزیرانی کۆماری ئەرمینیا بوو[٥]. پلانە هەقەتیەکەی تاشناق کە هی ئیمپراتۆریەتی ڕووسبوو و حیزب بەڕێوەی دەبرد، بریتیبوو لە دەستخستنە ناو دەستی ڕووسەوە. دەزگە موخابەراتیەکانی سەربازی عوسمانی ئەوەیان دەگەیاند کە بڕیارە نهێنیە هەقیقیەکان کە لە کۆنگرەکەدا گەڵاڵەکران ئەمانەن:

١- بەر لە ڕاگەیاندنی جەنگ، پاراستنی هێمنی و ئاسایش، لەگەڵ بەردەوامی لە ئامادەکاریە سەربازیەکان و هێنانی چەك لە ڕووسیا و ناوخۆوە.

٢- لەکاتی ڕاگەیاندنی جەنگ، وا بڕیارە کە سەربازە ئەرمەنەکانی ناو سوپای عوسمانی بە چەك و کەلوپەلیانەوە بدەنە پاڵ سوپای ڕووس.

٣- لەکاتێکدا ئەگەر لەشکری عوسمای پێشڕەوی کرد، دەبێ هێمنی بپارێزرێ.

٤- ئەگەر لە دواییدا لەشکری عوسمانی کشایەوە یان لە جێی خۆی مایەوە، دەبێ چەند دەستەیەکی شەڕوانان پێکبهێنرێ و زنجیرەیە کارو

کردەوەی ڕێکوپێك بۆ لێدانیان لەپشت ڕیزەکانی سوپاوە بکرێ[16].

ئامادەکاری بۆ جەنگ، کۆمەڵە ئەرمەنیە شۆڕشگێڕەکان لە ناوەڕاستی ۱۹۱۲دا لە ڤان کۆبوونەوە و لەسەر هەماهەنگیکردنی تەقەللا شۆڕشگێڕیەکانیان پێك هاتن. (مۆلینۆ-سیل) کونسوڵی بەریتانی لە ڤان وای دادەنا کە ئەو هاوپەیمانیەی کۆمەڵە و دەستە ئەرمەنیەکان کە هاتۆتە کایەوە لە ئەنجامی ئەو چاوپێکەوتنەی (فارمیان) سەرکردەی حیزبی تاشناقە لەگەڵ دەستەڵاتدارانی ڕووس لە تەفلیس[17].

بەبێ هیچ گومانێ تاشناق لە بارێکی پێشەنگی مێژوویدا بوو، حیزب تۆڕێکی لە بەکرێگیراوانی خۆی لە گشت لایەکی ڕۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵ و ئێران و بەشی ڕووسیا لە قەفقاس دامەزراد، وە دەستکەوتێکی باشی لەو باج و خەراجانەوە دەستدەکەوت کە لە ئەرمەنەکان کۆدەکرانەوە. لەمەش گرنگتر ئەوەبوو کە تاشناق هێزێکی سەربازی گەورەی تایبەت بە خۆیی هەبوو[18].

کاریگەری ئەندامانی تاشناق و هاوشێوەکانیان لە شۆڕشگێڕەکان بۆ سەر ئەرمەن لە ڤاندا ڕەهابوو، بە داهاتنی ساڵی ۱۹۱۳ بەلای (مۆلینۆ-سیل)دوە شتێکی بەڵگە نەویستبوو کە ئەرمەنەکان لە هەرچی وەلا و ملکەچیەکی ساختەیە کە ڕۆژێ لە ڕۆژان پیشانیان دەدا، لێی پاشگەزبوونەوە، بە ئاشکرا پێشوازیان لە ئەگەری داگیرکردنی ئەیالەتە ئەرمەنیەکان دەکرد لە لایەن ڕووسەوە[19].

## • کردە و کۆشە بۆ یاخیبووەکان

لیژنە شۆڕشگێڕیە ئەرمەنەکان لە ساڵی ۱۹۱۰دا لەگشت لایەکی ڕۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵ بڵاوکراوەی لەژێر ناوی (ڕێنماییەکان بۆ بەرگریکردن لەخۆ) بڵاوکردبۆوە، ئەمەش ڕەشنووسێکبوو بۆ ئەو یاخیبوونەی کە بەدوویدا سەری هەڵدا[20].

ڕێنماییەکان بریتیبوون لە نەخشە و پلانی شەڕێکی ڕێکخراوەیی لەسەر ئاستی لادێکانا، وە ئامادەکاری دەروونی وتەرتیباتی ڕێکخراوەیی و تاکە کەسی، پێوانەکانی ڕێکخستن و بژاردەی چەك و چۆنێتی دەستکەوتنی لەناوخۆدا و دابەشکردنی لەناوچەکەدا، جگە لە ستراتیژی بەرەورووبوونەوەی هێزەکانی عوسمانی.

بڵاوکراوەکە بە زمانێکی سادە نووسرابوو، بەمەبەستی چڕکردنەوە و پوختەی فیکرە و باوەڕێکی عەسکەری زۆر ئاڵۆز تا ببێتە فیکرە و باوەڕێکی ئاسان و مولایم لەناو خەڵکە سادە ڕەشۆکیەکەدا، دورو درێژ و عەمەلیشبوون، تیایدا پرەنسیپەکانی شەڕی چەتە گەری و تیپ و دەستەی گەورەی شەڕکەرانی بە قووڵی تێدا خرابوونە ڕوو[21].

ئەرکی ڕێکخستن و سەرپەرشتیکردن درا بوو بەسەر یەکەی تایبەتدا کە لە گوندەکاندا مەشقیان بە ئەرمەنەکان دەکرد، ئەم یەکانەش هەوێنی ڕێکخستنەکانی لادێکان بوون و سەرکردەییان گرتبووە دەست. گوندەکان لە نێوان یەکەی گەڕۆك و یەکەی جێگیر دابەش کرابوون، بەسەر هەر کامیانەوە سەرکردەیەك دانرابوو، هەمووان گوێڕایەڵی دەستەڵاتی ئەوبوون، ئەم سەرکردەیە بەپێی شارەزاییەکەی هەڵبژێررابوو، لەبەردەم سەرکردایەتیە سێ کەسیەکەی هەرێمدا نوێنەرایەتی گوندەکانی خۆی دەکرد.

سەرکردەکانی هەرێمەکان لە سەرکردەی گوندەکان هەڵدەبژێرران، ئەوانەی بەتوانای شەخسی و نفوزیانەوە لەناوچەکەدا ناسرابوون، سەرکردەی هەرێم بەرپرسبوو لە دابەشکردنی چەك و سەندنەوەی لەوانەی ناتوانن بەکاری بهێنن تا بیداتە ئەوانەی توانای بەکارهێنانیان هەیە.

سیستمێکی پۆستە و گەیاندنیش دامەزرا بوو، بۆ ئەو کاتەی کە هێزە ئەمنیەکان دەدەن بەسەر گوندێکدا، دەبوو ئەو پۆستە جبیانە گورج داوای یارمەتی لە گوندەکانی دەوروبەر بکەن.

لادێییە موسوڵمانەکان لەم ڕێنماییانەدا بە نەیار و دوژمن دادەنران، بۆیە لەو گوندە تێکەڵانەی کە ئەرمەن تیایاندا کەمینەیەکبوون داوایان لێ دەکرا کە داوای یارمەتی لە گوندەکانی دەوروبەر بکەن، کەلوپەلی بەنرخ و چەکەکانیان خێرا کۆکەنەوە و بارکەن بۆ ئەو گوندانەی کە تەنیا ئەرمەنیان ها تێدا، فەرمانیش درابوو بە دەرکردنی کەمینەی موسوڵمانەکان لەو گوندانەی ئەرمەن تیایاندا زۆرینەیە یان ئەگەر کرا بیانکەنە بارمتە.

ئەرمەن دەبوو درگەی ماڵەکانیان لەسەر پشتبێ لەڕووی برایانی ئایینیاندا، ئەوانەی لەدەست هێزەکانی دەوڵەت هەڵاتوون. هەر گوندێکیش لەبری ئەو چەکانەی تیایدا دەست دوژمن کەوتوون دەبوو پێکەوە بە هاوبەشی بیبژێرن و پارەکانی بدەن، بەڵام ئەو چەکانە کە لە دوژمنەوە دەستدەکەون ئەوا بەر لە هەمووان دەدرا بەوەی گرتوویەتی و دەستی خستووە.

ڕێنماییەکان بەشێکی زۆری سەردێڕی (پەلاماری گوندەکان)ی لەخۆ گرتبوو، ئەمەش وای پیشاندەدا کە گەلێ دورەلەوەی کە تەنیا نامیلکەیەکبێ بۆ (بەرگریکردن لەخۆ)یەکی ڕوتوقوت، ئەم بەشەی بە درێژی باسی لە ڕێگە و شێوازەکانی دەستخستن و کۆکردنەوەی زانیاریە هەواڵگریەکان دەکرد، سەرەڕای ئەوەی کە پلانی چەند پەلاماردانێکی تێدایە وە وردەکاری پەیوەند بە ڕاونانی لادێییە موسوڵمانە ڕاکردووەکانەوە.

زۆری پێ نەچوو، تەکتیکی (ڕێنماییەکانی بەرگریکردن لەخۆ) بووە پلان بۆ یاخیبوونی ئەرمەن.

کەمێ بەر لە هەڵگیرسانی جەنگ، لە ڤان ماوەیەکی خۆپرچەککردن و ڕێکخستن بە چڕوپڕی لەناو ئەرمەنەکاندا بەڕێوە دەچوو. بەر لە یاخیبوونیشیان بە هەشت مانگ (سمیس)ی کونسوڵ لە ڤان دەنووسێ:

(( هەروەك مەعالیتان دەزانن، ئەم سێ حیزبە (تاشناق و هانشاك و

ئـەرمیناکان) لـە ڤـان، وا بـۆ شـەش مـانگ دەچێ لەسـەر ڕامـاڵینی گشت ناکۆکیـەکانی نێوانیـان ڕازیبـوون و یـەکبوون لـە پێنـاو خزمـەتکردنی بەرژەوەندیـە باڵاکـانی کۆمـەڵی ئەرمـەن یـان میللـەت بـە نیسـتلاحی ئەرمەنەکان، بەو ئاماژەیە کە نفوزی حیزبی تاشناق زۆر زیاترە لە نفوزی دووانەکەی تر، ئەمەش بەهۆی چالاکبوونی سیاسی زیاتری و توندڕۆییشی لە کار و بیروبۆچوونەکانیدا، لەڕووی ڕێکخستنەوە حیزبێکی ڕێکوپێکە، وەك دیارە دەستکەوتێکی دەوری و گەورەی ها لەلا، لەو نابوونانەی لەخەڵك و لە ئەندامانی دەسێنێ، لەناو شار و گشت گونـدە ئەرمەنیەکانـدا کـە هـەواداری خۆی تێدایـە. لەسـەر حیسابی حیـزب ئەمانـە کار دەکـەن و بـەردەوام لـە پەیوەندیدان بە لیژنەی ناوەندیانەوە لە ڤان.

لە ساڵی پێشوودا، بەشێوەیەکی بەرفرەوان حیزبەکە گلایـە نـاو کاری هـاوردەکردنی چـەك بـە نهێنی و دابەشـکردنی بەسـەر هەوادارانیـدا، جێـی ئاماژەیـە کـە ئـەو دەمانچـانەی لـە جـۆری مـاوزەرن بازاڕیـان گـەرمترە و بەئاسـانی دەشـاردرێنەوەو هـاوردە دەکـرێن و وەك تفـەنگێکی کـورتیش بەکاردێت، چونکە دوربینێکی ها لەسەر کە تواناکەی هەزار مـەترە، هەنـدێ ئەرمەنم دیوە، لە ناوچە گوندنشینەکان، بەئاشکرا ئـەم چەکانەیان پێبـوو. هەرچـەندە خـۆم لـەو چـەند گونـدە کەمـەی کـە سـەردانم کـردون هـیچ تفەنگێکم نەدیوە، بەڵام زوربەیان شارەزایی و زانیاری خۆیـان لـە جۆرەکانی تفەنگ و بەکارهێنانی پیشانداوە.

دەڵێن ئەرمەنەکانی ڤان لە کوردەکان چەکدارترن، بۆ زانین و بەبێ دوو دڵی ئەرمەنەکان تفەنگی تازەیان دەستکەوتووە، بێجگە لە ژمارەیەکی کەم لە تفەنگی مارتینی کەم کە دەوڵەت بەسەر گوندەکانیا دابەش کردبوو، بەهۆی نائـارامی و نـەبوونی ئەمنـەوە بەگشـتی لادێییـەکان چـەك پەیـدا دەکـەن، ئەمەش چەند مانگێکە ناوای لێهاتووە، ئەم هەڵپـەی حـەز لەچەککردنە لەو

زەردر و زیانانەوەیە کە ئەو لادێییانە بەدەستی چەتە کوردەکان لێیان کەوتبوو، حیزبی تاشناق ئەم هەلەی تا ئەوپەڕ قۆستۆتەوە و سیاسەیەك پەیڕەو دەکات کەوا لە ئەرمەنی هەرێمەکە بکات لەڕووی مەحەممەدیەکاندا خۆیان ڕاگرن.

دواجار کاری پرچەککردنی گوندنشینان بووە بازرگانیەکی ئەوتۆ کە سەرکردەکانی تاشناقی کەمەندکێش کرد و بێ چەنوچوون تێوەی گلاون. بۆ زانینیش، تفەنگێ یان دەمانچەیە بە نرخێ دەفرۆشرێ کە سێقاتی نرخەکەی خۆیەتی.

جگە لەوەی کە دەبێ حوکمەتەکەی ناوخۆ ئاگای لەمانەبێ کە ڕوودەدەن بەڵام هیچ ڕێوشوێنێکی نەگرتۆتەبەر بۆ دانانی سنوورێك لە بۆ قاچاغچێتی و نامدیوکردنی چەك، بەڵکو بە پێچەوانەوە وا دەردەکەوێ کە ئەو سیاسەیەی وا لەناواندا سیاسەتەکەی والیە کە دەیەوێ یارمەتی لادێییەکان بدات بۆ بەرگریکردن لە خۆیان لە کاتی پێویستدا، ئەویش لە ڕێی دابەشکردنی تفەنگی کۆنی سەربازیەوە بە ڕێژەی سێ بۆ شەش تفەنگ بۆ هەر گوندێك سا کورد بن یان ئەرمەن.

نزیکەی شەش مانگ دەبێ لە ڤانەوە هەزار تفەنگ ڕەوانە کراوە تابەسەر ئەو عەشایرە کوردانەی سەر سنووری فارسدا دابەشکرێن، بەتایبەت لەو ناوچانەی کە ساڵی پار زیاتر بەدەست پەلامارەکانی سمکۆوە زیانیان پێگەیشتبوو[٢٢].))

لەماوەی پێش جەنگەکە لە ڕۆژهەلاتی ئەنەدۆڵدا کاری جاسووسی و هەواڵگری ڕووسەکان پەرەی سەندبوو، جاسووس و هەواڵگران بەناوە تەقلیدیەکانی وەك: ڕۆژنامەوان یان بازرگان یان مامۆستای زانکۆ کە گەشتێکی زانستی و کۆڵینەوە دەکات، خۆیان پیشاندددا و لەژێر ئەو پەردانەدا، یان هەندێکیان بەبەرگێکی عەشایری کوردیەوە دەهاتن. دەوڵەت

هەستی کردبوو کە ئامانجی ئەمانە پەیوەندیکردنبوو بە شۆڕشگێرانی ئەرمەن و بەکوردەکانەوە، بە کورتی ئەرکی چاووڕاوکردنی* سەربازی ئاسایی و گوێ هەڵخستن بۆ سووسە زانیاریەك[23].

## • هەواڵگری عوسمانی لەو یاخیبوونەی پلانی بۆ دانرابوو

لەکاتێکدا عوسمانیەکان لە خشتەی دیاریکراوی کاتی یاخیبوونی ئەرمەن بە ئاگابوون. بەڵام لە چاوەڕوانیشدابوون، لە حەوتی ئەیلوول/ سەپتەمبەری ١٩١٤ باڵیۆزی عوسمانی لە تاران ئاماژەی بەوە کرد کە ڕووسەکان چەکیان بەسەر ئەرمەنەکانی ناو ئێران و قەفقاسدا دابەشکردووە، کونسوڵی ڕووسیش لە تەورێز گفتی بە (ئەرمینیایەکی تازە)داوە ئەگەر پشتگیری لە ڕووس بکەن، وە ئامازەی داوە بەو پەیوەندیانەی نێوان ئەرمەنی ڤان و ڕووس[24].

لە ڕاپۆرتی هەواڵدەرە عوسمانیەکانیشدا کە لە (پۆترسبورگ)ەوە هاتووە: دەوڵەتی ڕووسیا بۆ بەدەستهێنانی لاگیری ئەرمەن لەخۆی وا لەکاردا، بەهیوای وروژاندنی باری یاخیبوونێك لە ڕۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵدا چ کاتێ گەرەکی بێت[25]. لە ڕاپۆرتەکانی پۆلیس و سوپا و ئەفسەرانی هەواڵگریشدا بەڵگەی ئەوە دەردەکەوت کە ئەرمەن بە هاریکاری ڕووس یاخیدەبن[26].

سوپای عوسمانی بەڵگە تازەکانی وا دادەنا کە بەشی ئەوەیان هاپێ کە هوشیاری بەگشت یەکە سەربازیەکان بدات. لە ١٩ ئەیلوول/ سەپتامبر و بەر لەدەستپێکی کارە دوژمنکارەکانیان، سەرکردەی سوپای سێ گشت یەکەکانی موچیاری کرد بەوەی کە گشت ئەو ڕێوشوێنانە بگرنەبەر بۆ بەربەستکردنی مەترسی یاخیبوونی ئەرمەن:

* چاووڕاوکردن: إستطلاع ((وەرگێڕ))

ڕووسەکان پارمەتی ئەرمەنی قەفقاسیان داوە بەخۆ تەیارکردنی ئەرمەنی ناو سەڵتەنە لەو ڕێیەوە کە گفتیان داونێ گوایە لەو خاکانەی ئۆمەتی عوسمانی بەشیان بدەن، جگە لەمە کەسانێکی زۆریان بەبەرگی لادێیی عوسمانیەوە (وەك دانیشتوانی ناوخۆ لە کورد و ترك) بەسنوورەکەدا هێناوە بۆ گەپاندنی چەك و زەخیرە بەگوندە ئەرمەنەکان. جا یەکە سەربازیەکان فەرمانێکیان پێ گەیی بەوەی هەر کەس بەبێ پاسپۆرت سنووری بەزاند دەبێ گورج دەستگیرکرێ، ئیتر دیمەن و ڕواڵەتی دەرەوەی هەرچۆنێبێ. هەروا هەرکەس ویستی چەك و زەخیرەی شەڕ ئامدیوکات بگیرێ و ناشبێ لە پلەوپایەی هەستیاردا دانرێ یا دابمەزرێ.

ترسەکە تەنیا لە یاخیبووانی ئەرمەن نەبوو: سەرکردەیی دیسان فەرمانیدا بەوەی کە دەبێ کوردەکان و موسوڵمانانی دی، ئەوانەی گومڕا کراون بە بیری پیسی ئەرمەن و ڕووس لە خشتەبراون، دەبێ بێنە سەر ئەو باوەڕەی کە گرتنەبەری ئەم ڕێ وشوێنانە دژ بە ڕووس کارێکی دروست و ڕاستە، ئەمەش لەڕێی تێگەیاندنیانەوە بە هەقیقەی ئامانجەکانی ئەرمەن و ڕووس کە دەیانەوێ چی بکەن[٣٧].

بەهەمان شێوە ڕێنمایی ئاراستەی بەرپرسانی دەوڵەت و پۆلیس و دەزگە هەواڵگریەکان کرا:

١- لەسەر هاوکارانی پۆلیسی نهێنی و ئەوانەی خۆیان گۆڕیوە و متمانەیان پێ دەکرێ، زانیاری لەبارەی دەستە و کۆمەڵە ئەرمەنیەکان و نا موسوڵمانەکانی وەك ئەوانن (یاخیبوو) کۆبکەنەوە، سەبارەت بە ڕێکخستنیان، چالاکیەکانیان، ئەو گوندانەی وان لێی، ناسنامەی سەرکردەکانیان.

٢- لە حاڵێکدا ئەگەر دەستەڵاتە ناوخۆییەکە نەیتوانی ئەو جموجۆڵە شۆڕشگێڕیەی کە دۆزراوەتەوە و ئاشکرابووە، بگرێتە خۆ و دەست بەسەریدا

گرێ، وە ڕێوشوێنە سەربازییەکانی بە تەواوی بکات، یا پارەتی لە نێزیکترین بنکەی سەربازییەوە وەرگرێ.

٣- هەر کەس چەکی هەلگرتبێ یان سەرپێچی سیستەمەکە بکاو نیزام تێکدا، دەستگیر دەکرێ و ڕاپێچی ئەنجوومەنی حەربی دەکرێ کە حوکمە سەربازیەکان پەیڕەودەکات[28].

عوسمانێکان سەرکەوتنێکی گەورەی ئەوتۆیان بەدەستنەهێنا لە تەقەللایاندا بۆ ئابلووقەدانی پیلانی یاخیبوونەکان و لایەنگرە ڕووسەکان، هەرچەندە پێشتریش پێیان زانیبوو.

## • سەربازیی ڕەعیەتە نا موسولمانەکان

هەلوێستی کەمایەتیە مەسیحیەکان لە ئاست خزمەتی سەربازی هەمیشە نادیار و تەمومژاوی بووە، لە سەرەتای دامەزراندنی سەلتەنەکە مەسیحیەکان لەناو یەکە شەڕکەرەکانی دەولەتدا خزمەتیان دەکرد، بەلام لە دەمێکەوە بوو کە عوسمانێکان بڕیاری پەیڕەوکردنی پرەنسیپە ئیسلامیە سونەتیەکانیان دابوو، سەبارەت بە بواری خزمەتی سەربازی، بەمانای ڕێبەندیکردنی نا موسولمانان لەچوونە ناو لەشکری دەولەتەوە، لەباتی ئەمە باجێکی تایبەتیان خستنە سەر (دوایی ناونرا –بەدەل- یان؛ لەبری خزمەتی سەربازی)[29].

بەشێوەیەکی گشتی ئەمە کارێکی سوودمەند بوو بەلای ئەو نا موسولمانانەوە، چونکە گوزەران لەناو لەشکری عوسمانیدا، بەتایبەت لەشەڕەکانی سەدەی نۆزدەدا، زوربەی کات سەخت و ژیان کورتبوو[30].

سەرەڕای قازانجەکانی (بەدەل) کەمایەتیەکان حەزیان بەم جۆرە سیستمە نەدەکرد، چونکە بەلگەیەکبوو بۆ هاونیشتیمانبوونێکی پلە دوو، جا ئەو چاکسازیانەی سەدەی نۆزدە کە جێبەجێکران، پێشەوەچوونێکی مەزنی

هێنایــە کایــەوە، ڕووە و بــەدیهێنانی دادپەروەریــەکی قــانوونی کــەوا لــە فەلســەفەی ڕێبــازی عوسمانیــدا، کەمایەتیــەکانیش خرانــە ژێــر حــوکمی دەستوور گەلێکی تایبـەت بـە خۆیانـەوە، هـەروەك چۆن کۆمەڵەکانی تـر لـە هەرێم و نیشتیمانە تایبەتـەکانی خۆیانا پابەنـدی دەستووری گـەلی خۆیـان بوون و بەتەواوی بەشـدارییان دەکـرد لـە هەڵبـژاردنی نوێنـەرانی خۆیـان لـە مەبعوسان (پەرلەمان)دا، بەمـە مەسیحیەکان پلـەی بـەرزیان بـەخۆوە دەدی، بـە وەزیـری کاروبـاری دەرەوەشـەوە، بـەڵام لـە خزمــەتکردنی سـەربازیەکی (ئیجباری[*])دا هەمیشە یەکسانی لەنێوان موسوڵمان و مەسیحیدا ونببوو.

لە تشرینی یەك/ ئەکتۆبەری ١٩٠٨ وەزارەتی جەنگ قانوونێکی تازەی بۆ خزمــەتکردنی سـەربازی ئیجبـاری ئامـادەکرد، بـەپێی ئـەو قانوونـە گشت ڕەعیەتەکان لەوانەی تەمەنیان لە نێوان ٢٠ - ٤٥ ساڵدایە دەبێ پابەنـدبن بـە خزمــەتکردنێکی (ئیلزامی)یـەوە، لـەوە دەچـوو ئـەم گۆڕانـە پشتگیریەکی فرەوانی لێ کرابێ، ئینجا ئەنجوومەنی وەزیران ڕەشنووسی قانوونەکەی نـارد بۆلای گشت سەرۆك و سەرکردەکانی کۆمەڵە مەدەنیـەکانی ئـەو کاتـە، دوایـی هەنـدێ لـە قەشـە ئەرمەنــەکانی ئەنـەدۆڵ بروسـکەیان کـرد بـۆ لیژنــەی سەربازی لە پەرلەمان، داوایان کرد کە هاوڵاتیە نامووسوڵمانەکانیش با ئەرکی بەجێهێنانی خزمەتی سەربازی بیانگرێتەوە[٣].

دەڵـێن (کوزمیدیـە فـەنی) کـە ئەنـدامێکی یۆنـانی دەستڕۆیشـتوو بـوو، لەهەمووان زیاتر پشتگیری ئەو قانوونەی دەکرد[٢].

لە ٢١ تەمموز/یۆلیۆ ١٩٠٩ پەرلەمان بڕیاری لەسـەر ڕەشنووسی قانوونی

[*] دوو جۆر خزمەتکردنی سەربازی هەبووە : ئیجباری کە تەمەنی گەنجەکە دەگەیشتە ١٨ ساڵ دەبوو ببوایە بە سەرباز وەك ئەرکێکی نیشتمانی، ئیختیاری (متطوع) ئەوەبوو کـە کەســــەکە بــــە ڕەزامەنــــدی خــــۆی دەبــــووە ســــەرباز. ((وەرگێڕ))

لابردنی باجی لێبوردن لە خزمەتی سەربازی (بەدەل)دا. هەر لەو ساڵەشدا قانوونی (بەخشین لە بەدەل) خرایە واری جێبەجێکردنەوە، جا لە نێوان نزیکە ۲۰۰ هەزار کەسی موهەییا و شیاو بۆ ئەوەی بکرێنە سەرباز لە ئادار/مارسی ۱۹۱۱ ژمارەی ناموسوڵمانەکان تیایاندا ٤۰ هەزار بوون، لە ۲۷ ئادار/ مارسی ۱۹۱۲ یەکەم بەتالیۆنی ناموسوڵمان لە قوتابخانەی جەنگ – حربیە - دەرچوون، لەنێوان ۳۹٤ پاڵێوراو بۆ پلەی ئەفسەر، چواریان یۆنانی و سێ ئەرمەن و یەهوودیەکیان تێدابوو.[۳۳]

لە هەردوو شەڕەکەی بەلکاندا ، ساڵانی ۱۹۱۲-۱۳، هەشت هەزار مەسیحی و یەهوودی رەوانەی بەرەکانی شەڕکران، هەر بۆ زانینیش سوپای بولگاریا لە یەکەم شەڕی بەلکاندا هەندێ سەربازی ئەرمەنیان بەدیل گرت[۳٤].

## • فیرارکردن*

بە نزیکبوونەوەی جەنگەکە لە رۆژهەڵاتی عوسمانی، کەمایەتیەکان هیچ هەستێکی چاکسازی و نەتەوەییان، کە لە ئەنجوومەنی نوێنەراندا هاواریان بۆ دەکرد، پیشان نەدەدا. هەر دوای راگەیاندنی نەفیری گشتی لە سێی ئاب /ئاغستۆسی ۱۹۱٤دا ئەرمەنێکی زۆر لە رۆژهەڵات (تەجنیدی ئیلزامی) دەیگرتنەوە فیراریان کرد، وەلاوانی ئەرمەن بە گشتی سەربازیان رەت کردەوە[۳۵]. بە هاتنی مانگی ئەیلوول/ سەپتەمبر مەسەلەکە بەتەواوی روونبۆوە، هەروەك لە راپۆرتی حاکم و بەرپرسانی تەجنیددا دەردەکەوت. لەسەرەتادا ئەرمەنەکان بەرلەوەی بگیرێن بەسەرباز، بەبێ چەك فیراریان دەکرد، بەڵام دوایی بە ژمارەیەکی زۆر بەچەکەکانیانەوە بۆی دەردەچوون.

---

* فیرارکردن: بەمانا: هەڵاتن یا راکردن لە سەربازی و بەجێهێشتنی. ((وەرگێر))

هەندێ لەو فیرارانە دەستەی بچووك بچووكیان پێكدەهێنا و دەبوونە چەتە و خەڵكی لادێكانیان دەتۆقاند و هەڕەمەكیانە پەلاماری موسوڵمانەكانیان دەدا، لەبەرامبەردا، هێتریش هەبوون – ئەمانە بەلای موسوڵمان و دەوڵەتەوە مەترسیدارتربوون - ڕێكخراوی چەتەیی چەكداری وایان پێكدەهێنا و لەگەڵ ئەو ئەرمەنانەی لە ڕووسیاوە هاتبوون دەبوونە هاوكار، بەڵام ئەندامانی لیژنەی شۆڕشگێڕی ئەرمەن وەك (ئەنترارنیك)ی ناودار لە ئەرزڕۆم و (سمبات) لە مووش و (هامازاسب) لە ڤان، كە لە ڕووسیا دادەنیشتن، ئەمانە یەكەی ٣٠٠ - ٤٠٠ كەسیان پێكهێنابوو و خۆیان سەرگردەییان دەكردن و بە ڕێنمایی ئەفسەرە ڕووسەكان لە مەشقكردندابوون[٣٦].

سەرەتا دەركەوت كە ئەم یەكانە بە تایبەت لە گوندە دورە دەستەكانی موسوڵمانەكان مەترسیان وا لەسەر ئافرەت و مناڵ و پیرەكان، چونكە گەنجەكانیان چووبوون بۆ جەنگ، بە گورجی كار و چالاكی ئەم یەكە چەتەگەریانە ڕووەو ئامانجە سەربازیەكانی دەوڵەت ببۆوە، زیاتر لە ١٢٠٠٠ هەزار ئەرمەنی عوسمانی بەرەو ڕووسیا بوونەوە و لەوێ مەشقیان لەسەر تەكتیكی شەڕی چەتەگەری دەكرد، دوایی هەندێ لەوانە گەڕانەوە و پەیوەندیان بەو جەنگاوەرانەوە كرد كە هێشتا لەناو سەڵتەنەدا بوون و پەلاماری یەكە سەربازیەكانیان دەدا و هێڵەكانی پەیوەندیان پەكدەخست، هێرشیان دەكردە سەر ئەفسەری تەجنید و هەندێ بەرپرسی دەوڵەت، جێی ئاماژەیە كە ئەو یەكە جەنگاوەرانە بوونە بڕبڕەی پشتی باڵی سەربازی و بەرپرس لە بەجێهێنانی پلانی شۆڕشگێڕی لە لادێكانی ڤاندا[٣٨].

هەندێ لەوانەی فیراربوون و گەنجانێكیش لە ئەرمەنی بەشی ڕووسیا خرانە ناو هێزە شاهانەكانی ڕووسیاوە ، ئەو یەكە تایبەتانەی ناونرابوون (زمالات) – یەكەیەكبوون لە كۆماندۆس و ئەوانەی خۆبەخشانە هاتبوونە

ڕیـزەوە. هەریەکـە لـە هـەزار ئەرمـەنی ئـەرمینیای ڕووس و عوسمـانی پێکهاتبوو، ژمارەی ئەم زمالاتانـە لـە دەستپێکی جەنگەکەدا خـۆی دەدا لـە چوار و دوایی بووەوە پێنج و لە کۆتایی ١٩١٥ بوونە شەش.

ئەمانـە لـە باشـترین یەکـە سـەربازیەکانی ڕووسـبوون، چـونکە سەربازەکانیان شارەزای خاکەکە بوون و زۆریش بەمەسەلەکەی خۆیانـەوە پابەندبوون. پەیوەندی توندیش بـە شۆڕشگێڕان و ئەرمەنـە حیزبیەکانـەوە گرێی دابوون.

ببوونە چاوساغی ڕووسەکان لە پێشڕەویاندا بەرەو ڤان [39].

لەلایـەکی دی هەنـدێ لـە ئەرمەنـە فیرارەکـان ڕایـانکردبووە نـاو چادرگەکانی شۆڕش لە ڕۆژاوای ئێران کە بە دەست ڕووسەوە بوو، لێـرە دەستیان بـەخۆ تـەیارکردن کـرد تـا بچنـە پاڵ هێزەکـانی ڕووس کـە ڕووەو هەرێمی ڤان دەبوونـەوە. (کازم بـەگ) سـەرکردەی فیرقـەی دەرەکی گـەڕۆك بـوو، زانیـاری لـە دیلـەکانی بـەرەی شـەڕەوە کـۆدەکردەوە و دەیگەیانـدە سەرکردەیی سوپای سێ، دەڵێ:

لـە ئێـران یـاخیبووە ئەرمەنـەکان خۆیـان لـە چـەند بـەتالیۆنێکا ڕێکخستووە، هـەر بەتالیۆنـە بەلایـەنی کەمـەوە ٨٠٠ کەسـە، هـەر کام لەمانـە کراوە بـە سێ تیپـەوە، ئامـاژە بـەوەش دەدەیـن کـە جیالـەمان چـەتەکانیش ڕێکخـراون و لـە (خـۆی) کەتیبەیـەکی یـەدەگی ئەرمـەنی خۆبـەخش و دوو پەلی سوارەی یاخیبووی چالاك لە ناوچەی (بایەزید و ماکۆ) هەن. [40]

## * کلپەی یاخیبوونەکە

لە کۆتایی ساڵی ١٩١٤ فیرارکـردن و چالاکی چـەتەکان لـە زیادبوونـدابوو، ڕاپۆرتی لێپرسـراوانی دەوڵـەت ئـەوە دەردەخـەن کـە هەسـتیان بـە مەترسـی ڕەوشـەکە کـردووە، هەنـدێ بەڵگـەش کەوتۆتـە ڕوو ئـەوە دەسـەلمێنن کـە لـە

ڕاپۆرتەکانــدا هــاتووە لــە بــارەی ڕێکخــراوی شۆڕشــگێڕی ئەرمەنـــەوە و هاریکاریان لەگەڵ ڕووسدا.

هێرشە سەرەتاییەکانی ئەرمەن دەکرا بە ڕووداوی دابڕاو بزانرێ، بـەڵام لــە ســـەرەتای ســـاڵی ١٩١٥دا ئاســـتی ڕێکخســـتنی یـــاخیبووان هەڵکشـــا و هێرشەکانیشیان توندتربوو، ئـەوەی جێـی گومـانیش نییـە ئەوەیـە کـە لـە کارەکانیانــدا پـــەیڕەوی پرۆگــرام و پلانـــی چەســپاویان دەکــرد(١)، ئەمــە لــە سروشت و چۆنێتی پەلامارەکانیاندا ڕەنگی دەدایەوە و دەردەکەوت:

چـەك و زەخـیرە و بۆمباکـە بـە پـەنهانی شـاردرابوونەو، دژ بـە یەکـە سـەربازیەکانی سـوپا و دەرەك بـەکاردەهاتن، لـە ڕۆژەلاتــەوە ئەرمەنــەکان پەلاماری کاروانی ئازووقەی سوپایان دەدا، هێڵەکانی گەیانـدنیان دەقرتانـد و پەیوەندییــەکانیان دەبــڕی، بۆســەیان بــۆ کــاروانی گــەورەی ئــەو بریندارانــە دەنایەوە کە لە بەرەی شەڕەوە دەگوازرانەوە و دەیانکوشـتن، ڕێگـە و بانـەکان تێکدەدران، دەرەك کە لە زۆربەی شارەکانی ڕۆژەلاّتا بوون بۆ پاراستنی ئـەمن و ئاسـایش دەخرانــە بۆســەوە و دەکــوژران، ئــاگر بەردەدرایــە ئــەو شـار و گوندانەی کە دەکەوتنە سەر دووڕیـانی ڕێگـە سـەرەکیەکان و خـاڵی بـەرگری سـەرەکی، بەمـە ژمـارەی قوربانیـانی خـەڵکی مـەدەنی زیـاتر دەبـوو، پـرد و شوێنە قایمەکان وێران دەکران و دەڕوخێنران.

جا بەپێی سروشتی ئا ئـەم پـەلامار و هێرشـانە گومـانی تیـا نـامێنێ کـە ئامانجەکەیان سەربازیەکی ڕوتبووە.

ڕاپۆتی زۆر بـە دەوڵـەت و سـەرکردەیی سـوپای سـێ دەگـەیی، دەربـارەی چـالاکی یـاخیبووان لەگەشـت لایـەکی ڕۆژەلاتــەوە دەدوان، ئــەو ڕاپۆرتانــە بەزمانێکی وشـکی سـەربازی و بیرۆکراتانـە نووسـرابوون، ئیشـارەیان دەدا بـە زنجیرەیـە ڕوداوی تۆمـارکراو لەهـەموو هەرێمەکـەدا. ڕاپۆرتـە سـەرەتاییـەکان ئیشارەیان دەدا بەوەی کە سەرەڕای ڕوداوە جیاوازەکان هەستیان کردبوو کە

ئـەوان دەتـوانن ياخيبوونەكـە سـەركوتكەن. بـەلام بێگومـان بـۆ ئـەم كـارە رێوشوێنى توند و يەكلاكەرەوەيان دەگرتەبەر، بەسووتاندنى گوندەكانيانەوە، بۆ نموونە حاكمى پەتليس ئەم زانياريانە دەخاتە بەردەمى وەزيرى ناوخۆ:

لە ٢١ شوبات/ فەبرايرى ١٩١٥

١- لەناحيەى (حاكيف) ئەو گوندانەى ياخيبوون، گيرانەوە و سووتێنران، مالاتـەكانيان دەستى بەسـەردا گـيرا، بەلگەنامـەى شۆڕشـگێڕيمان لـە گيرفـانى يـەك لـە سـەركردەكانيان بـە نـاوى (كـالۆ)وە دۆزيوەتـەوە و لـە مالەكەشـيدا هەمان شت. ئەمانە هێشتا نەگەيشتوونەتە پەتليس.

٢- لە ڤان پەيوەستبووم بە سەركردەييەوە، بەهۆى ئەو رێوشـوێنە تونـد و يەكلاكەرەوانەى لە (هيزان) گيراونە بەر، بەدور دەزانرێ كە ئەرمەنـەكانى (غيفاش و راشديە) ببنە هۆى ناژاوەنانەوە، لە غيفاشەوە بە خێرايى يەكەى دەرەك نێـرا بـۆ بەرەورووبوونـەوەى هێرشـەكان لـە (كارجـار بوجـاك) كـە ئەرمەنەكانى ئەو ناوە و ئەوانەى لە دورترەوە هاتبوون كردبوويان.

٣- لـە ئێسـتادا لەسـەر رێگـەى پـەتليس - غيفـاش رەوشـەكە ناسـاييە، لەوانەيە هەندێ رووداو لە هيزان بووبێ، وە چەك لـە دژى هێزەكانى دەرەك لە دوو شوێنى دەشتى (مووش) بـەكارهاتووە، زيـاد لەمـەش پـەلێك سـەرباز نێرراوە بۆ گوندى (سيرڤنگ) لە ناوەندى قەزاى مـووش بـۆ گـرتنى ئەوانـەى فيرارن. بەلام لـە ئاشـێكى نـەتراڤى گوندەكـەوە تەقـەيان لێكـراو شـەڕێكى دوو سەعاتى لەنێوان هـەردوولا قـەوما و ئەسپێكمان كوژرا، كـە شـەڕەكە دەسـتى پێكـرد سـێ ئەفسـەر يەكـەكانى خۆيـان لـە مووشـەوە هێنـا و چـواردەورى گوندەكە درا، ئەنجام نۆ كوژراو هەبوو و خانووى فيرارەكانيش سووتێنران.

٤- هـەر ئـەو رۆژە، لـە گونـدى (كـومس)ى سـەر بەناحيـەى (ئـەكعان) دەستدرێژى كراوەتە سـەر مـالى موختـارى گوندەكـە. كابرا لەگـەل يەكەيـەكى دەرەكـدا دەبێ، شـەڕێكى هەشـت سـەعاتى قـەوما، لـە دەرەك و ميليشـياكان

هەشت کەس کوژران، یاخیبووان کەوتنە سووتاندنی ئەو خانووەی کە موختارەکە خۆی تیا مەڵاس دابوو، بە پەلە پرۆزێ قوتار بوو. لەنێو ئەوانەی کە شەڕیان لەگەڵ دەکردین، نوێنەری تاشناقەکانی مووشبوو بەناوی (روبن) و یەکێ لە ئەندامانی حیزب بەناوی (ئیسرو)، ئەمە گەلێ گومانی لەسەر لیژنەکە پەیدا کرد[٤١].

لەگەڵ بەرفرەوانبوونی یاخیبوونەکە و زۆربوونی پەلاماردانی لێپرسراوان و سەربازەکان، (ئەنوەر پاشا)ی وەزیری جەنگ بڕیاریدا زیاتر بایەخ بداتە ئەو ڕاپۆرتانەی لە هەواڵگریەوە دێن، لە ٢٥ ئەیلوول /سەپتەمبری ١٩١٤ فەرمانێکی ڕەوانە کرد دەربارەی گرتنە بەری هەندێ ڕێوشوێنی خۆپاراستن:

(( هەندێ چەتە و ڕێگری ئەرمەن لە پەتلیس پەیدابوون، جگە لە هەندێکی تری ڕاکردو لە خزمەتی سەربازی، کەوتوونەتە ڕاوڕوتکردن و دزی، لە (حەلەب و دورتیول) ئەرمەنەکان پەلاماری سەرباز و دەرەکەکانیان داوە، بڕێکی زۆریش لە تەقەمەنی و کۆمەڵێ لە کلیلی پەڕ لە (شفرە) بە فرانسی و ڕووسی و ئەرمەنی لە ماڵی چەند ئەرمەنێکی شاری (قەیسەری) دۆزراونەتەوە.

هەرچەندە لە ئێستادا ئەم ڕوداوانە زۆر گرنگیەکی ئەوتۆیان نییە بەڵام بەڵگەیەکی چاکن بۆ ئەوەی کە دوژمنانمان لە خۆ ئامادەکردندان بۆ یاخیبوونێك لەناو وڵاتدا. جا ئەمە پێویستی کرد کە ئەم خاڵانە بخەینە ڕوو و ڕایانگەیەنین:

١- بەشداریکردنی سەربازە ئەرمەنەکان لەو لەشکر و سوپایانەی وان لە جووڵەکردندا، لەناو یەکەکانی دەرەگی گەرۆك و جێگیر، قەدەغەیە و نابێ لە نووسینگەکانی بارەگەی گشتی و ئەو بەشانەی کە سەربە سەرکردایەتی گشتین، دابنرێن.

٢- لەدەستەڵاتەکانی سوپا و سەرکردەکانی فەیلەق و جێگیر و گشت سەرکردەیەکی تره، بگره ئەرکی سەر شانیشیانە کە بە گورجی و خێرا هەر بەرهەڵستیەك یا دەستدرێژیەکی چەکداری یان سەرپێچی کردنێکی فەرمانەکانی دەوڵەتە، سەرکوتکەن و هەر کارێکی دوژمنکارانە و مقاومە نەهێڵن. جگە لەمانە سەرکردەکان بۆیان هەیە کە گورج کارکردن بە حوکمەکانی عەسکەری ڕاگەیەنن، لە هەر جێ و کاتێکدا زەروری بێت.

٣- سەرەڕای گرتنەبەری ڕێوشوێنی هوشیاری و ئاگادارکردنەوە، دەبێ لە گرتنەبەری هەرکارێکی سەرکوتکردن کە دەبێتە هۆی ترس و تۆقاندنی خەڵکی خۆبپارێزن، لەو شوێنانەی کە هیچ نیشانەیەکی تێدا نابینرێ بۆ کاری توندوتیژی.

بەڵام دەبێ بە توندی ئاگاداری ئەو کارانە بین کە نەبنە هۆی پەژارەبوونی ڕەعیەتە باش و گوێ ڕایەڵەکانمان، تا میللەت هاننەدرێ یان بەهانەبات بۆ یاخیبوونێك لە ئەنجامی هەستکردن بە نائومێدی.

٤- لە دەرەنجامی نەفیری عام و لەبەر ئەوەی کێشەکانی بەرگری و نیزامی گشتی بەهەموو جۆرەکانیەوە لە کارە سەرەکیەکانی هێزی چەکدارە، ئەوا لەسەر بەرپرسە مەدەنیەکانە کە گوێڕایەڵی بڕیاری سەرکردەکان بن لەو بارەیەوە، لێپرسراوە مەدەنیەکان تەنیا لە هەرێمی ئەستەموڵدا دێنە بارەگەی گشتی بۆ تاوتوێکردنی ئەو مەسائیلانەی پەیوەندن بە نیزامی گشتیەوە.

٥- لەو کاروبارانەی پەیوەندن بە نیزامی گشتیەوە دەستەڵاتێك کە زیاتر بەتوانا و لێهاتوو بێت بریتییە لە سەرکردەکانی سوپا لەو شوێنانەی کە سوپای سێ و چوار و ناوچەکانی عێراق وان تێیدا، لەم کارانەشدا باشترین دەستەڵاتێك دیسان وان لەو ناوچانەی کە سوپای یەك و دووی تێدایە، ئەرکی سەرکردەی فەیلەقەکانیشە کە زانیاریەکان بگەیەننە جێگری

سەرکردەی باڵا و سەرکردەکانی تری لەشکر.

٦- لەسەر سەرکردەکانی سوپای سێ و چوارەکە بەزوترین کات جێگری سەرکردەی باڵا ئاگادار کەن بەو ڕێوشوێنانەی کە گیراونەتەبەر و ئەو پلانانەی بۆیان دانراوە، ئەمە لەکاتی ڕودانی هەرگرفتێکدا[٢٤].))

سەبارەت بە سەرکردایەتی ناوەندی شتەکە ئاشکرابوو کە ڕەوشەکە لە ڕۆژهەڵاتدا لەدەستی دەستەڵاتە مەدەنیەکان چۆتە دەر. شەڕێکی چەتەگەری ڕاستەقینە دەستی دراوەتێ، جوان جوانیش دیاربوو کە ئەنوەر پاشا هەستی بەوە نەدەکرد کە ئەرمەن جێی متمانەن، سەرەڕای ئارەزووی لە پارێزگاریکردنی وەلایان بۆی، ئەوەش لەوەدا کە دووپاتی دەکردەوە: (ڕەعیەتە باش و گوێ ڕایەڵەکان) دوچاری هیچ ئەزیەتدانێك نابنەوە.

لە ڕۆژەکانی سەرەتای جەنگەکەدا ڕاپۆرتە موخابەراتیە سەربازیەکان وا نیشارەیان دەدا کە یاخیبوونی ئەرمەن دەستی پێکردووە و ڕەوشەکە مەترسیدارتر دەبێ، بەرپرسان پێیان لەسەر ئەوە دادەگرت کە دەبێ ڕێوشوێنی خۆپاراستن بگیرێتەبەر، بەڵام کاتەکەی تازە تێپەڕیوە. دەوڵەتی عوسمانی هێشتا لە مەترسی تەنگژەکانی خۆی لە ڕۆژهەڵاتدا نەگەیشتبوو، ئەو ڕێوشوێنانەی دژ بە یاخیبووان کە دەگیرانەبەر، هەر ئەو کارە تەقلیدیانەبوو کە دەبووە لەناوبردنی هەندێ دەستە و تاقمی بچووك و پاراستنی دامەزراوەکانی دەوڵەت و ئاسانکاریش بۆ تەجنیدکردنێکی ئیجباری ئەوانەی دەیگرتنەوە.

کارکردن بەقانوونی عەسکەری ڕاگەیەندرا*، تەو ئەرمەنانەی مابوونەوە لە ئەرکی شەڕکردنەوە گواسترانەوە بۆ فەرمانی جیا لەوەی پێشوویان، یانی بە گشتی بۆ کرێکاری و لەو بابەتە، وە یەکەی سەربازی و دەرەك بۆ

---

* بە ئیستیلاحی دوایی (قانوونی حوکمەکانی عورفی) دەگرێتەوە. یان وەك ئیستە پێی دەڵێن (احکام قانون الطوارئ) ((وەرگێڕ))

راوەدونانى ياخيبووان و كردنەوەى رێگەو بانە گيراوەكان رەوانەكران، بەلام ئەو گوندانەى لە شوێنى هەستياردابوون وەك تەنگە و دەربەندە شاخاويەكان، يان لە دووڕيانەكاندابوون، بەهۆى ياخيبوونەكەوە سەرانسەر خاپوور كران.

سەربازەكان بە هاوڕێيەتى باجگر و ئەفسەرانى تەجنيدەوەبوون، بۆ پاراستنيان، هەندێ پلان بۆ سزادانى ئەو گوندانە دانرا كە دالدەى چەتە و ياخيبووان و فيرارەكانيان دەدا، بەلام جێبەجێكردنى ئەم پلانانە دواى ئەو روداوانەى كە دوايى باسدەكرێن، وەك شتێ ببوونە كارى ئەستەم و مەحال[44]. چونكە ئەمجۆرە پلان و كارانە بۆ ياخيبوونێكى سالانێك لەمەوبەر دەستيان دەداو گونجاوبوون بەلام ئيستە كەلكيان نەبوو. بەتايبەت كە چالاكيەكانى ئەرمەن گۆڕابوون و ببوونە ياخيبوونێكى گشتگيرى سەرتاسەر.

## • كلپەى ئاگرى شەڕ لە هەرێمى ڤان

لەگشت ئەو راپۆرتە هەوالگريانەدا دەردەكەوێ كە ئەرمەن لە هەرێمى ڤان پشتێكيان بەسەركەوتنە چاوەڕوانكراوەكەى رووس بەستبوو تا ئەمانيش دەستدەنە ياخيبوونەكەيان[45]، لە كانوونى يەك/ديسامبرى ١٩١٤ (سيفديت) حاكمى ڤان ويستى كەمێ ئەو گرژى و ئالۆزيەى رەوشەكە برەوێنێتەوە، ئەوەش لە رێى مامەلەكردنێكى وەك جارى جاران لەگەل سەركردە ئەرمەنەكاندا، بەلام زۆر باشيش دەيزانى كە ئەمە هيچ كەلكێكى نابێ:

(( لەگەل پياوماقوولانى ئەرمەندا قسەم كرد، تەبيعەتى رەوشە گشتيەكەم لە زۆر رووەوە بۆ شرۆڤە كردن، پێم گوتن كەهەر روداوێ لەنێو موسلمانان و ئەرمەندا حەتمەن دەبێتە هۆكارێك بۆ چۆنێتى ژيانى ئەرمەن لە سەلتەنەكەدا، ئامـاژەم دا بەوەى كە ئەو باروزرووفانەى لە ئەنجامى بەيەكادانە جياوازەكان لە ناوچەيەكى وەك ئێرە دێنە كايەوە و كار ناكەنە

سەر دەرەنجامی شەڕەکانی کۆتایی و زووبەزوو دەگۆڕێن. قایلبووم بەوەی کە گەیشتن بە دەرەنجامی ئەرێنی مەحاڵە، چونکە ئەو زیادەڕۆییانەی عەشایرەکان دەربارەی ڕەوشی ئێستا دانیشتوانە موسوڵمانەکە دەترسێنێ، بۆ ئەمە، من سوورم لەسەر ئەوەی کە ئەهێڵم ئەرمەن دووبەرەکی بنێنەوە.

ئەمە لەبەر ئەوەی دوژمن لە( قوتوور)ە هەندێ عەشایریش گوێی بۆ دەگرن و ملکەچین، باوەڕ ناکەم کە فیرقەی دەرەك بتوانێ بۆ ماوەیەکی زۆر بەرگری بکات، لەبەر ئەمە دەستدەکەم بەناردنی خێزانی لێپرسراوەکان بۆ پەتلیس[٤٦].))

(سفدیتە فەنی) دەیزانی کە مەترسی ددان لە شاری ڤان جیردەکاتەوە، ئەمە وای لێکرد کە ماڵ و منالی لێپرسراوەکان ڕەوانەی پەتلیس بکات، بەڵام ئەم کارەساتیاریەی خراپ مەزندە دەکرد. لە واقیعدا زێدەڕۆیی عەشایرەکان لە بارەی ڕەوشی ئێستاوە، زێدەڕۆییەکی فیعلی نەبوو، سەرەك هۆزەکان خۆیشیان ئەمەیان باش دەزانی، زۆر لە خێزانەکان نەڕۆیشتن، سیفدیتیش وای هەستدەکرد کە مەترسی بنەڕەتی لە هێرش و پامالکردنی ڕووسەوەیە، لە ئێرانەوە بە تەنگەی قوتووردوە لە ڕۆژهەڵاتی ڤانەوە.

سیفیدت مەترسی یاخیبوونی ئەرمەنی بەدور نەدەزانی، بەڵام هەستی دەکرد کە ئەرمەن لە ڤان سەرچاوەی دڵەڕاوکێی سەرەکی نین، چونکە لە کۆتایی ساڵی ١٩١٤دا بێوەی دیاربوون. ئەوەی زیاتر لێی دەترسا چالاکیەکانی ئەرمەن و نەستووریەکانبوو، لە ڕۆژئاوا و خوارووی ڕۆژهەڵاتی ڤان لەسەر سنووری ئێران. وای دادەنا کە سێ هەزار نەستووری (کۆمەڵێ چەکداری مەسیحی کە بۆ سەرکردەکانیان نەبێ نیتر ڕۆژێ ملیان نەداوە بۆ کدس و بەیارمەتی ڕووس زیاتر چەکدار بوون) لە بەشی خوارووی هەرێمی ڤان شەڕیان لەگەڵ هێزەکانی عوسمانیدا دەکرد.

ئەفسەرە عوسمانیەکان ئەوەیا ڕاگەیاند کە دانیشتوانی ئەرمەن

سەرجەم لە ناوچەی (سەلماس)ی ئێران چەكدارن و وان لە پاڵ یاخیبووندا، بەڕواڵەت لەژێر سەركردەیی (ئەنترانیك) و هاوڕێیانیدان[٤٧].

یەكە نیزامی و غەیرە نیزامیە عوسمانیەكان لەگەڵ یاخیبووەكان بەیەكیانا دا، بە هاتنی مانگی كانوونی یەك/ دیسامبری ١٩١٤ ئەرمەن لە رۆژاوای ئێراندا خۆیان لەیەكەی شەڕكەردا ڕێكخستەوە و چوونە ژێر سایەیەكی تەواوی ڕووسەكانەوە. ئەو چەك و كەلوپەلانەیان وەردەگرت كە ئەرمەنەكان لە ئەرمینیای ڕووسیاوە هاوردبوویان، ڕووسیش ژمارەیەكی زیاتری لێ پڕ چەك كردن، فیرارەكانی سوپای عوسمانیش بەچەكەكانیانەوە دایانە پاڵ چەتە یاخییەكان لە ئێران، هێزە عوسمانیەكان خۆڕاگر بوون ، بەربەرەكانیان دەكرد، كەرەت هەبوو سەردەكەوتن و كەرەتی تریش شكستیان دەبووە نسیب. بەلام هێزە بچووكە عوسمانیەكانی تر هیچ پیرۆزیەكیان بەدەستنەدەهێنا[٤٨].

ئەو هێزانەی پەلاماری سنووری ڤانیان دەدا سەربازی نیزامی ڕووس و لیوای یەكی ئەرمەن بوون لەگەڵ ئەو خۆبەخشانەی لە ڕووسیاوە هاتبوون (لەناویاندا هەندێ لەو ئەرمەنانەی لە ئەنەدۆڵەوە هاتبوون) جگە لە هەندێ دەستەی ئەرمەنی تر كە لە ئێران و ناو سەڵتەنەوە هاتبوون[٤٩]. هەندێ عەشایریش دابوویانە پاڵ ڕووس، جێی ئاماژەیە كە ژمارەی هێزەكانی ڕووس گەلێ زۆرتری تێپەڕاندبوو لە ژمارەی هێزەكانی بەرگری عوسمانی. لە (هوشاب)ەوە سەركردەی فیرقەی گەڕۆكی دەرەك (كازم بەگ) لە پێنجی كانوونی یەك/دیسامبر دەنووسێ:

((هێزێكی دوژمن لە ٤٠٠٠ هەزار سەربازی پیادە و ١٠٠٠ سوارە و دوو تۆپی مەییان و دووانی شاخاوی گەیشتنە دەوروبەری شاری (سارای)، ئەمڕۆ یەكەی چاو و ڕاوكردن گەیشتە گوندی (مەلا حەسەن)ی ناوچەی (مەسلەحان، سارای و ئەرسیك)، یەكەیەكی ٥٠٠ كەسی دوژمن بە پاڵپشتی دوو

تۆپی شاخاوی لە (دیر)ەوە هاتن و (بشکالە)یان گرت، بەڵام یەکەکانی دی لە دەوروبەری دیر مانەوە، سەرەك عەشایرەکانیش بەبێ تەقە سەردو خوار بوونەوە، ئێمە ئیستە واین لەپاڵ (ئەگگول) لە سەرووی (هوشاب) بە هێزێکی ٢٠٠٠ کەسیەوە دوێنێ لە هوشابەوە بڵاوەمان لێ کرد، چەند یەکەیەکی دی هێشتا هەر لە شوێنەکانی خۆیان ماونەوە.

دوژمن، ئەو شوێنانەی دەیانگرێ دانیشتوانەکانیان چەك دەکات، چەکەکانیان دەدا بە ئەرمەنەکان بۆ پێکهێنانی یەکەی سەربازی تر لێیان، یەکەکانی دوژمن هەندێ عەشایری ئێرانیشیان وا لە ناودا (کوردی ئێران) جا لەبەر ئەوەی ئێمە ناچاربووین کە سەربازە ئەرمەنەکانمان چەککەین، بەهۆی ئەو زیانانەی تووشمان هاتوون بەهۆی فێرارکردنی گەلێکیشیانەوە ئەوا ژمارەی هێزەکانمان کەمبۆتەوە، خۆ ئەو یەکانەش کە لە (رفندیز)ەوە گوازراونەوە هێشتا نەهاتوونەتە (سۆمای) تا بێنە پاڵمان، بەپێی ئەو زانیاریانەی لە موسڵەوە پێمان گەیشتووە دوو تۆپە شاخاویەکە گەڕێنراونەتەوە بۆ (رفندیز)[50].))

لەنێوان ١٧ - ١٩ کانوونی یەك/دیسامبر، شەڕێکی گەورە لە خوار قوتوورەوە دژ بە ئەرمەن بەرپا بوو، عوسمانێکان ٤٠٠ کەسیان لە برینار و کوژراو لێ تەلەف بوو، ناچار گەڕانەوە سارای ڕەوەندە کوردەکانی سەر بە عوسمانیان تووشی شکستهاتن و دوا بەدوا گەڕانەوە[51].

کە ڕووس و ئەرمەن لە ئێرانەوە کەوتنە پامالکردن، لە مانگی کانوونی یەك/دیسامبری ١٩١٤ لە ناوەوە پێکادان بەبەردەوام دەستی پێکرد، بەرپرسانی عوسمانی لە ناوچەکە ئەو ڕوداوانەیان بە درێژی دەگەیاندە سەرکردایەتی سوپاو وەزارەتی ناوخۆ، (تەحسین بەگ)ی حاکمی ئەرزڕۆم لە ٢١ کانوونی یەك/دیسامبردا دەنووسێ: لەهەردوو کەرتی (کارجیکان و غیفاش) لە هەرێمی ڤان ئەرمەن لە حاڵێکی یاخیبووودان، هێڵی تەلەگرافیان ڤرتاندووە و

پەلامارى قايمقاميان داوە. وە دەڵێ: هێزەكانى دەرەك بەشى سەركوتكردنى ياخيبوونەكە ناكات و دەبێ سەربازى زياتر بنێرن[٥٢].

ڕەوتى هێرشى ئەرمەنەكان بۆ سەر دەرەك و گرتنى ڕێگە و خاڵە ستراتيژەكان لە كانوونى دوو/ يەنايرى ١٩١٥ لە هەڵگشاندابوو.

ئەستەموول ئاگاى لەوەبوو كە ڕويدەدا، هەرچەندە نوێنەرانى ئەرمەن لە پايتەختدا هەر جموجۆڵێكى شۆڕشگێڕانەيان ڕەتدەكردەوە، تۆبالەكەيان دەخستە سەر فەشەلى ڕەوشى ئەمنى لە ڕۆژهەڵاتدا[٥٣].

ڕاپۆرتە هەواڵگريەكان بە وردى وەسفى ئەو مەترسيەيان دەكرد كە خەريكە لە ئەنجامى ياخيبوونێكى گشتى ئەرمەنەوە دەدا بەسەر ناوچەكەدا، شيكردنەوەكانيش ئاماژە بەوە دەدا كە ڕووسەكان بەزۆرى لەلاى سەرەوە پەلامار دەدەن (لە بايەزيدەوە بۆ ئەباك)، هەر لە عەينى كاتدا چاوەڕێى ئەوە دەكرا كە ئەرمەنيش لە ناوچەى ڤان ياخيبوونێكى گشتى بەرپاكەن لەپێناو ئاسانكارى داگيركردنەكەى ڕووس.

سيفديت و گەلێ بەرپرسى تريش دەياننووسى:

كە ئا بەو چەشنە ياخيبوونێك ئەگەرى ڕودانى هەيە. هەرچەندە ئەمانە خراپ بۆى چووبوون لەبارەى كاتى ڕودانەكەيەوە لە شارى ڤاندا، لەلاى خۆيەوە سيفديت هەوڵى پێكهێنانى هێزى غەيرە نيزامى عەشايرى دەدا وەك خۆ تەياركردنێك بۆ بەرەورووبوونەوەى ياخيبوونەكە، بەڵام وادەردەكەوت لە بەررامبەردا هيچكام لە حوكمەتى مەركەزىو سەركردەيى سوپاى سێ بەتەماى مەترسى شەڕێكى چەتەگەرى سەرتاسەر و دڕندانە نەبوون كە لە شوبات/فەبرايرى ١٩١٥دا قەوما.

لە شوبات/ فەبراير، باجگرەكان بە هاوكارى دەرەك ڕووە و ناحيەى (تيمار)ى سەرووى ڤان بوونەوە، بە مەبەستى سەرژمێريكردنى مەڕوماڵات كە بەپێى ژمارە و سەريان باجيان لەسەر دانرابوو، لێرە لەنێوان لادێييە

ئەرمەنەکان و باجگرەکاندا ناکۆکی دروستبوو، ئەمەش تەنیا ڕوداوێك نەبوو کە هەر لەوێ ڕوویدات، بەڵام ئەوەی گۆڕابوو لادێییەکانبوون کە چەکداربوون و موهەییای یاخیبوون بوون. تومەس پێشتر بۆ ڕووبەڕووبوونەوە ئامادەکاری کرابوو، جا زیاتر لە هەزار ئەرمەنی چەکدار شەپۆلی یاخیبوونیان لە تیمار و دەوروبەری بەرپاکرد و دەمودەس، وەك ئاگر لە پاوەن بەردەی، تەنییەوە، کەوتنە پەلاماردانی گوندە موسوڵمانەکان و دەستیان کرد بە کوشتنی موسوڵمان و چوونە سەر بنکەی دەرەکی دێی (بنات) دەرەکان و سەرکردەکەیان کوشت[٥٤].

یاخیبوون گورج قەزای غیفاش و جاتاکی سەر بە ڤانیان گرتەوە، لە غیفاش (ئیسماعیل حەقی) قازییان کوشت، هێڵەکانی تەلەگراف و ڕێگەکانی هاتوچۆیان بڕی[٥٥].

بەپێی ئەوەی لە ئامیلکەکەی (ڕێنماییەکانی بەرگریکردن لەخۆ)دا هاتبوو، باقی گوندە ئەرمەنیەکانیدی کەمەندکێشی یاخیبوونە سەرتاسەریەکە ببوون. ئەوەشی لە گوندە تێکەڵەکاندا دەژیا باری کردبوو بۆ ناو ئەو گوندانەی ئەرمەنن و هەر زوو ئەم کارە سیفەتێکی دەستەجەمعی بەخۆوە دی و بووە دیاردەیەکی وا کە موسوڵمانەکانیشی گرتەوە لەوەی کە باریان دەکردە ناو گوندە موسوڵمانەکان. یاخیبووان پەلاماری گوند و پەنابەرانی موسوڵمانیان دەدا، لە ئاست ئەمەدا عەشایری کوردیش دەستیان کردە هێرش و پەلاماردان بۆ سەر گوندەکانی ئەوان[٥٦].

هەرچەندە هیچ تۆمارێك لەبارەی کاریگەری دەروونی ئەو پێکدادانانە بۆ سەر گوند نشینەکان لە ئارادا نییە بەڵام دەکرێ بگوترێ کە هەردوولا لە دوو جەمسەری جیا لەیەکدابوون بەڵام خاڵی هاوبەش کە پەژارە و دەردیسەریەکە بوو، کۆی کردبوونەوە و زیانێکی بەشەری زۆریان بەردەکەوت. کۆچ و باری ئەرمەن بووە هۆی زۆربوونی ژمارەی هێزە

ئەيارەكانى عوسمانى، چونكە زۆرێك لەوانەى حەز و ئارەزووى ياخيبوونيان نەبوو ئيستە بەپێى واقيعى حاڵ وا شەڕەكە يەخەى گرتن وەبوونە بەشێك لێى، ئيتر ئەو شەڕە بريتى نەبوو لە تەنيا ململانێيەك لەنێوان سەربازانى عوسمانى لەلايەك و ڕووس و حيزبە ئەرمەنەكان لەلايەكى دى، بووە شەڕێكى گشتگيرى نێوان موسوڵمان و ئەرمەن.

بەهەقەتى لە سەرەتاى شوبات/فەبرايرى ١٩١٥ەوە ياخيبوونە گشتيە ئەرمەنيدكە، جگە لە شارى ڤان و دەوروبەرى، ڕاستەوخۆ دەستى پێ كرد. بەو ئامازەيەى كە ڤان هيچ كات تاكە شوێنى ياخيبوون نەبووە، چونكە ئەرمەن لە هەرێمەكانى (ڤان، پەتليس، سيڤاس، ئەتەنە و ئەرزرۆم)يش ياخيبوون[57].لە شوبات /فەبراير ئەرمەنەكان پەلامارى (مووش، پەتليس ،سيلازغ) و شوێنانى تريشياندا، سەربازيان دەكوشت و تەوەى دەشهات بەهانايانەوە پەلاماريان دەدا، لەگشت لايەكى هەرێمەكە و لەگوندە ئەرمەنيەكاندا كۆبوونەوەكانى ڕێكخستنى شۆڕشگێڕانە بەڕێوە دەچوو.

بەرپرسە عوسمانيە عەسكەرى و مەدەنيەكان لەبارەى ئەو كوشت و كوشتارەوە ڕاپۆرتى خۆيان دەدا، هەر بۆ نموونە:

سەربازە هەڵاتووە ئەرمەنەكان لە نێزيك هيزانەوە دوو دەرەكيان كوشت و پاش ئەمە لە شەڕێكى سێ ڕۆژەدا حەوت سەرباز و دەرەك ديسان كوژران، بۆ ئەمە، ڕاپۆرتەكانى سوپا ئاماژە بەوە دەدەن كە ئەرمەنەكان لە گوندەكانى ئەو ناوچەيە گردبوونەتەوە[58]. لە دەشتى مووش دەرەكەكان دوچارى هێرشێ بوون و شەڕێكى دوو سەعاتى لە نێزيك پايتەختى مووش قەوما، شەڕێكى دى لە دێى (كرميس)ى سەر بە (ئەكعان بوجاغى) هەشت سەعاتى خاياند و نۆ ميليشا و دەرەكى عوسمانى كوژران، لە زۆر گونديشدا خەڵكە مەدەنيەكە سەردەبڕران، وەك (گوميش، تاسو، ڤيكيرسيز، سيفور، ميرهيغو، ئيستوكى، هيتر)[60].

لە ٢٧ شوبات/فەبرایر نیزیکەی ٢٠٠ سەربازی خۆبەخشی موسوڵمان کە لە (ئەدیلکیفاز)ەوە دەهاتنەوە ڤان پەلاماردران و هەشتیان لێ کوژرا، لە (ئیرگیش)ەوە بەهانایانەوە چوون، ئەرمەنەکان ڕووە و دەریاچەی ڤان هەڵاتبوون[11]. بە داهاتنی مانگی ئادار/مارسی ١٩١٥ گوندەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵ سەرتاپا لە حاڵەتی شەڕدابوون، یاخیبووان و سەربازە فیرارەکان لە دەوروبەری ڤان هێرشەکانیان چڕتر کردبۆوە، بەبێ گوێدانە تەمەن یا ڕەگەز (نێر یا مێ) هەر موسوڵمانێ شۆڕشگێران چاویان کردایە زۆر بە ئاسانی و خەمساردانە دەکوژرا[12]. بەڵام کەرتەکانی سەروو لە حوکمێکەوە کەوتە دەست حوکمێکی تر، سەرەتا لەدەست ڕووسدابوو، دوایی هێزە عوسمانیەکان دەریان پەڕاندن، ئینجا ناوچەی (بارگیری - محەممەدی) کە دوا هێڵی بەرگری ڤان بوو، ناوچەیەکی مشتومڕ لەسەر، لە شوبات /فەبرایری ١٩١٥دا ڕووسەکان پانتاییەکی گەورەیان لێ داگیرکرد بەڵام لە کۆتایی هەرەو مانگەدا لێی کشانەوە.

لە ئادار/ مارس یاخیبووەکان پەرەیان بە پەلامارەکانیان داو جۆرە کوشت و بڕێکیشیان دەستدایە کە بە پیلان و پرۆگرامێکی داڕێژراو بەڕێو دەچوو، یاخیبوونەکە وا فرەوانبوو تا گشت هەرێمی ڤانی گرتەوە بەتایبەت پارچەکانی خواروویەوە کە ئەرمەنەکان کردبوویانە بنکەی سەرەکی بۆ خۆیان، لە قەزای (جاتاك)ی سەر بە ڤان کە لەومبەر گەلێ جار پەلاماردرابوو، لەوەی دەکرد کە یاخیبوونەکە بەر لە بڕیاردان لەسەری دەستی درابێتێ، بە دەلیلی ئاشکراکردنی پلانەکەیان لەلایەن دەوڵەتەوە، یاخیبووان هێڵی تەلەگرافی نێوان بەتلیس و ڤان و جاتاکیان قرتاند، کە تەنیا هۆیەکی گەیاندن و پەیوەندی بوو لە دەڤەرەکەدا، دەستیان کردە پەلاماردانی یەکە سەربازی و ڕێبوارە موسوڵمانەکانی ئەو ناوە[13].

ناوچەی جاتاك بەتایبەت، پاڵەپەستۆیەکی فرەلایەنەی لەسەربوو،

یاخیبووان چواردەوری بینای حوکمەتیان گرت و دوو کەسیشیان کوشت، سەرباز و دەرەك پەلامار دران و هێڵی تەلەگرافیان فرتاند، سەرە ڕێگەیان بەسەرباز دەگرت[64]. هەردوو هەرێمی ڤان و پەتلیس یاخیبوونەکە تیایاندا ڕوو لە پەرەسەندن بوو، لەوانەوە تەنیەوە بۆ ئەملاولا، جا لەبەر ئەوەی حاکمانی هەرێم بەگوێرەی ئەو توانا کەمەی لەبەردەستیانا بوو دەجوڵانەوە، بۆیە سەرکەوتنێکی کەم نەبێ لە بەرەوڕووبوونەوەکەیاندا هیچی وایان بەدەستنەهێنا، بۆیە ناوەڕۆکی ئەو نامانەی دەیاننارد بۆ ئەستەمووڵ گۆڕا، وەسفی شەڕێکی سەرتاسەری لە ڕاپۆرتە سەربازیەکانیاندا دەردەکەوت: بەدرێژایی شەو لەگشت جەبهەکاندا شەڕ بەردەوامە، دەشێ ژمارەی یاخیبووان لە دوو هەزار زیاتر بێ و ئێمەش هەوڵی سەرکوتکردنیان دەدەین[65].

ئەوەی پێشتر بە کاری (چەتەیی و ڕێگری یان خیانەت ناوی لێ دەنرا و بەم زوانە سەری پان دەکرێتەوە) ئیستە ئەوە بە یاخیبوون دادەنرێ. بەرپرسانی عوسمانی لەتەك یاخیبوونەکەدا ڕاهاتبوون و تولفەتیان پێوەگرتبوو، بەڵام هێزەکانیان کورتی دەهێنا و کەمبوون، لەگەڵ پەرەسەندنی یاخیبوونەکە و زیادبوونی پەلامارەکان بۆسەر گوندی موسوڵمانەکان و ئەو ناوچانەی ژیانی تێدابوو لەناو سنووری هەرێمەکەدا، (سیفدیت بەگ) کە لەتەك هێزە عوسمانیەکاندا بوو لە ئێران، لەگەڵ کەتیبەیەکی ٦٠٠ کەسیدا چوو بۆ شاری ڤان، دوو تۆپی مەیدانیشی درایە و ئیتر لە شارەکەدا کەتیبەیەکی تەواوی دەرەك و دەرەکی گەڕۆك و سەد سەربازی نیزامی و سەد سوارە (یانی ٢٢٠٠ کەس)ی سەرکردەیی دەکرد، جگە لە تۆپێکی شاخاوی و دووانی مەیدانیش[66].

ئەو سەربازانەی سەر بەسوپای سێ بوون زۆر کەمبوون و چاوەڕوانیش دەکرا کە سیفدیت چ هێزێکی تری بۆ بهاتایە دەست بەکاری دەهێنا بۆ

گوژاندنەوەی کڵپەی ڕاخیبوونەکە. لە واقیعیشدا، هەتا ئەگەر سوپای ڕووس هەڕەشەش نەبووایە بۆ سەر ڤان، هێشتا هەر ژمارەی سەرباز بەشی گوژاندنەوەی ئاگرەکەی نەدەکرد، لەکاتێکدا ڕووسەکان لەخۆتەیارکردندا بوون بۆ پامالکردنی هەرێمەکە لە ڕۆژهەڵات و باکوورەوە، ئەرمەنیش لە ڕاخیوبووندابوون، هێزە کەمەکەی عوسمانیش جێگەی بەزەیی بوو، دوایش دەرکەوت کە ژمارەی ئەم هێزە هەتا بەشی ڕزگارکردنی شاری ڤانیش ناکات لە چنگی ڕاخیبووەکان، چ جای سەرکوتکردنی ڕاخیبوونەکە لە لادێکاندا.

جاران، سیفدیتە فەنی هێجگار هێند نائارام نەبوو سەبارەت ئاسایشی شارەکە، بەڵام وردە وردە دەرکی بەوە کرد کە شاری ڤان خۆیشی وا نەناو جەرگەی ئاگرەکەدا، لەنامەیەکیدا بۆ سەرکردەیی سوپای سێ، ٢٥ ئادار/مارسی ١٩١٥ باس لە ڕەوشی مەترسیداری هەرێمەکە دەکات، داوای تۆپێك و کەتیبەیەکی تری سەرباز دەکات:

(( ئەرمەنیەکان خۆیان ئامادەکردووە بۆ ڕاخیبوونێکی گشتگیری کە بتوانێ یارمەتی هێرشەکەی ڕووس بدات، کە لە (ئەباك و سارای)ەوە دێت و داگیرکردنی ڤان بۆ دوژمن ئاسانکات. ئەوان نیستە تەنیا چاوەڕوانی کردنەوەی ڕێگەکانن کە بەفر و سەهۆڵبەندان گرتوونی، بەتەمای ئەمە سەرەتا کەوتنە بەشداریکردن لەو ڕوداوانەی لێرە و لەوێ بە جیا ڕویاندەدا، ئەوەکو باری ئێمە بەهۆی ئەو هێزانەی داوامان کردبوون و چاوەڕوانیان بوون، لە بنەڕەتەوە باشبێ.

جا لەبەر ئەوەی ئەو هێزانە نەهاتن، دەستیان دایە دەستدرێژی بۆ سەر ئەو گوندە موسوڵمانانەی کە نێزیکبوون لەو گوندانەی ئەرمەن تیایاندا کۆببوونەوە، هەر لە دێی (ئیرلیر) نێزیك بە ڤان پەلاماری دەرەك و باجگرەکانیاندا، ئیتر بۆیان نەکرا کارەکانیان بە ڕێکوپێکی بەڕێوەبەرن تا کاتی ڕاخیبوونە گشتیەکە، کردەوەکانیان مەبەستەکانیانی ئاشکرا دەکرد،

سەرەڕاى بەرگريكردنى موسوڵمانان لە خۆيان و تەقەللاى ئەو پەلە سەربازانەى لە ڤانەوە ڕەوانە دەكران و ياخيبوونيان بلاّوە پێكرد.

ئەم ڕەفتارانە لە مەڵبەندى هەرێمەكە و شوێنانى ترى نێزيكيدا دووبارە دەبنەوە، نيشانەكانى ڕودانى ئەو ڕوداوە حەتميانە وان لەبەرچاومان، ڕاپۆرتەكانى سەر لقەكەى قووتور ئيشارە بەوە دەدەن كە ڕووسەكان بەرەو ئەو دۆڵە وان لە پێشڕەويدا. پاش گرتنى خاڵە گرنگەكانى تەنگەى قوتوور ئينجا هێرش دەكەنە سەر (ساراى)، گومانى تێدا نييە كە ئەرمەنەكانيش لە هەموو لايەكەوە ياخيدەبن[٦٧].))

زستان لەشكرى ڕووسى لەناوچە شاخاويەكاندا ئەوق كردبوو، لە كۆتايى مانگى ئادار/مارسدا ڕێگە و بانەكان كرانەوە و هێزەكانى ڕووس هەڕەشەيان بە پاماڵكردنى ڤان لە سێ لاوە دەكرد:

- لە باكووردوە، دەيانتوانى لەو تەنگە و دەربەنە شاخاويانەوە كە لە دۆڵى (ئيليشكرت)بوون بێنە پێش، لە ئادار/مارسى ١٩١٥ ئەو دۆڵەيان گرتەوە كە عوسمانێكان گرتبوويانەوە، ئەم دۆڵە ببووە بنكەيە بۆ بەرەو پێشەوەچوون ڕووەو باشوور. بەلاّم لاى ڕۆژاواوە بە گرتنى (توتاك)[٦٨] گەيشتنە سەر ئاوى (موراد).

بەتاليۆنى سوارەى پەدەگ لە (بارجيرى) لاواز و كزبوو، هەتا بەشى ڕووبەڕووبوونەوەى ئەو ئەرمەنانەشى نەدەكرد كە لە ئێرانەوە ئامدبو دەبوون تا بدەن بەسەر ولاّتدا.

- لە ڕۆژهەلاّتى شارى ڤانەوە، عوسمانێكان تەنگەى قوتووريان بەدەستەوە بوو، ڕووس و ئەرمەنيش هەڕەشەى ڕاماڵينى ئەوانەيان دەكرد كە بەرگرى لەو تەنگەيە دەكەن، بەوەدا كە يەكەى حيزبيى ئەرمەنى لەوديو ڕيزەكانى شەڕەوە چالاكو دەستبەكار بوون، پێشتريش لە كانوونى يەك/ديسامبر ١٩١٤ هێزێكى عوسمانى هەر لەو جێيەدا بەتەواوى شكێنرابوو[٦٩].

• لە باشوورەوە، هێزێکی ڕووسی کە لە رۆژاوای دەریاچەی ورمێ وە مۆڵی خواردبوو، هەڕەشەی لە (بشکالە)ی خوارووی هەرێمی ڤان دەکرد.

لەوەی باسکرا، دەرکەوت، بە بەرنامە لە ئادار/مارسی ١٩١٥ەوە یاخیبوونەکەی ڤان دەستی درایە و بەرەوپێشەوە دەچوو، دیارە پاش ئەوەی لە قەزای جاتاکەوە دەستی پێکرد، بەپێی یەك لەو ڕاپۆرتانەی سەرکردەی دەرەکی گەڕۆکی ڤان کە لە ١٦ نیسان/ئەپریل نووسیویە، یاخیبووان لە قرتاندنی تەلی تەرەگرافەوە چوون بۆ پەلاماردانی بنکەکانی دەرەك و سەربازگەکانی ناو کەرتە ئەرمەنیەکانی قەزای جاتاك. جا بۆ دانانی سنووری بۆ ئەو ڕوداوانە، چەند پەلێ دەردك ڕەوانە کران، بەڵام لووتیان بوو بە لووتی هێرشێکی ئەرمەنیەوە[٧٠]. دوایش ئەو پەلانە نەیانتوانی ڕێڕەوی ڕوداوەکان بگۆڕن یان کار بکەنە سەریان.

لە دەستپێکی ١٨ نیسان/ ئەپریلەوە لە ناحیەی (هاڤازور)ی، رۆژهەڵاتی شاری ڤان ئەرمەنەکان دەستیان کردە شەڕ لەگەڵ دەردك و میلیشیاکان، هەروا لە (هوشاب و ئیرجیك)یش ئەرمەن ڕاپەڕین، شەڕی نێوان ئەرمەن و دەرەك لە جاتاك بەردەوامبوو[٧١].

## • یاخیبوونەکە دەگاتە ناو شاری "ڤان"

لەگەڵ ئەو شەپۆلە یاخیبوونەی گشت لادێکانی دەوروبەری گرتبۆوە کەچی شاری ڤان تا ڕادەیە هێمن بوو. خۆ ئەگەر پاراستنی ناو شارەکە کز و لاواز بێ دیارە ئەو هێمنیە تا سەر نابێ. لە باکوور و رۆژهەڵاتدا یەکە سەربازیەکان لە بەرگریکردندابوون ، وە یان دژ بە یاخیبووان لە شەڕدابوون. لیژنە ئەرمەنیەکان لەژێر ڕابەرایەتی تاشناقدا یەکیانگرتبوو، ڤیرارەکانیش بە پاڵ هەندێ ئەرمەنی لادێیی چەکدارەوە ڕیزی ئەرمەنە چەکدارەکانی ناوشاریان بەهێز کردبوو، هاوردەگردنی چەکیش، کە

ستراتیژی داهێنـان و شـتی تریشـی لێ کـەوتبۆوە، وەك هێنـانی نـارنجۆك و بۆمبا و چەك لە (تەرابزون)ەوە لەناو بارستەی پووشدا، هەر بەردەوامبوو.

حیزبـی تاشـناق لـە شـاری ڤـان (ئەنجوومـەنی بـەرگری میللـی) دەبـرد بەڕێوە، سەرۆکەکەی (هایگ گوسـیان - گاسـویان) بـەر لـە شـەڕەکە وەسـفێکی کورتی ئەنجوومەنەکە و ئامادەکاریەکانی نووسیوە و دەڵێ:

((یەکیەتی شۆڕشگێڕانی ئەرمەن بەرپرسێتی دەستەبەرکردنی بـەرگری لـە سـەرەتای ڕوداوەکانـەوە خستە ئەستۆی خـۆی، جـا لەبـەر ئـەوەی (ڤـان ڤاسبوراگان) بۆتە یەکێ لـە گۆڕەپانـەکانی شـەڕ و پـڕە لـە کـوردی چـەکدار و دەسـتەی حەمیـدییە و میلیشـیای ئاژاوەچـی و دز و درۆزن، بۆیـە لـە مـانگی تشرینی یەك/ ئەکتۆبـەری ١٩١٤ەوە یەکیەتیەکە سـەرقاڵی ئەوەیـە کـە پلانـی بەرگریکردن داڕێژێ و ئەو ئەرکانەش کە پەیوەنـدن پێـوەی، بـەلام بانگەشـە پێشوەختەکەی (شەڕە پیرۆزەکە) قورەکەی خەستترکردەوە.

ئەنجوومەن لە حەوت ئەندام پێکهاتووە: داڤید سارکیسیان، بەڕێوەبەری مارکێتێـك. لیڤـۆن کالجیـان، بازرگـان. هاییـك گوسـویان، مامۆسـتا. میهـران تورومانیان، سابونچی. میهرداد مـیرزا خنیـان، موڵکدار و جوتیـار. سـەرکیس شەهێنیان، بازرگان. هاروتیون نیر گارایان، ئاسنگەر.

پاش پرس و ڕاوێـژ لـە دەسـتەڵاتدارانی سـەرەوە، ئەنجوومەنەکـە تـوانی ئەرکە جەوهەریەکانی جێبەجێ بکات، وەك:

أ- تۆمارکردنی چەکەکان و ڕێکخستنی شوێنی شاردنەوەیان پـەیاکردنی چەکی ئاگراوی*.

ب- تۆمـارکردنی نـاوی ئـەو پیاوانـەی لـەبارن بـۆ شـەڕکردن و توانـای بەرگرییان هەیە. دانانی سەرکردەکانی بەرگریکردن و چـاککردنەوەی چەکە خراپەکان.

ج- هێنانەکایەی دامەزراوی تیمـارگردن و چارەسـەرکردن و فریاکـەوتنی

سەرەتایی و زامنکردنی داودەرمان.

د- پێکهێنانی لیژنەیەکی دەستەبەرکردن کە لەکاتی پێویستدا دەشێ بخرێتە کارەوە[٧٢].))

دەستبەکاربوونی ئەنجوومەنی بەرگریکردن لە تشرینی یەك/ ئەکتۆبەری ١٩١٤ەوە شتێکی دەروونی بووە، پانی بەر لەوەی شاری ڤان ببێتە یەکێ لە گۆرەپانەکانی جەنگ بەماوەیەکی زۆر، لەوانەیە ئەرمەنەکان ئەم بڕیارەیان بۆ خۆئامادەکردن و خۆپاراستنێ دانابێ، هەرچەندە (گۆسۆیان) ئەمەی ئاشکرا نەکرد بەڵام عوسمانیەکان ئەو چالاکیەیان بە شێوازێکی جیاوازتر شرۆڤە دەکرد، ئەمەش بەوپێیەی کە ئەرمەنەکان فێراریان کردبوو و کۆبوونەوەی تاشناق لەگەڵ بەرپرسانی ڕووس و بەهێزکردنی دەستە و تاقمەکان و سەرکردەیی شۆڕش لە ڤان، جگە لە پێکەوەنانی تاقمە چەتەی شەڕکەری ئەرمەنی و دەستکردنیان بە پەلاماردانە بەراییەکان.

ئەم ئامادەکاریانە لە ڕۆژانی یەکەمی یاخیبوونەکەوە بەرلەوەی تارمایی شەڕەکە بگاتە ڤان وە بەر لەوەی بە ماوەیەکی زۆر دەوڵەت هەچ ڕێوشوێنێکی تێدا بگرێتە بەر دژ بە یاخیبووەکان. ئەمانە گشتی دەلیلن بۆ ئامادەکاری بۆ ئەو یاخیبوونە و نیازی یاخیبوون.

لە نیسان/ ئەپریل، (سیفدیت)ی حاکمی ڤان دژ بە سەرکردەکانی تاشناق ڕێوشوێنی گرتە بەر، بێگومان ئەو وای چاوەڕوان دەکرد کە لە ڕێی تیرۆرکردنی سەرکردەی حیزبە شۆڕشگێڕەکانەوە یاخیبووان هەڵدەتەکێنێ. لە ڤانەوە (ئیشخان)ی ناردە (جاتاك) بۆ وتووێژکردن، وەك دەردەکەوت لەگەڵ یاخیبووان، بەڵام لە گوندی (هیرج) شەوی ١٦ - ١٧ نیسان /ئەپریل کوژرا، بەڵگەش نییە بۆ ئەوەی کە ئاخۆ حوکمەت فەرمانی دابوو بەو کوشتنە پانێنا. بەڵام ئەمە گریمانەیەکە و زۆر ڕێی تێدەچێ.

لە ١٧ نیسان/ئەپریل (فرامیان) دەستگیر کرا و لەتەك پاسەواندا نێردرا

بۆ ئەستەموول، بەڵام بەر لەوەی بگاتە پەتلیس ونبوو (بەزۆری کوژرا). لەنێو سێ سەرکردەکانی تاشناقدا تەنیا (ئارام مانوکیان) توانی هەڵبێ[٣٣]. هەر کە هەواڵی دەستگیرکردنی فرامیانی بیست بڕیاریدا خۆی ونکات. جێی ئاماژەیە کە ئەگەر ئارام هەڵنەهاتبا ئەوا سیاسەی دڕندانە و نا ڤانوونیەکەی (سیفیدیت) بەزۆری لە هەڵوەشاندنەوەی سیستمی شۆڕشگێڕی ئەرمەندا سەردەکەوت. لەباتی ئەمە ئەو سیاسەتە وای کرد کە زوربەی سەرکردەکانی تاشناق ببنە هێزێکی ئەوتۆ لە بەڕێوەبردنی یاخیبوونەکەدا کە دەستەلاتێکی ڕەهایان بێ. هەر ئەم سیاسەیە بەزۆری بۆ یاخیبوونی سەلماند کە شاری ڤان ماوەیەکی دورو درێژبوو ببووە پەناگەیەکی ئەمین بۆیان، ئیستە وا ئەما.




نەخشەی ١ - ٨

● یاخیبوونەکە لە شارە کۆنەکەی ڤان

* لەوانەیە مەبەست لێی نارنجۆك و بۆمبا و مۆلۆتۆف و...لەو بابەتانە بێ.

"وەرگێڕ"

لە خوارووی شاری ڤان یاخیبوون بەردەوامبوو، عوسانیەکانیش دەرەقەت نەدەهاتن، سەرەڕای ئەو پێویستیە زۆرەیان بە سەرباز بۆ سنووری ئێران، یەکەکان نێردران بۆ شاری جاتاك و لێرەش تووشی نارەحەتیەکی زۆر بوون، کازم بەگ کە سەرکردەی فیرقەی دەرەکی گەڕۆکبوو لە ڤان، لە ۱۸ نیسان/ ئەپریل لە هەکاریەوە دەنووسێ: لەسەر ڕێگەکان سەربازەکان دراونەتە بەر تەقە و هێشتا نەیانتوانیوە بگەنە جاتاك و هیچ ئاگایەکیشیان لە جاتاك نییە چونکە هێڵی تەلەگراف قرتێنراوە و هەواڵی ئەوێیان پێ نەگەیشتووە.

وە دەڵێ: لە ئیستادا ڤان و شارەکانی دی هێمنن بەڵام کە شەپۆلی یاخیبوونەکە فرەوانبوو و تەنیەوە و گشتلایەکی گرتەوە وا چاوەڕوان دەکرێ هێڵەکانی تەلەگراف سەرتاپا بپچڕێن[٧١].

ئەو پێشبینیکردنە خراپەی کازم لە ناهەقیدا نەبوو، چونکە زنجیرەیە هێرش و کاری تیرۆر لەگشت لایە سەریان هەڵدا. پاش دوو ڕۆژ لەو ڕاپورتە، یانی لە ۲۰ نیسان/ئەپریل ئیتر یاخیبوونەکە گەیشتە ناو شاری ڤان. سیفدیت بەگی حاکمی شار لە بەیانی ۲۰ نیسان/ئەپریل دا نامەیەکی بۆ سەرکردەیی سوپای سێ نارد و تێیدا دەڵێ:

١- یاخیبووە ئەرمەنەکان کەوتنە تەقەکردن لە بنکەی هێزە ئەمنیەکان و خانووەکانی دەوروبەریان کەوان بەپاڵ گەڕەکە ئەرمەنەکانەوە، تەقە بە تەقە وەڵام درایەوە و بەرگریش لەناوچەکە کرا.

٢- لەناکامی بەیەکا هەڵپژان لەگەڵ جەتە یاخیبووەکاندا، ژمارەیەکی زۆر لە یاخیبووەکان تا دوێنێ ئێوارە کوژراون، هەردوو گوندی (ئەتالان و بلتنس) تالان کران و ئینجا سووتێنران، دەیرێکی ڤایمیش لە (ئەکیلیز) کە دەبوو ببووایە سەنگەرێکی یاخیبووان کاول کرا و سووتا.

٣- هێڵی تەلەگرافی غیفاش چاك کرایەوە و پەیوەندیەکان وەك خۆیان

لێهاتەوە.

٤- ئەمڕۆ، هێڵی تەلەگرافی نێوان: بشکالە و هافازور وە نێوان: میرمورتال و ریشات فرتێنرا، بەڵام ئیستە وا خەریکی چاککردنەوەمین[٧٥].

## • دەستپێکی یاخیبوونەکەی "ڤان"

لە واقیعدا چەند رۆژێکبوو قۆناغی یەکەمی ئەو یاخیبوونە دەستی درابوویە، ئەو کاتەی موسوڵمان و ئەرمەن لە گەڕەکە تێکەڵەکانی شارەوە هەڵدەهاتن بۆ ئەو گەڕەکانەی تەنیا لایەکیانی تیا نیشتەجێ بوو، ئەرمەن دەستیان کردە سەنگەر لێدان و قایمکاری بە دەوری ماڵەکانیاندا، هەروا لای خۆیانەوە عوسمانیەکانیش خاڵ و بنکەی چاودێریان دامەزراند، بە درێژایی ئەو هێڵانەی کە تیا بەرامبەر بوون پاسەوان و دەوریەیان تیا بڵاوکردەوە، لە ١٨ نیسان/ ئەپریل هەرسێ حیزبە ئەرمەنەکە کۆبوونەوە و ڕایانگەیاند کە (لیژنەی سەربازی بۆ بەرگریکردن لە ئەرمەن)یان دامەزراند، ناویشنرابوو (لیژنەی نیشتمانی بۆ بەرگریکردن لەخۆ) و گەلێ ناوی دی. ئینجا حیزبی تاشناق نوێنەرەکانی خۆی نارد بۆ ئێران و ڕووسیا، بە مەبەستی خستنەڕووی ڕەوشی حیزبەکە لە ڤان[٧٦].

لیژنە سەربازیەکە کەوتە دابەشکردنی چەك، ڕێ پێدراویەکیشی دامەزراند و دەستی کردە دروستکردنی تفاقی شەڕ و بنیاتنانی سپێر و سەنگەر و کاری خۆ قایمکردنێکی وا کە لە کاتی شەڕدا هەر حوکمەتێ ئەوانە دەکات. سەرۆکی لیژنە ئەرمەنیەکەش بانگەوازی بە پیرەوەچوونی (ئەرکی یاخیبوون)ی کرد.

دوای کوژرانی (ئیشخان و فرامیان) ئیتر ئارام مانوکیان بووە یەکە سەرکردەی باڵای حیزبی تاشناق کە لە ڤاندا مابێتەوە، هەر تەنیا سەرۆکو سەرپەرشتیکاری سەربازی نەبوو بەڵکو فەرمانداری و سەرکردەیی تەواویشی

گرتەدەست[78].

هەندێ سەرچاوەی ئەرمەن وای دادەنێن گوایە یاخیبوون لە ڤان لە ۲۰ نیسان/ئەپریلەوە، کاتێ دەستی پێکرد کە بە بێ هۆ پەلاماری ئەرمەنەکانیاندا. هەر ئەو سەرچاوانە کەوتنە مقۆمقۆی ئەوەی گوایە هێزە عوسمانیەکان بەبێ هۆ کەوتبوونە بۆمبارانکردنی گەڕەکە ئەرمەنیەکان. بەڵام ئەم بۆچوونە تا ڕادەیەکی باش بە درۆ دەزانرێ، سەرچاوە ئەرمەنەکان رووی دەمیان لە ڕای گشتی بوو، ئەسبابی ڤایلکردنیشیان پێ بوو بۆ سەلماندنی تەواو بێتاوانی خۆیان. لەبەرامبەردا بەڵگەنامە عوسمانیەکان هەموویان هی ناوخۆبوون، یانی بەنیازی ئەوە نەبوون کە سەرکەوتنێکی دیپلۆماسی یا سیاسی پێوە دەستخەن، چونکە ئەوانەی نووسیبوویانەوە چاوەڕێی ئەوەیان نەدەکرد کە ■ سنووری دەوڵەت خۆیدا بەولاترەوە بچێ، تەنیا ڕاپۆرتبوون و دەنێررانە لای سەرکردەکان و بەرزتر لە خۆیان، بەگشتی وەسفێکی ئەو ڕوداوانە بوو و بەشێواز و زمانێکی پیشەیی وشك نووسرابوونەوە. کەواتە دەکرێ دابنرێن بەسەرچاوەیەکی زیاتر متمانە پێکراو.

هەر بە مێژووی شۆرشگێڕانی ئەرمەندا لە ڤان، مەحاڵە گومانی ئەوە بکرێ کە یەکە پاڵنەرێ بۆ ئەو یاخیبوونە کە ڕۆژێ لە ڕۆژان نەگۆڕاوە، بریتیبوو لە: سەربەخۆیی ئەرمەن لە ڕۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵ.سەرچاوەکانیان ئاماژە بەوە دەکەن کە ترس هۆکارێکی تربووە بۆ بەرپابوونی یاخیبوونەکەی ناو شاری ڤان، کەچی ئەمانە باسی ئەوە ناکەن کە ئەرمەن لە هەموو لایەکی هەرێمەکە و شوێنانی تریش یاخیبوون، ئەمان بەزۆری تەرکیز دەکەنە سەر زیانەکانی ئەرمەن کە لە ئەنجامی یاخیبوونەکەوە بوون، دەبێ ئاگاشیان لەو گۆڕانکاریانەش بووبێ کە لە لادێکان ڕوویان دەدا.

هەروەك لە بەشی نۆیەمدا ڕووندەبێتەوە، زۆر بە گورجی یاخیبوونەکە

گۆڕا و بووە شەڕێکی نێوان کۆمەڵەکان، ئەرمەنەکان پەلاماری سەربازەکانیان دەدا و سوپاش گڕی بەردەدایە گوندە یاخیبووەکان، بێتاوانانی موسوڵمان و ئەرمەن بەمەدا وەك یەك ئازار و ئەشکەنجەیان دەچەشت، هەردوو تەرەفیش ناچاربوون بدەنە پاڵ برا ئایینیەکانیان[80].

دەکرێ لە هۆکاری ترسی ئەرمەن لە ڤاندا بکەین، لەوەی کە دەشێ شەڕەکە بگاتە زێد و وڵاتیان. بەتایبەت کە سەرکردەکانیان لەشار هەر ئەوانبوون ڕابەرایەتی یاخیبوونی ئەرمەنەکانی هەرێمەکەیان دەکرد، کوژرانی سەرکردەی وەك ئیشخان و فرامیان لە نێوەندە ئەرمەنەکانی شاردا دەنگی دایەوە[81].

کە (سیفدیت)یش بەپێی قانوون فەرمانیدا کە دەبێ ئەرمەنەکان ئەو گەنجانەیان کە لە تەمەنی سەربازیدان بیانادەن بەدەستەوە بۆ ناو سوپا، بەمە وایان هەستدەکرد کە هێڵی بەرگری خۆیان لەدەستدەچێ. زەکە دەوڵەت هێزەکانی خۆی لەناو گەڕەکە ئەرمەنەکاندا بڵاودەکاتەوە، ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە نیازی هێرشێکی هەیە؟ هەتا ئەو ئەرمەنانەی بێوەی بوون و حەزیان بە هەراوهوریا نەدەکرد وایان لا باشتربوو کە خۆیان (ئەرمەنەکان) دەستپێشخەربن، چونکە شەڕی موسوڵمان و ئەرمەن تازە ببووە شتێکی حەتمی و دەبوو ببوایە[82].

بێگومان سیفدیت لە شارەکەدا ڕێوشوێنی بۆ خۆپاراستن دەگرتە بەر، سەربازەکانی دەنارده مەخفەرە تازەکانی پۆلیس و بەکەی دەرەکی دەحستە گەڕەکە موسوڵمانەکانەوە، لەنێوان شارە کۆنەکە و گاردنی ڕۆژاوا کە زۆرینەی ئەرمەنبوون. داوا لە گەنجە ئەرمەنەکان و کرێکارانی کشتوکاڵ و ڕێگەوبان کرا کە: خزمەتە سەربازیەکەیان بەجێ بێنن، ئەمە داوایەکی قانوونی بوو، بەڵام بۆ ئەوەشبوو کە ئەمانە لەوانەیە سبەی ببنە یاخیبوو، ئەم ڕێ و شوێنانە ترس و نیگەرانی خستبووە دڵی ئەرمەنەکانەوە.

بەڵام ئایا دەوڵەت ڕێگە چارە و بژاردەیەکی تری بە دەستەوەبوو؟ تەنیا گەمژە و گێلەکان مەترسی یاخیبوونێکی ئەرمەنیان لەناو شاری ڤاندا بەدور دەزانی، بۆیە ئامادەکاریەکان و جێبەجێکردنیان ئەرکێکی باشبوو.

نەدەکرا دەوڵەت خۆی لەو بەڵگانەی کە لە بەرچاویدا قوتببوونەوە گێلکا و گوێیان نەداتێ. دەمێکبوو یاخیبووان سروشتی نیازەکانی خۆیان سەلماندبوو، نەدەکرا دەوڵەت چاو لە ٢٠٠٠ پارچە چەك بپۆشێ کە لە ١٩٠٨دا لە ڤان دۆزرایەوە، دیسان دەستپێکردنەوەی تاشناق لەو کاتەوە بە خۆپڕچەککردن؟ دەکرا چاو بپۆشرێ لەوەی کە حیزبی تاشناق کە هەر خۆیبوو لە ڤاندا ڕابەرایەتی ئەرمەنی دەکرد، خەریکی ڕێکخستنی ڕیزی سەربازانی بوو لە ئێران بە ئامانجی داگیرکردنی سەڵتەنەی عوسمانی و مەشقپێکردنی ئەرمەنەکانی ئەنەدۆڵ لە ڕووسیا هەر بۆ هەمان مەبەست؟

ئایا دەکرا چاو لەو گشت ڕاپۆرتە موخابەراتی و هەواڵگریانە بپۆشێ کە پیلانەکانی تاشناقیان بۆ شۆڕشکردن یەکالا دەکردەوە؟ ئایا دەکرا چاو لەوە بپۆشرێ کە ئەرمەنە لادێییەکان کە ئیستە یاخیبوون لە لایەن ئەو مامۆستایانەوە کە ئارام مانوکیان لە ئەختمارەوە ڕەوانەی دەکرد مەشق و ڕاهێنانیان پێ دەکرا؟ لە گشت ئەمانە گرنگتر، ئایا دەکرا دەوڵەت چاو لەو شەپۆلە یاخیبوونە ئەرمەنیە بپۆشێ کە گشت لایەکی هەرێمەکەی گرتبۆوە؟!

## • ڕەوشی شارەکە

کە لە بەیانی ٢٠ نیسان/ ئەپریلدا (سیفدیت) نامەکەی نارد بۆ سەرکردەیی سوپای سێ، دیاربوو بەهۆی گۆڕانکاریەکانی ناو شارەوە نائارامیەکەی نارەحەتی کردبوو، هەر بۆ شەبەقی لە بەشی ئەرمەن لە گاردندا پشێویەك ڕویدا، گەڕەکە موسوڵمانەکان و یەکەکانی دەرەك نێزیك

بە گاردن درانە بەر ڕێژنەی گوللە، بەڵام سیفدیت وای دەزانی هێشتا دەتوانێ دەست بەسەر وەزعەکەدا بگرێ، ئەگەر هێزێکی ئەوتۆی بدرێتێ، بەتایبەت داوای جۆرە تۆپخانەیەکی کردبوو کە ڕیز بکات. ئەمەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە وای دانابوو بەم زووانە ڕووبەڕووی هێزێکی گەورە دەبێتەوە.

کە شەو داهات (شەوی ٢٠ - ٢١ نیسان/ ئەپریل)ڕەوشەکە گۆڕا، هێزەکانی ئەرمەن گشت ئەو ڕێگەوبانانەی دەهاتنە ڤانەوە گرتنیان و کەوتنە قایمکاری، سەرەتا ڕێگەی ڤان - غیفاش تەنیا ڕێگەیەکوبوو کە هاتوچۆی لێوە دەکرا و لێوەی پەیوەندی دەکرا بە باقی ناوچەکانی سەڵتەنەوە. لەبەر ئەمە سەربازە عوسمانیەکان هێزە کەمەکەیان خستەسەر ئەو ڕێگەیە تا بیپارێزن، بەڵام گوندە ئەرمەنیەکانی دەوروبەر، کە پێشتر پەلامار و دەستدرێژی تێدا کرابووەسەر سەرباز و بەرپرسان (بەتایبەت لەهەردوو کەرتی هافازور و تیمار) هاتنە پاڵ کاروانی یاخیبوونە گشتگیریەکە، تا هێزی فیرقەی دەرەکی گەڕۆکیش بەهاناوە هات و گەیشت، لادێکان بە فیعلی کەوتبوونە دەست ئەرمەن.

عوسمانێکان ئەو هێزانەی لەبەردەستیانابوون گورج ڕەوانەی ڤانیان کردن، کەتیبەیەك لە فیرقەی دەرەکی گەڕۆك و تۆپخانەکەشی کە وا بڵاوبوو گوایە سەربازەکانی لە جاتاك شەڕیان لەگەڵ یاخیبوواندا دەکرد، لە ٢٢ نیسان/ئەپریل ئەم کەتیبەیە گەیشت و لەسەرووی ڕۆژاوای شارڤا سەربازەکانی دەستیان کردە شەڕ فرۆشتن بە یاخیبووان و دەوریەکانیشیان کردە سنووری گاردن کە بەدەستی ئەرمەنەوە بوو[٨٣].

لە کەرتی هافازور و شوێنانی تر توانیبوویان یاخیبووان ببەزێنن[٨٤]. جا گوندەکانیان سووتاندبوون و ئاوارەکانیان هاتبوونە ناو ڤانەوە[٨٥]. جێی باسە کە گوندی یاخیبووی تر کە کەتبوونە دامێنی شاخی (نیریك)ەوە توانیبوویان لە بەرامبەر سوپای عوسمانیدا هەتا هەشتی ئایار/مایۆ

خۆڕاگربن. دواى ئەمە شەڕكەر و ئەهلەكە ڕژانە ناو ڤانەوە.

هێزەكانى ئەرمەن لە ڤان شەڕيان لەگەڵ سوپاى عوسمانى و دانيشتوانە موسوڵمانەكەيدا دەكرد، بە دوو زنجيرەى جيا لەيەك: لە شارە كۆنەكە (ناوچەى كايل) و گاردن، شەڕەكە لە گاردن وەك كارێكى سڕكردن وابوو كە ياخيبووان دەيانكرد، لە بەيانى ٢٠ نيسان/ ئەپريل سەنگەر و شوێنەكانى پۆليس لەبەشى ڕۆژاواى گەڕەكەكە بە خێرايى دەستيان بەسەردا گيرا و ئينجا شەڕەكە بووە زنجيرەيە بەيەكادان بەدرێژايى هێڵەكانى تەماسى نێوان گەڕەكە ئەرمەنى و موسوڵمانەكان. هەردوولا كەوتنە ڤايمكردنى ئەو بينايانەى نيشانچى تێدابوو و تەقەيان لێوە دەكرد.

تەنيا چوونە ناوەوەيەكى عوسمانيان بۆ ناو ياخيبووان ئەوەبوو كە بۆ گرتنى كونسوڵگەرى بەريتانيا و كڵێسا ئەرمەنيەكەى (ئەراك) و سووتاندنى هەندێ خانووى ڤايمكراوى ئەرمەن بوو.

زۆر بە ئاسانى دەڵێين كە ژمارەى سەرباز ودەرەك لەمە زياتر لە تواناياندا نەبوو جارێكى دى بكەونە شەڕەوە، هێزە ئەرمەنيەكانيش گورج كەوتنە ناگرتێبەردانى كونسوڵگەرى بەريتانيا ئەمە واى لە عوسمانيەكان كرد پاشەوپاش بگەڕێنەوە.

نارنجۆك و ماددە گڕدارەكان بە دێناميت و بۆمباى ناگراويشەوە كاريگەرترين چەكێك بوون و لە گاردندا ئەرمەن بەكارى دەهێنا[86]. جگە لە كونسوڵگەريەكەى بەريتانيا ئەرمەنيەكان توانيان ئەو شوێنانەى عوسمانێكانى تێدابوو كەتبوونە سەر ڕێگەيان، كاوليانكەن. سەربازگە گەورەكەى (حەميداغا)يان كە بنكەيەكى هێزەكانى دەوڵەتى تێدابوو، سووتاند، زێدەڕۆيى ناكەين ئەگەر بڵێين كە لەڕووى هێز و تواناوە ياخيبووان شانيان دەدا لە شانى سوپاكەى دەوڵەت، بەڵام لە چەند ناوچەيەكى كەم نەبێ حوكم تيايدا نەگۆڕا[87].

لـە گـەڕەکی (تـوبراك کایـل) و قـەڵاوە عوسمانێکـان ڕووە و سـەرووی ڕۆژاوای شـار ئەرمەنــەکانیان دەدایــە بــەر ڕێژنــەی گوللــە، تۆپخانەیــەکی گەڕۆکیشـیان بــەکاردەهێنا بــۆ کوتــانی یــاخیبووان لــە دەوروبــەری ئــەو ناوچەیەی بەدەستیانەوە بوو، گولله تۆپەکان زیانێکی گەورەیان دەدا لەو خانوانەی لـە خشت و قوڕبـوون، بـەڵام لـەوە نەدەچوو کـە کـارێکی گـەورەی کردبێتە سەر وورەی یاخیبووان و ڕیزەکانی تێك دابن[88].

وێنەکانی ڤان دوا بەدوای شەڕەکە ئەوە دەردەخەن کە شارێك غەرقە لە کاولبوون و وێرانیـدا، بـەڵام نـاتوانرێ بزانـرێ وە یـا جیابکرێتـەوە کـە کامـە کاولکاری و وێرانی تۆپبارانەکەیـە و کامـەش هـی ئـەو دینامیـت و ئاگرانەیـە کـە ئەرمـەن کردبـوونی[89]. چـونکە هـەردوولا وەك یـەك بەرپرسـیارێتی ئـەو کاولبوونەیان وا لە ئەستۆدا.




**نەخشەی ٢ - ٨**

**ڕێگەوبان و هێڵەكانی تەلەگراف لە (ڤان)دا**

سەرچاوە ئەرمەنیەکان وا باس لە خۆیان دەکەن کە گوایە (ئابلۆوقە درابوون) بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە ئەرمەنەکان چواردەوریان گیرابێ و ڕێگەی هاتنە ناوەوە و دەرچوونیان لێ گیرابێ، ئەوان دەیانتوانی (شەرکەر و پەنابەرانیان) لە شارەکەدا بێن و بچن[90]. هەروا دەیانتوانی بەبێ ڕێگریەکی ئەوتۆ لە گاردنـدا بن کە ناوچەیەکی خۆیانبوو، لە ٢٢ نیسان/ئەپریل شەرکەرەکان لە گاردنەوە ڕووەو گوندی (دارمان) بوونەوە کە دە میل لەسەرووی شاردوە بوو، بۆ یارمەتیدانی ئەو شەرکەرە ئەرمەنانەی ئەرێ، [91] لەسەرەتای ئەیار/مایۆ هەر لە گاردنەوە بە زەخیرە و ئازووقەوە بۆ یارمەتی شەرکەرانی ئەرمەن چوون بۆ (شوشانتز) لە خوارووی ڕۆژاوای (ئیریك).

ئەوان کە بتوانن زەخیرە جگە لە نان و شەکر و سابوون و جلوبەرگ و پێویستی تر لەشاردوە بگوازنەوە ئەمە باشترین بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە ئەرمەن لەلایەن سووپاوە ئابلۆوقە نەدرابوون[92]. ئەمە ڕێك لەگەڵ ڕاگەیانننەکانی سیفدیتدا گونجاوە کە دەیگوت ژمارەی ئەو سەربازانەی کە لەژێر دەستیدا بوون کەمبوون، ڕاستریش ئەوەیە بگوترێ کە ئەرمەنەکان نەیاندەویست شارەکە جێبهێڵن و لەدوی شوێنێکی ئەمینتر بگەڕێن[93]. بەڵکو دەیانویست تا پێشڕەویەکی خۆش نەکەن دەستبەرداری ڤان نابن، جا هەرواشبوو.

پاش هێرش و پەلاماری یەکەمجاری ئەرمەنەکان، لە گاردن هێزی عوسمانی توانیان خۆیان ڕاگرن، بەڵام لەشارە کۆنەکەدا وانەبوو، لە ٢٠ نیسان/ئەپریل[94] لەملاولایەوە شەڕ گەرمبوو، ئەرمەن توانی سەرباز و دەرەك ناچارکەن کە گەڕەکە ئەرمەنیەکانی ڕۆژاوای شار چۆڵکەن، دووەمجار لە دەورو پشتی فەرمانگە حکومیەکان کە کەوتبوونە خوارەوە، ئاگریان بەردایە نووسینگەی پۆستە و بانکی عوسمانی و بیناکانی لیژنەی ئایینی گشتی و ئینحیساری تووتن و چەند فەرمانگەیەکی دی[95].

سەرباز و دەرەکەکان ناچاربوون بچنە قەڵای (ئیجکالە) و پارمەتی موسوڵمانەکانی ڕۆژاوای شارە کۆنەکە بدەن تا هەڵبێن و خۆیان قوتارکەن و بێنە ناو قەڵاکەوە کە جمەی دەهات لە پەنابەری موسوڵمانی تر[96]. عوسمانێکان کەوتنە وەڵامدانەوە بە تۆپبارانکردن لە قەڵاوە. ئەرمەن پلانیان دانابوو بۆ چۆنێتی گۆڕین و پەردپێدانی یاخیبوونەکە. چەکی چاکیان پێبوو، هەتا لافیتە و ئاڵا شۆڕشگێڕیەکانی تایبەت بە یاخیبوونەکەیان ئامادە کردبوو کە (ئەرمینیای ئازاد)یان لەسەر نووسیبوو، یاخیبووان جۆرە کڵاوێکی تایبەتیان لەسەرنابوو کە لە فرانسا و ڕووسیاوە هێنرابوون، هەندێکیان وشەی (تۆڵە)ی لەسەر نووسرابوو.[97]

لە دوو ڕۆژی دواتردا ئەرمەنەکان زۆربەی خانووی موسڵمانەکانیان لە بەشە کۆنەکەی شاردا سوتاند، ٧٠٠ پیاوی شەڕکەریان هەڵبژارد بۆ تەشکیلی هێزێکی تایبەت تا هێرشێکی نەخشەبۆدانراو بکەنە سەرقەڵاکە و بەڵام دوایی ناچاربوون سەرفینەزەر لەو کارە بکەن.

سەربازە عوسمانییەکانیش نەیانتوانی هێرشێکی بەرامبەری سەرکەوتوو بکەنە سەر ئەوان و ئیتر شەڕ هاتە سەر ئەوەی کە یاخیبووەکان نیمچە ئابلۆقەیە بخەنە سەر قەڵاکە[98]، بە هیچ جۆرێ نەیانتوانی بە فیعلی دەسەڵاتی خۆیان بسەپێنن بەسەر گشت دەوروبەری قەڵادا، عوسمانێکانیش ڕێگەکانی ڕووەو ڕۆژاوایان بە کراوەیی هێشتەوە (ڕووەو دەریاچەی ڤان) وە ڕووەو خوارووی ڕۆژاوا بۆ (غیفاش).

## * هێزە نەیارەکان

هەروەك گەلێ قۆناغ لە مێژووی یاخیبوون لە ڤاندا، سەرچاوەکانی هەردوولا دەربارەی هێزەکانی ئەو دوو لایەنە لە شارەکەدا، ناکۆکن، عوسمانێکان ژمارەی بنەڕەتی شەڕکەری ئەرمەنیان بەر لە یاخیبوون لە ناو

شاردا بێ پتر لە ۲۰۰۰ کەس دەدایە قەڵەم، ئەم ژمارەیەش زووبەزوو لە زیادبووندا بوو، بەهۆی چەکدارکردنی مەدەنییەکان و هاتنی کۆمەڵە یاخیبووی تر لە لادێکانەوە، وا بڵاوبوو کە زۆر لەو شەڕکەرانەی بەر لە یاخیبوونەکە و لە رۆژانی پەکەمیدا هاتبوون لەو فیرارانە بوون کە لە سوپا هەڵاتبوون و زۆربەیان مەشقی سەربازییان پێ کرابوو. (۹۹)

یاخیبووان چەکی باشیان پێبوو، جگە لە تۆپخانەکەیان، بەشێکی چاکیش لە بۆمبا و نارنجۆکیان لە

عەمبارەکاندابوو[۱۰۰]، بەهاتنی ۲۲ نیسان/ ئەپریل هەندێ سەرچاوەی عوسمانی وایان دەقەبڵاند کە نێزیکەی ۱۰۰۰۰ هەزار ئەرمەنی چەکدار دەوری موسڵمانانی (ڤان - کایل)یان داوە و لە گاردن شەڕ دەکەن، سەرچاوەی تریش هەبوو (ژەنەراڵی فەنزەبیللایی رافاییل دو نۆگالیس) کە لە ناو ریزەکانی لەشکری عوسمانیدا لە ڤان کاری دەکرد، ئەم پیاوە باسی لە ۳۰۰۰۰ هەزار شەڕکەر و بگرە زیاتری دەکرد. (۱۰۱)

سەرچاوە ئەرمەنیەکانیش جۆراوجۆر باس لەمە دەکەن:

(والی – حاکم ـی ڤان هێزێکی ۱۰ بۆ ۱۲ هەزار کەسی پێشرەوی دەکرد ۶۰۰۰ هەزاریان پیادە و لەنێوان ۴۰۰۰ - ۶۰۰۰ هەزار عەشایری کورد و ئەو فیرقانەی کە بە (شیتی) دەناسران و دەرەکیش، هەروا والی ۱۲ چەکی قورسی هەبوو (لە تۆپی سوکەڵەی شاخاوی و قورسی کورتهاوێژ بۆ روخاندن و هەڵتەکاندنی قەڵا و قوللە) جگە لە بێشومار تفەنگ و زەخیرە، بە گشت ئەمانە ئەو گەنجینە چەکەیان پێکهێنابوو لە شارەکەدا و سەرباری کەشتیگەلێکی ناو دەریاچەکەی ڤان، لە لایەکی دی، ئەو سەرژمێریە وردانەی کە لە لایەن ئەو رێکخراوانەوە ئامادەکراون کە سەر بە لیژنەی عەسکەریەکەن و رێگەیان بەوە دەدا کە هێزی شەڕکەرە ئەرمەنەکان بە تەواوی دیاری بکەن، بەوانەشەوە کە لەناو پەنابەرەکاندا لە – حایوتس

دزور - ەوە هاتبوون، ژمارەی شەڕکەرانی ڤان گەیشتوەتە ١٠٥٣ شەڕکەر، ئەم ژمارەیەش بە پێی ئەو برە چەکانەی کە لە (ئیغستان)ی گەڕەکی گاردندا هەبووە: ٥٠٦ تفەنگ و ٧٤٨٢٤ فیشەك ٥٣٩ دەمانچە، لەوانە ٢٠٠ دەمانچەی ماوزەر کە یەك فیشەکی دەخوارد، جگە لە ٢٩٠٨٩ فیشەك، جێی ئاماژەیە کە ئەم شەڕکەرانە زۆربەیان نەشارەزابوون و هەندێکیان یەکەمجاریانبوو چەکی لەشاننابێ.)[١٠٢]

لەم شیکردنەوەیەدا وادیارە (ئەناهید تیرمیناسیان) سەرژمێریەکانی لە (ئۆنیگ سوختاریان)ەوە وەرگرتووە [١٠٣]، کە خۆی لە یاخیبوونەکەدا بەشدار بووە، بەڵام رۆژنیك ئەوەی نەدرکانووە کە ژمارەی شەڕکەرانی ئەرمەن لە ڤاندا گەیشتۆتە ١٠٥٢ کەس، لە واقیعدا موختاریان دەڵێ: بە تەنیا لە گاردندا ١٠٥٣ شەڕکەری تێدابووە، بە شەڕکەرە زیندووەکانیشەوە، لە ١٣ ئەیار/مایۆدا دوای ٢٢ رۆژ لە شەڕ کە زۆربەیان تیاچوون، بەڵام ژمارەی چەك و فیشەك دەچێتەوە بۆ ١٣ ئەیار/مایۆ کە تیایدا بەشێکی زۆری تێدا بەکارهات یا تەلەف بوو، ئەم ژمارانە ئاماژە بە شەڕکەر و چەك و ئازووقەیە دەدەن کە تەنیا لە گاردندا ماونەوە، پاش تەواوبوونی بەشێکی زۆری شەڕەکان.

سەرژمێریەکانی (تیرمیناسیان) یەك شەڕکەری ئەرمەنی لە شارە کۆنەکەدا تێدا نییە، هەرچەندە سەرچاوە ئەرمەنەکان ئیشارە بە ٢٥٠٠ هەزار ئەرمەنی دەدەن کە لە شارە کۆنەکەدا بوون لە کاتی شەڕدا[١٠٤]. لەم پێوانەیەوە دەبێ ئیشارە بەوە بدرێ کە سەرچاوەی ئەرمەنی و ئەوانەش کە پشتگیریان دەکەن سەرژمێریەکی تریان داوە و بگرە کەمتریش. هەر بۆ نموونە:

ژمارەی شەڕکەری ئەرمەن ٨٠٠ کەس ٤٠٠ لەمانە چەکی سەربازیان پێبووە ( جۆری ماوزەر[١٠٥]). نێردراوی (گرایس کناب) لەلای خۆیەوە دەنووسێ کە ئەرمەن ١٥٠٠ نیشانچی مەشقپێکراویان هەبووە کە نێزیکەی

٢٠٠ تفەنگیان پێبووە.[106] موختاریانیشی (كە قسە لەبارەی ١٠٥٢ شەڕكەرەوە دەكات) كە تەنیا لەنێوان ٢٥ بۆ ٣٠ شەڕكەری ئەرمەن لە شارە كۆنەكەدا بوون[107].

مەحاڵە بڕوا بەوە بكرێ كە شەڕكەرانی ئەرمەن لە گاردن بریتیبووبێ لە ١٠٥٢ كەس، لەمانە تەنیا نیوەیان چەكدار بووبن، هەر لەم ڕوانگەیەوە بە زەحمەت خەملاندنە زۆرەكەش باوەڕی پێدەكرێ كە ئاماژە بۆ ٢٠٠٠٠ هەزار شەڕكەری ئەرمەن دەكات لەهەموو ناو شارەكەدا. لە واقیعدا عوسمانیەكان هیچ وەسیلەیەكیان نەبوو بۆ سەرژمێریكردنی ئەو یاخیبووانە بە وردی بەڵام ئەوەی كە هەیە ئەوەیە كە ژمارەی هەقەتیان لەوە تێپەڕاندووە كە ئەرمەنەكان خۆیان دەیقەبڵێنن: ئەگین لە كوێ كۆمەڵێكی بچووكی ئەشارەزای مەشقپێنەكراو دەتوانێ بەرەنگاری هێزێكی نیزامی سوپای عوسمانی ببێتەوە، لە گاردن و شارە كۆنەكەشدا بتوانێ ئەو هێزە بشكێنێ؟!

كەسیش، هەتا توندترین ڕەخنەگریش، ڕۆژێ نەیوتووە كە سەربازە تركەكان ئا بەم ئاسانیە دەشكێن، بە پێچەوانەوە مێژوونووسانی بواری سەربازی لەشكری عوسمانی بە شارەزاترین سوپایە دادەنێن لە دنیادا[108]. لە ساڵی ١٨٩٦ لە بارو زرووفێكدا كە زۆر لەمە دەچوو، وەك لێكۆڵەرە ئەرمەنەكان باسی دەكەن، لە ڤان سوپای عوسمانی زۆر بە ئاسانی توانی یاخیبووانی ئەرمەن تێكشكێنێ. جا ئەگەر شیكردنەوە ئەرمەنیەكان دەربارەی ڕوداوەكانی ١٩١٥ ڕاستبوونایە خۆ لە ١٨٩٦دا ئەرمەنەكان باشتر چەكداربوون.

لە تەفسیرێكدا سەبارەت بە سەركەوتنی ئەرمەن (ئەناهید تیرمیناسیان) دەڵێ: ورە و پاڵنەری ئەخلاقی و ڕێكخستن و ستراتیژی كاریگەری بەرگریكردن. ئەمانە هۆكارێ بوون پێكفە وای لە ئەرمەن كرد كە لە ئاست هێزەكانی دەوڵەتدا خۆڕاگرن[109]. ئیتر دور لەوەی كە ئینكاری دەوری ئەرێنی

گشت ئەم خەسڵەتانە بکرێ، وا دەردەکەوێ ئەوانە بەسنەبوون بۆ ئەوەی ئەرمەن وا لێ بکەن کە خۆڕاگربن لە ڕووی هێزەکانی دەوڵەتدا. لەبەر ئەمە لەوانەیە ئەو بۆچوونەی کە زیاتر ئاقڵانەتر بێ ئەوە بێ کە بگوترێ هێزەکانی ئەرمەن بە ژمارە و لەوانەی عوسمانی بە ڕێژەیەکی زۆر زیاتربوون، وایش بۆی دەچین کە هەر سەربازێکی عوسمانی لەبەرامبەر دوو یا سێ یاخیبووی ئەرمەندا بووە بە چەکی تەواوەوە.

مەسەلەی ژمارەی شەڕکەرانی ئەرمەن بابەتی پێناسەکردنی (شەڕکەر) دەوروژێنێ و دەیانخاتە بەر باس و وردوبوونەوە لێی. قەزای ڤان زیاتر لە ٣٠٠٠٠ هەزار ئەرمەنی پیاو و گەنجی گرتبووە خۆی، زوربەیان لەوانە بوون تازە هاتبوونە شارەکەوە، سەرەڕای ئەمە ژمارەیەکی زۆریش لە سەربازی فیراری تێڕژابوو، ئەمانەش وەك هەزارا ئاوارە و پەنابەری ڕاکردووی لادێکان[١١٠]، لەنێو ئەمانەدا زیاد لە ١٥٠٠٠ هەزار پیاو کە ئەگەری ئەوە هەبوو شەڕ بکەن (بەمانای پیاوی کامڵ نەك گەنج یا پیری بەساڵاچوو)[١١١]. نێرەکانیان و هەتا هەندێ ئافرەتیشیان بە هەر شێوازێك بووایە لە شەڕەکەدا بەشداربوون، زۆریان چەك نەبوو بۆیان جا زەخیرەیان دەگواستەوە و سپێر و سەنگەریان لێدەدا و فیشەکیان دادەگرتەوە و ئیتر تا لەم کارە بەردەستیانەی شەڕکەران، خۆ کە یاخیبوویەکی چەکدار دەپێکرا یا دەکوژرا یەکێکی دی تفەنگەکەی یا دەمانچەکەی هەڵدەگرتەوە و دەچووە جێی بۆ شەڕکردن[١١٢]*.

لە سەرژمێری ئەرمەنیەکاندا لەوانەیە جیاوازیکردن لەنێوان ئەوانەی وەك (شەڕکەر) دادەنران و ئەوانەش کە شەڕیان دەکرد یان بەشداری

---

* ئەمە یەکێکیشە لە ڕێنماییەکانی ماوتسی تۆنگی چین و هۆشی مینەی ڤیەتنام لەبارەی شەڕی پارتیزانیەوە، کە جێگەی جەنگاوەر نابێ چۆڵبێ وکە کوژرا دەبێ یەکێکی دی جێی بگرێتەوە. ((وەرگێڕ))

شەڕەكەیان دەكـرد، ئەمـە بوویێتـە هـۆی شـرۆڤەكردنێكی جیـا لـەنێوان قەبلاندنەكەی ئەرمەن و عوسمانیدا، بە زۆریش ڕۆژێ نابێ كە پەی بە ژمارەیـەكی وردی شـەڕكەرانی ئەرمـەن بـبرێ، بـەلام ئامـاژەدان بـە بـوونی نێزیكەی ١٥٠٠٠ هەزار شەڕكەر شتێكی پەسەند و ماقووڵە.

لەبەرامبەردا دیاریكردنی ژمارەی سەربازە عوسمانیـەكان كە لە ڤان و دەوروبەری شەڕیان دەكـرد، كارێكی گران نییـە، هەرچەندە (تێرمیناسیان) باس لەو سەرچاوانە ناكات كە خەملاندنەكانی لێوە وەرگرتوون، لەنێوان ١٠ - ١٢ هـەزار سـەرباز، لەوانەیـە (دونگـالیس) سەرچـاوەكەی بێـت، بەتایبـەت ئـەویش هـەر ئەومنـدەی خەملانـدووە. دەبـێ ئامـاژە بـۆ ئـەوە بكـرێ كـە (دونگـالیس) لەسـەرژمێریەكاندا كەتیبەیـە نیشانچـی كـورد و كەتیبەیـە خۆبەخشـی عوسمـانی تێخسـتووە، كـە ئەمانـە لـە تۆمـارە عوسمانیەكانـدا نـەبوون، بـەدەربوون لـەو زانیاریانـەی درابـوو لـەبارەی ژمـارەی سـەربازە نیزامیەكانـەوە، یـانی ئـەو ٢٣٠٠ سـەربازەی لـەژێر فـەرمانی (سـیفدیت)ی حاكمدا بوون[113].

لێكدانــەوە و شـیكردنەوەكان ئــەوە دەگەیــەنن كــە ئــەو ژمارەیــەی (دونگالیس) داویە، یانی لەنێوان ١٠ - ١٢ هەزار، زۆری پێوەنراوە، لەوانەیە بۆ بەهێزكردن و چەسپاندنی پێگەی خۆی بووبێ وەك وسەركردەیە، چونكە ئەگـەر ئـەو دوو كەتیبـە كوردە نیشانچیە خۆبەخشـە عوسمانیانـە هێزێكـی پەسەند بوونایە، كە ئەمە گومانی تێدایە، ئەوا ژمارەكە بە دەوروبەری ٢٠٠٠ هەزار شەڕكەر زیـادی دەكـرد. ئـەو كەتیبـە دەرەكـە گەڕۆكـەی كە نێزیكـەی هـەزار كەسـێ دەبـوو دەخرێتـە سـەر ئـەو هێزانـە بـەلام سـەربازانی فیرقـەی دەرەك تەنیا لـە ڤانـدا چـالاك نـەبوون، بـەڵكو لـە ناوچـە دور و نێزیكـەكانی ڕووەو سەروی شارەكەوە و لـە سنووریدا شـەڕیان دەكـرد. دەشبێ ئـەو (٢٠٠) سـەربازەی لـە ڤانـەوە ڕەوانـەی (بـارگیری) كـران لـە كـۆی سـەربازەكانی نـاو شاریان دەربكەین[114].

لە ٩ ئەيار/ مايۆ دوو كەتيبەی تر بەر لە كەوتنی ڤان گەيشتن، بەڵام واديارە ژمارەيەكی كەمی سەربازەكانيان چوونە شارەكەوە، لە يەك لە قۆناغەكاندا ١٢٠٠ كورد[115] هاتن و ڕێگەكەيان كردەوە و بۆ ماوەيە، بەر لەوەی بە داهاتنی ٢ ئەيار/ مايۆ گشت كوردەكان شارەكە چۆڵكەن، شەڕيان كرد[116]. ئەمە ئەوە دەگەيەنێ كە زۆرترين خەمڵاندنێكی هێزە عوسمانيەكان ئەگەر بكرێ، لە ڤان و دەوروبەريدا، دەگاتە ٦٥٠٠ كەس، ئەم ژمارەيە هەتا ٣ ئەيار /مايۆ ، ديارە ئەوانەش ناگرێتەوە كە لە شەڕدا كوژراون.

ئەو زانيارييانەی پەيوەندە بە چەكی ئەرمەنەكانەوە لەوەی (تيرميناسيان) جياوازترن، عەمباری چەكی ئەرمەن لەوانەيە هەندێ دەمانچەشی گرتبێتە خۆ كە بە ماوزەرِی تاك فيشەكی ناودەبرا، بەڵام سەرچاوە عوسمانی و بيانيەكان كۆكن لەسەر ئەوەی كە ئەو چەكە دەستيانەی ياخيبووكان لەوانی تر زياتر بەكاريان دەهێنا، دەمانچەی ماوزەرِی ( C-٩٦) بووە. وەك پێشتريش باسكرا كونسوڵی بەريتانيا (نيبان.م. سميس) وا وەسفی چەكەكە دەكات كە: شۆڕشگێران دەمانچەی ماوزەرِيان لا پەسەندترە، چونكە هاوردەكردن و شاردنەوەی ئاسانترە، دەشكرێ وەك تفەنگێكی بچكۆلە كە تا هەزار مەتر بڕ دەكات بەكاربێت.[117]

هەروا ئەو دەمانچە ماوزەرانەی كە ڕيزيان دەكرد كاريگەربوون، بەتايبەت لە شەڕی نێزيك و بەرامبەردا وەك شەڕەكانی ناو شاری ڤان، ( دونوگاليس) لەم ڕووەوە دەنووسێ: ئەرمەنەكان زوربەيان باش چەكداربوون، بەتايبەت بە دەمانچەی ماوزەر كە چەكێكی ترسناكە و دەشێ بە ڕەشاشی ئۆتوماتيكی بەراوردكرێ بەڵام ئەم گوللەكەی كەمتر بڕ دەكات. لەباتی تەقاندنی فيشەكێ دەتوانێ چوار پێنجێ ڕيزكات يان جاری واش هەيە ڕووەو يەك نيشانە شەش گوللە لەسەر يەك دەتەقێنێ[118].

قسەی ناڕاست لەبارەی چەندێتی ئەم چەكەوە ئەسڵەن ئەو خەمڵاندنە

کەمانە زیاتر دەشێوێنێ، ئەو خەمڵاندنە کەمانەی کە ئەرمەنەکانی ناو شار داویانە"[119].

دەبێ چەکێکی زۆری تری ناو شارە کۆنەکەش بخەینە سەر ئەو خمڵاندنانەی ئەرمەنەکان دەیڵێن، کە ئەوانەش جێی گومانن، مێژوونووسی ئەرمەنی ( هایگ گوسیان) لەبارەی شەڕ لەو شارە کۆنەدا دەنووسێ: گشت سامانی چەکی هێزەکانی بەرگری، ئارو بەرەکەی هاتبووە سەر ۹۰ دەمانچەی ماوزەر، ۱۳۵۰۰ فیشەکلغ، ۱۰۱ تفەنگ لەگەڵ ۲۰۲۰۰ فیشەك، ۱۲۰ دەمانچەی بچووك لەگەڵ ۱۰۸۰۰ فیشەك"[120].

عوسمانێکان و دونوگالیس و چاودێرە بیانیەکانیش، گشت خەمڵاندنەکانیان ئاماژە بەوە دەدەن کە لە ڤاندا ئەرمەنەکان لەوەی سەرچاوەکانیان باسی لێوە دەکەن چاکتر چەکداربوون، ڕاپۆرتی کونسوڵە بەریتانێکان لە ڤان کەمێ بەر لە شەڕەکە خەمڵاندنی عوسمانیان پشتڕاستدەکاتەوە، بەتایبەت ئەوانەی پەیوەندن بە توانا و هێزی چەك و سیلاحەوە، لە ۱۹۱۳ - ۱۹۱٤ دوو کونسوڵی بەریتانیا نووسیویانە: حیزبی تاشناقی ئەرمەنەکان شارەکەیان پڕکردووە لە چەك، لەمەش خراپتر لە لادێکاندا"[121].

کونسوڵ (سمیس) لە کانوونی دوو/یەنایر ۱۹۱٤ ئەوە دەگەیەنێ کە ئەرمەنەکان لە کوردەکان باشتر چەکدارترن. دەڵێ: سەرکردەکانی تاشناق لە بازرگانیەکی پڕ لە قازانجەوە ئالاون ئەویش چەك فرۆشتنە بە لادێییەکان، بەنرخێ کە سێ ئەوەندەی نرخە ئەسڵیەکەیەتی لە بازاڕی ئازاددا، سەیر لەوەدایە دەوڵەت ڕێگری لەم تەخشان و پەخشانی چەکە ناکات. بەپێی سمیس حوکمەتەکەی هەرێم هەتا پارمەتی چەکدارکردنی ئەرمەنەکانیشی دەدا، ئەوەش لە ڕێی دابەشکردنی چەکەوە بەسەر لادێکاندا، بۆ بەرگریکردن لەخۆ.

سەرەڕای ئەوەی کە حوکمەتە ناوخۆییەکە دەبوو باش بیزانیبا کە چی ڕوودەدات، کەچی هیچ ڕێوشوێنێکی نەدەگرتە بەر بۆ ڕێگرتن لە قاچاخچێتی چەك بەڵکو بە پێچەوانەوە کار ئاسانیشی بۆ دەکرد، لەوە دەچوو کە سیاسەی والی لەمەدا دەستڕۆیشتووتربێ بەمەبەستی هاریکاریکردنی لادێییەکان تا لەکاتی پێویستدا بەرگری لە خۆیان بکەن، لە ڕێی دابەشکردنی ئەو تفەنگە کۆنانەی کە بە دەست سەربازەکانەوە بووە، بە ڕێژەی سێ بۆ شەش چەك بۆ هەر گوندێك کوردبوونایە یان ئەرمەن[٣٢].

بۆ سەلماندنی ئەوەی کە دەوڵەت بە جددی ئەرکی خۆی بەجێهێناوە لە بەرگریکردن لە ئەرمەن و کورد دژ بە عەشایرەکان، لەم بەڵگەیە ڕوونتر نییە. بەڵام دەبێ لەبارەی بڕی ئەو چەکانەوە کە دەوڵەت دابەشی دەکردن بپرسین، ئەو چەکانەی کە ئاخریەکەی لوولەکانیان کرانە لێپرسراوان و سەربازەکانی دەوڵەت.

جارێکی تر، وەك ژمارەی شەڕکەرەکان، مەحاڵە بتوانرێ هاوسەنگی لەنێوان ڕوداوەکانی یاخیبوونەکە و ئەو خەملاندنە کەمانەی عەمباری چەکی ئەرمەنی بکرێ، خۆ ئەگەر وای دانێین کە ڕاگەیاندنە ئەرمەنییەکان ڕاستن، ئەوا ئەرمەن بە شەش هەزار تفەنگ و ٤٠٠ دەمانچە کە ڕیز بکات توانیویانە شکست بە شەش هەزار شەڕکەری عوسمانی بێنێ کە هەر هەموویان تفەنگیان پێبووە و تۆپخانەشیان لە پشتەوە بووە[٣٣].

تۆ بڵێی ئەمە جێی باوەڕ بێ و بچێتە ئەقڵەوە؟

## • دواهەڵ

تەنیا فرسەتێ کە بەدەست عوسمانیەکانەوە بوو بۆ ڕزگارکردنی هەرێمی ڤان، لە شکاندنی ڕووس و گێڕانەوەیان لە ڕۆژاوای ئێرانەوە کە توانایەکی باشی لە خۆ گرتبوو، بە پێچەوانەی ڕۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵەوە، ئێران

پڕبوو لە تەنگە و دەربەندی فرەوان و دەشتی بەرین، ئەمەش لە ڕووی سروشتیەوە ئاسانکاریە بۆ هەر هاتنە پێشەوەیە لە باکوور و باشوورەوە. دانیشتوانی ئازەربایجانی ئێرانیش کە زوربەیان ترکبوون، هاوپەیمانی ڕووس نەبوون، دەگـرا لـە کاتێکـدا عوسمانیـان بڕیـاری هێرشـێ بـدەن، بـۆ دەستەبەرکردنی پاڵپشتیەك پشتیان پێ ببەستێ، لەمەش گرنگتر ئەوەبوو عەشایرە کوردەکان لە ناوچەکەدا لە کانوونی یەك/دیسامبری ١٩١٤ نیازی ئەوەیان پیشاندا کە ئەگەر عوسمانیەکان ئەو پێشڕەویەی گفتیان پێی دابوو بیکەن، ئەوانیش شەڕ لەگەڵ ڕووسەکاندا بکەن، هەتا سمکۆش کە دەمێکبوو لە عوسمانیەکان یاخیببوو[134] لە ڕووسە وەلی نیعمەتەکانی کە لە دۆڕاندندا بوون هەڵگەڕایەوە.

بەشی هەرە زۆری هێزەکانی ڕووس لە باکووری ڕۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵدا مۆڵ بوون، لە ئێراندا کەمیان مابوو، سەربازە عوسمانیەکان بەشی ئەوەیان دەکرد کە بچنە ناو ئێرانەوە. لە ٢٤ کانوونی یەك/ دیسامبری ١٩١٤ دا یەکەم هێزی چاوهەڵخەر (استکشاف)ی عوسمانی بۆ چاووڕاوکردنی ناوچەکە لە ئەستەمووڵەوە جوڵا، سەرکردەکەی (خەلیل پاشا) کە سەرکردەیی فیرقەی ٣٦ وبەشەکانی تری لە دوو فیرقەی سێ و پێنجی گرتە دەست[135]. بە مانا ١٠٠٠٠ هەزار سەرباز، ئەم هێزە نیزامیە ئەوانەبوون کە هێرشە شکستبارەکەی (سەری قامیش)یان دیبوو، جگە لە تەشکیلاتی تازەی دەرەك و پاسەوانانی سنوور (بەقسەش فیرقەی دەرەکی گەڕۆك لەوانیشی دەگرتەوە کە سەر بە کازم و بەگ بوون).

خەلیل پاشا فەرمانی درایە کە بەرەو بەغدا بێتەوە تا هێرشێ لە ئێرانەوە بکات بۆ ئانەوەی مەترسیەك لە ناوەڕاستی ئاسیاوە ئەم فیکرە و ئەم ئامانجە بەهۆی مەسافە جوگرافیەکەیەوە نا ماقوڵانە بوو، ئەو ترس و بیمەی ڕووسەکان لە دوای شەڕی سەری قامیش خستیانە دڵەوە وای کرد

پلانەکە بگۆڕرێ.

هەر کە هێزە چاوەڵخەرەکە لە یەکی ئادار/مارسی ١٩١٥ گەیشتە موسڵ فەرمانی درایە کە لەلای باکووری ڕۆژهەڵاتەوە ڕووەو ئێران بجووڵێ، ئەمە بە مەبەستی ڕامالینی ڕووسەکان لە ڕۆژاوای ئێراندا و پاراستنی ڕۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵ لە هەر پەلامارێکی ڕووس لە ئێرانەوە. خۆ ئەگەر ڕەوشەکە لەباربوو، ئەوان هێزە عوسمانیەکان دەتوانن ڕووەو باکوور پێشڕەوی بکەن بۆ ناو خاکی ڕووسیا، دیارە بەناو دۆڵ و نشێوە پانوپۆڕە تا ڕادەیە تەختاییەکانی ڕۆژاوای ئێراندا، ئینجا ئەوکاتە ترکەکان و عەشایری کورد لە ناوچەکە دەدەنە پاڵ عوسمانیەکان، ئەگەر سەرکەوتوو بن.

بە پێچەوانەی هێرش بۆسەر ئاسیای ناڤین، ئەم پلانەیان ژیرانەتر و زیاتر ئیمکانیەتی سەرکەوتنی هەبوو. ئەگەر سەرکەوێت ئەوا دەتوانێت عوسمانیەکان لە پاڵەپەستۆیەکی گەورە و توندی ڕووس کە لە سەرەوە دەیکەن، ڕزگارکات. بەڵام دوای هەموو شتێ پلانەکە فەشەلی هاورد، بەتایبەت بەهۆی یاخیبوونەکەی ئەرمەن لە ڕۆژهەڵاتی سەڵتەنەکەوە.

هێزە چاوەڵخەرەکە هێرشێکی کردە سەر ئێران و گەیشتە (دیلمان)، لە ٢٩ نیسان/ئەپریل ئەم شارە گیرا، ڕووسەکانیش هەر ئەوەندەیان پێکرا بکەونە گردکردنەوەی ئەو هێزانەی لە ناواندا بوون و بە فیرقەیەکی (دروزینا)ی ئەرمەنیشەوە لە بەرەیەکی بەرگریکردن لەسەروو دیلمانەوە[١٣٦]، هەردوولا هێزەکانیان بەرامبەر و لەیەك ئاستدا ڕاگیر کردبوو، بەڵام ئەوەندە هەبوو کە شوێنی ڕووسەکان لە هی ئەمان باشتربوو.

شەڕەکە گەرمبوو، عوسمانێکان تیایدا شکان، لە ٢،١ ئەیار /مایۆدا کشانەوە دواوە[١٣٧].

یاخیبوونی ئەرمەن کاریگەریەکی یەکلاکەرەوەی هەبوو لەسەر ئەنجامی ئەو هەڵمەتە لە ئێراندا، تەنیا هۆکار هەر فیرقەی دروزینای ئەرمەنی

نەبوو، بەپێی ئەو حاڵە ئەگەر خەلیل پاشا بیتوانیبا پشت بەو فیرقە گەڕۆکەی دمرەك ببەستێ لە ڤان، کە بریتیبوو لە ۲۰۰۰ هەزار کەس. ئەوا لە بۆ ئاوەژووکردنەوەی واقیعەکە سەرو زیادیشبوو، بەلام ئەم فیرقەیە لە هەرێمی ڤان لە بەرامبەر پاخیبووە ئەرمەنەکان لەشەڕدابوو[١٣٩].




**نەخشەی ٣-٨**

**رۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵ و ئازەربایجان و ئەرمینیا**

## * كۆتاییەكە لە "ڤان"دا

دەنگوباسەكانی ڤان گەیشتنە سەركردەكانی لەشكری عوسمانی، ئەوانەی كــە هــەوڵیان دەدا بــەهۆی بــەكارهێنانی توانــای بەشــەری كەمیانــەوە بــەرگریكردن لــە شــارەكە بەهێزتركــەن، لــە ٢٣ نیســان/ئەپریلدا هێــزی عەشـایری كـورد هێنرانـە نـاو شـارو بـەڵام بـۆ ماوەیـەكی كـاتی بـوو، زۆر نەمانەوە، لە ٢١ نیسان /ئەپریل سەركردەی سوپای سێ دیسان هێزێكی ناردە ڤـان، كەتیبـەكانی دەرەكـی گـەڕۆك لـە (ئـەرزرۆم و ئـەرزینگان) و یەكەیـە تۆپخانەی شاخاوی سـەر بـە فیرقـەی پیادەی ٢٨ی لەگەڵدابوو[٣٠]. ئـەم هێـزە نەگەیی بگاتە نێزیك ڤان هەتا ٩ی ئەیار/مایۆ، یانی پاش ئـەوەی كـە كـار لـە كار ترازا و سەرەڕای ئەوەش هێزێكی كەمبوو و بەشی نەدەكرد.

جگـە لەمـە ئـەو هێـزە كەوتـە كردنـەوەی ئـەو ڕێگەیـەی كـە ڤـان بـە ناوچـەكانی خـوارووی ڕۆژاوا و دەوروبـەری دەریاچـەی ڤـان بـەرەو پـەتلیس دەگەیـەنێ، جێـی باسـە ئـەم ڕێگەیەكـە كـوونی دەربـازبوون بـوو لـە ڤانـەوە ڕووەو ڕۆژاوا. دەورێكـی مەركـەزی بـینی لـە مانـەوەی هێزەكـانی بـەرگری و موسوڵمانەكانی ڤاندا بە زیندوویی.

یەكەم هێـزی چاوەڵخسـتن تـەنیا هێزێكبـوو كـە دەیتـوانی ژمارەیـەكی ئـەوتۆ لـە هێزەكـەی بنێـرێ بـۆ كوژاندنـەوەی یاخیبوونەكـە لـە ڤـان، لـە سەرەتای ئەیار/مایۆی ١٩١٥ ئەو هێـزە هێرشێكی كـردە سـەر دیلمـان و ئینجا ئەركی بەرگریكردنی لە سنووری خواروی ڕۆژهەڵات دەستەبەركرد، بۆیە گشت ئەم هێزە بۆ بەجێهێنانی ئەركیان تێكڕا لەبەرەی شەڕدا زەروووری بوون.

(خەلیل پاشا)ی سەركردەش، ڕێگەی بە فیرقـەی دەرەكـی گـەڕۆك دا كـە لە هێزە هێرشبەرەكان دابڕێ، ئەمـە بـە مەبەسـتی ئابڵووقـەدانی جموجـۆڵی یاخیبووەكـان. ئـەو كارەسـاتی یاخیبوونەكـەی ڤـانی دەرك پـێ دەكـرد بـەڵام

دەستەڵاتی ئەوەی نەبوو کە بە شێوەیەکی شەخسی فەرمان بدات بەناردنی سەربازی زیاتر، بۆیە داوای لەسەرکردەیی باڵاکرد کە ڕێگە بدەن تا ڤان ڕزگارکرێ، کەچی سەرکردەیی باڵا هێشتا قەبارەی مەترسیەکانی بۆ ساغ نەببووەوە، بۆیە بەوە وەڵامی خەلیلیان دایەوە کە هێزێکی باش لە ئەرزڕۆمەوە نێرراوە و ئیتر پێویست بە ناردنی بەهاناچوونەوەیتر ناکات.

کە ١٠ ئەیار/مایۆ هات ئینجا سەرکردەیی باڵا بەخۆیانزانی کە چەندە هەڵەن، فەرمانیاندا بە سەرکردەی هێزی چاوهەڵخستنی یەکەم کە هێز بنێرن بۆ کوژاندنەوەی پاخیبوونەکەی ڤان. بەڵام ئەمجارەش کار لەکار ترازا بوو[١٣٢]. چونکە دوای تێپەڕینی هەفتەیەك بەسەر وەرگرتنی ئەو فەرمانەدا، ڤان گیرا و سەربازەکان ئەوەندەیان بەدەستەوە نەبووتا بگەنە شوێنی مەبەست. هەرچۆنێبێ خۆیشیان لە نێزیك (بشکاله)وە تا ئەژنۆیان لە چڵپاوی پامالّی رووسدا بوو.

فیرقەی دەرەکی گەڕۆکی ڤان بەرگری لە هەردوو بەرەی (بشکاله و قوتوور) دەکرد، جا مەحاڵبوو بتوانێ هێزی زیاتر بنێرێتە شارەکەوە، کازمی سەرکردەی فیرقەکەش نەیدەویست سنوور بەبێ بەرگریەك جێبهێڵێ، بەتایبەت چاوەڕوانی ئەوە دەکرا کە ئەرمەنە حیزبیەکان هێرشێکی کاریگەری فرەوان بە پاڵپشتی سوارەی ڕووس بکەنە سەر سنوور.

هەرچۆنێکبێ ژمارەی هێزەکانی کەمبوون، هەتا سەبارەت بە بەرگریکردنەکەشی لە سنوور، خۆ ئەگەر ڕووس بڕیار بدەن کە لەلای (سەلماس)ەوە یان بە دەربەندی (قوتوور)دا بێنە پێش، ئەوا بەرپرسیارێتی ڕووبەڕووبوونەوەی بەتالیۆنێکی پیادەی ڕووس و ١٥٠ سوار و دوو تۆپ دەکەوێتە سەر شانی فیرقەیەکی ٧٠٠ کەسی بەبێ تۆپخانەیەك، سەرکردەی ئەم فیرقەی دەرەکە گەڕۆکەشی لە (هوشاب) هیچ یەدەگێکی نەبوو جگە لە کەتیبەیە پیادەو تەنیا تۆپێك[١٣٣].

بەڵام لەناو خاكی ئێراندا حیزبیە ئەرمەنیەكان و ڕووسەكان كەوتنە جموجۆڵ دژ بەو یەكە سەربازیانەی (دیر و قوتوور). لە (جۆڵەمێرگ) (هەكاری - سانكاك) نەستووریەكانیش گردببوونەوە و گوژمێكی یاخیبوونیان دەستدابوویە. چونكە نەدەكرا هێزێك ڕەوانەی جۆڵەمێرگ بكرێ، بۆیە هەواڵ درایە قایمقامی هەكاری كە بۆ پاراستنی شارەكە دەكرێ موسوڵمانەكان پشت بە هێزی دەرەك و عەشایری ناوخۆ ببەستن، هەندێ ڕاپۆرتیش ئاماژە دەدەن بەوەی كە هەندێ یەكە لە سوارەی ڕووس لە ناوچەی (سارای) سنووریان بڕیوە و هاتوون بەمەدیودا، لقی (مورادیە)ی ئەسپسواری یەدەگ هەوڵی دەدا كە شەڕكەرانی ئەرمەن و ڕووس ناچاركات بكشێنەوە، هەر ئەو كاتە ئەمانە ئەمایاری ئەوەبوون تەنگە و دەربەندە شاخاویەكانی سەروو (بارگیری) ببڕن و بێن وبەمەدیودا.

جاسووسە ئەرمەنەكان ڕووسەكانیان لە وردەكاریەكانی ڕەوشی ڤان ئاگادار دەكردەوە، ئەوانیش بڕیاریاندا لقێكی بەهێز لە سەرباز و ئەرمەنی (دروزینی - یانی فەیلەقی یەكی ئەرمەن) بنێرنە دۆڵی قوتوور. لەملاشەوە سەركردەیی عوسمانیەكان وای چاوەڕوان دەكرد كە ڕووسەكان هێزێكی شەڕكەری ئەرمەن بنێرن بۆ داگیركردن لەناو خاكی عوسمانیدا تا توانای بەرگریكردنی عوسمانێكانی پێ لاواز كەن. ڕووسیش هێزەكانی خۆی لە ڕۆژاوای دەریاچەی ورمێ قایم كردبوو، بەسێ ڕێچكە ڕووەو خوارووی دیلمان دەهاتنە پێش. بەرەو ڕووی ئەمە تركەكان تەنیا ئەو ۷۰۰ كەسەی قوتووریان هەبوو و هەزاری تریش لە (دیر).

یەكەی ئەرمەنی و ڕووسەكان ڕووەو دۆڵی قوتوور جمان و بەتوندی دەستیان بەسەر قوتووردا گرت و ئینجا ڕووەو ڕۆژاوا[۱۳].

لە ڤان ڕەوشی سەربازی لە فەلاكەتدابوو، دادەڕما، ئەرمەن بەوردیەكی تازەوە پەلاماری قەڵاكەیان دەدا، قەڵاش سیخناخبوو لە موسوڵمانی ئاوارە و

دەربەدەر کە ئەوێکانێیان کردبووە پەناگە، وا مەزندە دەکرا هەر بە گرتنی قەڵاکە گشتیان تیاچن، سیفدیتی حاکمی شار ڕەوشەکەی تاوتوێ کرد و ئینجا داوای لە وەزارەتی ناوخۆ کرد کە ڕێی بدەن تا شوێنەکە چۆڵکات. یاخیبووان ڕێگەکانیان تەنیبوو و پەلاماری گوندەکانی دەوروبەریشیان دەدا و دەشیانسووتانن، ئیتر مەحاڵبوو سنوورێکیان بۆ دانرێ یان دەستخرێتە ڕێگەیان.

ژمارەیەکی زۆر ئافرەت و منالی دەربەدەر لە قەڵاکەدا بوون، نەدەکرا بنێررێنە دەرەوە بۆ گوندی عەشایرەکان تا بیانگرنە خۆ و پەنایاندەن، دەی باشە دەکرا بنێررێن بۆ هەرێمەکانی ڕۆژاوا؟[135]

لە ٨ ئەیار/ مایۆ ئەرمەن هێرشێکی بەربلاویان کردە سەر ڤان و ئاوایبەکانی دەوروبەری، موسوڵمانەکان هەڵدەهاتنە گەڕەکی گاردنی ڕۆژاوا، لە قەڵاکەوە گڕی ئاگر دیاربوو، ئاگرێك کە ماباقی لەگەڕەکە موسوڵمانەکان و گوندەکانی دەوروبەریانی دەسووتاند و مەحفی دەکردنەوە.

سیفدیت فەرمانیدا بە گواستنەوەی ئافرەت و منالەکان و هەندێ بەرپرسی موسوڵمان، بۆ ئەمە بەناو دەریاچەی ڤاندا ١٤ بەلەمی خستە کارەوە ڕووەو پەتلیس[136]. بەلام ئاووهەوای خراپ تەنیا حەوت لەو بەلەمانەی گەیاندە ناوچەی (ئێرکیش)، ئەرمەنەکان پەلاماریان دەدان و بێ ئەوەی کەسیان لێ دەرچێ نوقومیان دەکردن، تەقەشیان لە بەلەمەکانی تریش دەکرد، لە ١٢٠٠ کەس تەنیا ٧٠٠ کەسیان گەیشتنە پەتلیس[137].

ڕووس لە باکوورەوە ڕووەو ڤان داکشا، ژەنەرال (نیکۆلای یودانیتش) سەرکردەی هێزەکانی ڕووسبوو، فەرمانیدا بە لیوای (قۆزاق)ەکان کە لەلای ژەنەرال (تروخین) بوون و ئەو چوار فەیلەقەی (دروزینی)یە ئەرمەنەی لە (بایەزید) بوون، بابە تەنگەی (تیبیرین)دا بچنە پێش تا لە (بارگیری) پەلاماری عوسمانێکان بدەن و پاشان بە هەریای ئەرمەنەکانی ناو ڤان کەون.




**نەخشەی ٤ - ٨**

**داگیرکاریەکەی ڕووس**

مەترسیەکە لە ڕادەیەکدابوو، کە (سیفدیت)ی حاکمی ڤان تۆپێک و ۲۰۰ سەربازی لە ڤانەوە نارد بۆ هێلی (موورادیە)[138]. لە ۲٤ ئەیار /مایۆ ڕووسەکان گەیشتنە بارگیری و هێزە بەرگریە ترکەکانیان ڕاونا[139]. لێرەوە هیچ هێزێکی ترک لەنێوان ئەوان و شاری ڤان بوونی نەبوو، ئیتر ئەرمەنەکان لە تەکیاندا بەرەو هەرێمەکە کشان[140]. هەواڵێک بەر گوێی موخابەراتی عوسمانی و دەزگەی هەواڵگری کەوت، ئەوەبوو کە :(ئەنترانیک) کە سەرکردەیەکی حیزبی بوو لەگەڵ ۱۲۰۰ لە پیاوەکانی خۆی (سەلماس)یان جێهێشتووە و چوونە پاڵ گەتیبەکەی سەرکردەی ڕووسی ئازەربایجانی (تشیرنو رویال). ئێستە وان بەڕێوە بەرەو (بشکالە)[141].

لە دیلمانەوە پیاوەکانی ژەنرال (فومانازار بیکوڤ)ی ڕووسیایی بەرەو پێش هاتن و لە ۷ ئەیار/مایۆدا بشکالەیان گرت و لێرەوە بە هێواشی ڕووەو ناوچەکانی باکووری ڕۆژاوا بۆ ڤان چوون.

ڤان گیرا.

هێزە عوسمانیەکان ناچارکران بکشێنەوە تا لەگەڵ یەکە ئەساسیەکانی سوپادا لە هەرێمی پەتلیس یەکانگیر ببنەوە. لێردود دەکرا بەرەو ڕووی هاتنە پێشەوەی ڕووسەکان ببنەوە، ئەوەی لە هێزەکەی خەلیل و فیرقەی دەرمکی گەڕۆك (کەوا کەمببوونەوە ببووە سێ یەك) مابوونەوە، پاشە و پاش کشانەوە بۆ خوارووی دەریاچەی ڤان ڕووەو پەتلیس[142]. سیفدیت ٤٥٠ لە هێزە کەمەکەی خۆی بەرەو ژور نارد تا ڕێگەکان لە پێش ئەو سەربازانەی دەکشانەوە بە کراوەیی بهێڵنەوە، هەندێکی تریشی ناردە ناوچەی خوارووی ڕۆژاوا تا ڕێی هەڵاتن بەرەو پەتلیس زامنکەن.

لە ۱۲ ئەیار/مایۆ فەرمانیدا بە دەستپێکردنی قۆناغی کۆتایی لە چۆلکردنی قەلاکە لە لایەن موسوڵمانانی ڤانەوە، هەرچەندە هەندێکیان ڕووەو ڕۆژاوا ببوونەوە و زۆریان لە ڕێگە وبانەکاندا لەلایەن حیزبیە

تاشناقیەکانەوە کوژرابوون، ئێستە، زوربەی ئەوانەی لە ڤاندا مابوونەوە لە ترسی هاتوچۆ، بڕیاریاندا بڕۆن، لەبەرامبەردا هەندێ موسوڵمان ناچار مانەوە یا نەیاندەتوانی بڕۆن ومیان ئەرمەن دەوری گرتبوون. لە ١٦ - ١٧ ئەیار/مایۆ دوا سەرباز و هاووڵاتی فەلاکەیان چۆڵکرد، ئینجا سیفدیت و سەربازەکانیشی لە ٢١ ئەیار/مایۆ (غیفاش)یان جێهێشت. ئەو سوپایەی لە ڤانەوە دەهات ناچاربوو لەسەرخۆ و بە هێواشی بە ڕێگەکەدا بڕۆن کە دەیانگەیاندنە بەتلیس، چونکە دەبوو ئەو پەنابەر و ئاوارە موسوڵمانانە بپارێزن کە لە ڕێگەکەدا بوون و لە شەڕکەرە ئەرمەنەکان هەڵاتبوون.

ئەرمەن شاریان داگیر کرد، ئەوەی لە گەڕەکە موسوڵمانەکان و فەرمانگەکانی دەوڵەت بە پێوە مابوو، ئاگریان تێبەردا. دوای چەند ڕۆژێ، یانی لە ٢٠ ئەیار/مایۆ سەربازانی ڕووس هاتنە ناو شارەکەوە، کەمێ بەرلەوەی بگەن، ئەرمەن ئیدارەیەکی تایبەت بەخۆیان لە شاردا دامەزراندبوو، ئارام مانۆکیان سەرۆکی بوو (بڕوانە بەشی نۆ) یاخیبووان بە گەرمی پێشوازیان لە ژەنراڵ (نیکۆلاییف) کرد و کلیلی شارەکەیان پێشکەش کرد، دوای دوو ڕۆژ لە ئاهەنگێکدا نیکۆلاییف پێکهێنانی حوکمەتی هەرێمی ڤانی ڕاگەیاند و ئارام مانوکیان کرا بە حاکمی شار و قەیسەری ڕووسیش پیرۆزبایی خۆی گەیاندێ.

## • هەماهەنگی لەگەڵ ڕووسدا

چونکە ڕوداو و بەسەرهاتەکان نەکراونە بەڵگەنامە و نەنووسراونەتەوە، ڕادەی دەستەلاتی ڕووس بەسەر یاخیبووەکاندا بەگران دیاری دەکرێ، بەڵام بەپێی سەرچاوە عوسمانی و ئەرمەنیەکان، تاشناقی ڕووس لە پشت یەکەم بڕیاری تاشناقەوە بوو لەبەربەرەکانی حوکمەتی عوسمانیدا، دەبێ بشزانرێ کە لاگیری و ودلای ئەمانە بۆ مەسەلەی ڕووس

زۆر جار جێگەی گومان بووە.

ڕووسەکان لە ڕووی ماددیەوە پاڵپشتی یاخیبوونی ئەرمەنیان دەکرد، لە کۆنگرەی ئەرمەن لە (تەفلیس) شوبات/فەبرایری ١٩١٥ نێرراوی تاشناق ڕای گەیاند: هەروەك ئاشکرایە و زانراوە دەوڵەتی ڕووس بە بڕی ٢٤٢,٩٠٠ هەزار ڕۆبڵ لە سەرەتای شەڕەوە بۆ سەندنی چەك و مەشقی ئەرمەنە ترکەکان و ڕێکخستنی بزوتنەوەی یاخیبوون لە ئەرمینیای* ناو ترکیا، بەشداری کردووە. واش چاوەڕوان دەکرێ دەستە خۆبەخشەکانی ئێمە ڕیزەکانی ترك جێهێڵن و بێنە پاڵ یاخیبووان و ئەگەر بکرێ هاوکاری لەشکری ڕووس بکەن لە پێشڕەویکردنیدا بۆ داگیرکردنی ئەرمینیای ناو ترکیاو کارئاسانی بۆ بکەن. ئەمەش بەهۆی بەرپاکردنی ترس و تۆقاندن لەودیو ڕیزەکانی سوپای ترکەوە[١٤٤].

پارمەتیەکانی ڕووس کە بە تاشناق دراون گەیشتونەتە بڕێکی زۆر، لە ١٣ ملیۆن دۆلار تێپەڕیون، بەپێی نرخی پارەی ئێستە[١٤٥]. ڕووسەکان سووربوون لەسەر ئەوەی کە هەرچی هەوڵ و تەقەللای عوسمانێکانە لە جەنگەکەدا پەکی بخەن، سەرەڕای پڕچەككردنی یاخیبووان بەتەواوی و دەستەبەرکردنی کەلوپەلیش بۆیان. ڕووسەکان ئەو چەتە گوردە جودا خوازیانەشیان پڕ چەك دەکرد و ڕێکیان دەخستن، واش مەزندە دەکرا کە ئەمانە لە ئێرانەوە بێن و لە هەرێمی ڤانەوە پەلاماری هێزە عوسمانیەکان بدەن، وەزارەتی دەرەوەی ڕووسیا لەم سونگەیەوە ڕێنمایی بۆ کونسوڵی ڕووس لە (سابلاخ) ناردبوو، ئەم ڕێنماییانە بریتیبوون لە: پێکهێنانی دەستە چەتەی بچووك بچووك لە ناوچەی (خۆی و دیلمان) لە ئێراندا، بەم پێیە

---

* ئەرمەنەکان بەخاك و وڵاتی خۆیان دەڵێن (ئەرمینیا)، بەشی ناو ڕووسیا کە دوایی بووە (کۆماری ئەرمینیا) ئەوە ڕۆژهەڵاتە، ئەو بەشەی ناو سنووری ترکیا ئەرمینیای ڕۆژئاوایە. ((وەرگێڕ))

٢٠٠٠ تفەنگی (بەردان) دابەشکرا، هاوکاری پارە و دیاریش بۆ پیاو ماقووڵانیان بە مەبەسی هەڵنانیان بۆ یاخیبوون[٤٦].

واش دانرا بوو کە ئەم دەستە چەتە کوردانە کار بۆ لاوازکردنی عوسمانیەکان بکەن و بەر لە هێرشە گشتیەکەی ڕووس و پێکادان لەگەڵیان سەرقاڵیان کەن، کەچی هەرکە جەنگەکە هەڵگیرسا ئەم عەشایرانە هیچ لاگیری و وەلایەکیان بۆ ڕووسەکان پیشان نەدا، بەڵام لەناوچەی ورمێ ئاژاوە و بەرەڵڵاییەکی ئەوتۆیان نایەوە ئەوسەری دیار نەبێ، ئەوەش بەهۆی پەلامار و هێرشەکانیانەوە[٤٧].

کە پلان و دیکۆمینتەکانی سەرکردەیی ڕووس لەبەردەستدا نەبن بە تەواوی ناتوانرێ بزانرێ کە تا چ ڕادەیە یاخیبووە ئەرمەنەکان پابەند بە پلانەکانی ڕووسبوون، بەڵام ئەوەندە هەیە کە ناکرێ بڕوا بەوە بکرێ گوایە کار و ڕەفتاری ئەرمەنەکان بۆ ئەوە نەبووە کە داگیرکاریەکەی ڕووس خێراتر و گورجتر بێ.

باشترین بەڵگەیە بۆ ئەو هەماهەنگیەی کە لەنێوان ڕووس و یاخیبووەکاندا بوو کارو ڕەفتارەکانی یاخیبووان خۆیانە: ئەو شەپۆلە یاخیبوونە سەرتاسەریەی لە سەرەتای جەنگەوە لە خوارووی ڕۆژهەڵات لەهەردوو ناوچەی جاتاك و هوشابەوە تەنیەوە بۆ ناوچەکانی دی. لە تەماشاکردنێکی خێرادا بە نەخشەی ژمارە ٢ - ٨ دەکرێ ئاگاداری ئەم دوو ناوچەیە بین و سەرنجمان ڕاکێشێ، چونکە دەکەونە سەر ئەو دوو ڕێگە تەنیایەی کە دەچنە ناوچەی (ورمێ)ەوە لە ئێران، بۆ ئەمە، هێلی تەلەگراف کە بە هوشابدا دەچوو بۆ ناوچەی خوارووی ڕۆژهەڵات بەوێدا تێدەپەڕی. بۆ زانینیش ئەم دوو ڕێگەیە و هێلی تەلەگرافەکەش چەندەها جار قرتێنراون، هەروەك چۆن ئەو هێلانەی ڕووەو ئەو پەڕی باشوور دەچوون لە بشکاولەوە دەبڕران.

پەیوەندی لەنێوان یەكە عوسمانیەكانی خوارووی هەرێمی ڤان و بارەگەی سوپای سێ لە ئەرزرۆم، بەزۆری هاتبووە سەر نامە و نامەكاریەك بە رێی موسڵ بۆ سوریا و لەوێوە بۆ ئەستەموول و دوایی دەدرایە ئەرزرۆم. یاخیبووەكان كاریان هاتبووە سەر ئەو ناوچەیەی كەوتبووە خوارووی شاری ڤانەوە، بە شێوەیە ئەو سەربازە عوسمانیانەی كە دەنێررانە سەریان لە جاتاك بەچەند هەفتەیەك رێگەیان لێ دەگیرا و نەیان دەتوانی بچنە پێش. دیارە ئەمەش هەروا رێكەوت نەبوو كە شۆرشێكی گەورەی تر لە ناوچەی غیفاش هەڵگیرسا، ئەوێش مەڵبەندێكی تری گەیاندن و تەلەگراف بوو، گشت رێگەكان كە ڤانی بە رۆژاواوە دەبەست بە غیفاشدا تێدەپەرِی، جگە لەوەی رێی غیفاش گرنگترین رێگەیە بوو بۆ گەیاندنی خۆراك و كەلوپەل بە ڤان. تاكە رێی دەربازبوونیش بوو لەشارەكەوە.

جا بەپێی ئەو رەفتارانەی ئەرمەن كە لە غیفاش دەیاننواند، عوسمانێكان ناچاربوون هێزی گەورە (بەسەربازی ناو ڤانیشەوە) تەرخانكەن بۆ ئەوەی ئەو رێگەیە ناچووغبێ و هاتوچۆی لێ نەبرِێ.

سێیەم مەڵبەندی گرنگی یاخیبوون لە ناوچەی (ئیرجیك – سارای - قوتوور) بوو، بۆ زانینیش ئەو هێلی تەلەگرافەی شاری ڤانی دەبەست بە بەرەی شەرِی ئێرانەوە، دیسان هەر بە ئیرجیكدا تێدەپەرِی و دەگەییە سارای، ئەمەش وەك هێلەكانی دی قرتابوو، ئەو ئەفسەرانەی لە قوتوور بەرەورِووی رووس ببوونەوە ناچاربوون كە هەندێ سەربازیان لەبەرەی شەرِەكەوە بگێرِنەوە تا شەرِ لەگەڵ یاخیبوواندا بكەن. بەلایەنی كەمەوە لە شەرِێكی قورسی نێزیك بە سارای یاخیبووەكان سەركەوتن.

كە ئێمە قسە لەسەر هەرێمی ڤان دەكەین دەبێ ئاماژەش بەو شێوازە بدەین كە یاخیبووان لە كارەكانیاندا پەیرِەویان دەكرد و یارمەتی دۆزەكەی رووسیان دەدا كە لە ناوچەكانی تری ئەنەدۆڵ و (شیبنكاراهیزار و سیواس)

کە دوو ناوچەن کەمینەیەکی کەمتری ئەرمەنیان تێدایە لەچاو ڤان و پەتلیسدا، بڵاوبێتەوە. یاخیبوونەکە لە ڕێگە سەرەکیەکانەوە و لە تێکدانی هێڵی ئاسن و مەڵبەندەکانی تەلەگراف کە ڕووەو ڕۆژهەڵات دەبوونەوە، دەستی پێکرا.

بۆیە دووبارە، بەنەقڵدا ناچێ کە پەلاماری ئەرمەن بۆ سەر هێڵە سەرەکیەکانی گەیاندن لەنێوان ناوجەرگەی سەڵتەنەی عوسمانی و بەرەی شەڕ لەگەڵ ڕووسدا هەروا بەبێ ئامانجێکی ستراتیژی و بەبێ مەڵامەتبوون بێ.

گشت ئەوانەی گوتران بەڵگەی تەواو و یەکلاکەرەوە نین بۆ ئەوەی کە یاخیبووان ملکەچی سەرکردەیی ڕووسەکان بووبن. بەڵام بەڵگەیەکی تەواو و یەکلاکەرەوەن کە یاخیبووان بێگومان بە شێوەیەکی باش یارمەتی دۆزی ڕووسیایان داوە.

## ● ئەنجامەکانی یاخیبوونەکەی ئەرمەن

یاخیبوونی ئەرمەنەکان لە هەرێمی ڤاندا میحوەرێکی لەو شەڕە کارەساتبارەدا پێکهێنا کە لە ڕۆژهەڵاتی عوسمانیدا هەڵگیرسا. ئەنجامەکانی ئەو یاخیبوونە لە ئەهامەتیەکانی یەکەم جەنگی جیهان، دانابڕێ و جیاناکرێتەوە، بەتایبەت لە زیانی عوسمانیەکان لەسەری ڤامیش و یاخیبوونی ئەرمەن و داگیرکردنەکەی ١٩١٥ی ڕووس گشتیان هۆکاری بەیەکەوە بەستراوبوون.

ئەگەرەکو تەبع و سروشتی ئەنوەر پاشا وانەبووایە و بڕیاری بدایە کە لەشکری عوسمانی لە باشووری ڕۆژهەڵاتدا بخاتە بارێکی بەرگریکردنەوە نەك هێرشبردن، ئەوا هەرگیز ئەگەری ئەوە نەدەبوو کە ڕووسەکان هێرشێ بکەنە سەر ئەنەدۆڵی عوسمانی. ئەمەی وترا بۆچونێکبوو بە زەحمەت دەهاتە دی،

لەسەرەتای جەنگدا ڕووسەکانیش زۆرباش ئەمەیان دەزانی[٤٨]. بە تایبەت کە سەربازەکانیان بەردەوام لە قەفقاسەوە دەگواستەوە بۆ شەڕکردن لە ئەورووپا، جا ژمارەی لەشکرەکەیان بەشی هێرشێکی لەو جۆرەی نەدەکرد، خۆ ئەگەر هێزەکانی عوسمانی بڕیاریان بدابا بۆ بەرگریکردن لە شوێنی خۆیان بمێننەوە ئەوا خۆیان سەربەرزانەتر دەدیەوە، زیاتر بەهۆی ئەو خەسڵەتە سروشتیانەی کە لە مەیدانێکی شەڕی شاخاویدا هەیانبوو. بە کورتی، لەسەر سنووری باکووری ڕۆژهەڵات ڕەوشەکە نەدەشێوا و بە جێگیری دەمایەوە و عوسمانیانیش دەیانتوانی هەزارا سەرباز بۆ شوێنانی دی بگوازنەوە، لەبەر ئەمە فەرتەنەکەی سەری قامیش هەڵیکبوو و خوا ناردی بۆ ڕووسەکان تا پامالکردنەکەیان ئاوا سووك و ئاسان ئەنجامدەن.

دوای سەری قامیش، زیانە زۆرەکان لەشکری عوسمانی شەتەکدا و گیری خوارد، بەڵام وەزعەکەیش نائومێد نەبوو، توانیان سەر لەنوێ سوپای سێ تەشکیل کەنەوە، هەرچەندە ژمارەی ئەو سەربازە پەدەگانە و سەربازەکانیدی لە دەستە و کۆمەڵی تر نەدەگەیشتنە ژمارەی ئەوانەی کە لە سەری قامیشدا تیا چوون. کە مانگی تشرینی دوو/نۆڤامبری ١٩١٤ هاتە پێش عوسمانیەکان ١٢ فیرقەیان لە ڕۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵا هەبوو، هەرچەندە ڕووسەکان باشتر و چاکتر مەشقپێکراو و چەکدارتر بوون و ژمارەیەکی زۆرتر تۆپیان لەلا بوو، بەڵام ژمارەی هێزەکانی عوسمانی زۆر کەم نەبوو (نیزیکەی ٧٠٠٠٠ هەزار سەربازی نیزامی و زۆرێك لە غەیرە نیزامی، بەرامبەر بە ١٦٥٠٠٠ هەزار سەربازی نیزامی ڕووس).[٤٩]

ڕوداوەکانی دوایی دەریانخست کە هێزە عوسمانیەکان توانیان، با بەشێوەیەکی کاتیشبێ، لە ١٩١٥ داگیرکاران ببەزێنن و بیانشکێنن[٥٠]. ئاماژەش دەدرێ کە ئەو زیانانەی لە عوسمانیەکان کەوت لە بەرگریکردندا، سەرەڕای ئەو کاولکاریەی سەرانسەری ڕۆژهەڵات، تا ڕادیە گردنیە نێچیرێکی ئاسان لە

پامالکردنە گورچکبڕەکەی ١٩١٦دا.

دوو هۆ کاریان کردە سەر کەمکردنەوەی زیانی عوسمانیەکان و وایان کرد بتوانن پێشڕەویەکەی ڕووس بدەنە دواوە، ئەوانیش هێڵەکانی گەیاندنی ناوخۆ و هێرشکردن بەناو ئێراندا. بەڵام ئەم دوو خاڵە بەهۆی پاخیبوونی ئەرمەنەکانەوە مانای خۆیان لەدەستدا و بایەخەکانی نەهێشت.

عوسمانیەکان لە بەهاری ١٩١٥دا تەنیا شتێکی باشتر و کاریگەر کە هەیانبوو هێڵی گواستنەوە و گەیاندنی ناوخۆ بوو، لەبەرامبەردا، ڕووسەکانیش لە خاکەکەی خۆیاندا ئەم چاکەی گەیاندنی سەربازیەیان هەبوو، خۆ هەر کە هاتنە ناو سەڵتەنە و ڕۆژاوای ئێرانەوە ئیتر لە سونگەی ڕێگە و بانە خراپەکانەوە لەگەڵ عوسمانیەکاندا بوونە برابەش، ترکەکان شارەزاییەکی باشی ئەو ڕێگە و بانە خراپانە بوون، بۆ هاوردەکردنی کۆمەك لە شوێنە دور لە شەڕەکانەوە گورج بەکاریان بهێنایە، لە ڕووی تیۆریەوە ئەمە سوودەکەی ئەو شوێنە بەرگریە مەرکەزیە بوو. دیسان لەمەش گرنگتر دەبوو عوسمانێکان سیستمی تەلەگرافیان لە ئەنەدۆڵدا بە شێوەیەکی کاریگەر بەکارهێنایا، بۆ ڕێکخستن و هەماهەنگی ئایین و نۆینە سەربازیەکانیان، ڕێگە وبان و هێڵی تەلەگراف هۆکاری جەوهەری بوون، ئیتر هەر کام لەم دوو لایەنەی ڕووس و عوسمانی ئەمایان باش دەزانی، بە زەروورەت مەرج نیە کە مرۆڤ لە کاروباری سەربازیدا بلیمەتبێ، بۆ ئەوەی ئەوە بزانێ کە وێڵکردن و لاخستنی ئەم دوو لایەنە باشەی عوسمانێکان کە بریتیبوون لە ڕێگەوبان و هێڵی تەلەگراف، دەبووە هۆی ئەوەی کە ڕووس لە هێرشەکەیدا دەستوبردکات، ئامانجی هێرشی ئەرمەنیش زەوتکردنی ئەم دوو لایەنەبوو لە عوسمانیەکان.

گومانی تێدا نییە کە ڕێگرتن لە گەیشتنی خواردن و کەلوپەل و بڕینی پەیوەندیکردن کاریگەریەکی سەربازی وا قووڵی جێهێشت کە مەحاڵبوو

بەتەواوی دیاری بکرێ، هەتا ئەگەر کاری شۆڕشگێڕان تەنیا بهاتایەتە سەر
برین و قرتاندنی هێڵەکانی گەیاندن و پەکخستنی جووڵەی سەربازەکان ئەوا
ئەمە لە بنەڕەتەوە کاری دەکردە سەر ڕێڕەوی شەڕەکە، چونکە ئەو
سەربازانەی کە فەرمانیان بەدەست نەگات لە جێی دیاریکراودا گل ناخۆنەوە
یا لەکاتی پێویستدا ناگەنە شوێنی شەڕەکە، وەیان ئەو سەرکردانەی
پەیوەندیان پچڕاوە و زانیاریە موخابەراتیەکانیان لێ گیراوە باری خۆیان
ناتوانن هەڵسەنگێنن و بەپێی ئەو زانیاری وهەڵسەنگاندنە مامەڵە بکەن.

لە گشت لایەکی هەرێمی ڤان و بەتلیس و ئەرزرۆم، شەڕکەرە
ئەرمەنەکان هێرشە کاولکاریەکانیان دەکردە سەر ڕێگەو بان و هێڵەکانی
تەلەگراف. ڕاپۆرتە عوسمانیەکان (کەمێکیان) ئەوەیان دووپات دەکردەوە کە
پەیوەندیە سەربازیەکان بە زەحمەت ئەنجام دەدرێن و زۆر جار هەر بە
تەواوی دەپچڕێن. چونکە ئەرمەنەکان هێڵەکانیان دەقرتاند و
پارێزگاریکردنیشیان نارەحەتبوو. دوژمن دەیتوانی لەو شوێنەی پارێزگاری
لێ نییە هێڵێکی سەدان میلی بقرتێنێ، ئەرمەنەکانیش باش شارەزای ئەو
شوێن و ئاستانە بوون کە کاری خۆیانی لێوە بە ئەنجام دەگەیاند. لە
دەرەتانێکی ئاوادا ئەرکی بزاوتنی سەربازەکان لە خەویکی قورس دەچوو، جا
ئەوە ڕێکەوت نەبوو کە عوسمانێکان توانیان لەبەرامبەر ڕووسەکاندا لە
(مالاز گیرت) خۆڕاگربن[٥].

کە سەربازەکان گشتیان لە ڕۆژهەڵات کشانەوە و گردبوونەوە ئیتر
موحتاجی پەیوەندی و گەیاندنێکی دورو درێژ نەبوون. لەقەبارەی ئەو
پاڵپشتی و کۆمەکەی کە جاسووسەکان و هەوالگرانی ئەرمەن بە لەشکری
ڕووسیان دەکرد زێدەڕۆیی ناکرێ، لە دەستپێکی پەلامارەکەی ڕووس وا
چاوەڕوان دەکرا کە عوسمانیەکان گشت لایەنی باشی شەڕکردنیان لەسەر
خاکی خۆیاندا هەبێ، هەر خۆیان شارەزای تەنگە و دەربەندە شاخاوی و

ڕێگە دوورەدەستەکان بن، بشتوانن پشت ببەستن بە هاوکاری دانیشتوانی ناوچەکان. بەڵام وانەبوو، ڕووسەکان هەروا هێزێکی ئاسایی نەبوون:

دەبوایە کە بۆ داگیرکردنێکی خاکی دوژمن هاتن: نەشارەزا بەسروشتی مەیدانی شەڕەکە و ڕووبەڕووی ڕق و کینەی خەڵکەکە ببوونایە و نەیانهێڵایە بچنە پێشەوە. کەچی وانەبوو، بەڵکو کە هاتن بۆیان هەبوو پشت بەیارمەتی و هاوکاری بەشێکی زۆری خەڵکەکە ببەستن کە ئەرمەنبوون. هەواڵگری ئەرمەن زیاتر بایەخی بە پلانی شەڕەکان دەدا، چاوهەڵخەرەکانیان ڕێگەیان بۆ ناو خاکێك دەکردەوە کە باش باش شارەزای بوون، بۆیە ڕووسیش بەپێی ئەو زانیاریە هەواڵگریانەی پێی درابوو بڕیاری داگیرکردنی ڤانی دا[152]. لەو کاتەی فەیلەقەکانی ئەرمەن چاوساغی ڕووسیان دەکرد بۆ چوونە ناو شارەکەوە، ئەو شارە لەژێر دەستی دانیشتوانە ڕەسەنەکانی هەرێمەکە خۆیدا بوو[153].

لەوانەیە هەندێ سەرژمێری سادە باشترین ئامراز بێت بۆ شرۆڤەکردنی کاریگەریە تێکدەرانەکەی یاخیبوونی ئەرمەن:

عوسمانێکان بۆ بەرەو ڕووبوونەوەی یاخیبووان لە شارەکە ناچاربوون ٦٠٠٠ هەزار پیاو تەرخان کەن، ژمارەیەکی نەزانراویش بۆ سەرکوتکردنی یاخیبوونی شوێنانی تر لە هەرێمەکە.

پێشتر باسی ئەو کاریگەریە ئەرێنیەمان کرد کە بەشێکی زۆر لەو سەربازانە هەیانبوو بۆ سەر هەڵمەتەکەی (خەلیل) لە عێراق و جگە لەسەر ئەو شەڕەی کە لە باکووردا بوو، جێی ئاماژەیە کە ڕووس بە ٥٥٠٠ هەزار سەربازەوە پەلاماری هەردوو دەربەندی (تیبریز و بارگیری)یاندا، لەوانە ٤٠٠٠ هەزاریان ئەرمەنبوون و ١٥٠٠ هەزار قۆزاقبوون، هێزێکی عوسمانی لە بەرامبەردا بەرەنگاریان بۆوە، ئەم هێزە پێکهاتبوو لە یەك لیوای ١٧٠٠ کەسی سوارە[154]. توانای بەرگریکردنەکەیان بایی ئەوە نەبوو کە بتوانن خۆیان

ڕاگـرن بۆیــە ســەربازە ڕووس و ئەرمەنــەکان ئــەو ســوارانەیان تێکشــکان و زۆربەیان لەناوبردن.

لەناو ڤاندا هەزاران پیاو دەکرا یەکخرێن و ببنە بەربەستێك و ڕێ بە داگیرکردن بگرن، بەپێی ئەوەش کە شوێنی بەرگری ناو شاخ و کێو لـەبارترە ئەوا نیوەی ئەو هێزەی کە لە ڤان بوو بەشی دەکرد و بەسبوو بۆ ئـەو کارە، ئەو تۆپەی لە ڤانیش بەکاردەهات لە تیبریزی و بارگیریدا کەڵکی نەبوو[155].

دەبـێ ئــەوەش بگـوترێ کـە کاریگـەری ئەرمـەن لەسـەر کـوردە غـەیرە نیزامیـەکان دیسـان گرنگبـوو، چـونکە دەوروبـەری ١٨٠٠ کـورد لەسـەرەتای جەنگەکەدا چوبوونە ناو (فیرقەی سوارەی عەشایری سووکەڵە*)ەوە، ئەمانـە بەشـێکبوون لـەو شـەڕکەرە کوردانـەی کـە دەشـێ یارمـەتی عوسمانیـەکانیان دابێ[156].

خــەڵکی ســەر بــە هــۆزە کوردەکــان، لەوانــەی کــە جــاران دوژمــنی دەوڵەتبوون، وەك سمکۆ، سەلماندیان کە نیازیان وایە بەرامبەر ڕووس ببنـەوە ئەگەرەکو شکان، بەڵام کە هێرش و پامالکردنەکەی ڕووس هاتە سەر ئـەوەی دەستپێبکات، ئەو شەڕکەرە کوردانە و سوارەی عەشایری سووکەڵە سـووك و باریك ڤوچاندیان و بۆی دەرچوون، لە هیچ لایە نـەبینران، ئەگـەر سـەربازە عوسمانیەکان لە ڤان بوونایە ئەوا لە دیلمان و بـارگیری هاوکێشـەکە نـاوەژوو دەبـۆوە، کوردەکان لاگیری و وەلای خۆیـان بـۆ دەسـتەڵات دەپاراست، ڕاسـتە ئـەوان لەسـەربازەکان خۆڕاگرتر و ڕێکو پـێکتر نـەبوون، بـەڵام فیرقەیـەکی سوارەیان پێکهێنابوو کە سوپای عوسمانی موحتاجی بوو.

ئەگەر یاخیبوونەکەی ئەرمەن نەبووایە، باوەڕ نەدەکرا کە هەرێمی ڤان ئــەو بایەخــەی بــووبێ وەك لــە یەکــەم جــەنگی جیهانیــدا هــەیبوو، وەك

---

* بەمانای (فرقة الخيالة العشائرية الخفيفة).

پێشتریش ئاماژە درا پلانی بنەڕەتی ڕووسی لەسەر بنەمای بەرگریکردن بەشێوەیەکی ئەساسی دامەزرابوو، بەڵام ئەگەر هەل لەباربێ ڕووەو ڕۆژاوا نەك بۆ خواردوە، دەجمێن و پامالْ دەکەن، عوسمانێکان ئەوە نەبوون کە لە هەرێمی ڤاندا ڕووبەڕووی ڕووس ببنەوە، وایان مەزندە دەکرد کە شەڕە یەکلاکەرەوەکە لە دەشتی ئەرزرۆمدا بقەومێ، ئەو دەشتە پێشتریش شوێنی گەلێ شەڕ و پێکادانی تربووە.

لە واقیعدا داگیرکردنی شاری ڤان لەلایەن ئەرمەنەوە هۆکارێکی دیاریکراو بوو کە پالْ بە ڕووسەکانەوە بنێ تا پامالْی هەرێمەکە بکەن[١٥٧]. زۆریشی پێوە نانێین ئەگەر بڵێین ئەو شەڕە ناوخۆییە کاولکاریە و شکستی عوسمانێکان و ژمارەی کوژراوان، گشتیان دەرەنجامێکی ڕاستەوخۆی ئەو یاخیبوونەی ئەرمەنبوون لە هەرێمی ڤاندا.

## ● پەراوێزەکان

١- بەر لە مانگەکانی سەرەتای دەستپێکی جەنگەکەو لە کاتی جەنگیشدا، ئەوەی پەیوەندبێ بە ڕەوشی سەربازیەوە، بڕوانە (و.نی.د. ئالن) وە (بول موراتۆڤ):

Camb idge university کامبریدج Caucasian Battlefields La cuerre Turque dans la Guerre م.لاوشیری سەرکردە press 1953. pp 231-92 (E.Chiron 1926.pp 55-77 365 پاریس Mondiale) Birinci Dunya Harbinde Turk Hrbi, Kafkas Cephesi Zuncu Ordu Harekati

Turk لەوانەیە باشترین سەرچاوەیە بۆ شەڕی عوسمانی: جزمی یەکی Harbi ئەنکەرە: genelkurmay Basimevi ١٩٩٣ pp ٩٧-٩٨

Umumi harpte Kafkas Cphesi ٢-(نی.ڤ. ماسوڤسکی:

١٩١٧ - ١٩١٤Genelkurmay Mathaasi ١٩٣١Escrinin Tenkidi (
(Voyna na karkazskom fronte

Turk ٧٣,٦٢La renaissance/ vozrozhdenie پاریس:
٤٤ - ٢٤ .pp ١٩٢٢Harbi

هەرچەندە (دەرەکی گەڕۆک) ناوی (بەش)ی لێنرابوو بەڵام لە هەر بەشێکی تری ئاسایی بچوکتربوو، سێ کەتیبەبوو، سەرجەم ژمارەیان ٢٠٠٠ پیاو بوون، دەزگەی هەواڵگری بەریتانیا بە هەڵەداچووبوو کە لە لیستی تۆمارەکانیدا تەنیا دوو کەتیبەی ناونوس کردبوو، ( بەریتانیای مەزن، مۆزەخانەی جەنگی ئیمپریالی:

Handbook of the Turkish army, Enghth provisional edition

شوبات/ فەبرایر ١٩١٦ (ناشفیل و سکوکی: مۆزەخانەی جەنگی ئیمپریالی ١٩٩٦- ل ٢٠٢ - ٢٢٨)

٣- ATASE Arsivi I.D.H.K klasor (لە خواردوە بە K نیشارەی پێ دەدرێ Dosya ٢٨٠٩ (لە خواردوە بە D نیشارەی پێ دەدرێ: فایل)

Fihrist 17 (لە خوارەوە بە F نیشارەی پێ دەدرێ: فەهرەست)
Turk Harbi T.D.H/4-5p82

٤- گرنگ لەوەدایە کە دەرەکی ئاسایی لە فیرقەی دەرەك جیابکەینەوە، ئەو دەرەکانەش دەمێنێتەوە کە تێکەڵ بە فیرقەکەنەکراون، لە ڤان و باقی هەرێمەکەدا، ئەوانەی لە دواییدا هەر بە دەرەك ناودەبرێن، ئەندامی فیرقەی دەرەکی گەڕۆك نەبوون لە ڤاندا.

٥- ئەرشیفی نیشتمانی ولاتە یەکگرتووەکان ٦١٨/٨٦٧٠٠ ل٥ - ٦ ئامریکاییەکان لە بارەی مەترسی ڕووداوەکانەوە روون و ڕاست ڕای خۆیان هەبوو، وەبە (زۆر مەترسیدار)یان دەدایە قەڵەم، چونکە برینارێکی زۆریان

لە نەخۆشخانەی ڤاندا تیمار دەکرد، (لیژنەی ڕێپێدراوە ئامریکاییەکان ٨,٩,١٦ نێردراو بۆ ڕۆژهەڵاتی ترکیا، ئەنجومەنی ئافرەتان،جزمی یەک، ڕۆژهەڵاتی ترکیا ١٩٠٩ - ١٩١٤، بەڵگەنامە و ڕاپۆرتەکان، پیتی Z - A ڕاپۆرتی وێستگەی ڤان، لیژنەی ڕێ پێدراوەکان ١٩١٣-١٩١٤

٦- لە پایزدا کە سەربازەکان نێزیک بە سنووری ڕووس گردبوونەوە، درمی تیفۆس بەتوندی لە ئەرزڕۆم و خەربووتدا داکەوت، بەڵام لە ماردین و ڤان و پەتلیس دا کەمتر، لە کانوونی یەک/ دیسامبر لە ئەرزڕۆمدا ڕۆژانە نێزیکەی ٤٠٠ کەس لە سەرباز و مەدەنی دەمردن، لە خەربووت ڕۆژانە مردن دەگەیشتە ٧٠ کەس (ڕاپۆرتی ١٠٥ ی ساڵانەی لیژنەی ڕێپێدراوە ئامریکاییەکان و سەرەڕای راپۆرتی کۆنگرەکەی (نیوهایفن)، (کونیتیکوت ٢٦ تشرینی یەک/ ئەکتۆبەری ١٩١٥ بۆستن ١٩١٦ ل٨٠)

٧- ئەم یەکانە سەربازی وایان تێدابوو کە لە ئەستەمبووڵەوە هێنرابوون سەرەڕای کەتیبەی ٣٧ی عێراقی، شکستی ئەم کەتیبەیەبوو کە بووە هۆی ئاسانکاری بۆ بەریتانییەکان تا بەصرە بگرن، (حەسەن عیززەت) لەباتی ئەودی پیلانەکەی ئەنوەر جێبەجێ بکات، خۆی دابەدەستەوە

٨- La guerre Turque dans la Guerre
Turk Harbi pp 347 - 562 Mondial pp.382 - 387
لارشیر

ئالن و مۆراتۆڤ Caucasian Battlefielsd pp ٢٨٥ - ٢٤٩
ئالن و مۆراتۆڤ تواتج دەگرنە ئەو سەربازە ئازایانەی کە بێئاگا و بە حەماسەوە دووی ئەو سەرکردە دەبەنگەیان کەوتبوون. ل٢٨٤

٩- ATASE Arsivi, I. Dunya Harbi
٥٤ - ٢. F- ٥٩, D-٢٨٨Kolleksiyonu K-

١٠- سەرچاوەکەی پەراوێزی ژمارە (٨)

١١- Turk Harbi pp ٥٤٤. ٥٦٧ هەروا بڕوانە ئەو وەسفە کورتە لە ئالن و مۆراتۆڤ دا: Caucasian Battlefields. Pp. ٢٨٨ - ٨٩

١٢- لویز نالبەندیان، بزوتنەوەی شۆڕشگێڕی ئەرمەن (بێرکلی: (University of California press. 1963. p 111

١٣- فایلی ٢٢٨٣/١٩٥ لە دیکسن بۆ ئۆکۆنر، ڤان ١٥ ئادار/ مارس ١٩٠٨

١٤- ئیسات ئۆراس لە کتێبی :

The Armenian in History and the Armenian Question (Documentary Publications. 1988. pp 841-42

پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ کە تاکە سەرچاوە بۆ ئەم باسە لە کتێبێکی ئاشناڤدا دەرکەوتووە کە لە ١٩٢٠ لەژێر سایەی داگیرکردنەکەی بەریتانیادا لە ئەستەموول چاپکراوە. بۆیە ئەم زانیاریانە بە پڕوپاگەندەیەك دادەنرێن کە لاوازن و جێی باوەڕ نین. هەروا بڕوانە کاموران گورون:

The Armenian File لەندەن: ڕۆستەم و ئینفیلد و نیکلسن ١٩٨٥

ل١٨٨. هراتش داسنابیدیان:

History of the Armenian Revolution Federation Dashnakisution

کە براین فلیمینگ و ڤاها هابیشیان وەریان گێڕاوە (لەمەودوا بە : History of the ARF ئیشارەی پێ دەدرێ) میلانۆ، خانەی جێمی بۆ بڵاوکردنەوە ١٩٨٩ ل ١٠٧ - ١٠٨ لەم کتێبەدا داسنابیدیان ئیشارە دەدا بەوەی کە عوسمانیەکان لە ڕاستیدا ئەمەیا نایە بەردەستی لیژنەیەکی نۆ کەسی نەك هەموو ئەندامانی کۆنگرێس، دەڵێ کە لیژنەکە ئەم داوایەی ڕەتکردەوە، لیژنەکە لە ئەرزڕۆمدا بۆ چارەسەری هەندێ مەسەلەی تر مایەوە، کە دەبوو بەلایاندا بچێ بەتایبەت پاش هەڵوەشاندنەوەی کۆنگرێس، هیچ نووسینێ لەبابەت ئەو کۆبوونەوەیە نەپارێزراوە و نییە، ئەگەر بووبێتیش فەوتاوە.

١٥- هوفهانس كاتشازنونی:

the Armenian Revolutionary Federation (Dashnagtzoutiun) Has nothing to do Anymore: The Manifesto of Hovhannes Katchaznouni. First prime Minister of The Independent Armenian Reoublic

(یەكیەتی شۆڕشگێڕانی ئەرمەن هیچ كارێكیان بەدەستەوە نەما كە بیكەن، بەیاننامەكەی هومهانس كاتشازنونی، یەكەم سەرەك وەزیرانی كۆماری ئەرمەنی سەربەخۆ) بەشی زانیاریەكانی ئەرمەنی ١٩٥٥ ل٢، هەروا بڕوانە : گورون، The Armenian File. P. ٨٧ - ٨٩

دیسان: ك.س.پاپازیان: Patriotism perverted (بۆستن: Baikar press١٩٣٤ .p. ٣٧)

١٦- ATASE Arisivi ژمارە ١٣ خانەی ٤ فایلی ٥٢٨ بەشی ٢٠٦٢ بەڵگەنامەكانی ١١، ١٩٠٣. ژمارەیە لەم بەڵگەنامانە لە: Documents on Ottoman Armenians چاپكراون، جزمی یەك و دوو و سێ (ئەنكەرە بەڕێوەبەرایەتی گشتی ڕۆژنامەوانی و زانیاریەكانی سەر بەسەرۆكایەتی وەزیران ١٩٨٢،١٩٨٣، ١٩٨٦).

١٧- فایلی ٢٤٤٩/٣٧١ لە مۆلینۆ-سیل بۆ لۆدز، ڤان ٨ئەیار/ مایو ١٩١٣

١٨- فایلی ٢١٣٠/٣٧١ لە سمیس بۆ مالیێ، ڤان ١٠ كانوونی دوو/ یەنایر ١٩١٤

١٩- فایلی ١٧٨٢/٣٧١ لە مۆلینۆ-سیل بۆ لۆدز، ڤان ٤ نیسان /ئەپریل ١٩١٣

٢٠- سەڵتەنەی عوسمانی:

Aspirations et agissementsRevolutionnaires des Comites Armeniens avant et apris la proclamation de la constitution ottomane

(ئەستەموول - p.١٩١٧n ل٥٠ - ٥٣ بڕوانە پاشكۆی ژمارە چوار كە لە ڕێنماییەكانەوە دەرهێنراوە.

٢١- وەك لێـرەدا هـاتووە، وشـەى (چـەتە) هـەموو ئـەو شـەڕكەرانە دەگرێتـەوە كـە جـۆرە ڕێكخسـتنێكيان تيـادا نييـە و نيزامێكـى ديـارێكراو ناپانبـات بـەڕێوە، بـەڵام وشـەى (شـەڕوانان) ئـەو كۆمـەڵ و دەسـتە گەورانـە دەگرێتـەوە كـە زۆر كـەڕەت ٥٠ - ١٠٠ ئەنـدا ژمارەيانـە و بـەزۆرى سوارەشـن. بەڵام ئەو وشەيەى لە سەرچاوەكاندا بەكاردێ بۆ شەڕوان، بەزۆرى: ( sete ( chette

٢٢- فايلى ٢٤٥٦/١٩٥ لـە سمـيس بـۆ مـاليێ، ڤـان ١٠ كـانوونى دووا/ يـەنـاير ١٩١٤

٢٣- بۆ دەستخستنى نموونـە لـەو ڕاپۆرتانـەى عوسمانێكان كـە لـە بارەى هەوالگرى ڕووسەكانەوەيە، بڕوانە: زەكەريا تركمان:
Birince Dunya savasi oncesinde Ittihat ve Terakki Hukumetinin Dogu Yadinci Askeri Tarih Semineri لە Anadolu Islahat projesi ve Uygulamalari BOA, (Genelkurmay Basimevo. 2001. pp 245 - 46 جزمـى دوو- ئەنكەرە Bildirileri 14) 10/23 D (1913 Mayis 14) 10 - 23 D 1913 subat 22) 17/23 D, DH SYS (1913 Ekim18) 17/23 D, 17/23 D 1913 Haziran 15.

٢٤- Atase Arisivi I. Dunya Harbi Kolleksiyonu k ٢٨١٨,
-F-٥٩D ,٢ - ١٠ بەڵگەنامە: ٤،١

٢٥- ١٣٣٠ Atase Arisivi I. Dunya Harbi
م. موختار، ژمارە ٤١٤، ٢ ئەيلوول /سەپتەمبرى ١٣٣٠
Kolleksiyonu K - 28111, D - 26. F 24 بەڵگەنامە ١،٥)

٢٦- هەركە ئەو يەكە خۆبەخشە ئەرمەنانـەى (ئـەنترانيك) ڕابـەريانبوو نێزيـك دەبنـەوە، شـەڕكەرانى تاشـناق شـاخەكانى ناوچـەكە دەگـرن و ئـاڵاى شۆڕشى لەسـەر هەڵدەكـەن، پلانـەكانى ياخيبوونەكـە لـە نيسـان/ ئـەپريلى

١٩١٥دا جێبەجێ دەكرێ. كاتۆلیكۆسیش ئاگاداری كردووینەوە كە ١٠٠٠٠ هەزار شەڕكەر ئامادەن بەشداری ئۆپەراسۆنەكە بكەن (بڕیاری ئاشناق هەروەك (أ. خاتیزیان) ڕایگەیاندووە

Hayastani Hanrapetutean tsagumn uzargats ume

(بنەماكانی كۆماری ئەرمەن و پەرەسەندنی) ل٤٨ هەروەك ئۆراس لە كتێبی :

The Armenian in History and the Armenian Question

وەری گرتووە لە ل٨٦٧

٢٧- فەرمانی سوپای سێ بۆ گشت یەكەكان.

Atase Arisivi I. Dunya Harbi Kolleksiyonu k-2918. F- 6

٢٨- هەر ئەو سەرچاوەیەی پێشوو.

٢٩- بڕوانە: نوفوك گولسوی:

Gayri Muslimlerin Askerlik Macerasi

ئەستەموول .Simurg Yayinlari ٢٠٠٢:

٣٠- Montgomery papers كتێبخانەی كۆنگرێس ١٣C نامەی ٢٦ تەمووز/یۆلیۆ ١٩٢٣ ل٤ - ٥، بەر لە ساڵی ١٨٩٠ لەنێوان موسوڵمان و مەسیحیەكاندا جگە لە یەك ناكۆكی جەوهەری نەبێ كە ئەویش جیاوازیكردن بوو لە نێوانیاندا، ئیتر هیچی تر نەبووە، موسوڵمانەكان مەسیحیەكانیان بە ڕەگەزێكی نزمتر دادەنا، دیارە ئەمانیش لەوە نیگەرانبوون بەڵام ئەم هەستە توند نەبوو. لەو قۆناغەدا مەسیحیەكان ئاسوودە بوون (جگە لە ئەیالەتەكانی ڕۆژهەڵات بە تایبەت) بڕێك كڵێسا و شوێنی پەرستنیان هەبوو هەروا قوتابخانەی تایبەت بە خۆیان، ناچاریش نەبوون بەشداری شەڕەكانیش بكەن، ساڵانە بڕی ٢,٥ دۆلاریان دەدا بەرامبەر ئەو بەشداری نەكردنە، لە ئانی شەڕیشدا ئەوە شتێكی سروشتی بوو كە شتێ

پارەی زیاتریان دەدا بەڵام زۆریش نەبوو. دڵ ئارامیش نەبوون. کەچی ترکەکان کەمێ کینەیان بەرامبەر ئەو مەسیحیانە لە دڵدابوو، چونکە لە ماڵەکانی خۆیاندا دەمانەوە و لەسایەی شەڕدا کاسبی خۆیان دەکرد و پارەیان سەریەك دەنا بەڵام ئەوان (ترکەکان) ناچاربوون دوردەکەوتنەوە لەماڵ و منداڵی خۆیان و دەچوونە شەڕەکانەوە، کە دەشکەڕانەوە ماڵوێران و خێزانەکانیان داماو و دەستکورت.

٣١- سینان کونیر ئالپ،

Ikinci Mesrutiyet Doneminde Gayrimuslimlerin Askerlik Toplumsal Tarih Meselesi

ئەستەموول، کانوونی یەك/ دیسامبری ١٩٩٩: ١٢

٣٢- پەیامی ٢ تەمموز/ یۆلیۆی ١٩٠٩

Meclis- Mebusan Geridesi Devre 1.sene 2, İkinci Mesrutiyet کونیر ئالپ Oturum 105, 20 Haziran 1325 Temmuz 1909. Doneminde Gayrimuslimlerin Askerlik Meselesi. P 13.

٣٣- هەر ئەو سەرچاوەیەی پەراوێزی (٣١)

٣٤- دەربارەی ئەو سەربازانەی لە کەمینەکانبوون، بڕوانە ئیسات ئەرسەلان :

Canakkale de Cunceler (1997 نیسان/ ئەپریل) Isiginda/cephenin Iki Tarfi, Silahli Kuvvetler Dergisi Jandarma matbaasi 1995 ئەنکەر (sehitlemeriz ve Gazilemeriz حوسێن ئیشیك) pp 177 - 78

٣٥- هەر لە ئادار /مارسی ١٩١٣ەوە سەربازە ئەرمەنەکان دەستیانکردە فیرار کردن و هەڵدەهاتن بۆناو ڕووسیا، بەڵام کونسوڵی بەریتانیا (ج.هـ.مۆناهان) دەیگوت: سەربازە ئەرمەنەکان مامەڵەی باشیان لەگەڵدا دەکرا، فایلی ٢٤٤٩/١٩٥ لە مۆناهان بۆ لۆدز ، ئەرزڕۆم یەکی ئادار /مارس ١٩١٣،

هەتا نێردراوە ئامریکاییەکانیش دەیانگوت کە ئەرمەنەکان نەدەبوون بە سەرباز (لیژنەی ڕێپێدراوە ئامریکاییەکان ١٦،١٠،١) ئەرشیفی قوستەنتەنیە ، جزمی حەوت نامە بۆ: و.و.بیت ١٩١٣ - ١٩١٤، بڕوانە: أ.بوهاریان:

The legendery clash in van vaspurakani herosamarte 75 van p 19 بیرسن کاراکا

بابازیان یەریڤان ١٩٩٠. Hayastan جاری وابووە بە خاوو خێزانەوە دوی فیرارمکە کەوتوون و چونەتە ڕووسیاوە (ژەنراڵ ج. کورگانۆڤ:

La particpation des Armeniens a la Guerre mondiale sur le Front du caucase (1914-1918) Massis 1927 . p17

کورگانۆف ئەفسەرێکی ئەرمەنی بوو لە سوپای ڕووسدا، دوایی بووە ژەنراڵ لە سوپای ئەرمەندا، سەرچاوە ئەرمەنەکان وادەگەیەنن کە ئەرمەنەکان نەیاندەوێرا بچنە سوپاوە و ببنە سەرباز لە ترسی ئەوەی نەیاندەزانی چیان بەسەردێ.

٣٦- لە ١٩١٢ەوە کونسوڵی ڕووس لە ڤان وای مەزندە دەکرد کە سەربازە ئەرمەنەکان دەدەنە پاڵ یاخیبووانی ئەرمەن و ڕووسیش دێنە ناوەوە، (ج.س.ڕینۆڵدز ١٦،١٠،١ ئەرشیفی قوستەنتەنیە، جزمی حەوت نامە بۆ : و.و.بیت ١٩١٣ - ١٩١٤

٣٧- جستن مەکارسی لە کتێبەکەیدا:

Death and Exile: the Ethnic cleansing of Ottoman moslims (Darwin. 1995. 9 186 بڕیستن)

لیستێ بەناوی ئەو سەرمچاوە موخابەراتیانەی سەر بەو نۆپەراسۆنانە دەخاتە ڕوو.

٣٨- موستەفا بەگی حاکمی بەتلیس ، ١٨ ئەیلوول /ساپتەمبری ١٩١٤

Askeri Tarih belegeleri, dergisi sayi 83 belge, No: 2 1893

راپۆرتێ لە سەرکردەیی فیرقەی سوارەی دووەوە بۆ سەرکردەیی سوپای سێ

Atase Arisivi I. Dunya Harbi Kolleksiyonu k, 2818 D59

لە حاکمی تەرابزونەوە (کەمال عەزمی) بۆ سەرکردەیی بالا، تشرینی یەك/ ئەکتۆبەری ١٩١٤، بەڵگەنامەکانی ٦/١. هەر سەرچاوەی: ATASE

٣٩- ئالن و مۆراتوف: Caucasion Battlefields, pp ٢٤٢,٢٩١,٢٩٩

ئەکدس نیعمەت کورات: ئەنکەرە Ankara universitesi ١٩٧٠ p .

٢٨٥

ئەرشیفی نیشتمانی فرانسایی SHDT فایلی ٧N//١٦٤٩ کورگانۆڤ:

La particpation des Armeniens a la Guerre mondiale .p.9

٤٠- ATASE Arsivi, K ٢٨١٨ D. F٥٩, ٦٠-٢

٤١- ٢٨ تەمووز/یۆلیۆ ١٣٣٠: سەرچاوەکەی پێشوو: .F١٥ - ١

٤٢- هەر ئەو سەرچاوەیە: ٢ — ٢ - ٦. F

٤٣- هەر ئەو سەرچاوەیە: .F٩

٤٤- هەر ئەو سەرچاوەیە: ١ - ١٥. F.٣٣٣

٤٥- دەربارەی شەڕ لە هەرێمی ڤان، بڕوانە: Turk harbi. Pp ٥٧٥ - ٩٨. ٦٧٦ - ٧٨

ئالن و موراتوف: Caucasion Battlefields p ٣٣١ ئەناهید تیرمیناسیان ڤان ١٩١٥: Armenian van/ vaspura چاپی: ریتشارد. ج . هۆڤانیسیان (کوستامیسا- کالیفۆرنیا: خانەی مازدا بۆ بلاوکردنەوە ٢٠٠٠)ل ٢٠٩ - ٤٤ ئیرگونوز ئەکجورا: Van ve cevresinde Ermeni Isyanlari ١٨٩٦

p. ١٩٩٤Turk Dunyasi Arastirmalari Vakfi :ئیستەنبوول
١٢٣

La Guerre Turque dans la Guerre Modale ،لارشیر
بـــەلام (ا.دو) : ١٩١٤Mets depkere Vaspurakan tvakannerin

(یەریڤان ١٩١٧، Loys) لەم لێکۆڵینەوەیەدا پیانەچوینەتەوە، بـەلام بـۆ وتارەکەی تیرمیناسیان سودێکی زۆری بـووە، کتێبەکـەی کۆسـۆیان لـە کشت سەرژمێرەکان پڕ گومـانترە و جێـی بـاوەڕ نییـە، ئەمـە باسێکی ڕاسـتەوخۆی شـەڕەکان دەکـات، لەبەرامبـەردا، موختاریـان نووسـینێکی ڕەخنـەیی نووسی گشت ئەرمەنی وا داناوە کە بێ سنوور جوامێرن و موسوڵمانایش بـێ سـنوور بوودەڵە و ترسنۆکن، گێڕانەوەکانی پڕن لـە وەسـفی شـەڕێکدا کـە چـۆن چـل جوتیـاری ئەرمـەن ٢٠٠ سـەرباز لـە شـەڕێکی یـەك ڕۆژەدا دەشـکێنن و تـەنیا یـەك ئەرمەنیشـی تێـدا دەکـوژرێ، یـان چـۆن ٢٠ ئەرمـەن ڕووبـەڕووی ٢٠٠ سـواری تـرك دەوەسـتنەوە خـۆ ئەگـەر ئـەو ژمارانـەی موختاریـان هێنـاونی کۆکرێنەوە، سەبارەت بە کوژراوان و ئاوارەکانی ئەرمەن، ئەوا زۆر زیـاترە لـە گشـت ئـەو ئەرمەنانـەی کـە بـە هەقـەتی لـە ناوچـەکەدا بـوو، لەوانەیـە پێوسـتنەکات کـە بڵێین ئەرمـەن لـەو بـاس و بابەتـە مێژووییانـەی ئـەودا هەرگیزاو هەرگیز نەجووڵاون و شۆڕشیان نەکردووە و بۆ بەرگریکردن نەبێ لە خۆ هەتاوقەت نەجەنگاون.

٤٦- لە سیڤدیت بۆ وەزارەتی ناوخۆ، یەکی کانوونی یەك/دیسامبری ١٩١٤
ATASE Arsivi I. Dunya harrbi koll ksiyonu. K 4
بەلگەنامەکان: ١٩٩٦/٣

٤٧- لەیەکەم ساڵی جەنگدا، شەرکەرە ئەرمەنەکان لە ناوچەی سەڵماسدا گردبیوونەوە، ئـەنترانیك لەمانـە هێزێکی هـەزار کەسی غـەیرە نیزامـی لـێ تەشکیل کردن و دانیە پاڵ ڕووسەکان (هالوك سیلفی:

Hangi Antranik? 31: 2002 نیسان/ ئەپریل ٢٠٢٢ Dergisi 12

ئەنترانیك لە (شیبینکارا هیسار) ساڵی ١٨٦٥ لەدایکبووە. ژیانی بۆ دۆزی ئەرمەن تەرخان کردووە، لە ساڵی ١٨٩٠دا پاش ئەوەی ترکێکی کوشت چووە پاڵ باوکی و بووە شەڕکەر، ئینجا هەڵات بۆ ئەستەموول و چووە لیژنەی (هانشاك)ەوە، لێرە ئەفسەرێکی پۆلیسی بە فەرمانی لیژنەکە کوشت و ئیتر رایکرد بۆ باتووم، لەوێ لە خاو و خلیچکی و سارد و سڕی چالاکیە شۆڕشگێڕیەکان وەڕس و هەراسان بوو، بۆیە چوو بۆ رۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵ، ویستی لە ڤان و پەتلیس و مووش شۆڕشێ هەلگیرسێنێ؛ لە شۆڕشەکەی ساسۆندا (یەکەم ١٨٩٥ و دووەم ١٩٠٤) بەشداری کردووە.

٤٨- . K ... Dunya Harbi . I. ATASE Arsivi ٢٠. D٥٢٠ .
٥F

٤٩- کۆرگانۆف: La participation das Armenians a la ١٣-١٧Guerre Mondiale. Pp

٥٠- سەرچاوەی پەراوێزی (٤٨): ٥٥ - ٢-F بەڵگەنامەکان ١:١٠

٥١- هەر ئەو سەرچاوەیە: ٥ -F

٥٢- هەر ئەو سەرچاوەیە: ٥ -F بەڵگەنامەکان ١١:١

٥٣- هەر ئەو سەرچاوەیە: ٨,١ -F

٥٤- سەڵتەنەی عوسمانی: Aspiration et agissements . p ٢٦٨

Tarihti Ermeni Mazalim ve Ermeniler (Anada
محەممەد هوکاوغلو: ١٩٧٦. pp ٦٢٢,٢٢
ئەنکەرە Arsivi Vesikalariyla

٥٥- سەڵتەنەی عوسمانی: هەر ئەو سەرچاوەیە.

٥٦- گونار ویسنەر لە کتێبەکەیدا: Hayaths Dzor-
xavasor (Wesbaden : Reichert ١٩٩٧)

وە لە لاپەڕە (٥٥ - ٦٠) بەدرێژی کە لە سەرچاوەی ئەرمەنییەوە وەری گرتووە زانیاری دەربارەی هێرشەکانی کورد و سوپا بۆ سەر ئەرمەنەکان دەخاتە ڕوو، هەروا دەربارەی کۆڕەوی ئەرمەن، بەلام باسێکی هیچ شۆڕشێکی ئەرمەن یان پەلاماردانی موسوڵمانەکان ناکات کە ببنە هۆی دەستدرێژی، ئەمە وا دەکات بیر بکرێتەوە لەوەی کە هەروا بە ئاسانی کورد و ترک لەشەو ورۆژێکدا بڕیاریان دابێ پەلاماری ئەرمەنەکان بدەن. دیارە ئەمەش سروشتی ئەو سەرچاوانەی پشتی پێ بەستوون پیشاندەدات. هەروا (ویسنر)گلەیی لەوە دەکات کە ڕاپۆرتە بیانیەکانی بەردەست دەگمەنن، بەلام باسیش لە ڕاپۆرتە عوسمانیەکانەوە ناکات و ناویاننابات.

٥٧- ئەو کتێبە دانراوانەی کە باس لە بابەتی ئەو شۆڕشانەوە دەکەن زۆر زۆرن و ناژمێررێن، بۆ خوێندنەوەیەکی گشتی مێژوویی یان لێ وەرگرتنیان، بڕوانە:

ماکارسی = Death and Exile. Pp ١٧٩ - ٨٧

گورون: The Armenian File. Pp ١٨٦ - ٢٠٢

سەڵتەنەی عوسمانی: Aspiration et agissements . pp ٢٢١ - ٢٢٤

٥٨- ATASE Arsive - k ٢٢٨٧. D ١٢. F ٦. ٦- ١

٥٩- هەر ئەو سەرچاوەیە: ٣ – ٢ - F.٦

٦٠- هەر ئەو سەرچاوەیە: ٣ - ١١/١ . F-٥٢٠

٦١- گورون: The Armenian File . p ٢٠٤

٦٢- بگەڕێوە بۆ بەشی نۆی ئەم کتێبە.

٦٣- سەڵتەنەی عوسمانی : ل٢٦٨-٦٩ هەروا بڕوانە ئەو بابەتانەی لە ئەرشیفی لەشکری ئاڵمانەوە وەرگیراون، لە (جەلالەددین یافوز) :

Armenilerin Arkasinda Hep Birileri mi olacak KoK Arstirnalar 3. No 1- 2001 p 20-21

٦٤- AtaSE Arsivi. K- ٢٨١٨-D ,٥٩ F ,١ - ١٥

٦٥- هەر ئەو سەرچاوەیە: F-١٧

٦٦- هەر ئەو سەرچاوەیە: F-١-٤٤ هەروا تۆپەگۆنەکانیش لەسەر دیوارەکانی قەڵاکە ڕیزکرابوون.

٦٧- هەر ئەو سەرچاوەیە:١٠٣٢ و F-١,٣٢

٦٨- لارشیر: La Guerre Turque dans la Guerre Modial , ٣٩٤p

ئالن و مۆراتۆف Caucasian Battlefields-p 303-5

٦٩- بگەڕێوە بۆ ئەو لێکدانەوەیەی سەرەوەی ئەم بەشە.

٧٠- ATASE Arsivi . K. ١٨-٢٨ .D ,٥٩ .F ,١ - ١٦

٧١- هەر ئەو سەرچاوەیە: F.٢-٦ بەڵگەنامەکان:

Ermeni Komitelerninin amal ve Harekat-I (Itilaiyesi, 1:23 (Matbaa-I Amire. 1332. p 202

٧٢- گوسویان: The Epic story. P ١٣ بۆهاریان دەڵێ کە ئەرمەنەکان لە گەڕەکی گاردندا لە مانگی ئادار /مارسدا مەشقیان تەواو کردبوو دەستیان دابووە دوا ئامادەکاریەکانیان بۆ شەڕکردن، وەك دەستپێشخەریەك بۆ کارەساتەکانی داهاتوو. ( The Legendary clash in van. Pp. ٢١) زۆر جار نووسینە مێژوویە ئەرمەنیەکان لەبارەی شۆڕشی ڤانەوە سەرچاوەیەکی بەهێزن و زانیاریان سەبارەت بە هەڵوێستەکانی ئەرمەن خۆیان و بڕیارەکانی سەرکردەییەکانیانەوە لێ دەستدەکەوێ، هەرچەندە دەبێ ئەو نووسینانە وەك بەڵگەنامەی سیاسی سەیربکرێن و زۆرتر پڕن لە هەڵە و نوقسانی. هەر بۆ نموونە (هایگ غۆسۆیان) لە نووسینەکانیا ئەوە دووپات دەکاتەوە کە هێرشە داگیرکاریەکەی ئەنوەر پاشا بۆ سەر بەرەی قەفقاس سەرکەوتنی بەدەستهێنا! هەروا ئاماژە دەدا بەوەی کە ئاژاوەگێڕیەکانی

ئەرمەن لە جاتاك لە مانگی نیسان/ ئەپریلی ۱۹۱۵ دوە دەستیان پێ کرد، کە ڕاستیەکەی لە شوبات/فەبرایردا بووە، ئیتر ئەوەباسی زۆر باخیبوونی تر مەگە بەر لەوە کە لێیان دەدوێ، لەناست ئەمانەدا هێشتا نووسینەکانی ئەم غۆسۆیانە کە دێتە سەر وەسفی ڕەفتارەکانی ئەرمەنەکان لە بەشە کۆنەکەی شاری ڤاندا، سوودبەخشن.

۷۳- تیرمیناسیان ۱۹۱۵ Van ل۲۱۷-۱۸. لەوە دەچێ تیرۆر کردنی سەرکردەکانی تاشناق بەشێکبووبێ لەو سیاسەیەی حوکمەتی ناوەندی بۆ پەلاماردانی سەرانی یاخیبوونەکە، چونکە کەسانی تریش لە نیسان/ئەپریلدا دیسان ئیعدام کران. لەوانە سەرکردەی ئەرمەن لە ئەستەموول. دەشێ بگوترێ ئەم کارانە تەنیا تیرۆرکردنێکی ڕووتبوون بەرامبەر دوژمن لەکاتی جەنگدا، بەڵام گومان لەوەدا نییە کە دەکرا ئەو سەرکردانە بەندکرێن و دادگەیی بکرێن، چونکە هێند بەڵگە لە دژی ئەوانە بەدەستەوەبوو کە ڕاپێچی دادگە بکرێن و بدرێنە قەزا. بۆ بەدەستهێنانی لیستی ئەو سەرکردانەی تاشناق کە ونبوون، بڕوانە مێژووی یەکیەتی شۆڕشگێرانی ئەرمەن لە ل۱۱۰.

۷٤- ATASE Arsivi. K- ۲۹٤۷. D ۶۲۸. F. ۳,٤.

بۆ ئاگابوون لە بەیاننامەکەی ئەرمەن سەبارەت بە کارە سەرکەوتووەکەیان لە ناوچەی جاتاك، بڕوانە (موختاریان: An Accont. P۲۳)

۷۵- سەرچاوەی پێشوو: F.٤,۳ بەڵگەنامەکان ۲۲:۱ بڕوانە (لەسەر نووسینەکانی) بارون ماکسی فون ئوبنهایم لەبارەی پەلامارەکانی ئەرمەنەوە، ئاب /ئاغستۆس ۱۹۱۵. ۷۲۵۳، ۲۹ AA MA Nr

ئیرمغارد فاراه :

Die deutsche pressepolitik and propagandatatigkeit im Osmanischen Reich van 1908 - 1918 unter besonderer

Beriicksichtigung des, Osmanischen Lioyd (Steiner 1993: شتوتگارت)

٧٦- بوهاريان: The Legendery clash in van, pp ٢١ - ٢٤

٧٧- تيرميناسيان٢٢٨, Van ١٩١٥P

٧٨- هەر ئەو سەرچاوەيە، ل٢٢٦ - ٢٠ موختاريان An Account ل ٢٣

- ٢٤، ٢٩ - ٣١ بوهاريان The Legendery clash in van

ل ٢١ - ٢٤ گشت ئەم سەرچاوانە، بەتايبەت موختاريان و بوهاريان ليستی تـەواو بـەناوی ئەنـدامانی ليژنـەی سـەربازی و دەزگـەكانی تـر دەدەن بەدەستەوە

٧٩- بڕوانە گۆسۆيان، ١٩The Epic story. P دوو ئافرەتی مسۆنێری ئامريكايی (گرايس كنـاب، كلارنـس ئەشـير) وای بـۆ دەچـن كـە پەلامارەكـە لەودوە دەستی پێ كرد كـە سـەربازە تركـەكان ويـستبوويان پـەلاماری ژنێكـی ئەرمەنی بدەن و سواری بن، لەمەدا چەند ئەرمەنیٚ كە ويـستبوويان نـەهێڵن كوژراون، وەك دەردەكـەوێ ئـەمـە چيرۆكێكی ناخۆشـە و پێـوەی نـراوە، زيـاد لەمەش ناگاتە ئەوەی ياخيبوونێك بەرپا كات. (گريس.هـ.كنـاب: Mission ٢٥at van. P) ئەم كتێبە بە شێوەيەكی تايبەت چاپكراوە و بـە ژمارەيـەكی كەميش. بەڵام سەر لەنوێ لە بەريتانيا لە چاپ درايەوە

Misc. No, The Treatment of Armenians in the Ottman Empire 1915 - 16. 31,1916 (H.M. stationery office, 1916 pp. 32-47

ئـەم سەرچـاوانە تايبـەتن بـە چـاپخانە بەريتانيەكە، كلارنس.د.ئەشير، بۆسـتن و نيويـورك An Armenian physician in Turkey Houghton Miffiin company ١٩١٧ p. ٢٤٧

زۆر كەرەت كـە نێردراوەكـان لـە ڤـان شتێكيان سـەبارەت بـە ڕووداوەكـان نـەدەزانی، پشـتيان بـەو دەنگۆيانـە دەبەسـت كـە لـە ئەرمەنەكانـەوە پێيـان

دەگەیی، بۆ نموونە بڕوانە ڕاپۆرتەکانیان لەسەر (کوشتارێکی گەورە) لە ئەرمەنـــەکان لـــە نێزیـــك مـــووش، بـــەریتانێکان بەدواداچـــوون و لێکۆڵینەوەیەکیان لەمەدا کرد، بۆیان دەرکەوت کە ئەو کوشتارە هەر نەبووە (فایلی ٢٠٠/٤٢٤ لە مونسل بۆ ئۆکۆنر، ڤان ٤ ئەیلوول /ساپتەمبر ١٩٠٠) هەندێ جار نووسینەکانیان سەرچاوەیەکی چاکن بۆ زانیاریەك کە بە چاوی خۆیان دیویانە، بۆ نموونە بە وردی ئەو کۆبوونەوانەیان نووسیوە کە لەگەڵ کونسوڵی ڕووسدا کردویانە، یان لەگەڵ حاکمی عوسمانی لە شارەکە. سەرەتا هەڵوێستیان دژ بە شۆڕشبوو، چونکە شۆڕشگێڕان بە عەلەنی بێ ئیمانی خۆیان ڕادەگەیاند، ئەمەش بەلای ئەو نێردراوانەوە کارێکی بێ ئەخلاقی بوو، هەروا ئەندامانی تاشناق ڕێگر بوون لەبەردەم کارەکانیاندا، هەروا نێردراوەکانیش ناستەنگ بوون لەبەردەم دامەزراندنی ئەو مامۆستایانەی بیروباوەڕی تاشناقیان بڵاودەکردەوە و پڕ و پاگەندەیان بۆ دەکردن (لیژنەی ڕێپێدراوانی ئامریکایی ١٩،٩،٨ نێردراو بۆ ڕۆژهەڵاتی ترکیا، لیژنەی ئافرەتان، جزمی یەکەم ١٩٠٩ - ١٩١٤ ڕاپۆرتو بەڵگەنامەکان، نامەکان A.Z، ڕاپۆرتەکان دەربارەی قوتابخانەی باخچەی ڤان بۆ کچان وە قوتابخانەی شار بۆ کوڕان، ٤ ئاب/ئاغستۆس، سەرژمێریەکان ١٩٠٩).

لەسەروبەندی یاخیبوونەکەدا، کە ڕووسەکان پشتگیری خۆیان بۆ ئەو نێردراوانە چەسپاند، ئەوانیش بە تەواوی هەڵوێستی خۆیان گۆڕی و پاپاندایەوە بەلای ئەواندا، (بە درێژی و وبەنهێنیەکی تەواو قسەم لەگەڵ کونسوڵی ڕووسدا کرد، ڕۆژی شەممە کە کۆبوومەوە لەگەڵیدا، بە توندی بۆی دووپات کردمەوە کە ڕووسیا ئەگەر بێتە ناوچەکەوە بە هیچ جۆرێ نابێتە ئاستەنگ لەبەردەم کارەکانی ئێمەدا (لیژنەی ڕێپێدراوە ئامریکاییەکان ١٦،١٠،١ ئەرشیفی قوستەنتەنیە، بەشی حەوت، نامە بۆ و.و.بیت ١٩١٣ - ١٩١٤) ئەوان مەگەر چلۆنها ئەگین یەك کوشتن یا مردنێکی موسوڵمانیان تۆمار

نەکردووە، باسی هیچ کارێکی ئەرمەنیشیان نەکردووە مەگەر ئەوانەی کە هێجگار ناهەمواربوون، ئەوەش بەچەند ڕستە و وشەیەکی کورت کورت، هەر بۆ نمونە ئەم نێردراوانە باسی ئەو کوشتارەی پەتلیس ناکەن کە بە بەڵگەوە تۆمارکراوە، جگە لە تاقە شتێ لەبارەی ڤوتاربوونی پزیشکێکی موسوڵمانەوە کە زۆر کەڕەت چاکەی بەرامبەر ئەرمەنەکان کردووە؛ کە زانیان ژنە ئەرمەنەکانی داڵدەداوە و پاراستوونی. لەو چارەنووسە ڕزگاری بوو کە چاوەڕوانی هەر ترکێکی دەکرد لە شارەکەدا. (لیژنەی ڕێپێدراوە ئامریکاییەکان ١٦،٩،٨ نێردراو بۆ ڕۆژهەڵاتی ترکیا. لیژنەی ئافرەتان جزمی دوو١٩١٥ - ١٩٣٠ ڕاپۆرت و بەڵگەنامەکان Z - A) ئەشیر تەنیا چەند ڕستەیەکی تەرخان کردووە بۆ باسی کوشتنی موسوڵمانەکان بە دەستی ئەرمەنەکان لە ڤاندا، دەڵێ تەو تاوانانە ئەسبابی خۆیان هەبووە؛ پێشتر ئەوەمان گوتوە کە ئەمانە بە درێژایی ژیانیان زۆریان چەشتووە بەدەست ترکەکانەوە. An Armenian physician in Turkey. P ٢٨٥

گرایس کتاب نەهاتۆتە سەر باسی کوژراوانی موسوڵمانەکان، لە کتێبەکەیدا: Mission at Van.

٨٠- بڕۆرەوە سەر بەشی نۆی ئەم کتێبە. بەپێی ڕاپۆرتەکانی (ا.دو)، تیرمیناسیان لیستێکی دوورودرێژ بەناوی ئەو گوندانەی کاولکراون دەخاتە ڕوو، لەوە دەچێ کە ژمارەکانیان زۆر لەوە زۆرترە کە بتوانرێ لە چەند ڕۆژێکدا بسووتێنرێن ( ٥١ گوند لەچەند ڕۆژێکی کەمدا)؛ تیرمیناسیان. ل٢١٨ – ١٩١٥ Van بەڵام بە هیچ کلۆجێ باسی هیچ یاخیبوونێ ناکات.

٨١- بوهاریان لە کتێبی: The Legendary clash in van. P ١٩

وە هی تریش ئەوە دەگەیەنن کە تیرۆرکردنی (فرامیان و نیشخان) هۆکاری ڕاستەوخۆی یاخیبوونەکە بووە.

٨٢- تیرمیناسیان لە Van١٩١٥دا دەنووسێ:

( لەسەر ئەوەی سیفدیت بەگ ڕازی ئەبووفرامیان مەرەخەسکات وە لە ئەنجامی جموجۆڵی سوپاوە کە لە ٥ نیسان/ ئەپریلەوە هەردوو بەشەکەی ئەرمەنی و موسوڵمانی لە ڤاندا لێك دابڕی، ئارام هاتە سەر ئەوەی کە لە بەرگریکردن لەخۆ زیاتر شتێکی تریان بۆ نەماوەتەوە، ئەم تەجرەبەیەش سەبارەت بە ئەرمەنی ڤانەوە شتێکی تازە نەبوو، لە حوزەیران/یۆنیۆی ١٨٩٦دا تاقیکرابۆوە، وەك ستراتیژێکی هاوبەشی نێوان سێ حیزبە شۆڕشگێڕیە ئەرمەنەکەی – تاشناق و ئەرمیناکان و هانشاك، سەرەڕای ئەمەش شەڕی ئەرمەن و تاتاری ١٩٠٥ - ١٩٠٧ بووە هۆی چاندنی تۆوی دوژمنایەتی لە نێوان ئەرمەن و موسوڵمانەکاندا (ئازەربایجانیەکان) لەزۆر شوێنی تری قەفقاسیا، لەنێو – باکۆ و تەفلیس - هەر ئەو شەڕانەشبوو کە ئەرمەنی ڤان و پەتلیس و مووش و ئەرزڕۆمی جوڵاند و هەتا لە تەبرێزیش هانی دان، تەجرەبەکە سەلماندبووی کە بەرگریکردن گرەوێکی براوەترە لە مل شۆڕکردن. دواجار بەلای هەوالگری ڕۆژاواوە لە ڤان، بەرگریکردن لە خۆ ببووە مەسەلەیەکی شەرەفمەندی نیشتمانی و ئەخلاقی و سیاسی، ئەمە سەرەڕای مەترسێکانی تۆڵەسەندنەوەی حوکمەتیش لەولاوە بوەستێ.

٨٣- ئەلن و مۆراتۆڤ لە کتێبی: Caucasion Battlefields. P ٢٩٩ نیشارە دەدەن بەوە کە بەشی دەرەك ( کەلە چەند کەتیبەیەکی پۆلیسی سەربازی پێکهاتبوو) بەسەرۆکایەتی کازم بەگ و چەند یەکەیەکی تریشی خرابووە سەر، لە پەتلیسەوە هێنران و ئابلۆوقەیەکیان خستبووە سەر دانیشتوانە یاخیبووەکان. بەڵام وئەم دوو نووسەرە بەهەڵەدا چوون، چونکە تۆمارە عوسمانیەکان هیچ شتێك لەباردی ئەو کەتیبانەی پەتلیسەوە باس ناکەن و ئیایاندا نیە و هیچی وایان لە پەتلیس نەبووە تا بەهۆی شۆڕشەکەوە ڕەوانەی ئەویکانێی بکەن. زۆرتر ئەم دووانە لێیان تێکچووە و وادەزانن کە ئەو هێزە پشتیوانانە هەر ئەو دوو کەتیبەیەن کە لە

٩ئـەیار/مایۆ گەیشـتن و بـە هـەرێمی پەتلیسـدا تێپـەڕیون. گشـت فیرقـە دەرەکەکە بە جارێ ڕەوانە نەکران، تەنیا یەك کەتیبەی نێررا، کازم بـەگیش خـۆی بەشەخسـی نەچـوو بـۆ ڤـان، لەمبارەیـەوە کـازم ڕاپـۆرتێکی بـۆ سەرکردەکانی لە ٢٩ نیسان /ئەپریلدا بەرزکردۆتەوە:

AtASE Arsivi. I. Dunya Harbi Kolleksiyonu. K 2820 . DA 69. F. 3. 71

. F ٥٩٢Turk Harbi. P ،٤٥١٧ /٦ ژمارە AA ٢٠٠٥:٢ بەلگەنامەکان

٦. H ٥٢٤٠. Kls ٢٢-١

بەڵام ئەلن و مۆراتۆڤ سەرچاوەکانیان دیاری نەکردووە

٨٤- هیفاسور، تیمار و ئیبیسیك، AtASE Arsivi. I. Dunya

. ٢٠٠٥ ٣٦٩:بەلگەنامـەکان DA ٢٨٢٠Harbi Kolleksiyonu. K

٣,٧١F.

٨٥- کناب لە کتێبەکەیدا Mission at van .p٣٦ دەنووسێ کە لـە ٢٥ نیسـان /ئـەپریل دا ئـەو پەنابەرانـە دەگەیشـتن، سـەرنجی پـەراوێزی ١١٠ لـە خوارترەوە بدە.

٨٦- موختاریان لە کتێبی: An Account . pp ٧٧ - ٧٩ بوهاریان لـە کتێبی: The Legendary clash in van. P ٢٤

کاریگـەرێتی نـارنجۆك پیشـان دەدەن کـە بـەکاردەهات، هـەروا ڕایشـی دەگەیـەنن کـە یاخیبووەکـان چـەکی ئـەوتۆیان پێبـووە کـە شـان بـە شـانی ئەوانەی سوپابوون.

٨٧- هەر ئەو دووانەی سەرەوە (بوهاریان، موختاریان) لـە کتێبەکانیانـدا بەتایبەت دووەمیان، ئیشارە بەوە دەدەن کە سەربازە ترکـەکان نـە مەشـقێکی وایـان پـێ کرابـوو و نەشارەزاشـبوون لـە شـەڕێکی چـەتەگەری وادا کـە لـە هەرێمی ڤانـدا ڕووبەڕووی ببوونەوە.

٨٨- سەبارەت بە تۆپ و تۆپخانە، بڕوانە (ڕافایێل دو نوگالیس ) لە کتێبی:

Four years beneath the Crescent (Scribners 1926. p 75 - 81. 83-85. 94: نیویورك)

بۆچوونی زۆر دەربارەی ئەو تۆپانە هاتنە گۆڕێ، موختاریان دەڵێ گوایە لە یەکی ئایار/مایۆدا ٤٠٠ گوللە تۆپ بەسەر ئەرمەنەکاندا دابارێ، لە شەقامەکاندا ١٢ کەسی بێ تاوان کوژران، جا وەك دەردەکەوێ ١٢ کەس بەرامبەر داباریني ٤٠٠ گوللە تۆپ کە نراوە پێیانەوە ژمارەیەکی کەمە، خۆ موختاریان کە وەسفێکی فیعلی ئەنجامەکانی ئەو ئاگرکەوتنەوانەمان بۆ دەکات کە بەهۆی تۆپەکانەوە بووە، ئەوا زیانەکان واقیعی ترن (بۆ نموونە وەسفی ئەو بینایانە کە تەقێنراونەتەوە کە ڕێك وەك وەسفەکانی — دونوگالیس - وایە) ئەگەر ئەم وەسفانەی ڕاستبن ئەوا دەبێ بیر لەوە بکرێتەوە کە هێزەکانی عوسمانی تۆپەکانیان بەناو شەقامەکاندا بردووە (ل٨٣ - ٨٤) ئەمەش دەلیلە بۆ ئەوەی ئەو چەکانە بچووك بوون، دەبێ تۆپی شاخاویش بووبن.

سیفدیت تەنیا دوو تۆپی مەیدانی لەژێر دەستدابووە کە بەر لە یاخیبوونەکە وەریگرتبوون، جگە لەو چەکانەش کە فیرقەی دەرەکی گەڕۆك ناردبوونی لە ٤ ئایار/مایۆدا یەك لەمانە تەقیەوە (موحتاریان. ل٨٤). گۆسۆیان دەنووسێ: عوسمانێکان بەسایەی ئەو تۆپخانەیەی ناو قەڵا و سیانی ترەوە توانیان پەلاماری ئەو گەڕەکانە بدەن کە ئەرمەنەکان لە شارە کۆنەکەدا گرتبوویان:

(١٠١An Account. P) موختاریان (٢١ The epic story. P)

لەمەدا کە بە گومانە وە باس لە تۆپەکان دەکات، دەڵێ: بۆ سبەی، ترکەکان بەهۆی ئەو دوو تۆپە مەیدانەیانەوە گشت سەنگەرەکانمانیان لە گەڕەکی

ئاراراك تۆپباران كرد، دەبێ عوسمانێكان تۆپخانەیەكیان لە قەڵاكەدا بووبێ، دووانی مەیدانیش و ژمارەیەكیش لە تۆپی بچووكی شاخاوی، لە واقیعیشدا هەرچەندە ناویانناوە (تۆپخانەی قەڵا) بەڵام، زۆریان تەنیا تۆپی هاوەنی خانبڕ بوون*، جگە لەوەی كە كۆنیش ببوون بەڵام هەر بەكاریان دەهێنان:
Four years beneath the Crescent. P. 84
گۆسۆیانیش لە: The epic story. P ٣٧-٣٨دەڵێ: پێنج لەو تۆپە هاوەنانە: سیانیان قورس و دووانەكەی تر سووكبوون. ئەناهید تیرمیناسیان وا ڕایدەگەیەنێ كە ١٢ تۆپ بوون (شاخاوی سووكەڵە و تۆپخانەیەكی ناو قەڵاكە، قورس بەڵام كورتهاوێژ) كەچی ناوی تۆپی مەیدانی نابات.

٨٩- بگەڕێوە بۆ بەشی نۆی ئەم كتێبە

٩٠- دونوگالیس لە كتێبەكەیدا (ل ٧٩) دووپاتی دەكاتەوە كە سیفدیت دەیویست زۆرترین ئەرمەنی بێنێتە ناو شارەكەوە، تا خواردن و خۆراكی یاخیبووەكان ڕوو لە كەمبوون بكات، هەروا بە ناڕەزاییەوە دەڵێ كە سەركردەیی ئەرمەنەكان هەستی بەو مەترسیە كرد و ویستی خۆی لێ لادات، هەتا ڕادەی ئەرمەنەكان تەقەیان لەو پەنابەرانەش دەكرد كە دەیانویست بێنە شارەوە، لێشیان كوشتن (ل٩٣). تیرمیناسیان (ل ٢٣٨ - ٣٩) باس لە كوشتن ناكات، دەڵێ: (ئەو ڕۆژانە ئەهامەتی گەورە گەورە بەسەر خەڵكدا دەهات، لیژنەی سەربازی نەیدەهێشت نان و خواردن بدرێ بەوانەی شەڕ ناكەن و بەرگری ناكەن، برسیە بێ كەڵكەكانیان دەردەكرد، ژمارەی ئەمجۆرە ئەرمەنانەش زۆربوون، ئافرەت و منداڵ كە تركەكان هێنابوونیان تا

---

* خانبڕ: تفەنگ یان دەمانچە و تۆپ و لەم بابەتانە كە تەقەی زۆر بێ بكرێ خانەكانی ناو لوولەكەی دەسوێ و ئیدی ئەو توانای دورهاوێژیەی نامێنێ، بەمە دەگوترێ (خانبڕبووە) یان گوللەی باش ناهاوێژرێ. ((وەرگێڕ))

شەڕکەرەکانی پێ لاوازکەن، بۆهاریان (ل ٢٤ - ٣١) دەڵێ: سیفیدیت ژمارەیە ئەرمەنی ناردە ناو شار و بەڵام هیچ ناڵێ لە بابەت ڕێبەندی کردنیان بۆ هاتنە ناوەوە

٩١- موختاریان An Account .p٦٧

٩٢- هەر ئەو سەرچاوەیە ل٨٧

٩٣- ئەگەر بشکانایە و هەڵاتنایە، دەچوونە ناو ئێران، ئەگەرێکبوو و خرابوود بەردەم، لە کاتێکدا فانیان لەدەستچوایە، بەڵام وەك دەردەکەت ئەمە سەرکێشیەکی خوازراو نەبوو.

٩٤- سەرچاوە عوسمانیەکان ئەوە دەگەیەنن کە شەڕەکە کاتێ هەڵگیرسا کە ئەرمەنەکان کەوتنە تەقەکردن لە مەخفەرەکانی سەرسنور، لە بەرامبەر ئەمە ئەرمەنەکانیش دەڵێن: نەخێر، کاتێبوو کە تاقمێ ترك پەلاماری گەڕەکی ئەرمەنەکانی ناو شارە کۆنەکەیان دا، شەڕ لە گاردنەوە دەستی پێ کردبوو بەر لەوەی بتەنێتەوە بۆ بەشە کۆنەکەی شار.

٩٥- ئەنجومەنی ئەرمەنی پێشتر پلانی ناگرتیبەردانەکانی دانابوو ئەوەش بە پاڵنەری سەربازی، نەك شتەکە ڕێکەوت بوو بێ، (بە پێی پلانەکانمان بۆ بەرگریکردن، هەر لەگەڵ دەستپێکردنی شەڕدا دەبێ ئەم بینایانە کاول کرێن، چونکە لەوانەیە سەنگەرەکانی بەرگریکردنمان لاوازکەن، لە حاڵەتێکدا ئەگەر نەتەقێنرێتەوە: بینای پۆستە و بروسکە، بینای ریجیە – ئینحساری توتن - و بانکەکە، بیناکانی شارەداری و تەندروستی، مەڵبەندی پۆلیسی ناوشار، باروتخانە و عەمباری چەك، عەمباری کەرەستە و ئەدەواتی سەربازی، بینای دادگە، سەبارەت بەو دوو بینایەی دوایی دەبوو سەرەتا هەوڵی گرتنیان بدرێ، بەڵام کە نەتوانرا ئەمە بکرێ، ئیتر سووتاندنیان زەروری بوو):

گۆسۆیان: The Epic story PP ١١ - ١٢ – ٢٢ - ٢٣

ATASE Arsivi .I. Dunya Harbi kolleksiyonu k- -٩٦
٤١ - ٢ F- ٦٩ D - A ٢٨٢٠
بەڵگەنامەکان ٢٠٠٢ - ٢٠ نیسان/ئە پەریلی ١٩١٥
گۆسۆیان دەڵێ: پەنابەرە موسڵمانەکانیش پەنایان دەبردە بەر بەشی موسڵمانی گاردن، سەرەڕای ئەمەش سەرچاوە عوسمانیەکان ئەمەی تێدا نیە، لەوە دەچێ گرتنەبەری ئەو ڕێگەیە شیاو نەبووبێ چونکە دەبوو ئەوان بە ناو ئەرمەنەکاندا تێ بپەڕینایە، کە ئەمەش ستەمبوو.

-٩٧ سەڵتەنەی عوسمانی، Aspiraton et agissements. P ٢٦٩

-٩٨ Turk Harbi. P ٥٩٢ کتێبەکەی گوسویان جزمێکە تاڕادەیەکی زۆر باس لە پەلامارەکانی ئەرمەنەوە دەکات لە بەشەکۆنەکەی شاردا، هەروا پەلامارەدانی قەڵاش.

-٩٩ ATASE arsivi F. ٥٩٢Turk Harbi. P ٧ - ١٠٠

-١٠٠ موختاریان: The Epic story. P ١٣ An account. Pp ٧٧ - ٨٢

-١٠١ دونوگالیس Four years... p ٧٦ بەپێی بەڵگەکانی ناوخۆ لەوە دەچێ کە دونوگالیس بە زۆری زانیاریەکانی لە (کتێبی شین)ەوە blue book وەرگرتبێ یا لەوانەیە ئەفسەرێکی لێهاتووی سوپابووبێ، بەڵام لە دوو توێی نوسینەکانیدا وا دیارە تووشی بەدگومانی و بێباوەڕی بووبێ هەروا خۆبەزلزانین، لە گشت کتێبەکەیدا باس لەوە دەکات کە چۆن بەرپرسێ یان هەندێ کەسی تر ویستویانە تیرۆری بکەن و گشت جارێ سەرکەوتوو نەبوون لە هەوڵەکەیاندا، وە تەنیا دونوگالیس نەبێ نیتر کەسی دی تەکتیکە شیاوە سەربازیەکان نازانێ، بەڵام بە تەواوی شیکردنەوەکانی بۆ کەسەکان هەر متمانەیان پێ ناگرێ و جێی باوەڕنین.

-١٠٢ تیرمیناسیان Van ١٩١٥ p ٢٢٩.

۱۰۳- سەرچاوەی تێرمیناسیان دیاری نەکراوە. سەرژمێرییەکان لەو کتێبانەدا بڵاوکراونەتەوە کە لەم لێکۆڵینەوەیەدا زیاتر بەکارهاتوون بەڵام دەرەنجامەکان رێك وەك ئەوانەن کە لە کتێبەکەی موختاریاندایە و هەروا بوهاریانیش. لەوانەیە ئەوەی موختاریان سەرچاوەیەکی ئەساسی ئەوانی تر بێ کە زانیاریەکانیان لێ وەرگرتووە.

۱۰٤- گۆسۆپیان: The epic story. P ۱۲جیاوازی ناکات لە نێوان شەرکەرەکان و دانیشتوانە ئەرمەنەکەدا، ژمارەی ئەرمەن لە شارەکەدا بە ۲۵۰۰ کەس دەخەمڵێنێ و باس لە ۱۰۰۰ پەنابەری ئەرمەنیش دەکات کە لەسەرەتای بەزمەکەوە هاتنە ناو شارەکەوە.

۱۰٥- History of the ARF جزمی سێ، باسی سەرتاپای هێزە ئەرمەنیەکە دەکات لە ڤاندا.

۱۰٦- کتێبی: Mission at van . p ۲٥ناوهێنانی کتێبی (شەرکەرە مەشق پێکراوەکان) بەتایبەت زۆر گرنگە.

۱۰۷- موختاریان An Account . p ۱۱٦

۱۰۸- هەر بۆ نموونە بروانە ستایشی هەریەك لە (ئالن و موراتوڤ) بۆ شەرکەرە عوسمانیەکان، هەرچەندە جاری وا بووە سەرکردەکانیان لەو ستایشکردنە بەدەرناوە، بۆ نموونە: دەبێ سڵاو ئاراستەی سەری ڤامیشکەین، لە مێژوودا یادی بکەینەوە، بەو پێیەی پڕە لە گیانی ئازایی شەرکەری ترك (ل۲۸٥).

۱۰۹- تێرمیناسیان. ل۲۲۹

۱۱۰- داسنابیدیان دەنووسێ و دەڵێ: ۱٥۰۰۰ - ۲۰۰۰۰ هەزار پەنابەری ئەرمەنی لە ڤانا بوون: History of the ARF جزمی سێ، گرایس کناب لە Mission at van . p ۲٥ دەڵێ: لە گاردندا ژمارەی دانیشتوانی ئەرمەن لە ۲۰ نیسان /ئەپریل گەیشتە نێزیکەی ۲۰۰۰۰ هەزار کەس، دوایی ۱۰۰۰۰

هەزاری تر هاتنە سەرباری ئەو ژمارەیە (ل٣٨). بەپێی موختاریانیش (ل٦٣) ١٠٠٠٠ هەزار جوتیاری ئەرمەن لەتەنیا ڕۆژێکدا ڕژانە ناو شارەکەوە بۆ گەڕەکی گاردن، ئەمە لە ٢٥ نیسان /ئەپریلدا.

وەك دەردەکەوێ ناکرێ متمانە بەم ڤسانە بکرێ، بەڵام خۆ نیشانەن بۆ بوونی پەنابەر و ئاوارەیەکی زۆر لەو گەڕەکی گاردنەدا. بوهاریان (ل ٢٤-٣٦) وای داناوە کە ١٠٠٠٠ هەزار پەنابەر لە لادێکانی دەوروبەری کێوی (ڤاراك)ەوە هاتون و کۆی ئەو پەنابەرانەشی بە دەیان هەزار کەس داناوە.

١١١- بۆ نموونە: ئەو هێزە ٧٠٠ کەسیەی کە لە ٢٢ ئەیلوول/ ساپتەمبر بە پێی سەرچاوەی ئەرمەنی و عوسمانێکان، ویستویانە ڤەڵاکە بگرن، لە ڕاستیدا دەبێ ئەندام وسوێند خۆر بووبن لە تاشناقدا، فیرار و مەشقپێکراو بووب، لە ٢٢ ئەیلوول/ساپتەمبرەوە ئەمانە شارەزا و هەڵبژاردەی ئەرمەنەکانبوون، هەر وەك ئەو هێزە ئاسمانیە تایبەتە بەریتانیەی کە بە (SAS) ناو دەبرا یا (هێزە تایبەتەکان)ی ناو لەشکری ئامریکا (مارینز - ا.ب).

١١٢- ئەفیرە گشتیەکە بۆ چەك هەڵگرتن و شەڕکردن گشت کەسێکی ئەرمەنی دەگرتەوە، بەبێ جیاوازی لە پلە و پایەی کۆمەڵایەتی و ڕەگەز و تەمەنی، شەڕەکە شەڕی گشت ئەو گەلە بوو (تیرمیناسیان: VAN 1915.P229 . ئەوەشی پەیوەندی بە ئەفیرە گشتیەکەی ئەرمەنەوەیە بڕوانە: گۆسۆیان: The epic story. P 29-30 کە وەسفی ئەو شەڕکەرە خۆبەخشانە دەکا و باس لە لیژنەکانی پارمەتیدەر دەکات کە مەسەلەی دابینکردن و چاککردنەوەی چەکیان بەجێ دەگەیاند و بینا و جێگەیان دەستەبەردەکرد. هەتا (دانیال)ی ڤەشەش بەشداری شەڕەکەی دەکرد(ل ٢٥). موختاریان لە : An Account p112 باس لەو ٨٠٠ وەستای بیناسازیە دەکات کە سەنگەر و ڤایمکاریەکانیان لە گاردندا

دروســـتدەکرد، دەڵــێ چــوار یـــەکی ئـــەو چـــەکانە جوتیـــارە پەنابـــەرەکان هاوردیووبیان لەتەك خۆیاندا و بە دەست شەڕکەرانەوەبوو.

١١٣- دو نو گالیس Four years... p ٧٤

١١٤- بڕوانەرە باسی (کۆتاییەکە لە – ڤان -دا) لەم بەشەدا.

١١٥- Turk Harbi. P ٥٩٢، ١٢٠٠ بۆ ١٢٠٠ کومیتادشی کوردی نیشانچی شـەڕکەری چـاك بەتایبـەت لـە دەسـتەویەخەدا، بـەڵام لەشـەڕی سـەربازی دیسپلینیدا کـەڵکێکی ئـەوتۆیان نـەبوو، چونکە نیـزام و دیسپلینیان بـەلاوە نەبوو. دو نو گالیس: Four years... p ٧٥

١١٦- هەر ئەو سەرچاوەیەی پێشوو.

١١٧- فایلی ٢٤٥٦/١٩٥ لـە سمیس بـۆ مـالیێ، ڤـان ١٠ کـانوونی دووو/ یـەنایر ١٩١٤

١١٨- دو نو گالیس: Four years... p ٦٨

١١٩- تیرمیناسیانیش خەملاندنەکەی موختاریان باسناکات کە گوایـە ٤٠ تفەنـگ و ٣٦٠٠٠ هـەزار فیشـەك (بـەو پیاوانـە بـووە کـە تایبـەت لـەلای ئـارام پاسەوانی تایبەتی بوون یان لەژێر فەرمانی سەرکردەیی بـەرگری و دەزگـەی ئردابوون). ئەمە بەدەرە لەو ژمارانەی باسی کردون کـە ٥٠٥ تفـەنگ و ٧٤٨٢٤ فیشەك بووە، وە ٢٠٠٠٠ فیشەکی تریشی باس نەکردووە کـە لـە عـەمبارەکانی یەکیەتی شۆڕشگێڕانی ئەرمەندا بووە (موختاریان: An Account. P ١١٢)

١٢٠- لـە کتـێبی: The epic story. P ١٣ گۆسۆیان لەسـەری دەڕوا و دەڵێ: لـە دواییـدا ٧٠٠٠ فیشـەکی تـر ئرایـە سـەر ئـەو ژمارەیـە، چـەخماخ سـازەکانیان ١٢٠٠٠ هـــەزار فیشـــەکی تریـــان داگرتـــەوە، هـــەر لـــە گەرمـــەی شەڕەکەدا، شەش بۆمبای گەورە و شەشی مامناوەند و چواری بچووکیش لـە دەستدابوو، ئینجا هەر لە گەرمـەی شـەڕەکەدا ٢٠٠ ڕەتڵ بـارود لـە پاشماوەی بۆمبا نەتەقیوەکانی ترك (پووچەڵەکان) کۆکرایەوە. تیرمیناسیان بـاس لـەوە

ئاکات کە لە گوێوە دەستخرابوو بەڵام بڕێکی جیاوازتر باس دەکات: عەمبارە چەکی ئەرمەن لە شارەکەدا زۆر کەمبوو، لە ١٠٠ تفەنگ و ٢١٠ دەمانچەی ماوزەر و ٦٠٠٠٠ هەزار فیشەك زیاتر نەبوو. ل ٢٣٥.

١٢١- فایلی ٣٧٨٣/٣٧١ لە مۆلینو - سیل بۆ لۆدز، ڤان ٤ نیسان/ئەپریل ١٩١٣، فایلی ٢١٣٠/٣٧١ لە سمیس بۆ مالیێ، ڤان ١٠ کانوونی دوو/یەنایر ١٩١٤.

١٢٢- فایلی ٢١٣٠/٣٧١ لە سمیس بۆ مالیێ، ڤان ١٠ کانوونی دوو/ یەنایر ١٩١٤.

١٢٣- مەحاڵە ژمارەی ئەو چەکە دەستیانەی تیرمیناسیان باسی کردون بزانرێ. لەهەقیقەتدا ئەوانە ڕەشاشبوون.

١٢٤- بڕوانە بەشی حەوتەم.

١٢٥- یەکەکانی (بیس) لە لقەکانی سوپای نیزامی (nizam) پێکهاتبوون سەرەرای یەکەی یەدەگیش، دەشبێ وا دانرێن کە کەمتر چالاکبوون لە لقە نیزامیەکانی تر.

١٢٦- بێجگە لە (دروزینا) یەك کەتیبەش لەوێ دایکوتابوو، ڕووسەکانیش شەش کەتیبەی تریان هێنا و دوو بەتالیۆنی قۆزاقیش (ئالن و موراتۆڤ ٢٩٨Caucasion Battlefields. P

١٢٧- Turk Harbi, P ٥٩٢ وە ئالن و موراتۆڤ . ل ٢٩٦ - ٩٩

١٢٩- گشت ئەندامەکانی بەشی دەرەك شەڕیان نەدەکرد، بەڵام لە ئیش و کارەکانی تردا جێی سەربازەکانی سپفدیت بەگیان گرتبۆوە، بەتایبەت لە پاراستن و پاسەوانی گوزەرگەکان کە هاتوچۆی لێوە دەکرا، بەپێی پیلانی عوسمانێکان دەبوایە سەربازەکان ئەو ئەرکەیان ببینیایە، بەڵام لەناو ڤاندا مەشغەڵەتی تریان هەبوو، گەر بکرایە لە شوێنەکانی خۆیان بوونایە لەسەر سنوور، ئەوا بەشی دەرەك دەیتوانی خۆی تەرخانکا بۆ هێزەکەی خەلیل.

١٣٠- ATASE Arsivi (AA) No. ٤/٢٦٧١ .Kls ٢٩٥٠-H .١٣ F .
١ - ١٠٦ H :١٣and F .١ - ١٠٩ Turk Harbi. P .٥٩٢.

ATASE Arsivi . I Dunya Harbi Kolleksiyonu . -١٣١
٧٩ - ٦٧٨Turk Harbi. Pp

٧٩ - ٦٧٨. Turk Harbi. Pp ٣٥ - ١AA.F ٢٩٥KIS -١٣٢

-١٣٣ هەر ئەو سەرچاوەیەی پێشوو.

. ATASE Arsivi. I Dunya ٥٢٤٠. K ٦. D٢٨-١F .٣٠ - ١ -١٣٤
Harbi Kolleksiyonu

-١٣٥ هەر ئەو سەرچاوەیە: ٢. F ٢٠٧. D ٤٤K

-١٣٦ هەندێ سەرچاوەش دەڵێن گوایە ١٢ بەلەم بووە.

-١٣٧ أ.سوسلو، ج. ئوگونەت. سەردار،

Vn, Bitlis, Mus ve Kars`taki Ermeni Katliam;ari van Yuzuncu Yil Universitesi 1994. p 20 ئەنکەرە:

Ermeniler Tarafindan Yapilan Katliam Belgeleri (1914- 1919) Basbakanlik Devler Arsivleri Genel کتێبی

یەکەم، ئەنکەرە:

Mudurlugu, Osmanli Arsivi (Daire Baskanligi. 2001)

. AA ١٦٢ - ١. F ٦٧٨Turk Harbi. P -١٣٨

-١٣٩ ئالن و مۆراتوڤ: ٧٨ - ٦٧٧Turk Harbi. Pp

٢٠٠٥. ٢. ATASE Arsivi: ٢٨٢٠. K ٦٩. D - A ٧١ - ٢F -١٤٠

-١٤١ هەر ئەو سەرچاوەیە.

-١٤٢ سەبارەت بە جموجۆڵی سەربازەکان، بڕوانە ئەو وەصفە دوورودرێژەی وا لە : ٨٨ - ٦٧٦Turk Harbi. Pp

وە پوختەکەشی کە وا لە کتێبی ئالن و مۆراتوڤ دا ل ٢٩٩ - ٢٠١

ATASE Arsivi.I Duniya Harbi Kolleksiyonu. K. ١٤٣
٦٢-١. F ١٤D - ٢٩٥٠

-١٤٤ ئۆراس: ٨٦٣The Armenians in History. P

١٤٥- ٢٠٠٢ دۆلارى ئامريكايى، ئەمە بە پێى هاوكێشەى (كۆى ئەنجامى تاكە يەك كەس لەناوخۆدا) حسێبكراوە، لەوانەيە هاوكێشەى حيسابى تر بمانگەيەنێتە برى پارەى زۆرتر يا كەمتر:

http://eh.net/hmit/saknesIV/History/Money.

//:http htmwww.roots - 9

١٤٦- ATASE Arsivi, K ١٤٨٨ F. ٢ - ٥

١٤٧- بە ئاشكرا دەركەوت كە ئەو پشێوى و ئاژاوانەى عەشايرەكان لەناو خاكى عوسمانيدا دەياننايەوە، گشتيان لە بەرژەوەندى رووسيا بوون، بەلام ئەوە بە زەحمەت دەزانرێ كە ئاخۆ رووسيا چۆنچۆنى سوودمەند ببوو لەو پشێوى و ئاژاوانەى ناو ئێران. بەزۆريش ئەوانە لە ناو پلانەكانى رووسدا نەبوون. بڕوانە ئالن و مۆراتوڤ. ل ٢٩٥.

١٤٨- بگەڕێوە بۆ باسى (ڕەوشى سەربازى ناوچەكە) لە سەرەتاى ئەم بەشەماندا.

١٤٩- ئالن و مۆراتوڤ ليستێكى ١٢ بەشى لە رۆژەلاتدا دەخەنەڕوو، بەلام ژمارە فيعليەكان زۆر لەوە نزمترن كە ئەم قسەيە بۆى دەچێ، بۆ زانينى تيلاييەك لە گۆڕان و پەرەسەندنى هێزى عوسمانى لەدواى سەرى قاميش بڕوانە: TURK HARBI. PP ٥٣٩ - ٨٤

زانيارى دەربارەى ژمارەى هێزەكانى عوسمانى زۆر ناديار و تەمومژاوى بوو، بۆيە هەر ژمارەيە بگوترێ تا رادەيەكى زۆر تەنيا خەملاندن و تەقريبيە، مەحالە ژمارەى سەربازە غەيرە نيزاميەكان بزانرێ بە ئەفرادەكانى عەشايرە كوردەكانيشەوە.

١٥٠- بڕۆرەوە بۆ سەر بەشى نۆيەم لەم كتێبەدا.

١٥١- هەروەها.

١٥٢- ئالن و مۆراتوڤ. ل ٢٩٩

١٥٣- كورگانۆڤ لە كتێبى: Lapurticipation des Armenians a

٣١ la Gucre Mondiale, p

باس لەو سوودە گەورەیەی چاوەڵخەرە ئەرمەنەکان دەکات کە بە سوپای رووسیان گەیاندووە.

١٥٤- ئەم ژمارەیە ئەو ٢٠٠ پیاوە دەگرێتە کە لە ڤانەوە رەوانە کران، ژمارەی رووس و عوسمانێکان تەقریبیە، ئەو تەلەفیاتانە ناگرێتەوە کە لە شەڕەکاندا لێیان دەکەوت.

ATASE Arsivi. I. Dunya Harbi Kolleksiyonu. -١٥٥
٧ - ٢ .F ٦٩. D.A – ٢٨٢٠K-

١٥٦- عەبدولقادر بەسەرکردەی سوارەی عەشایرەکان دانرا، نێزیکەی ١٨٠٠ هەزار کەسێك دەبوون، ئەمانە هەر لە ئەفیرەکەی پێش جەنگەوە هاتبوونە ژێر چەکەوە و لە ڕیزدا بوون، چاودڕوانی ژمارەی تریشیان لێ دەکرا کە بێن و چەك هەڵگرن.

١٥٧- بە پشتبەستن بە ڕاپۆرتی جاسووسە ئەرمەنەکان و پاش ئاگابوون لە ڕەوشی ڤان، ژەنراڵ (یۆدنیك)ی رووسی بڕیاریدا کە باری ئەو شارە برەخسێنێ. لە مانگی ئادار/مارسەوە چوار بەتالیۆنی (دروزینی) ئەرمەنی لە بایازید مۆڵدرابوون، یودنیك کە هێزەکەی بریتی بوو لە نیشتیمانیە توندڕۆو بەهێزەکان، لیوای (ترانسبیقالیا)ی قوزاقی خستە سەر کە ژەنراڵ (تروخین) سەرکردەیانبوو، جا ئەم ئەفسەرە فەرمانیدا بە تێپەڕین بە دەربەندی (ئالا داغ)ی تاباریزدا و پێشەوە چوون ڕووە و (بگریکالە)و (ڤان). (ئالن و مۆراتوڤ ل ٢٩٩).

# بەشی نۆیەم
# کوشتار و کاولکاری لە ڤان

کوشت و کوشتاری بە کۆمەڵ و کاولکاری لەو کاتەوە لەشاری ڤاندا دەستی پێکرد کە یاخیبوونی ئەرمەنەکان سەریهەڵدا[1]، خۆ بەر لەمەش کوشتن شتێکی سەیر نەبوو لەو شارەدا بەڵام لە سایەی یاخیبووندا بووە درندەیی و وەحشیگەریەکی بێوێنە، دوای کەمێ لە بەرپابوونی، شۆرشەکە سیمایەکی تایفەیی لەخۆگرت، وەك جاران ململانێی نێوان شۆرشگێران و دەوڵەتی عوسمانی وە یان لەنێوان شۆرشگێران و عەشایرە کوردەکاندا نەبوو.

سیاسەی شۆرشگێران کە درێژەی کێشا و بەری خۆیشی هەبوو، لەسەر بنەمای جیاوازیکردن بوو لەنێوان دوو تایفە و هەتا لەنێوان دوو کۆمەڵ لەسەر ئاستێکی جوگرافی، بە پاڵپشیا سیاسەی کۆکردنەوەی دانیشتوانە ئەرمەنەکان، رێك وەك لە (رێنماییەکانی بەرگریکردن لەخۆ)دا هاتبوو، بەدویدا زنجیرەیە پەلامار و دژە پەلامار، کوشتار و دژە کوشتار.

وەك لە رۆژانی یاخیبوونی یەکەمدا پێشبینی دەکرا، خوێنرشتنەکە زۆرتر لەو شوێنانەدا بوو کە شۆرشەکە تیایدا گەرم و گوربوو، وەك: ناوچەکانی بشکالە – دیر - جاتاك – غیفاش و هفاسور. سەرەتا پەلاماری بنکەکانی دەرەك دەدراو دوایی گوندەکانیش، بنکەکانی دەرەك ئامانجی ئاسانبوون، بەزۆری ٥ یان ئەوپەری ١٠ پیاوی تێدابوو بە چەکی سووکەوە[2].

کە ئەو دەرەکانە دەنێرران بۆ گرتنی سەربازی تازە یان گرتنەوەی

فیرارەکان، یان کۆکردنەوەی باج لە ئەرمەنە لادێییەکان، ناوە بەناو ورەوور و وردە شەڕ دەقەوما، چەکی دەستی ئەرمەنەکان تفەنگ و دەمانچەی ئالی و نارنجۆك و دینامیت بوو، لە گوندە موسوڵمانەکانیشدا نارنجۆك بەکاردەهات[٣].

لەبەرامبەر ئەمەدا هێزەکانی دەوڵەت لە بەکارهێنانی هێزی قورسدا ئەدەمپرنگانەوە بە کاولکردنی خانووی خێزانە فیرارەکانیشەوە. یان تدواوی ئەو گوندانەی بەشداری هەڵگەڕانەوەکەیان لە حوکمەت دەکرد، ئەنجامی ئەم شەڕ و پێکدادانانەش کوشتن و لەناوچوونی ژمارەیە لە پیاوەکانی دەرەك و شۆڕشگێران و گوندنشینانی موسوڵمان و ئەرمەنەکانبوو[٤].

کوشتارە گەورەکانی یەکەمجار لە موسوڵمانە مەدەنییەکان کە لە سەرەتای جەنگدابوو کاتێ ڕویاندا کە ڕووسەکان ناوچەکانی بشکاولە و دیر و سارایان گرت[٥].

لە تشرینی دوو /نۆڤامبری ١٩١٤ بەر لەوەی ڕووسەکان بێن و پامالّی دەڤەرەکە بکەن، هێزە کەمەکانی عوسمانی لەو ناوانە کشانەوە، تاقم و دەستەی یاخیبووی ئەرمەنەکانی ناوخۆ و ئەوانەشی لە ئێرانەوە هاتبوون کەوتنە پەلاماردانی گوندی کوردەکان و دانیشتوانی دیر و بشکالە[٦]. لە گەلێ گوندی دنگیرکراو پەلامار و دەستدرێژی بەکۆمەڵ دەکرایە سەر نافرەتەکان، ئێرینەکانیش گشتیان دەکوژران، شارەکانی (دیر، بشکالە و سارای) تالان و برۆ و کوشتنی زۆریان بەخۆوە دی.

ئەم ڕوداوانە نموونەن بۆ ئەوەی بزانی لە ناوچەکانی تریشدا چی قەوماوە، سەرەتا بەرپرسان و سەرباز و دەرەك دەکوژران، ئینجا دزی و تالانکردن دەستی پێ دەکرد، گفتیان دەدا بە موسوڵمانەکان کە ئەگەر دەستبەرداری پارە و ئەختینەکانیان ببن ئەوا دەستیان بۆ نابرێ، بەڵام گفت و بەڵێنێکی ئاوا بە دەگمەن دەبرایە سەر. گەنجەکان کە لە تەمەنی ئەوەدابوون دەستیان چەك بگرێ دەکوژران بەڵام ژنەکان لاقە دەکران. لە

گوندێکی گەورەی نێزیک بە سارای خەڵکەکەی ڕاپێچی ناو مزگەوتەکەی کران و دوایی ئاگریان نا بە مزگەوتەکەوە و ئەوانەشی تێیدابوون، بە تەواوی ژمارەی ڕزگاربووانی ئەو بێویژدانیە نازانرێ بەڵام هەرچۆنێبێ درندەیی ئەوانە پیشاندەدات. هەر بۆ نموونە: لە یەك لە گوندەکانی دیر زیاد لە ٤٠٠ کچ و ژن پەلاماردران و لاقەیان کرا.[٧]

خۆ کە لە کانوونی یەك/ دیسامبری ١٩١٤ ڕووسەکان لە دیر و بشکالە کشانەوە زوربەی دانیشتوانە ئەرمەنەکەی لەگەڵ سەربازە ڕووسەکان هەڵاتن و لە ترسی تۆڵەسەندنەوە لێیان چونە ئێرانەوە، ناهەقیشیان نەبوو، چونکە ڕووسەکان هەرچی بینا و فەرمانگەی دەوڵەتە بەر لەوەی بڕۆن کاولیان کرد، عەشایری کورد و مەدەنی ناوخۆ ژمارەیەکی زۆر لەو ئەرمەنانەی مابوونەوە یان هێشتا لە ڕێگەدابوون گۆشا و گۆش سەردیان دەبڕین[٨].

لە شەڕەکانی سەر سنووردا ئەرمەن و موسوڵمانێکی فرە تیاچوون. قەت جیاوازی نەکراوە لە نێوان شەڕکەرێك و کەسێکی مەدەنیدا کە بێ چەك بووە و تاوانی نەبووە. زوربەی ئێرینە، ئیتر لە هەچ لایەکبێ چەکداربوون و لە شەڕکردندا بەشداربوون، ئەوانەش کە نەیاندەتوانی شەڕ بکەن ئەوا لەناو تەڤوتۆڤدا پێوەدەبوون و دەبوونە قوربانی. بۆ نموونە: لە تشرینی دوو/ نۆڤامبری ١٩١٤ کە ڕووسەکان لە (دیر) کشانەوە، ئەرمەن سەنگەریان لێ دا و ڕۆژێکی تەواو بەر لەوەی بکشێنەوە ناو ئێران بەربەرەکانی سەربازە عوسمانیەکانیان کرد[٩].

هۆکاری پشت ئەم پەلامار و دەستدرێژیانە بەزۆری لە مەبەستە شۆڕشگێریەکانی تێپەڕاندبوو، بەشێکبوو لە پلانی مەچەك ئەرمکردن کە سوپای ڕووس دایڕشتبوو، چونکە کە ئاوارە و پەنابەرانیان دەکرد سەر ڕێگە و بانەکان ئیتر ئیدارەی هەرێمی ڤان شپرزە دەبوو و دەشێوا، دەرسان ناستەنگێکیشبوون لە سەرەڕێی جموجۆڵە سەربازیەکاندا[١٠].

هەتا یاخیبوونەکە درێژەی بکێشایە ئاستی کاردانەوەی عوسمانێکانیش بەرزتر دەبۆوە. بە کۆتایی شوبات/ فەبرایری ١٩١٥ لە زورمبەی ناوچەکانی هەرێمەکە دەرەك و چەند یەکەیەکی بچووکی سەربازی لە شەڕدابوون، بە تایبەت لە (جاتاك، هافاسوور و تیمار)، بیناکانی دەوڵەت داگیردەکران و چی گوندی موسوڵمانانبوو دەسووتێنرا و خەڵکەکەشیان دەکوشت[١].

عوسمانێکان لەو شەڕانەدا سەرنەدەکەوتن، بەوەدا کە ژمارەیەکی زۆر لە دەرەکی گەرۆکی ڤان دەنێررانە جاتاك و دوایی بۆ ڤان، ئەمانە لەتەك سەربازەکانی ڤاندا توانیان دەستگرن بەسەر شۆڕشی هافاسوور و تیماردا، هەرچەندە قەتاوقەت عوسمانێکان نەیانتوانی شۆڕشەکەی جاتاك یان ئەوەی پاڵ سارای دامرکێننەوە، گومانی تێدا نییە کە ئەو شێوازەی سەربازەکان گرتبوویانە بەر وەحشیانەبوو، بە دەستووری شێوازی شۆڕشگێڕەکان.

## • مەبەستەکان

سەرچاوە ئەرمەنیەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە گشت دەستدرێژوییەکانی عوسمانیەکان بۆ سەر ئەرمەن لە خۆڕا و بێ بیانووبوون، چونکە هیچ یاخیبوونێك لەئاواندا نەبوو تا ئەوە بکەن، ئەم سەرچاوانە وا وەسفی ئەوە دەکەن کە ڕویدا گوایە تەنیا پەلامارو شاڵاوی ڕوتبوون بۆ سەر ئەرمەنەکان و هیچی تر.

شەڕەکەی ئەرمەنیش تەنیا بەرگریکردنێك بوو لەخۆ.

عوسمانیەکان سووسە و چرپەی شۆڕشێکیان بیستبوو، لە بەڵگەنامە و نووسینە نهێنیەکانیشیاندا دیارە کە باس لە خۆئامادەکردنی ئەرمەن دەکەن بۆی، تەنیا کەسێك باوەڕ بەوە دەکات کە عوسمانیەکان درۆیان لەگەڵ خۆیاندا دەکرد و خۆیان دەخەڵەتاند کە بیگوتبا شۆڕش نەبوو و هەقیقەتێکی واقیعیش نەبوو. جگە لەمەش وەسفکردنی هێرشەکانی

عوسمانیـان بـۆ سـەر ئەرمـەن کـە بـە (کوشـتارێکی شـێتانە) دادەنـرێ لـەو بۆچوونەوەیە کە : سووك و ئاسان بڕیاریانـدابوو بەهـەر نـرخێکبێ و هـەر چۆنێکبێ ئەرمەن قڕکەن و قەلاچۆیانکەن. لەکاتێکدا ئەم بۆچوونە لـە هـیچ بەڵگەنامەیەکی عوسمانیەکاندا نەبوونی هەیە و نە ڕەنگی داوەتەوە.

یـان دەگـوترا کـە: بـەرەی شـەڕەکان زۆرموحتـاجی سـەربازبوون کەچـی ئەوان لەباتی ئەمە ڕاوە ئەرمـەنیان پـێ دەگـردن. کـە پەیوەنـدیـەکی تونـد و بـەهێز لـە پشـت بـەرەکانی شـەڕەوە گـەلێ پێویسـتتر بـوو، ئـەوان شـەڕێکی نـاوخۆیی وایـان هەڵگیرسـاند کـە گـەورەترین زیـانی پـێ گەیانـدن، کـورت و پوخـت گـەر بمانـەوێ بـاوەڕ بـە سەرچـاوە ئەرمەنیـەکان بکـەین دەبـێ وای دانێین کـە ئەولەویـەتی عوسمانیـەکان ئەرمـەن قـڕان بـووە هـەتا ئەگـەرەکو جەنگەکەش بدۆڕێنن. ئەمەش شتێکە بێ ماناو دور لە لۆژیکە.

لـە سەرچاوە ئەرمەنیەکانـدا و لـەو ڕاپۆرتانـەی کـە بـاس لـە کوشـتاری ئەرمەنـەوە دەکـەن، ئـەو بۆچـونەیان تیـا زاڵـە کـە گوایـە عوسمانیـەکان خوێنڕێژێکی دڵڕەقو بێ بەزەیین[٦٦]. هێزە عوسمانیەکان بەوە تاوانبارن کە لە پێنج ناوچەدا ئەرمەنە بێ وەیە بەوەفاکانیان سەر بڕیوە: هافاسوور، تیمـار، بشکالە، جاتاك، سارای. بەڵگەنامـە عوسمانیـەکانیش بەتایبـەت ئـەم ناوچـانە بەوە دەدەنە قەڵەم کە بنکە و قەڵای یاخیبووەکان بوون.

بـەپێی ڕوونکردنـەوەکانی عوسـمانی یەکـەم کـەڕەت کـە ئەرمەنـەکان یـاخیبوون دەسـتیانداوەتە کوشـتنی بەرپرسـان و پیـاوانی دەرەك و لادێییـە موسـوڵمانەکان، پاشـان سـەرباز و دەرەك بـە پـەلاماردانی ئـەوان وەڵامیـان داونەوە.

دەقە عوسمانیەکەی ئەم چیرۆکە هـەر تـەنیا بـە بەڵگـەوە نییـە، بـەڵکو لۆژیکیشە و کارەکانی فیرقەی دەرەکی گەڕۆك ئەمـە دەسـەلمێنن. وا بڕیـاربوو ئەم فیرقەیە لە شەڕەکەی (خەلیل پاشا)دا لەناو ئێران بەشـدار بـن، بـۆ ئـەو

شەڕە زۆریش پێویستیان بەم فیرقەیە بووە، بە نەچوونیان شەڕەکە بە بارێکی تردا دەشکایەوە. دەوڵەت بەشێکی زۆری ئەم فیرقەیەی نارد بۆ جاتاك، بەڵام تا ئەو ڕاستیە نەسەلێنرا کە یاخیبوونێك سەری هەڵداوە فەرمانی چوونەکەی بۆ نەهات. سەرچاوە ئەرمەنیەکان خۆیان ئەومیان گەیاندروە کە پەلاماری عوسمانیان لە (هافاسوور، تیمار) لە ١٩ نیسان/ئەپریل دوای ماوەیە لە دەستپێکردنی یاخیبوونەکە دەستی پێکرد، بەر لە شۆڕش لە شاری ڤان بە ڕۆژێك.

لە واقیعیشدا وبە پێچەوانەی ئەوەی سەرچاوە ئەرمەنیەکان دەیڵێن، زوربەی پەلامارەکان لە هافاسوور و تیمار پاش چەند ڕۆژێك بوون لە دەستپێکردنی شۆڕشی ڤان. یانی کە دەرەکەکان گەیشتبوون. بێگومان عوسمانێکان ویستوویانە پێشتر لەمە بەگژ یاخیبوواندا بچنەوە، بەڵام ئەوەندە سەربازیان بە دەستەوە نەبووە.

ئەگەر عوسمانێکان بە گژ شۆڕشگێراندا چووبنەوە ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە ژمارەیەکی زۆری ئەرمەنی بێ تاوان تیا نەچوون، دەبێ تۆڵە سەندن و رق و کینە و ددان بەخۆدا گرتن گشتی کاریگەر بوون بۆ سەر سەربازەکان هەر وەك چۆن بۆ سەر یاخیبووەکانیش هەروا بووە، دیارە ئەرمەن لەدەست سەرباز و عەشایرە کوردەکان هەڵاتوون.

## • پامالکردن

پەنابەرە ئەرمەن و موسوڵمانەکانی یەکەمجار لە ڤاندا، هەر لایە و لەدەست ئەویدی ڕایکردبوو، جا بە بەراورد لەگەڵ ئەوانەی دواتر ئەمان مەسافەیەکی تا ڕادەیە کورتیان بڕیبوو، هەر کامیان هەوڵی بوو بچێتە ناوچەیەکی نارامەوە، ئەرمەنێکی زۆر کەوتبوونە ئێرانەوە و لەوێ پەنابەر بوون، ئەمانە هی سەرەتای جەنگەکە بوون کەمێ بەر لە هەڵگیرسانی شۆڕش

لە ڤان، ئەو کاتەی کە ڕووسەکان کشانەوە و عوسمانێکان لەناوچەکانی بشکالە، دیر و سارای یاخیبووانیان تێکشکاند. موسوڵمانەکان ناچارکران پەنا بۆ شارەکە و ئەو گوندە ئەرمەنانە بەرن، ئەمەش لەترسی ئەو یاخیبووانەی سەرو وکەرتی تیمار و خوارووی هافاسوور[13].

کە دەرەکەکان گەیشتنە ڤان ئەرمەنەکان ناچار لەو کەرتانە چوونەدەر، ژمارەیەکی زۆریان پەنایان بردە بەر ئەو بەشەی شارەکە کە بەدەست یاخیبووەکانەوە بوو، بەشێکی تریش هەڵاتنە لاپاڵەکانی کێوی (ئیریك)، زۆرێکیش بەهۆی ئەو شەڕە دوورودرێژانەوە دەربەدەر بوون. تا حاڵی حازر ژمارەی ئەم ئاوارە و دەربەدەرانە نازانرێ. بەڵام بەگەڵێ شێوە دەخەمڵێنرێ و ژمارەکان تا رادەیە کەم دەکەن یان پێچەوانەی یەکتر دەکەونەوە.[14]

بە پێشڕەوی سوپای ڕووس و کشانەوەی عوسمانێکان، ژمارەیەك لەو ئەرمەنانەی تا ئەو کاتە بەشداری شەڕیان نەکردبوو و دوایی چووبوونە ناو تاقمە شەڕکەرەکان و لەو هێرشانەدا بۆ سەر موسوڵمانەکان بەشداریان کرد. لە (بارگیری) گوندە موسوڵمانەکان لە لایەن تاقمە ئەرمەنی ناوخۆ و ئەوانەی پێشتر لەگەڵ سوپای ڕووسدا هاتبوون، دوچاری پەلامار و شاڵاو بوونەوە. ئەو موسوڵمانانەی کە لە بارگیریەوە نێزیکتربوون، هێند نەیانپەرژا تا هەڵبێن، جا بە قسەی ئەوانەی توانیبوویان ڕاکەن، لەو ئانەدا سێ سەد گوند کاولکرا و خەڵکانێکی زۆریش تیاچوون. ڕاکردووەکان بەرەو خوار لە ڕێگەدا پەلاماردران و لاشەی کوژراوەکان بە درێژایی ڕێگەکە کەوتبوون[15].

هەر بەو حاڵە موسوڵمانە گوندنشینەکان کە لە سەر ئەو هێڵەوبوون ڕووس و ئەرمەنی پیا تێدەپەڕی تووشی زیانێکی وابوون کە بەسەر هەر گوندێکدێ کە سوپای دوژمن پیا تێدەپەڕێ: دەستدرێژی بۆ سەر ناموس،

تـالان و بـرۆ، مـاڵات زەوتکـردن، خـواردن سـەندن و کوشـتن بـۆ ئـەوەی سەرپێچیان دەکات، وەك باسدەکرا ئەو ئەشکەنجانە لەوەیان تێپەڕاندنبوو کە لـە شـدڕدا ڕوودەدەن. هێـرش بـۆ سـەر لادێییـەکان و پەنابـەران وەك بەرەنگاربوونەوەی سەربازی نەبوو، بەڵکو دەهاتە سەر قـەتڵوعام، پەنابـەران هـیچ جۆرە ئەسـبابێکی بـەرگریکردنیان نـەبوو، پیاوانیـان زوربـە لەبـەرەی شەڕدا بوون ئەوانەی تر بەساڵاچوان بوون لەگەڵ ئافرەت و منـاڵ. کـە گشت ئەمانە پەلامار دەدران مناڵەکانیش بەدەر نەبوون لە دەستدرێژی[16].

بـە پێـی هـەواڵ و قسەی ئـەو لادێییانـە قـۆزاق و دەسـتە ئەرمەنیـەکان دیارترین دەستدرێژی کەرێکبوون، ئەشکەنجە و لاقـەکردن دوو کـاری ئاسایی بوون، پاشـان کۆمـەڵکوژی. لەگـەڵ ئەمەشـدا هەنـدێ تـەنیا برینـدار دەبـوون هەشبوو هەڵدەهاتو دەیدایە گرد و بەرزاییەکان، دوایی چـی بـە چـاو دیبـوو دەیگەیاند[17]. وەك سەرنج دەدرا (سوربین) ناوێك کـە لـە بایەزیـد سـەرکردەی یەك لەو دەستە ئەرمەنانە بوو، زۆر کەڕەت ناوی دەهێنرا.

## * شاری ڤان

کـە مـانگی ئـەیار/مایۆ داهات، ڕووسـەکان شـوێنە گرنگـەکانی هـەرێمی ڤانیان گرتبوو[18]، بەڵام بەشێکی زۆر لە لادێکانیـان بەدەسـتەوە نـەبوو، لـەژێر چنگی دەسـتە و تاقمە ئەرمەنـەکاندا بوون، ناوبەناو دەوریـە قۆزاقەکانیشیان لەگەڵدا دەگەڕان.

ئەرمەنەکان حوکمەتێکیان بە سەرکردەیی ئارام مانوکیـان لـەو هەرێمـە ڕووسیاییە نوێیەدا پێکەوەنا. بەڵام عەمر کورتبوو[19]. لـە ١٦ ئـەیار/مایۆ تـا ١٨ هەر ئـەو مانگـە لـەناو خانووی موسوڵمانەکان و بینـای فەرمانگەکانـدا چـی کەلوپـەلێ مـابوو شـڕەخۆر بردیـان و ئینجـا سـوتاننیان[20]. ژمارەیـە لـە بەساڵاچوان و منـاڵ نـەبێ نێرینەی موسوڵمانەکان و زوربەی ئەو ئافرەتانـەی

لەشارەکەدا گلیان خواردبۆوە کوژران[٢١]. ئەوەی رزگاری ببوو، کە زۆریان ئافرەتبوون، وردەکاری کوشتارەکانیان دەگێرایەوە و باسیان لە کوشتنی کەس و ئاسیاویان دەکرد، تیرۆرکردنی کەسێتیە ئایینی و لێپرسراوەکان[٢٢].

وەك زنجیرەیە رووداو کارەساتەکەیان دەگێرایەوە: هەر نێرینەیەك لە ژوور ١٨ ساڵەوە (جگە لە بەساڵاچووان) و هەرزەکار لە ئافرەتەکانیان جیادەکردنەوە و بەجیا جیا و بەشێوەیەکی درندانە دەیانکوشتن. هەندێ ئافرەت و منالێش لەگەڵ پیاوەکاندا جاروبار دەکوژران، هەندێکی تریان لاقە دەکرد، ئەوانی دی سەرگەردان لەنێو داروپەردووەکانی ماڵە رووخاو سووتاوەکاندا بەرەڵلادەکران، بەگوێرەی چەند بەلگەیەکی دیاریکراو دەشێ هەندێ لەوانە لەلایەن ئەرمەنەکانەوە جۆرە یارمەتیەك درابن[٢٣].

کە رۆژانی سەرەتای سەرکەوتنی ئەرمەن تێپەری، ئەو دانیشتوە موسوڵمانانەی مابوونەوە، لە ئافرەت و منالێ کەنەیانتوانیبوو رابکەن یان بە منالی وردەوە گوندە سووتاوەکانیان جێهێشتبوو لەناو شاردابوون، هەندێ لەمانە پەنایان بردبووە بەر مەڵبەندی نێردراوە ئامریکاییەکان، لە ترسا و بۆ شتێکیش کە بیخۆن، ئەرمەنەکان هەندێکی تریان دەبردنە بنکەیەکی ئامریکایی و لەوێ شتێ خواردنی ئەوتۆیان دەدانێ تا لە برسا نەمرن،جاروباریش کەمێك گاڵ یان هەرزن کە رووسەکان لەتەك خۆیاندا هاوردبوویان. بەلام ئەم بنکەیە بەتەواوی ئەمین نەبوو، بەهۆی درم و نەخۆشیەوە مردن لەناو برینارەکانیا زۆربوو، ئەرمەن و قۆزاقەکان دەچوون ئەو ئافرەتانەیان لەو بنکەیە دەفراند و لاقەیان دەکردن و هەندێکی تریان بە منالەوە دەبرد و دەیان کوشتن، ئافرەتی وا هەبوو بە منالەوە لە بنکەکە دەهاتەدەر، وایان دەزانی لە جادە وبانەکانی شاردا سەلامەتتر دەبن، بەلام تاقمە ئەرمەن خۆیان بۆ دەنانەوە. ئافرەتێکی زۆر برانە بنکە ئالمانیەکە، بەلام رەوشی ئێرە خراپتربوو، بەدەر نەبوو لە دەستدرێژی و لاقەکردن و برسێتی، لەولاتر ئافرەتی وا هەبوو دوو مانگبوو لە بنکە ئامریکاییەکە

مـابۆوە تـا ئـەو كاتـەی عوسمانیـەكان هاتنـەوە و دەسـتیان گرتـەوە بەسـەر شاردا[٢٢].

سەرەڕای ئـەو پـەلامارە بـۆ سـەر ئەوانـەی لـەو كارەساتە ڕزگار ببوون، بەگەیشتنی ڕووسەكان ڕەوش و باری شارەكە باشتر بوو، ئـارام مانوكیـان كـە دەمێكبـوو ملكەچـی ڕووسـەكانبوو و كلكەلـەقێی بـۆ دەكـردن ڕێگەیانـدا تـا حوكمی شارەكە بكـات، بەمـەرجێ دەسـتەلاتی سـەرەكی بەدەسـت دەسـتەلاتی ڕەهای سەربازی ڕووسەوە بێ، لـەوەی دەكـرد كـە ڕووسـەكان هەوڵـدەن بـاری شارەكە هێـور كەنـەوە، هـەتا وپستیشـیان كـە پەنابـەرە موسـوڵمانەكان بـەوە قایلكەن تا بگەڕێنەوە ناو شارەكە، ئەمەش لەجێی دەستەبەركردنی خـواردن بۆیان.

جا هەرواشبوو، ژمارەیە ئافرەت و پیاو گەڕانەوە، ئەو گەنجانـەی كـە لـە شـار مابوونـەوە نـەمابوون. بـەلام بـە گەیشـتنی ڕووس كوشـتاریان وەسـتاند، منداڵ و ئافرەتەكان بە سایەیانەوە ڕزگاربوون. ئەم هەڵوێسـتەی ڕووس دەشـێ بدرێتە پاڵ هەستێكی مرۆیی هاوبـەش بـەلام دەشـبێ مەزنـدەی ئەوەشـی بـۆ بكرێ، وەك دوایی دەركەوت، كە ئەوان نەیان دەویست شـارەكە تـەنیا بـریتی بێت لە ئەرمەن، ئەمە لەگەڵ ئەو سیاسەیەیاندا گونجاو بـوو كـە دەیانویسـت قان بكەنە شارێكی ڕووسیایی نـەك ئەرمەنی.

ئیـدارە تازەكـە بـەرەوڕووی كۆسـپ وتەگەرەیـەكی دژوار  ـۆوە، بەشێكی زۆری شار كاولبوو، ئەوەی مابۆوە ئەرمەنی سەركەوتوو سوتاندبوویان. درم و دەرد و نەخۆشی داگەوتبوو، بەتایبەت تیفۆس، بەلام برسێتی نەببووە كێشە، وردەكاری ژمارەكان لەبەردەستدا نییە بەلام سی هەزار ئەرمەن لەشاردابوون، خەڵكی ئاتاجی جێگە و ڕێگەبوون، لەولاشەوە لەشكری ڕووس بـەزۆر دەسـتی بەسـەر خـواردنی خەڵكەكـەدا گرتبـوو تـا بـۆ خـۆیی مسـۆگەركات، بـەلام وادیاربوو خواردن بۆ هەمووان هەبوو.

## • لادێکان و پەنابەران

لە پامالگردنەکەی ڕووسدا، دوای ئەوەی شاری ڤان گیرا، ئەرمەنەکان ئەمایاری ئەوەبوون هەرێمەکە لە موسوڵمانەکان پاککەنەوە، هەرچەندە خەڵکێکی زۆر هەڵاتبوو بەڵام لە لادێکاندا ژمارەیەکی زۆر موسوڵمان مابوونەوە ، خێرایی هاتنە پێشەوەی ڕووس و ئەرمەن پەلامارەکانی بۆ سەر ئەو گوندانە کەم کردبۆوە، بەڵام هەر کە هەرێمەکە کەوت ئیتر ئەو پەلامارانە زیاتر و ڕێکوپێکتر بوون و بە پرۆگرامێکی دیاریکراو بەڕێوەدەچوون:

سەربازە نەخۆش و برینارە موسوڵمانەکان بەسەر گوندەکاندا دابەشکران تا چاك بنەوە، ئەوانەی کە لە یەکەکانیان دابڕابوون دیسان ڕووە و گوندەکان دەبوونەوە، هەندێکیشیان ئارەزومەندانە وازی لە سەربازیەکەی هێنابوو، زوربەی کەڕەت ئەمانە و لێپرسراوان و پیاوە ئایینیەکان بەر لە هەمووان دوچاری کوشتن دەبوونەوە ٢٥، نێرینەیەکی باڵغی لادێیی وگەنج و پیاوێك لەکوێ ببینرانایە دەکوژران[٢٦]. دوایی لە هەندێ گوندا ئافرەتەکانیش دووچاری لاقەکردن دەبوونەوە یان دەکوژران، گوندی واش هەبوو تەنیا تاڵان دەکرا و ئافرەتەکان بە ڕێگە و بانەکاندا بەرەڵڵا و سەرگەردان دەکران، دەبوونە پەنابەر، پەلامارەکان بەمجۆرانە بەپێی خواست و ئارەزووی سەرکردە ئەرمەنەکانبوو[٢٧].

وەك دەردەکەوێ سوپای نیزامی ڕووس زۆر کەم بەشداری لەو دەستدرێژی و شڕەخۆریانەدا کردووە، هەرچەندە هەندێ لادێیی و بەرپرس باس لە جۆرە پەلاماردانێکی قۆزاقەکان دەکەن کە بە هەماهەنگی لەگەڵ ئەرمەنەکاندا دەیان کرد.

دانیشتوانەکەی باکووری شارەکە وا بە ئاسانی نەیاندەتوانی ■ داگیرکارە

ڕووسەکە و تاقمە ئەرمەنیە هاوکارەکانیان هەڵبێن، گوندنشینان هەر کە دەیانبیست وا ڕووسەکان نێزیک بوونەوە گورج هەوڵی ڕاکردنیان دەدا، بەڵام کاتی ئەوەندەیان بەدەستەوە نەبوو ■ بەر لە گرتنی بەشاری ڤاندا تێپەڕن. دوای ئەمە ڕێگەی دەربازبوونیان لێ گیرا، لەسەرو خوارەوە ئابڵقووقە دران، ئیتر ئەم گوندانەش پڕبوون لە پەنابەری ناوچەکانی ئەوپەڕی باکوور کە واهاتبوون بەو هیوایەی بە ڤاندا هەڵبێن[28].

لە شەڕێکدا کە تاقمە ئەرمەنەکان: ئەوانەی ناوخۆ و دروزینی و ئەو ئەرمەنانەی لە باشووری قەفقاسەوە هاتبوون، گشتیان پەکیان گرتبوو و تیایدا مەدەنیەکی زۆر سەربڕران و ئەو گوندانەی سەرو ڤان زۆرترین خەڵکێکی لێ کوژرا. لە گوندێکەوە ئەمانە دەچوونە ئەوی دی. کەسێک شتێکی دەربارەی ئەو کارەساتە خووێناویەی ئەرمەن تۆمار نەکردووە، بەڵام شایەدی ئەوانەی لەو کوشتارانە قوتاریانبووە ئەوە دەگەیەنن کە کوشتوبڕەکە سەرتاسەری بووە، ئەوانە ناوی ئەو گوندانەش دەبەن کە کوشتارەکانی تێدا کراوە: (زینی، مەلاقاسم، شێخ کارا، شێخ ئەینە، ئەیانز، هیدربر، ئامووک، زورایاد، باکس، باگدشان، کاراجاک، ئیسکیلە، کاراسیک، مەلا سەلیم، میندایں، باهیز، زراڤە، گورستاو شین ....)[29] لەوانەی قوتاریانببوو لەگەڕانەوەکەی عوسمانیەکاندا ڕزگارکران. هەر ئەمانە دوایی ڕووە و باشوور و ڕۆژاوا هەڵاتن و چوونە پاڵ ئەوانەی لەوپەڕی باشوورەوە هاتبوون و زوتر توانیبوویان هەڵبێن.

هەلی باشتر بۆ موسوڵمانەکانی باشوور ڕەخساوتر بوو تا لەدەست کوشت و کوشتار خۆ ڕزگارکەن لە چاو ئەو موسوڵمانانەی لە باکووری ڤاندابوون. زۆرێک لە باشوورەوە چوونە ناو ئێران و هەرێمی موسڵ، ئەمانە کوردی سەر بە عەشایرەکانبوون، توانیان لای براکانیان پەناگەیەک لە ئێران و موسڵ بۆخۆیان دەستەبەرکەن[30].

ڕێگەوبانەکانی جاتاك و هوشاب و گوربینار زۆری سەخت و شاخاوی بوون، بەلام بەلای گوندنشینانەوە لە ئەیار/مایۆدا بڕینیان هێند سەخت نەبوو، هەندێ هەلی ئەوەی بۆ هەلکەوت کە خۆی بخاتە پال ئەو هێزە عوسمانیانەی ڕووە و پەتلیس دەبوونەوە، هەر کام لە فیرقەی چاوهەلخستن و دەردك ئەو ڕێگەوبانانەیان گرتبۆوە بەر، جا ئەو پەنابەرانەی بە پالیانەوە دەرۆیشتن بەڕێوە، تا بەپێی ئەوان خێراتر بجوولانایە زیاتر دەپارێزران. بۆیە ناچار وازیان لە کەلوپەل و ئاژەلەکانیان دەهێنا و لە کێلگەکاندا بەرەللایان دەکردن تا بەپێی سەربازەکان بڕکەن، جا کە گەیشتنە هەرێمی پەتلیس لەوە زیاتر کە بە کۆلیانەوە بوو یا بە سەرپشتی ولاخەکانیانەوە بوو شتێکی ئەوتۆیان پێ نەبوو[٣١].

یەهوودەکانیش لە باشووری ڤان لەم دەردیسەریە بێبەش نەبوون، ئەمانە بەشێکبوون لەو کۆمەلە یەهوودە کە لە هەرێمی موسلدا بوون، زوربەی زۆریان سەرەوخوار هەلاتن، وەك گشت پەنابەران بەدەست برسێتی و نەخۆشیەوە زۆریان چەشت، تا وای لێهات لە کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانیدا هیچ یەهوودیەك لەو ناوە نەمابۆوە.

لە سەرژمێری ترکی سالی ١٩٢٧دا جگە لە ٤٢ یەهوودی نەبێ کە لە هەرێمی هەکاریدا بوون کەسێکی تریان نەمابۆوە[٣٢].

سەربازانی عوسمانی کە دەکشانەوە گشت لادێییە موسولمانەکانیان لە تەکدا نەبوو، ڕەوشی خواروو ئەو شپرزەییەی پیشاندەدا کە لەو ڕۆژانەدا هەبوو، لەهەر دێیە خەلکەکەی کۆ دەبوونەوە تا بزانن چۆن مامەلە لەتەك ئەم شکستەی عوسمانیەکاندا بکەن و چ ڕێگەیە بگرنە بەر، زۆریان، لەوانەیە زوربەشبووبن، بڕیاری ڕاگردنیان دەدا، هەندێك متمانەیان بە ڕووسەکان دەکرد و وایان دەزانی ئەمانە دەتوانن دەست بەسەر ڕەوشەکەدا بگرن دیارە ئەوانەی مانەوە لە وزەیاندا نەما کە لەو گوندانەی هەزاران سالە باو و

باپیرانیـــان تیـــا ژیـــاوە، بمێننـــەوە و دانیشـــن. لـــە متمانەکردنەکەیانـــدا بـــە ڕووسەکان هەڵە بوون، چونکە قۆزاقەکان (هێزەکانی سوارەی بروسکە ئاسای ڕووس) لەو باشوورەدا کەوتنە کوشتن و بڕین و پەلاماردانی ناموسیان. بە پەنایانەوە شەڕکەرانی ئەرمەن و گوندنشینانیان ئەمانەش کەوتنە پەلامار و دەستدرێژی. تا بەم جۆرە ئەوانەی مابوونەوە بوونە پەنابەر.

هەتا ئەوانەشی کە لـە سـەرەتاوە بڕیـاری ڕاگردنیـان دا، ڕووەو ڕۆژاوا یـا باشـوور نەبوونـەوە، هـەر کـە هەسـتیان بـە مەترسـی دەکـرد گونـدەکانیان جێدەهێشت و ڕوویان لە گوندی گەورەتر دەکرد بەو تەمایەی لێرە پارێزراو بـن، بـەڵام ئەمـە وەهمێکبـوو و هیچـی تـر. لـە واقیعـدا هەنـدی گونـد نێزیکتربوون لەو ڕێگەیەی کە ڕووسەکان گرتبوویانە بـەر یـان لـە دامـەزراوە ئەرمەنیەکانـەوە،جا لـەوە دەچـوو نـەیانزانیبێ کـە چـی قـەوماوە و ئـیتر بـە هەڵـەدا دەچـوون و دەکەوتنـە نـاو چـنگی ڕووسـەکان و ئەرمـەن، هـەروەك ئەوانەی لە گوندەکانیاندا مابوونەوە[٣٣].

ئـەو ئاوارانـەی کـە لـە باشـووری ڤانـەوە هـاتبوون دەربازبوونیـان تـا ڕادەیـەکی زۆر بەنـد بـوو بـەو ڕێگەیـەی هـەڵیان بـژاردبوو، ئەوانـەی ڕێگـە شاخاویەکانیان گرتبووە بـەر حاڵیـان باشـتر بـوو، هەرچـەندە هەنـدێکیان لـە نێزیك (هیزان و مەکس) پەلامار دران[٣٤]. بەڵام ئەوانەی سەر ڕێگەی غیفـاش لە پێش ئەوەی سوپای عوسمانی بەوێدا تێپەڕێ یان لە پاشـان، تەلـەفیاتێکی زۆریان بەرکەت. لەو سەر ڕێگەیە گشت پەنابـەران یـەکیان گرتـەوە، لـەولاش پەنابـەرانی ناوەڕاسـتی هـەرێم و هـەتا ڕۆژەڵاتـیش تـەنیا یـەك ڕێگـەیان لەبەردەمـدا بـوو: دەبـوو ئـەو ڕێگەیـەیان بگرتایەتـە بـەر کـە بـە کـەناراوی خوارەوەی دەریاچەی ڤاندا درێژدەبێتەوە[٣٥]. ئەمەش بۆ ماوەیەکی کەم ئـەبێ ئەمین نەبوو، تەنیا ئەو کاتانەی سەربازانی عوسمانی پیاتێدەپەڕین.

بـــە درێـــژایی قۆنـــاغی پـــێش گـــرتنی ڤـــان، ســـەربازە عوسمانیـــەکان

توانیبوویان چاودێری ئەو ڕێگەیە بکەن کە لە ڤانەوە دەچووە پەتلیس بەڵام غیفاش خاڵێکی دورتر بوو تا بیگەنێ. لێرەوە ڕێگەکە بۆ (تاتفان) مەترسیدار بوو[٣٦]، لە دوو بەشی ڕێگەکە (ڕۆژاوای غیفاش و ڕۆژهەڵاتی تاتفان) شاخ و کێوە بەرزەکان لووتیان ژەنیبووە گەناراوەکە، پەنابەران لەنێوان کێوەکان و دەریاچەکەدا ئەوقیبوون و قفڵبوون. بەمە بوونە نێچیرێکی سووکە دەست و ئاسان لە بۆ پەلاماری شەڕکەران.

لە گشت لایەکی هەردوو هەرێمی ڤان و پەتلیسەوە شەڕکەری ئەرمەن سەریان لە ناوچەی خوارووی دەریاچەکە دەدا، بۆیە گوندەکانی خوار دەریاچەکە لەلایەن ئەرمەنی ناوخۆ و شەڕکەرەوە دووچاری پەلامار و کاولکردن بوونەوە. لەمەدا ئەرمەنەکانی ڕووسیش هاریکارییان دەکردن[٣٧]. هێزەکانی عوسمانی لە هەرێمی ڤان و سنووری باکووری هەرێمی پەتلیسدا لە شەڕدابوون، هێند سەربازیش نەبوو تا دەوریە بنێرنە سەر ڕێگەی (غیفاش - تاتفان). ئەم کەتیبە سەربازیەی کە لە ڤانەوە هات کە کشایەوە بەم ڕێگەیەدا ڕۆیشتن، چیان لە توانادابوو یارمەتی ئاوارەکانیان دەدا، بەڵام ڕووسەکان بە دویانەوە بوون، سەربازەکان تا نەگەیشتنە تاتفان نەوەستانەوە[٣٨]. لێرە، لەسەر داوای حاکمی پەتلیس، بۆ پاراستنی پەنابەران و زامنکردنی گەیشتنیان بە پەتلیس، بۆ یارمەتیدان سەربازانی فیرقەی چاوهەڵخستن دانرابوون[٣٩].

ڕێگەوبانەکان بە هەزاران کەسەوە جمەیان دەهات، ئەمەندە خواردنیان پێبوو کە بتوانن هەڵیگرن. کەچی لەگەڵ ئەمەشدا ترسی برسێتی لە ئارادا نەبوو، بە چاوپۆشی لە پەلاماری ئەرمەنەکان مەترسی گەورەتر کەمی ئاوی خواردنەوە بوو.

چونکە ئاوی دەریاچەکە بۆ خواردنەوە نەدەشیا، کانیاو و جۆگە و ڕووبارەکانی سەر ڕێگە بەهۆی خوێن و لاشەی بۆگەنو ڕزیوەوە پیسبوون و

ڕێگەکانیش بە تەرم و لاشەی کوژراوان گیرابوون... درم و پەتا و نەخۆشی بڵاوبوونەوە، سکچوون لە پێشیاندا و درمی ترسناکتری وەك تیفۆس و کۆلێرا. بەهۆی بەدخۆراکیشەوە لادێییەکان ماندویی برستی لێ بڕیبوون، زیاتر ئەگەری تووشبوونیان بە نەخۆشی هەبوو.

بۆ ماوەیەکی کەم پەنابەرانی ڤان لە پەتلیسدا ئارامی و دڵنیاییەکیان بەخۆوە دی، هەرچەندە لەو هەرێمەشدا ئەرمەن هەر شاڵاوی دەبرد[٤١]. کە لە ١٩١٦ ڕووس پەتلیسی گرت دیسانەوە هەڵاتنەوە، کۆمەڵێکیان ڕووەو (سێرت)ڕۆیشتن، کۆمەڵێکی دی بەرەو (ئامەد - دیاربەکر)، ڕزگاربووان لە شارەکانی (سێرت، ئامەد، ماردین، ئۆرفە، خەرپوت، ئەنتاب، سلێڤان، سیڤریك و ئەدەنە) جێگیربوون.

## • گەڕانەوەی عوسمانییەکان و دیسان شکستیان

دوای ئەوەی ڤان داگیرکرا، سوپاکانی عوسمانی لە ڕۆژاوای دەریاچەی ڤاندا لە هەرێمی پەتلیس جێگیر بوون[٤٢]، لەناوچەکانی (کوب، مووش و مالازگیرت) تواناکانی خۆیان چڕکردەوە و گردبوونەوە، فیرقەی چاوهەڵخستنی خەلیل ناچاربوو لە ڕۆژهەڵاتی پەتلیسدا خۆی دواخات تا بتوانێ دەست بەسەر ئەو ڕێیانەدا بگرێ کە دەهاتنە ناو شاری پەتلیسەوە بۆ پاراستنی پەنابەران لەپەلاماری ئەرمەنە یاخیبووەکان. بەڵام دوایی لە ڕاونانی ڕووسدا هەر بەشداری کرد (شەڕی مالازگیرت ١٠ - ٢٦ تەممووز/ یۆلیۆ و وردە شەڕەکانی تر).

عوسمانییەکان لە باشووری دەریاچەکەوە جووڵان و بەرەو ڤان بوونەوە[٤٣]. لە ٣١ تەممووز/یۆلیۆ ڕووسەکان فەرمانیان بە ئەرمەنەکان دا کە شار چۆڵکەن و ڕووەو باکوور ببزوێن، بە نزیکبوونەوەی هێزەکانی عوسمانی سوپای ڕووسیش لە ٤ ئاب/ ئاغستۆس شاری چۆڵکرد، ڕوویان کردە ئەو شوێنانەی

که لێیانەوە بەرگری بکات (بارگیری، سارای و هوشاب)[43]

ئینجا پەنابەرانی ئەرمەن بەدەست برسێتیەوە حەلوەلایانبوو ئەوانیش بە هەمان سوورەت لە ڕێ و بانەکاندا پەلامار دەدران، کتومت چارەنووسیان وەك ئەو موسوڵمانانەی لێ هاتبوو کە لە ڤان هەڵدەهاتن. بەپێی تەقدیری سەرچاوە ئەرمەنیەکان، کە تا ڕادەیە ڕاستن، سەد هەزار ئەرمەن (لادێیی و شاری) ئەو ڕێگەیەیان گرتبووە بەر، ڕووەو باکوور، ئەمانە بەبێ ئاگادارکردنەوەیەکی پێشتر کە بپەرژێن خۆ کۆکەنەوە و کەمێ خواردنیش لە تەك خۆیاندا بەرن.

لە باکووری بارگیری، هێزەکانی کورد ڕێگەیان بە ڕیزی سەربازانی ڕووس و ئەرمەن و ئاوارەکان دەگرت، بەتایبەت کە بە تەنگە و دەربەندی ناو شاخەکاندا ڕادەبوردن، هیچ بەلگەیەکی باوەڕپێکراو سەبارەت بەوە نییە کە لەوێ پەنابەران چییان بەسەرهاتووە، بەڵام مەزندەی ئەوە دەگرێ کە ٥٠٠٠ هەزار پەنابەر لەو شەڕ و پەلامارانەی ناو شاخەکاندا تیا چووبن[44].

زۆری ئەبرد پەنابەران گەیشتنە سەر سنووری ڕووسیا و لێرە لەلایەن ڕێکخراوە ڕووسیاییەکانەوە یارمەتی دران، کۆمەڵە خێرخوازەکانیش زیاد لە توانای خۆیان بەهانایانەوە چوون، یارمەتیەکانی دەوڵەتی ڕووسیش کەم و سنووردار بوون. [45]

شاری ڤان لەلایەن سوپای عوسمانیەوە گیرایەوە بەڵام لە کۆتایی مانگدا جارێکی تر لە دەستیان دایەوە، ئەم دیاردەی گرتن و لەدەستدانە جار لە دوای جار دووبارە بۆوە تا لە ٢٩ ئەیلوول/ سەپتەمبری ١٩١٥ ڕووسەکان دواجار گرتیانەوە[46]. لە ١٠ - ١٩ کانوونی دوو/یەنایری ١٩١٥ عوسمانێکان لە شەڕی (کوبروکۆی)دا شکان و ڕۆژەلآتیان بۆ ڕووس جێهێشت. لە ١٦ شوبات /فەبرایری ١٩١٦ ئەرزڕۆمیش گیرا و لە ٣ ئادا/مارسدا چوونە ناو وبەتلیسەوە و گرتیان.

پاش ئەم شكستە یەك لەسەر یەكانەی عوسمانیەكان، ئەرمەنەكان وایان دانابوو بگەڕێنەوە زێدی خۆیان، بەڵام ڕووس بە ژمارەیەكی كەمنەبێ ڕێی ئەدا ئەو باقیەی تریان بگەڕێنەوە، ئامانجیش لەمە ئەوە بوو ئەوانە دانەوێڵەیان بۆ دەستەبەركەن، چەند تاقمە چەتەیەكیش لەو ناوەدا مابوونەوە بۆ ڕاووڕووت.

ڕووس نیازی نەبوو دەوڵەتێكی ئەرمەنی لە ئەنەدۆڵی عوسمانیدا پێكبهێنێ. لە ڕۆژانی جەنگدا ئەرمەن هاوپەیمانێكی سەنگینیان بوو بەڵام هەر كە بۆیان دەركەوت وا لەوەدان كە جەنگەكە ببەنەوە، بە ئاسانی پووڵێكیان پێوەنان و خستنیانە پشتگوێ.

لە ئادار /مارس و نیسان/ئەپریلی ١٩١٥ بەرپرسانی ڕووس دەستیان كردە پێشنیاركردنی ئەو پلانانە بۆ نیشتەجێكردنی قۆزاقەكان لە هەردوو هەرێمی ڤان و ئەرزرۆم[47]. زوربەی زەوی ئەم دوو هەرێمە و بەشێك لە پەتلیس □ ڕادەیەكی باش لە ئاستی دەریاوە بەرزترە، كەواتە بەتەواوی بۆ نیشتەنیە ڕووسەكان گەلێ لەبارە[48]. ڕووسیا بە ڕێكەوتننامەی سایكس-بیكۆ ڕازی بوو، تیایدا بە دەق هاتبوو كە (ڤان) بۆ ڕووسبێ نەك بۆ (ئەرمینیا). جا هەر كە ڕووسا لە ١٩١٦ عوسمانێكانیان وەدەرنا گورج حاكمێكی سەربازیان بۆ ئەو شوێنانەی كە داگیری كردبوو (ڕۆژەلاتی ئەنەدۆڵ) دانا حاكمانی ئەو شوێنانە دەبوو لە ئەفسەرانی ڕووسبن، بەمانا ئیتر ئەرمەن بۆیان نەبوو حوكمی ڤان بكەن[49].

ڕووسیا كەوتە چەككردنی ئەرمەنەكان، چونكە ئیدی پێویستی بە شەڕكەری ئەرمەن نەما، وای دادەنا كە ئەرمەنە چەكدارەكان هەر بەو ئاسانیەی شەڕیان لەگەڵ عوسمانیەكان دەكرد ئاواش بە گژ ئەماندا دەچنەوە. لە كانوونی یەك/ دیسامبری ١٩١٥ فەیلەقە ئەرمەنیەكان (دروژینی) هەڵوەشێنرانەوە و سەربازەكانی خرانە سەر یەكە نیزامیەكانی ناو سوپای

ڕووس. ئەوەی ئەو تەشکیلاتانەی ڕەتدەکردەوە دەردەکرا.

ڕووس بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەو فەیلەقانە هۆکاری خۆی هەبوو، هۆکارێك کە لە ئیمپریالیەتبوونیشی تێدەپەڕاند. لە ڕەفتاری ناپەسەندی ئەم فەیلەقانە دەنگی ناڕەزایی و سکاڵاکردن لێیان لە ئەنەدۆڵدا وا بەرز بۆوە کە دەگەیشتە بەر گوێی بەرزترین لێپرسراوان لە سوپای ڕووسدا. ژەنەراڵ نیکۆلاییڤ لە یەکی تەمموز/ یۆلیۆی ١٩١٥دا بروسکەیەکی ناردە فەرماندەیی لەشکری قۆزاق، تیایدا دەڵێ:

(( کە بەرپرسانی ڕووس هەوڵیان دەدا بۆ ڕێبەندیکردنی خۆبەخشە ئەرمەنەکان تا تاڵانی نەکەن، ئەو ئەرمەنانە تەقەیان لە سەربازەکانی ڕووس دەکرد، بەرهەڵستیان دەکرد و وازیان لە ئاگر تێبەردان و سووتاندن نەدەهێنا و لەزەتێکیان لەوە دەدی. جۆرەها جینایەتیان ئەنجام دەدا، جا بۆ دانانی سنوورێ لەبەردەم ژمارەیەکی زۆر لە جینایەتە جۆراوجۆرەکانیان، دادگەیەکی سەربازیمان پێکهێنا. وە لەسەرمان پێویستبوو کە چەند یەکەیەکی (ئینزیباتی) جیاجیا ڕێکخەین بۆ ڕاگرتنی ئەم ڕەفتارانە.[٥٠]

کە وەزعەکەیان لە ژەنەراڵ (بۆلهو فیتینۆڤ) گەیاند و ئاگاداریان کرد، ئەویش بۆ کۆنت (م. فورو نتسۆڤ) کە جێگری حاکمی قەفقاس بوو، نووسی تا نەهێڵێ هیچ یەکەیەکی خۆبەخشی ئیزافی ئەرمەن بەشداربێ. لە نامەکەیدا دەڵێ:

٩ تەمموز/یۆلیۆ ١٩١٥

گەورە و بەڕێز....

بەر لە جەنگ ڕاتانسپاردم بە ئەرکی میلیشیاکانی ئەرمەن.

بە درێژایی پانزە مانگی ڕابردوو، چیمان پێ کرا بۆ جێبەجێکردنی ئەم ئەرکە درێغیمان نەکرد، تەقەللاکانی ئێمە و کاری میلیشیاکانیش بە گوێرەی فەرمانەکانتان دەرەنجامی باشیان لێ کەوتەوە، هیچ سکاڵایەکمان پێ

ئەگەیشت، بەڵام پاش گرتنی ڤان و ئەو کاتەی چالاکی میلیشیاکان لەوپەڕیدا بوو، (ا.ی.هادیسۆڤ) کە نوێنەرێکی ڕێپێدراوە لە ئیدارەی سەربازیەوە، ئەم بەیاننامەیەی گەیشتە دەست:

لەسەرکردەیی سەربازیەوە بۆ فەرماندەی گشتی

ژەنـراڵ نیکۆلاییـف لـە ڤانــەوە ئاگاداری کردینــەوە کـە سـەربازەکانمان تەقـەیان لــە خۆوبەخشــە ئەرمەنــەکان کــردووە، کــە تاڵانیــان کردبــووە و ئەوانەش کە لە ڕەفتاری تاڵان و بڕۆ و دزی و شڕەخۆریدا هاوبەشیان بوون، بۆ دانانی سنوورێ بۆ ئەم جۆرە تاوان و جینایەتانە، دادگەیەکی سەربازی لە ڤان دامەزرا.

بـەم هۆیــەوە، فەرمانــدەی گشــتی پێکهێنــانی یەکــەی تــازەی میلیشــیای قەدەغە کردووە هەتا ئەوانەی تر کە هەن نیزامیان بەسەردا نەسەپێنرێ.

بەپێی فەرمانەکانی بەڕێزیان وامن ئاگادارتان دەکەمەوە.

سەرکردەی باڵاتر / بولهو فیتینۆڤ[٥١]))

دەکرێ دەمەتەقێیە لەسەر ئەوە بکرێ کە ئاخۆ ڕووسەکان بە ڕاستی لە خـەمی موسوڵمانەکاندا بـوون و بۆیـان سـەغڵەتبوون یـان هـەروا بـە ئاسـانی دەیانویست سنوورێ بۆ هێزی سەربەخۆی سەربازی ئەرمەنەکان دانێن؟

بــە بــەرپابوونی شۆڕشــی بەلشــەڤی لــە ڕووســیا، لەشــکری ڕووســی لــە ڕۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵ دەستی کردە کشانەوە بۆ ناو وڵاتی خۆی، کە بووە هاوینی ١٩١٧[٥٢] تاقـە سـەربازێکی ڕووس لــە هـەرێمی ڤانــدا نــەما، جگــە لــە یەکــە ئەرمەنیـەکان و ژمارەیـەکی کـەم لـە ئەفسـەرانی ڕووس. لـە ڤانـدا ئەرمـەن حوکمی گرتە دەست، حووکمێکی دووەمجاری ئەرمـەنیان بـۆ ماوەیـەکی کـەم دامەزرانـد، حوکمـەتێکی تـەواو: وەزارەتـەکان و دراوێکـی تایبـەت بـە خۆیـان (دراوێکــی ڕووســی لەســەرو نووســینە ڕووســیەکانەوە بــە ئەرمــەنیش لێــی

نووسرابوو). دەوڵەتێکی بچکۆلانە لە کەناراوی دریاچەی ڤاندا، لە باکوورەوە تا (ئیرجیسی) بڕی دەکرد[53].

کە پەنابەرانی ئەرمەن لە دەستەڵاتی ڕووس ئازادبوون، کەوتنە گەڕانەوە بۆ هەرێمەکە، بەپێی (ڕیتشارد هوفانیسیان) لە کۆتایی ١٩١٧دا ١٥٠٠٠٠ هەزار ئەرمەن بەسەر ڤان و پەتلیس و ئەرزڕۆمدا دابەشبوون[54]. ئەم ژمارەیە تەنیا مەزندەیەکی ڕوتە و هیچیتر، بەڵام ئاماژەیەکە بۆ ئەوەی ژمارەی ئەرمەنەکان زۆر کەمە، شانسیان لە دەستبەسەراگرتنی ڕۆژەڵاتی ئەنەدۆڵدا هەرنەبوو، لە ١٩١٧دا ئەوانەی گەڕانەوە و ئەوانەشی کە هەر لە هەرێمەکەدا مابوون کۆمەڵێکی کەمتر لەوەیان پێکهێنا کە بەر لە جەنگ تیابوون، کەمتر لە نیوە.

ئەرمەنی ڤان لە ساڵی ١٩١٧ ئەوپەڕی١٠٪ی گشت دانیشتوانەکە بوون، ئەم ڕێژەیە گشت ئەتن و تایفەکان دەگرێتەوە. ژمارەی شەڕکەریان کەمبوو، نێرینەکانیان لە ٢٠ - ٣٥ ساڵی دەستنیشان کران و مەشقی سەربازیان پێ دەکرا، بەهاتنی کانوونی دوو/یەنایر هێزی ئەرمەن لە ڤان ژمارەی بە ٢٠٠ سەربازی سوارە و ٢٠٠٠ هەزار پیادە مەزندە دەکرا، ئەمەش هێزێکی سەربازی ئەوتۆ نەبوو تا حیسابێکی بۆ بکرێ.

پێشتر عوسمانێکان لە لایەکی ترەوە سەرقاڵی دۆڕاندنی جەنگەکەیانبوون، بەڵام لە ٦ نیسان/ئەپریلی ١٩١٨ شاری ڤانیان گرتەوە[55]، دیسان ئەرمەنی شارەکە بوونەوە بە ئاوارە و پەنابەر، بەڵام پەنابەرە موسوڵمانەکان، ئەوانەی قوتاربوون، گەڕانەوە زێدی خۆیان*.

---

* هەر ئەم تەجرەبەی حوکمە کورتخایەنەی ئەرمەن لە ڤان، دوای ٢٩ ساڵ، واتە لە ١٩٤٦ دیسان مێژوو لە کۆماری مەهاباد خۆی دووبارەکردەوە و هێندەی نەخایاند ڕووسیای بەلشەفی ئەوانیشی جێهێشت بۆ سوپای ئێران. ((وەرگێڕ))

## • کاولکاری

ژمارەی ئەو گوندانەی کە بەزۆر چۆڵکران یا کاولکران یان هەروا بەتەڕن سووك و ئاسان وازیان لێ هێنرا لەسەروبەندی یاخیبوونەکەدا، سا هی ئەرمەن بووبن یا موسوڵمان، مەحاڵە بزانرێ.

عوسمانیەکان هێند سەرقاڵبوون نەدەپەرژانە ئەوەی سەرژمێریان بۆ بکەن، لە گەرمەی پامالگردنەکەی ڕووسیشدا، ئەرمەنەکان لیستی ئەو گوندانەیان گرتبوو، لەوانەیە جێی باوەڕ بن و لەوانەشە جێی باوەڕ نەبن. بەهەرحاڵ ناتوانین لەو لیستە ئەرمەنیانەوە ژمارەی گوندە چۆڵەکانمان دەستکەوێ، یانی ئەو گوندانەی کە بەشێکبوون لە سیاسەی یاخیبووان بۆ گردکردنەوەی هێز تیایاندا، لەمانە ناتوانین بگەینە ئەوەی کە کامیان عەشایرەکان کاولیان کردووە و کامیان سەربازەکان[٥٦].

مەعلوومە کە سەربازانی عوسمانی خانووی ئەو کەسانەیان دەڕوخاند کەبوون بە سەربازیان ڕەتدەکردەوە، بەپێی بەرنامەیەکیش کە دانرابوو بۆ نەهێشتنی کاری یاخیبوون زۆر گوندیان سەرتاپا تەخت دەکرد، لە کشانەوە یەکجاریەکەشیاندا ئەرمەنەکانیش لە کاولکردنی سەرتاسەری گوندەکاندا بوونە شەریك. لەبەر ئەمانە لە کۆتایی یەکەم جەنگی جیهانیدا ژمارەیە گوندی کەم نەبێ لە هەرێمی ڤاندا ئەوانیدی بە پێوە نەمابوون.

کەواتە بۆ زانینی ئەوەی کە کێ گوندێکی کاولکردووە و کەی، سوودی نییە، تێکدان و بەتاڵان بردن لەسەروبەندی کشانەوەی یەکجاری ئەرمەن دەچێتە ڕیزی لۆژیکی جەنگەوە.

((خشتەى ١ - ٩ گوندەكانى هەرێمى ڤان))

| | بەر لەجەنگ | وەك خۆيان ماونەوە - پەلامار نەدراون (ساڵى ١٩١٩) |
|---|---|---|
| موسوڵمان | ١,٣٧٣ | ٣٥٠ * |
| ئەرمەن | ١١٢ | ٢٠٠ + |
| تێكەڵ | ١٨٧ | - |
| كۆى گشتى | ١,٦٧٢ | ٥٥٠ |

* ئەو خانووانەى سەر لەنوێ دروستكرانەوە يا دەستيان پيا هێنراوە.

+ ئەرمەن و تێكەڵاو

سەرچاوە: راپۆرتى (نايلز و سازرلاند) لە جاستن و ماكارسى، ليژنە ئامريكاييەكان بۆ ئەنەدۆڵ وە راپۆرتى نايلز و سازرلاند لە:

Turk Tarihi Kurumu Kongresi XI. Ankara: 5 - 9 Eylul 1990 (Ankara Turk Tarih.. pp 1809 - 5

ئەرمەن مكوربوون لەسەر ئەوەى كە مادەم لە ڤاندا بۆيان نەبوو نەهاتەدى ئيتر باقيەكەى بۆ ژيان ناشێن، بەلام ئەم لۆژيكە مەگەر تەنيا پاساوى ئەو كاولكاريەيانێ كە لە كشانەوەياندا جێيانهێشت.

كێشەكە لەوەدايە كە زوربەى ئەو كاولكاريەى بيناكانى دەوڵەت و خانووى موسوڵمانان و گوند و مزگەوتەكان لەكاتى بەزين و راكردنى ئەرمەنەكاندا نەكران بەڵكو لە گەرمەى سەركەوتنياندا دەيانكرد. شارى ڤان باشترين گەواهێكى ئەمەيە، كە دەوڵەت كشايەوە لێى و ئەرمەن دەستيان بەسەرداگرت، بەر لە هەموو شتێ كەوتنە وێرانكردنى ئەو خانووانەى كە مابوونەوە و هى موسوڵمانەكانبوون. لە واقيعدا ئەو خانووانە بوونە موڵكى خۆيان و پێويستيان پێيانبوو، چونكە ئەوانەى خۆيان لە ياخيبوونەكەدا

بەهۆی بۆردومانەوە کاولببوون. لەباتی ئەوەی بچنە ناویانەوە وێرانیان کردن، لە شوێنەکانی تری هەرێمەکەدا هەر لەم چەشنە ڕەفتارانەیان کردبوو. تاکە هۆکارێکی لۆژیکی ئەگەر پاساوبێ بۆ ئەم ڕەفتارەیان ئەوەیە کە وایاندەزانی ئەگەر لانەکانیان تێکدەن ئیدی موسوڵمانان ناگەرێنەوە[٥٧].

لەڕاستیشدا لەوەی دەگرد کە پاڵنەری هەقەتی بۆ ئەم ڕەفتارە تەنیا ئەو رقوکینە گەوجانەیەیانبووبێ لە هەر کەسێ موسوڵمانبێ یا عوسمانی. (ئۆنیگ سوختاریان) کە لە بلێسەی ئاگرەکانی ڤانی دەڕوانی ڕازیبوو و دڵی کورگەی نەدەکرد، ئەو کاولکاریەی ناونابوو (ڕۆژانی شێتیە پیرۆزەکە). دەیگوت: هیچ دەستەڵاتێك نەیدەتوانی جڵەوی ئەو شێتی تۆڵەکردنەوە کە ئەرمەنی ڤانی مەستکردبوو بگرێتەوە[٥٨]. ئەنجامەکەشی داڕوخانی گشت شتێکی جوان و دێرینی هەرێمەکە بوو، جگە لە زوربەی خانووەکانیشی.

لیستی ئەو گوندە موسوڵمانانەی کاولکرابوون لای عوسمانێکان* دورودرێژە[٥٩]، پیشانی دەدات کە هەردوو (ئیمۆری نایلز و ئارسەر سازرلاند)ی ئامریکایی ڕاستیان پێکابوو کە گوتبوویان: زوربەی گوندی موسوڵمانەکان تا ڕادەیەکی زۆر کاولکران یا زدرەرمەند بوون. هەر بەدەستی ئەرمەنەکان زوربەی مەزار و ڤەبرستانەکان و شوێنە پیرۆزەکان و دەیر و خانەقا و تەکێی سۆفیەکان (TEKKE) و مزگەوتەکانی هەرێمەکە خاپوور کران. ڕووسەکان چلۆنها لەم جۆرە کارانەدا بەشداربووبن. بینا و دامەزراوەکانی وەقفی ئایینی کە ساڵانێکبوو لە خزمەت هەژاراندا بوون، داریان بەسەر بەردیەوە نەهێشتبوو[٦٠]، لەولاشەوە ڕێژمیەکی زۆر لە دەیر و کڵێسای ئەرمەن وەك خۆیان مابوونەوە و دەستیان بۆ نەبرابوو، بەڵام دوایی بەهۆی گوێپێنەدان و پشتگوێ خستنەوە وردە وردە خۆیان دادەڕمان و هەرەسیان دەهێنا.

---

* ئەم قسەیە پێچەوانەی ئەوەیە کە لە دەسپێکی ئەم باسەدا وتراوە هەروا سەرنجدە لە پەراوێزی ژمارە (٦١) کەچی دەڵێ!!                ((وەرگێڕ))

## • تێکڕای مردن

تێکڕای مردن لەناو ئەرمەنی ڤان و ئەرمەنی دی لە ڕۆژەڵاتدا ناتوانرێ لەیەك جیاکرێنەوە، هیچ دیکۆمێنتێکیش کە ئەساسی بێ و لە هەرێمەوە دەرچووبێ، لەلایەن ئەو ئەرمەنانەی ڕوویان کردە خوارووی قەفقاس و شوێنانی تر هێنرابێ، هیچ شتێ لەمانە نەماوەتەوە. بەڵام تەنیا دەتوانرێ لەنێوان ئەو ئەرمەنانەی ڕەویان کردووە و ئەوانەی کە لە هەرێمەکانی عوسمانیدا ژیاون بەراوردێ بکرێ. یانی لە (ڤان، ئەرزڕۆم، پەتلیس و هەرێمی – قارس-ی ڕووسیا) لەم هەرێمانەوە پەنابەران زوربەیان چوونەتە خوارووی قەفقاسیا[٦٢].

جا لە ئەسڵی ٥٧٥٠٠٠ هەزار ئەرمەن کە لەو چوار هەرێمەدا بوون، تەنیا ٣٣٩٠٠٠ هەزاریان لەدوای ئاگربەست دەرباز بوون، ڕێژەی مردوانیش ٤١٪ بووە. بەڵام ئەرمەنی هەردوو هەرێمی (ئەرزڕۆم و قارس) بەو ڕادەیە کوێرەوەری و ناڕەحەتیان نەچەشت وەك ئەوانەی (ڤان و پەتلیس)، دەبێ ڕێژەی مردنی ئەرمەنی ڤان لە ٥٠٪ تێپەڕیبێ.

دەبێ نیوەی مردنەکان لەناو ئەرمەنی ڤاندا لە ئانی یاخیبووندا بووبێ، بەتایبەت لە گەرمەی کۆڕەوە کارەساتبارەکەی کە ناچار کران لە ١٩١٦دا مل بەرەو باکوور بنێن. کە گەیشتنە (جۆرجیا)ی ڕووس و (ئازەربایجان) و (ئەرمینیا)، بەهۆی برسێتی و دەردو ئاوەرمییەوە ژمارەی گوژراوان و مردن بە شێوەیەکی ترسناك لە بەرزبوونەوەدا بوو، لە (باتووم) کونسوڵی بەریتانیا ڕایەگەیەنێ کە تێکڕای مردن لەناو ئەرمەنە پەنابەرەکاندا لە قەفقاسیای ڕووسیا لە نێوان ٢٥٠ بۆ ٤٠٠ مردوە لە ڕۆژێکدا.

ئەمەش بەهۆی سکچوون و درمی حمی المبقعە و گرانەتا و دڕکە و سووریژە و کۆلێرا و دەفتێریاوە[٦٣]. گومانی نییە کە ڕووسەکانیش لەو

بەرزبوونەوەی ڕێژەی مردنەدا دەستیان هەبووە، چونکە زۆریان لە گەڕانەوە بۆ ڤان ڕێگریان لێ کرا، ئەوەیشی گەڕایەوە بۆ کۆماری ئەرمینیا، دوای ئەوەی کەمێ هاتنەوە ناو ڤان، ڕوانیان ڕەوشەکە زۆر خراپتر و دژوارتر لەوەی کە لە ١٩١٦ هەبوو. ئەم کەڕەتە ئەوەندە خواردن و خۆراك لە ئەرمینیادا نەبوو کە بەشی دانیشتوانەکەی خۆی بکات، ئیتر چۆناهی پەنابەرانیش تێرکات؟![٦٤]. کەسێ بەهانای سکی ئەو پەنابەرانەوە نەدەچوو جگە لەو یارمەتیە بیانیانەی لە ڕێی (لیژنەی بەهاناهاتنی ئامریکاییەوە لە ڕۆژەڵاتی نێزیکدا) پێشکەش دەکران[٦٥].

بەپێی سەرژمێریەکان ڕێژەی مردن لەناو موسوڵمانەکاندا زۆر خراپتر بوو، هەرچەندە باری قورسی کارەساتەکە پرزەی لە هەردوو تەرەف بڕیبوو، بۆیە بەراوردکردنی ئەم ڕێژانە نرخ و بەهایان ناهێڵێت. لەنێو ئەو ٣٦٣٠٠٠ هەزار موسوڵمانەی بەر لە شۆڕش و جەنگ کە لە ڤان دەژیان، تەنیا ١١٩٠٠٠ هەزار لە کۆتایی جەنگدا لە ژیاندابوون. ئەمما ١٩٤٠٠٠ هەزار کە مانەوە ( یانی بەرامبەر بە ڕێژەی ٦٢٪ یان دەوروبەر ٢/٢) ئەوانیش تیاچوون[٦٦].

زوربەی ئەرمەن و موسوڵمان لە ئانی ئاوارەبوون و پەنابردندا تیادەچوون، لیژنەی ئاوارەکانی عوسمانی ٨٦٨،٩٦٢ ئاوارەیان لە پامالکردنەکەی ڕووسدا تۆمارکردبوو، بەڵام ئەم ڕاپۆرتە ڕەسمیانە خەڵکێکی زۆریشی نەگرتبۆوە، مەحاڵیشە کە ئاوارەکانی ڤان لەگەڵ باقی ئاوارەکانی تردا جیا کرێنەوە. سەرژمێریە نێودەوڵەتیەکان ئاماژە دەدەن بۆ زۆری و گەورەیی ژمارەی پەنابەرەکان. دەکرێ بە پێی مەزندەیەکی تەقریبی بڵێین کە ١٣٠٠٠٠ و ١٤٠٠٠٠ هەزار ئاوارە لە ڤانەوە تا تشرینی یەك/ ئەکتۆبەری ١٩١٦ لە مردن ڕزگار بوون[٦٧].

بە پێچەوانەی ئاوارە ئەرمەنەکانەوە، موسوڵمانەکان لە ئامریکا و هیچ وڵاتێکی ترەوە کۆمەکیان وەرنەگرت (لیژنەی عوسمانی بۆ ئاوارەکان) ئەو

خۆراکـەی لەدەسـتیا بـوو دابەشـی دەکـرد، بـەڵام بڕەکـەی زۆر کـەمبوو، داوودەرمان لە دەستدا نەبوو بۆیە نەخۆشی و درمەکانی کۆلێرا و تیفۆس و گرانـەتا درویـنـەی خـەڵکێکی زۆری کـرد و لـەناوی بـردن. ئـاوارەی ئەرمـەن خانوویـان نـەبوو، لـە کۆمـاری ئـەرمینیا دەبـوو لـە سـفرەوە دەسـتیان پـێ بکردایە. وەزعی ئەمان لـە موسـوڵمانانی ڤان باشـتر بـوو، چونکە ئەرمـەن و ڕووس ۲/۳ی گونـدەکانی هەرێمەکـەیان وێـران کردبـوو، ئـەو بـاقی تـری بەشێوەیەکی ترسناك بەر زەرەر کەوتبوون[68]، لە زوربـەی ناوچـەکاندا تـەنیا خانووی ئەرمەنەکان بە پێوە مابوو، لە کۆماری ئەرمینیا ئەرمەنەکان خانوو و مـەزرای ئـەو موسـوڵمانانەیان داگـیر دەکـرد کـە یـا کوژرابـوون یـان دەرکرابوون[69]. ژمارەی ئەو دەرکراوانە دەگەیشتە ۱۸۱۰۰۰ هـەزار کـەس. بۆیـە لـە ڤـانیش موسـوڵمانەکان دەچـوونە خـانووی ئەرمەنەکانـەوە، ئەمانـە هـیچ کۆمەکێك نەدەکران وەك کۆمەکی ئەرمەنەکان دەکرا.

## • شایەدیەکەی "برایم سرجین"

(برایم سرجین) کە ئەم ڕوداوانەی دەگێڕایەوە تەمەنی پانزە ساڵ بوو، زۆر لە ڕوداوەکان کەسوکار و خەڵکەکە بۆیـان گێڕاوەتـەوە، بـەڵام ئـەوەی لـە ڕوداوەکانی گوندی (زیفیە) باسیان دەکات، تۆمارەکـانی جـەنگیش پشتڕاسـتی دەکەنەوە، ئـەوەی بەرپرسـان و خـەڵکی گونـدەکان دەیانگێڕایـەوە هـەر نـاوی ئـەو گوندانـەیان بـردووە و باسـیان لـەو جینایەتانـەوە کـردووە کـە دەرهـەق ئەهالیەکە کراون[70].

چـیرۆکەکەی بـرایم سـرجین زۆری ئـەو بەسـەرهاتانە دەردەخـات کـە لادێییـەکانی ڤـان بەسـەریان هـاتووە و تیایـدا ژیـاون. دانیشـتوانی گونـدەکان نەیان دەتوانی چارەنووسی خۆیان دیاریکەن، بەڵام دەیانویست بەربـەرەکانێ و مەقاومە بکەن[71]. کەچی لە کۆتاییدا هەوڵ و تەقەللاکانیان بە فیڕۆچوو و

یەك چارەنووس گرتنیەوە کە مردن بوو:

((سەربازێك، بیستبووی کە ڕووسەکان گەیشتوونە چاڵدێران، چوو بۆ گوندی (دیریبی) و بە موختارەکەی گوت: بژاری چی دەکەی لە کێڵگەکەتدا؟ وا ڕووس گەیشتە چاڵدێران، ئەمرۆ ئەگەر نەگەنە ئێرە سبەی دەگەن، بڕۆن و جێبهێڵن ئەگین سبەی گشتتان دەمرن. ئاوابی کۆبوونەوە تا خۆ ئامادەکەن بۆ ڕۆیشتن بەرەو ڤان، کەمێ خواردن و پێخەف نەبێ چیتریان نەبرد. بەلای گوندی (زراڤا)دا ڕەتبوون، گوندێکی چەرکەسەکانبوو، بەڵام خەڵکی گوندی (دیریبی) لە وەڵامی ئەماندا گوتیان: ڕووس هاتۆتە چاڵدێران، ڕۆیشتن تا گەیشتنە (مورادیە - بارگیری)، ئێمەش دەچینە ڤان، خەڵکی زراڤا گوتیان: ئەگەر ئەوەی دەیڵێن ڕاستبێ باشتر وایە ئێمەش بارکەین، پاش کەمێ ڕێی ڤان پڕبوو لە ڕێبواری لادێیی، خەڵکی گوندەکانی (هارکیس، زراڤا، دیریبی، شێخ عومەر، شێخ کارا، شێخ نینی، هیدیر و گولو) گشتیان بۆ ڤان دەچوون، ئەو کات ڤانیش چۆڵکرابوو، بەڵام ئەو لادێییانە ئاگایان لەو چۆڵکردنە نەبوو.))

کە لادێییەکان گەیشتنە دۆڵی (ئیفیریك) ئەرمەن پەیابوون و دەنگیان دان: ها گەوجینە، پێتان وایە بەرەو کوێ بچن؟. گوتیان: لە گشت شوێنەکانەوە ئاوارە ڕوومو ڤان دەچن، ئێمەش بۆ ئەوێکانێ.

ئەرمەنەکان جنێویان پێدەدان و دەیاگوت: کە گەمژە و نەفامن، شەش حەوت ڕۆژە ڤان گیراوە، تركەکان هەڵاتوون و حوکمی سیفدیت پاشا بەسەرچوو و نایەتەوە، ئارام پاشا حوکم دەکات، بریندار و موسوڵمانەکان لە نەخۆشخانەکاندا کوژران، ئافرەت و منداڵ فڕکران، مزگەوت و چادرگەکان سووتێنران، تەنیا بیست سی ئافرەت نەبێ نەمانەوە ئەوانیش دراونە دەست ئارام پاشا.

چەرکەس ئیبۆ گوتی: دەمانکەنە کۆیلە، با ڕوو بکەینە (زیفیە)، گوندی

خۆمانـە، نێزيـك بـە دەرياچـەكەيە كەشتى دەستدەخەين هەڵدێين، ئـەگين دەگيرێين[٧٣]. ئەو حەشاماتەى ڕژانـە گوندەكەمانـەوە، دوو هـەزارێك دەبـوون، پرسيمان: چى بووە، چى قـەوماوە؟ وەلاميـان دايـەوە: بـەڕێوەبووين بـۆ ڤـان، ئەرمەن هاتنە سەر ڕێمان گوتيان ڤان تەواو، هاتووينە ئێرە، تا كەشتى پەيدا كەين و خێزانەكانمان دەربازكەين.

كـات بـەهار بـوو، دەستەبەركردنى پێداويستيەكان بـۆ ئاوارەكان ئاسان نەبوو، لە خانوو ودەوار و كابينەكانـدا دامانـان، دوو هەزار زياتربوون، پێـنج سـەدێكيان جێگـە و ڕێگـەى شـياويان بەركـەوت، هەنـدێ سـەربازى دابـڕاو و ڕاكردو بە چەكەكانيانەوە گەيشتن، لـە وەزعێكى خراپـدابوون، قـژ درێـژ و ريـش هـاتوو جـل دڕاو، كـێچ و ئەسـپێياوى. بـەپير ئەوانيشـەوە چـووين، لەناوياندا: كاكە ئەسيبم و مستەفاى ئـامۆزام و مەمـەدى زاوامـان و ئەلياسـى پورزام و ڕەجەب چاوەشى شەعباناغا و عەريف سياتى عاسـم ئۆغلـۆ مسـتەفا و شـوكر چاوەشـى قاسـم ئۆغلـۆ نيمـڕا. هێنـد لاواز و لـەڕبوون وەك داسـك و دەرزى. كەوتينە ئەسپێ دۆزين لێيـان، يونسـى مـامم سەرتاشـێكى شـارەزابوو گوێزانى گرتە دەست و كەوتـە تراشـكردنيان، باوەڕتـانبێ گەنـە و مۆريـان وا دابووبوانە دەم و چاويان، كە گوێزانەكەى پيادەهێنـا خـوێن لەگەڵيـدا دەهاتـە دەر، دواى ئەمە ديمەن و ڕواڵەتيان وەك جارانى لێ هاتەوە.

دوواى دوو ڕۆژ، لـە سـێيەمدا مامۆسـتاكەمان كـە مـەلاى گوندەكەشـبوو شەبەقى بانگى بەيانى دا، هەنـدێ چـوون بـۆ نوێـژ و هەنـدێكى دى بەلەشـى قورس و گرانەوە كەوتنە كاركردن، ڕووبارێك كە لە سنوورى ئێرانەوە دەهات بەناو دێدا ڕەتـدەبوو، بـەهاران ئاوەكـەى وا هەڵدەستا دەبـووە دەرياچـەيەك، كەس نەيدەزانى ئەم ئاوە لە كوێوە هەڵدەقوڵێ، لەوبەريەوە دەنگى ئافرەتێك دەهاتە گوێ، دەيقيژان: بۆ خاترى خوا كەسێك نييـە بمپەڕێنێتـەوە؟. مـامم بەئەسـپەكەيەوە پەڕيـەوە لاى، تومـەس ئـەسماى كچـى عاسـم ئۆغلـۆى

ئەحمەداغایە، پرسی: كچم چی ڕوویداوە؟. كچە شووی كردبوو، بە بووكی برابووە گوندی (مەلا قاسم). گوتی: تۆ بمپەڕێنەوە ئەوسا پێتدەڵێم. نایە پشت خۆی و بە ئەسپەكە پەڕینەوە.

پیاوەكان لە نوێژ گەڕابوونەوە و گوێیان لە ئەسما دەگرت، دەیگوت: وریابن، حەمید و مەلا قاسم و ئەیانوسیان سوتاند، وا دەگەنە ئێرە ئەمڕونا سبەی، فریای خۆتا كەون.

كە ئەمەیان بیست مامۆستا گوتی: برایان، ئێمە موسوڵمانین، ناپینەكەمان دەڵێ بمرن نەك خۆ بەدەستەوەدەن، شەش دەمانچەمان ها پێ، بیست سنووق زەخیرەش، وا هەژنۆ سەربازیش بە چەك و تفاقیانەوە هاتوونە ناومان، دەی با بەرگریكەین، عوسمانە فەنی ئامۆزای باوكمە و سەركردەی میلیشیاكانە، ئەم چەك و زەخیرانەی بۆ ناردوین بۆ ئەوەی بەرهەڵستی دوژمنی پێ بكەین. ئێوە شارەزای ناوچەكە نین، چەند گردێك ها بەبان ئاواییەوە، بەشی سەروو دەڕوانێ بە پرد و زۆنگە سەوزەكەدا، دەشێ ئەرمەن لەوێوە بێن، ئەوەی شارەزایە با لەوێوە بچێ و بۆ ئەرمەن دانیشێ.

ئەرمەن لە سێ لاوە دەوری گوندیان دا، شالاویان دەبرد، پیاوەكانمان دەستیان لێ كردنەوە و تەقە دەستی پێ كرد، پشت بە خوا تا نیوەڕۆ لە شەڕدا بوون، پەلاماریاندان و شكاندنیان، ئەرمەن هەلاتن و ڕاونران، بەشێكیان چوونە دێی (مەرمیت)ەوە و ئەوانی دی بۆ (فادار) و لەو ناوەدا نەمان.

(نالیە) گوندێكی گەورەی ئەرمەنبوو، چوارسەد ماڵێك دەبوو، هێزەكانی خۆیان تیا مۆڵدا و چوونەوە بۆ شەڕ، هێزێكی سەربازی سەد كەسی ئەسپسوار دوای نوێژی عەسر لە ڤانەوە ڕووەو ئێمە هاتن و هێرشیان كرد، پیاوەكان گوتیان: خوای گەورە خۆ دیسان هاتنەوە، دوایی زانیمان كە

ئەرمەنی ڕووسیایی بوون، تەقوتۆقی شەڕەکەیان گوێ لێبووە و بە دەنگەوە هاتوون، تا مەغریب وێستان و لەوەدوا کەوتنە پەلاماردان، زۆری نەخایاند فیشەکمان نەما، فرسەتیان هێنا و دابارینە ناو ئاوایی، موسوڵمانێکی زۆر شەهید بوو، خەڵکەکە لە ترسان ڕایاندەکرد، دوو بۆ سێ هەزار موسوڵمانبوون، ئاگریان بەیەك بەیەکی ماڵەکانەوە دەنا، گوندەکە یەکپارچە بووە گڕ و بڵێسە و بەحەوادا دەچوو، منداڵەکانیا حەوا دەداو بەنووکی قەمەکانیان دەیانگرتنەوە، قەمەیان دەکرد بە ورگیاندا و دەیانقیژاند، هەندێ کچ و ژن خۆیان دایە دەم ئاوەکەوە، هەندێکی تر بۆ ناو ئەو پاوەن و پووشانەی گڕیان لێ بەرز دەبۆوە.

بڕێ منداڵ و ئافرەتی بەستەزمانیان دەنایە ناو تەویلە و کایەکانەوە و ئینجا ئاگریان پێوە دەنان، کەسانی دی وەك کارژۆلە گۆشاوگۆش سەردەبڕران، تەنیا یەك منداڵ قوتاربوو، ئەویش برایم خۆی بوو.

دیارە پاشان لێم پرسی کە چۆن ڕزگاری بووە و توانیویە هەڵبێ؟

تا توانیان قەلاچۆی ئەو خەڵکەیان کرد، تا تاریکی کرد کوشتار هەر بەردەوامبوو، بڕیار بوو کەسێك بە زیندوویی نەهێڵنەوە. عەریف (سیات)یان گرت لە توانیان لێیاندا، ئینجا جلەکانیان دڕاند و لە شانیەوە پێستیان دادەماڵی، دەیانگوت ئەوە نیشانەی شەرەفە و لەجیاتی سوڵتان ڕەشاد بەشانیدا دەکەین، هەردوو دەستیان بڕی و لە پێستەکەی قەبرغەی توورەکەیەکیان دروست کرد.

کە پیاوەکانیان کوشت شەش ژنی هەرزەکاری جوانیشیان یەك بە دوی یەکدا نا بە گوللەوە، ئەوانە (سەمەر)ی ئامۆزام و (ئەسمای) موختار و (خەیرییە) پورم و (ئایشێ) ئامۆژنم و (گولو) بوون.

ئەرمەنەکان لە ڕۆیشتندابوون کە (ئەزفادور)ی کوڕی (گیربیدیە)هاتو ئێمەی دۆزیەوە، باوکم لە گوندی (بیردقچی) ئەوان گەلێ ڕێزدار و

خۆشەویستبوو، چونکە کاتیخۆی (کیربییە)ی لە مردن گێڕابۆوە. بە هاوەڵەکانی گوت: لێیانگەڕێن.

بەمە مردنی لێ دورخستینەوە (ئەو ئانە باوکم لە ڕیزی خۆبەخشاندا بوو لە ئێران) کە ئەرمەنەکان ڕۆیشتن لە کونەکە هاتینە دەر، ناڵە و گروزانەوەی بریندارەکانمان گوێ لێبوو. هاوار کەسێك نییە بێبەلامانا، تیمارمانکات، چۆڕێ ئاو بکا بەددممانەوە؟

(ئەزفادور) بردینیە گوندی (بیردقچی) و ماوەیە لەوێ ماینەوە، خزمەکەم ڕوداوەکانی ئەوێی بۆ دەگێڕاینەوە و سوێندی دەخوارد کە:

ئەرمەنەکان ئێوارە هاتن، لە نێو ١٥٠ ئافرەتی گوندەکە ١٠ بۆ ١١ ئافورەتیان هەڵبژارد و تێیان بەربوونو تا بەیانی لاقەیان دەکردن، ئیتر ئەو ژنانەیان بە شێوەیە کە لەناو خوێناوی خۆیاندا جێهێشت. باسناکرێ.

ئەو بەردەوامبوو لە گێڕانەوەی کە چ ئەهامەتیە بەسەر گوندەکەیاندا هاتووە، دەیگوت: ژنێك نانی دەکرد، ئەرمەنیەك لێی پرسی: خەریکی چیت؟ وەلامی داوە و پێی گوت: وەك دەبینی نان دەکەم. دیسان پرسی: ئەی ئەختێ گۆشتی برژاویشت ناوێ؟ ئینجا مناڵێکی بە قەمەکەی داپاچی و هەڵی دایە ناو فرنەکەوە، مناڵەکە بە شێوەیەکی ترسناك لەناو فرنەکەدا هەڵدەقرچا و ژنەی بێ دەستەلاتیش ئەبلەق و بێدەنگ دەیڕوانیە ئەو مناڵەی بە زیندویی بە بەرچاویەوە دەسووتا.

ئەم کاتە بوو حوکمەتە ڕووسەکەی ڤان دامەزرا و (ئارام پاشا) بووە سەرۆك، پاش کەمێ ئاگاداریەکی دا و دەیگوت: با هەمووان بێنە ناو ڤانەوە، لێرە خواردن و خواردنەوەی بەلاش بۆ هەموانە، باوکم ئەو کاتە لەگەڵ سوپاکەی خەلیل پاشادا هاتبۆوە گوندی (خاجیك) باوکم و خاڵوانم کە ئەو ئاگاداریەی حوکمەتی ڤان دەبیەن، چووبوونە ڤان، بەڵام حەیف، جگە لە شارێکی بەسووتماکبوو خۆڵەمێش چیتریان چاو پێ نەکەوتبوو، بینا و

مزگەوت و حەمام و فەرمانگە و خانوەکان گشتیان کاول کرابوون و سووتێنرابوون، باوکم چووبووە گەڕەکی (هەشبوغان) کە هەندێ خانووی ئەرمەنی تێدابوو، بە ڕێکەوت (ئەزفادور) دەبینێ، پاش سڵاو دەڵێ: بەیانیت باش خەلیلاغا. باوکم پاش وەڵام لێی پرسی: ئاخۆ هیچ هەواڵێکی ناوایەکەمانت لا نییە؟، ئەویش دەڵێ: هەواڵ؟ (زیفیە) کاول بووە، گشتی وێرانە، جگە لە خێزان و کچ و کوڕەکەی تۆ کەسیکە دەرنەچووە. ڕزگارم کردون و کەی ئارەزوکەیت دەیاندەمەوە دەستت. باوکم دەڵێ: پیاوەتی تۆیە، بەڵام گەر بچمە ئەوێ دەمکوژن، دەکرێ ئەوانم بۆ بهێنی تا لەتەك خۆمدا بیانبەم؟

ئەو ئێوارەیە ئەزفادور هاتەوە لامان و پێی گوتین: ئەمڕۆ خەلیلاغام دی، ئامادەبن دەتانبەم بۆ لای. بەیانی خستینیە گالیسکەکەیەوە و بردینی بۆ ڤان. هەرگیز ئەو ڕۆژەمان لەیاد ناچێ، لە ڤانەوە باوکم بردینی بۆ هوشاب، لەوێ زۆر نەماینەوە، چونکە ڕۆژ نەبوو ئەرمەن پەلاماری نەدات. (خێزانەکە بووە پەنابەر)،

خەڵکێکی زۆر ڕووەو ئێران بوونەوە، یان ڕووەو ماردین و ئامادە، ئەوانە تێدەکۆشان تا بە زیندوی بمێننەوە.

## ● پەراوێزەکان

١- وامان بڕیار دا کە هیچ شتێ لەبابەت کوشتن و ئەشکەنجەدان و ئەتککردن ولاقەکردنێکەوە نە باسی کەین نە لە سەرچاوەی تر دەوەی وەرگرین، هەرچەندە سەرچاوەکان پڕن لە وەسفکردنی ئەمجۆرە ڕەفتارانە پێویست بە باسکردن وەسفکردنی ئەمانە نییە، چونکە بەڵگەکان بۆبوونی ئەم جۆرە ڕەفتارانە ئاشکرا و دیارن، تەنیا شتێکی بەدەر لەمانە (شایەدیەکەی برایم سرجین)ە قسە و باسەکانی کتومت وەك ئەوەن کە خۆی

گوتوونی و بگرە بەشێکی کەمیشی لەو وەسفانە تێدایە، بێجگە لەوەی کە زوربەی ئەوانەی لە گوندەکاندا بەپاڵ ئاوارەکانی ڤانەوە ئازاریان چەشتووە نەیانتوانیوە دمرد و پەژارەکانی خۆیان. بخەنە ڕوو، لیژنەیەکی عوسمانی لە بۆ کۆکردنەوەی ڕاپۆرت لەسەر ئەو کوێرەوەریانەی ڤان و ناوچەکانی دی درێغیان نەکردووە، هەروا ئەفسەرانی ناو سوپای عوسمانیش ڕاپۆرتی خۆیان دەنارده ئەستەموول و تیایانـدا باسـیان لـەو قـەتڵ و عامـە دەکـرد کـە ئەرمەنـــەکان کردویانـــە، کـــاتیخۆی بەشـــێکی کـــەمی ئـــەو ڕاپۆرتانـــە بلاوکراونەتەوە

Documents sur les atrocites Armeno – Russes. Tures et Armcnians کارا شەمس Anomyme de papeterie et dlmprimerie 1917 La Guerre ئەحمەد رۆستەم Imprimerie Nationale 1919: جنێڤ devant Ihisyoire (Istaempfli 1918: بێرن Mondiale et Question Turco Armenienne

هـــەردوو جزمـــی کتێبەکـــە بەرپرســـانی دەوڵـــەت نووســـیویانە، بەڵگەنامەکانیان کۆکردۆتەوە و لەو دوو جزمـەدا بلاویـان کردونەتـەوە، لـەم دوایيانەدا کتێبێکی زۆری تر چاپ کراون، لەوانە:

Ermeniler Tarafindan Yapilan Katliam Belgeleri 1914 - 1919

کە لـەوانی تـر زیـاتر درێـژەی بـە بـاس و وەسـفی کارەسـاتەکان داوە، Basbakanlik Devlet Arisvleri Genel Mudurlugu Osmanli Arsivi Daire Basknligi ٢٠٠١

ئاماژەدان بەو سەرچاوانە پەیوەستە بە قسەکانی ئەوانـەی دەربـازبوون لە کارەساتەکان نەك بەو شیکردنەوە و لێکدانەوانەی کە لە کتێبەکاندان.

٢- Ermeniler Belgeleri . pp ٥ - ١٠

٣- Documents sur les atrocites. Pp ١٨ - ١٩ . ٢٤ - ٢٧

٤- کارا شەمس ٤٤Tures et Armenians . p
ئەحمەد ڕۆستەم ١٠٠La Guerre mondiale. P
BOA HR SYS 2872/2. Belge No.9. Ermeniler Belgeleri. P 7, 45

٥- سەرچاوەی پێشوو: ٩٧ - ٧,١١,٣١ Ermeniler Belgeleri. P

٦- لە ڕاستیدا (بشکالە) پایتەختی یەکەم حوکمەتەکەی ئەرمەنبووە نەك ڤان بەڵام زۆر کەمخایەنبوو. بڕوانە: Documents sur les atrocites.

٧- کاراشەمس: ٤١Turcs et Armenians. P

٨- موختاریان کە هەرگیز باس لە پەلامارەکانی یەکەمجاری ئەرمەنەکان ناکات بۆ سەر موسوڵمانەکان، سوورە لەسەر ئەوەی کە گشت ئەرمەنەکانی دانیشتوی (بشکالە) هەر دوای کشانەوەی سوپای ڕووس سەربڕراون
An Account of the Glorious struggle of Van vasbouragan
کە ساموێل.س.تاربینیان وەری گێڕاوە، دیترویت I General ٣.p ١٩٦٧Society of vasbouragan

ئەگەر بیگوتبا: گشت ئەو ئەرمەنانەی مابوونەوە، دەکرا جێی باوەڕ بووایە، لە ڕاستیشدا ئەرمەنەکان هێجگار وا هەقیر نەبوون تا بمێننەوە و بەکلاو بگیرێن، موختاریان خۆی بەرپەرچی خۆی دەداتەوە، کاتێ دوای ئەمە دەڵێ کە گشت ئەرمەنەکان سەرنەبڕراون: ژن و کچە جوانە ئەرمەنیەکان هێنرانە مەخفەری (شامیران)ی ترکی تا بە موزایەدە بفرۆشرێن و ئارەزووە وەحشیەکانی خۆیانیان تیا بەتاڵ کەنەوە (ل:٢). ئەم سەرنجە هێند ناخۆشە کە زور بە ئاسانی دەکرا باس نەکرایە، بەڵام ئەوەی جێی گوتنە ئەوەیە کە تەنیا یەك بەرپرسی عوسمانی یان نێردراوە ئامریکاییەکان و بیانیەکان (ئیتالیایی و ئاڵمان و – دونوگالیس- و کەسانیدی) باس لە جۆرە مەزادێکی

ئاوا ناکەن، ئەگەر ببوایە بێگومـان سـەرنجیانی ڕادەکێشا، قسـەیەکی ئاوهـا وا دەکات کە گشت قسەکانی موختاریـان و نموونـەی ئـاوا کـە باسـیان دەکـات لـە کتێبەکەیدا ببنە جێی گومان و بوختان.

-٩ هەمان سەرچاوەی پەراوێزی (٧).

-١٠ هەمان سەرچاوەی پەراوێزی (٥)

-١١ هەر ئەو سەرچاوەیە.

-١٢ ئێرمیناسـیان لـە: ١٩١٥van pp. ٢١٨ - ٢٢ بـۆ نموونـە دێتـە سـەر وەسفی کاری پاکتاوکردنی ڕەگەزی لەلایەن عوسمانیانەوە بەڵام باس لە هیچ شۆڕشێ ناکات.

-١٣ Documents sur les atrocites. Pp ٤٩ - ٥١

-١٤ بـە گـوێرەی مەزنـدەی ئەرمەنـەکان ئەگـەر ژمـارەی پەنابـەرانی ئەرمـەن زینـدووەکان و ژمـارەی کـوژراوان کۆکەینـەوە، ئـەوا ژمارەیـەکی وا دەردەچێ کـە زیـاترە لـە ژمـارەی ئـەو ئەرمەنانـەی لـە ناوچـەکەدا دەژیـان. ئەمەش لەگەڵ ئەو سەرژمێریەیانە ڕێك ناکەوێ کە دوایـی بـۆ پەنابـەرانیان کردووە، عوسمانێکان هیچ شتێکی ڕوونیان نەداوە بە دەسـتەوە سـەبارەت بـە پەنابەرە موسوڵمانەکانی پێشتر.

-١٥ Documents sur les atrocites . p ١٥ - ١٦، ٢٠ - ٢٢، ٥٣

کاراشەمس Tures et Armenians . pp ٤٢ - ٤٣

-١٦ Ermeniler Belgeleri . pp ٥٢ - ٥٤

-١٧ ڕۆستەم، La Guerre modiake. Pp ٩٨ - ٩٩

-١٨ لەسـایەی شـەڕ و یاخیبوونەکـەدا، هـیچ بـاس و خواسـێکی کوشـتن نەهاتۆتـە گـۆڕێ، کوشـتنی ئەوانـەی شـەڕکەر نـەبوون لـەناو ڤانـدا، هـەروا بەڵگەکانیش لەم بارەیەوە کەمن، بڕوانە ( کارا شەمس ل٦٠ - ٦٢).

-١٩ بـــۆ زیـــاتر ڕونکردنـــەوە ســـەبارەت هەیکـــەلی حوکمەتەگـــە و

بەرپرسەکانی، بڕوانەرە موختاریان، ل١٢٤ - ٢٥

٢٠- هەر ئەو سەرچاوەیە، ل ١١٦ - ١٨، مسیۆنێری ئامریکایی خاتو (جۆرج. ك. مارسا ڕاینۆڵدز) نووسیویە کە ئەو ناوچەیەی تەنیا لەژێر دەستی ئەرمەندا نەبوو ئەدەسووتێنرا (لیژنەی ڕێپێدراوە ئامریکاییەکان ١٦،٨،٩ نێردراو بۆ ڕۆژهەڵاتی ترکیا، لیژنەی ئافرەتان، جزمی دوو، ترکیای ڕۆژهەڵات ١٩١٥ - ١٩٢٠، بەڵگەنامە و ڕاپۆرتەکان، نامەکان A-Z، لە کلارنس ئەشیرەوە بۆ ماڵەوەیان لە (کۆنیتیکۆت) ٢٠ ئەیار/ مایۆی ١٩١٥،

٢١- هەردوو مسیۆنێرە ئامریکاییەکە، خاتو (ج.ك.ڕاینۆڵدز) و (کلارنس ئەشیر) ددانیان ناوە بەو کوشت و بڕەی کە لە موسوڵمانەکان کراوە، خاتو ڕاینۆڵدز دەڵێ: لەوە دەکات ئەرمەنەکان تا ڕادەیەکی زۆر شووڵیان لێ هەڵکێشابێ، سوور بوون لەسەر تاڵان و بڕۆ و تۆڵە کردنەوە، هەرچەندە هەوڵماندا بۆ هێورکردنەوەیان بەڵام ئەوان نەیاندەبیست. ئەرمەنەکان زۆریان چەشتووە، بۆیە شتێکی سەیر نەبوو کە شووڵی لێ هەڵکێشن، ئەوا نیستە هەلیان بۆ هەڵکەوتووە بۆ تۆڵەکردنەوە. وەك بۆی دەچم ئەرمەنەکان دەیانەوێ ئەم هەرێمە بکەنە هەرێمێکی ئەرمەنی ڕوت (سەرچاوەکەی پەراوێزی پێشوو).

ئەم ئافرەتە لەنێو گشت نێردراوەکانی تردا ڕاستگۆترینیانبووە، بەڵام قسەکانی تەنیا بۆ لیژنە ئامریکاییەکە دەنارد، بە ئاشکرا دەری نەدەبڕین، بەڵام قسەکانی (ئەشیر) زیاتر ئاشکراتر بوون، ددانی ناوە بەوەی کە موسوڵمانە نێرینەکان دەکوژران، هەرچەندە کە قسە لەسەر ئافرەت و منداڵی موسوڵمانەکان دەکات کەمتر بەلای ڕاستیدا دەچێ: پیاوەکانیان دەکوشت و منداڵ و ئافەرمتەکانیان وازلێ دەهێنا، An American physicanin Turkey. P ٢٨٥

بەڵام هەرچەند دەیزانی کە خۆی نێردراوێکە، سەیر لەوەدایە کە

ڕەفتارەكانی ئەرمەنی باش دەناسی و تێیان گەیشتبوو، كاتێ ئەشیر ناچار نەبوو كە ڕەخنە لە ئەرمەن گرێ، وەك لەم حاڵی كوشتن و كوشتارەیاندا، قەت نەبۆتە شایەدێكی ئەوتو كە متمانەی پێ بكرێ، لەگەڵ ئەمەشدا، زۆر جار كتێبەكەی د. ئەشیر بەكارهاتووە لە وەسفكردنی ڕوداوەكانی ڤاندا، هەتا فیلمێكیش بە پشت بەستن بەو كتێبەی ئەو ئامادەكراوە، بۆیە دەبێ ئەگەر كەمیشبێ، شایەدیەكەی بەهێند وەرگیرێ.

هەڵە و ناڕاستیەكانی ئەو كتێبە وایان كردووە كە گشت ڕاپۆرتی ئەو نێردراوانە ببنە جێی گومان و متمانەیان پێ نەكرێ.

هەرچی بڕیاردانێكی پێشوەختی ئەو كاتەیە ئەشیر بەكاریان دێنێ، بەو پێیەی كە دەیڵێ گوایە موسوڵمانەكان لە كێشەی ئەرمەنەكان بەرپرسبوون، موسوڵمانەكان مەسیحیەكانیان نەدەویست، وا ڕاهاتبوون هەر سەركوتی ئەرمەنەكان بكەن و لێیاندەن، خۆ ئەگەر شكستیشیان خوارد ناچار دەبنە مەسیحی. لەباتی ئەوەی گومانمانبێ لە تیۆرەكەی ئەشیر سەبارەت بە یاخیبووەكەی ڤان، وا چاكترە سەرنجێ لە ڕاپۆرتەكانی تری بدەین كەدەربارەی مەسائیلی ترن.

كتێبەكە پڕە لە هەڵەی زەق لە باردی ڕوداو و ئەو شتانەی كە بوون، ئەو سوورە لەسەر ئەوەی كە ئالمانەكان لە ڤاندا جڵەوی كار و ڕوداوەكانیان بە دەستبووە، كە لە ڕاستیدا وا نەبووە، هەروا دەڵێ كە: چەند بەتالیۆنێ لە سوپای عوسمانی كە ئەرمەنبوون، هێرشیان كردۆتە سەر ڕووسەكان لە سنوور و شارێكیشیان لێ داگیر كردون:ل ٢١٧

بە تەنكید هەرگیز شتێك لەم چەشنە ڕوینەداوە و لەو جۆرە بەتالیۆنانەش نەبووە، وە نووسیویە گوایە: سیاسەتی (عەلی) حاكمی ڤان وای دەخواست كە شۆڕشگێڕانی ئەرمەن هانبدات تا چەك هاوردەكەن و گەنج و پیاوەكانیان بخەنە ژێر چەكەوە: ل١٢٦، كە ئەمەش قسەیەكە دور لە

لۆژیك و هەر شیاوی باسکردن نییە. دیسان دەنووسیّ کە: قانوونی مەدەنی عوسمانی ئەو قانوونەی ناپلیۆن بوو کە بەکاردەهات بۆ سەرکوتکردنی مەسیحییەکان: ل١٥٦ - ٥٨، ئەمەش قسەیەکە ڕێی تێناچیّ و دورە لە ڕاستییەوە.

لە لاپەڕە ١٥٧دا شتی زۆر بیّ بایەخی نووسیوە لەبارەی ئەوەی کە پیاوەکانی سوڵتان عەبدولحەمید خۆیان هانی ئەرمەنیان دەدا بۆ کارە شۆڕشگێڕیەکانیان. ل١٦١، وە دەڵیّ کە: کۆمەڵەی (ئیتیحاد و تەرەقی) بڕیاری دا کە ئەو بەڵگەنامانەی دەربارەی خۆ بەدەستەوەدانبوو، بیانهێڵێتەوە چونکە لە بەرژەوەندی تایبەتی خۆی بون: ل١٦٨. ئەم هەڵە و ناڕاستیانەی خرانە ڕوو جگە لە مشتیّ لە خەرواریّ شتێکی تر نین.

لە ١٩٠٥ کە کاپتن (تایریل) کونسوڵی بەریتانیا بوو لە ڤان، لەگەڵ د.ئەشیردا بەینیان زۆر خۆشبوو، جا لەسەر ئەوەی کە د. ئەشیر باسێکی لە ڕۆژنامەی (لەندەن تایمز)دا بڵاوکردبۆوە، دەڵیّ: ئەوەندە عەجباتیم لەمە دیّ کە ناتوانم بڕوا بە قسەکانی د.ئەشیر بکەم، بەر لەوەی لێشیان نەکۆڵمەوە مومکین نییە بە ڕاستیان بزانم.

تایریل بەوە گەیشتبوو کە چی پاڵ بەم نێردراوانەوە دەنیّ تا چارەی دەوڵەت فورسکەن و ناوی بزڕێنن: لە نووسینەکەی د. ئەشیردا نامانچی ڕاپۆرتی نێردراوەکان بەتایبەت لەبەشی دواییدا دەردەکەویّ، ئەوەش بریتیە لە وروژاندنی ڕای گشتی بەهۆی هەرشتیّ کە بینووسن. ڕۆژیّ لە ڕۆژان شتێکیان نەنووسیوە کە جیابیّ لەم ئامانجە و تا چەند لە بەرژەوەندی ئەرمەنە، ئەو دەستدرێژیانەی شۆڕشگێڕان دەیانکرد، ئەو ئاستەنگانەی کە دەبوو دەستەڵاتی ناوخۆ بەرەو ڕوویان بێتەوە، ئەو کارە باشانەی بەرپرسانی ترك دەیان کرد و هتد، باڵیۆزی بەریتانیاش سەرباری ئەمە دەڵیّ: ئەو وەزیرە ئامریکاییەی قسەم لەگەڵدا کرد پێی ڕاگەیاندم کە ئەو د. ئەشیر بە

کەسێکی ڕاستگۆ نازانێ، بەهۆی زێدەڕۆییە توندەکانیەوە و هەروا ڕق و کینەشی بەرامبەر بە ترك وەك ڕەگەزێك.

بە گورتی کە مەسەلەکە ترك بێت نابێ باوەڕ بە د.ئەشیر بکرێ نووسینەکانیش بۆ ئەو مەبەستە بەکارهاتوون، حوکمە پێشوەختەکانی و ناڕاستیەکانی ناچن بەلای ئەو باسانەی کە سەبارەت بە درمی تیفۆس و برسێتی و قات و قڕین. ل٢٢، بۆ نموونە کتێبی: Ermeniler Belgeleri
pp .١٩ - ٢٢

تەماشاکە، زۆربەی ڕاپۆرتەکانی ناو ئەمە باسی کوژراوەکان دەکات جار جار لیستیش بەناوەکانیان دەخاتە ڕوو.

٢٢- لە کتێبەکەدا ئیشارە بەم پەراوێزە نەدراوە —وەرگێڕ-

٢٣- سەرچاوە ئەرمەنەکان باس لەمەوە ناکەن، لە باتی ئەمە، دەڵێن گوایە هەموانیان داوەتە دەست نێردراوەکان، بەڵام ژنێکی موسوڵمان باس لە ئەرمەنێك دەکات کە بە هانایەوە چووە و بڕێ پارەی داوە پێی و لە ماڵەکەی خۆیدا شاردویەتیەوە:

Ermeniler Belgeleri . pp 140-43

هەروا ناوی (ساندیك ئەمینی ڕۆبین ئەفەندی) هاتووە کە دەڵێن ژیانی ژمارەیە ئافرەتی موسوڵمانی پاراستووە، کە ئەرمەنی تری لێ دوور خستوونەتەوە و نەیهێشتووە بیانکوژن. هەر ئەو سەرچاوەیە ل:١١ - ١٢

٢٤- Ermeniler Belgeleri . pp ١١ — ١٢. ٢٢ — ٢٤. ٥٢ — ٥٣. ١٤٠ - ١٤٤

Documents sur les atrocites . pp 38-39. Turcs et Armeniens pp 46 - 48. 64 - 65

وە ئەشیر: لە کتێبی An American phsican in Turkey. P ٢٨٩ - ٩١ دەڵێن کە پەنابەرەکان لەجێیەکی زۆر ئەمیندا بوون بەڵام زۆر پەست و شپرزەبوون، کەچی پەنابەران خۆیان ئەو قسانە ڕەتدەکەنەوە،

قسەکانیان وەك یەکە، هەتا باس لە ژمارەی ئەو ئانانەش دەکەن کە پێیانداون، بۆیە سووك و ئاسان ناتوانرێ بڕوا بە نێردراوەکان بکرێ.

موختاریان دەڵێ: ١١٧An Account. P ، ژمارەیەکی زۆر لە دیلەکان، کە زوربەیان پیاوی بێ چەك و ژن و پیر و منالی بێکەس بوون، بران و بەڵام هیچ کام لەمانە نەکوژران، ئەوەی لەمە ڕزگاری بووە، قسەکانی لەگەڵ ئەوەی لێرەدایە جیاوازە، هەتا وردەکاری و ناوی ئەو کەسانەش دەدەن کە کوژراون و چۆناهیش کوشتویانن. کتاب: ل٢٤ - ٤١ دەڵێ کە هەزار موسوڵمان درانە دەست نێردراوەکان تا بیانپارێزن، بە پێی ئەوەی دەیگێڕێتەوە گوایە نێردراون بۆ گوندەکان تا دور بن لە کوشتن و ئازاردانەوە، ئەوانەشی ڕزگاریانبووە هیچ شتێ باس ناکەن لەبارەی ئەوەی کە گوندەکانیان جێهێشتبێ، هەرچەند دەڵێن کە هەندێ ئافرەت بە مەیلی خۆیان ڕۆیشتوون. ئەگەر کتاب ڕاستدەکات، بەپێی چارەنووسی لادێییە موسوڵمانەکانی هەرێمی ڤانەوە ئەوا ئەمە جێی گومانە. (بڕوانە ئەو زانیاریانەی خوارەوە).

١٠ Documents sur les atrocites . pp -٢٥

٢٦- ژمارەیەکی زۆری کوردەکان لە خزمەتی سەربازی عەفو کران چونکە لە یەکە غەیرە نیزامیەکاندا چەکیان بە شانەوە بوو یا ڕاسپێردرابوون کە بە ئیش و کاری زەرعاتەوە خەریکبن، ئیتر ئاوا لە گوندەکانیان مانەوە.

٤٢ - ١٤٠Ermeniler Belgeleri . pp -٢٧

٢٨- بگەڕێوە بۆ (شایەدیەکەی برایم سرجین) لەم بەشەدا.

Documents sur les atrocites . pp . Turcs et Armeniens. P 60 - 61 Ermeniler 29- Armeniens. Pp 60 - 61 Ermeniler Belgeleri. P 10. 32. 50 کارا شەمس

هەندێ لە ناوەکان بەهەڵە نووسراون، چونکە بەپێی خوێندنەوەیان بە پیتی فرانسی و کوردی نووسراون، هەروا هەندێ ناو بە ڕێنووسی جیا جیا

نووسراون (بۆ نموونە Zeve و Zive)، ئەم سەرچاوانەی ناویان براوە ناوی گەلێ گوندی کاولبووی هاتیا، بەلام وا دیارە هەواڵدەرەکان تەنیا ناوی ئەو گوندانەیان داوە کە نێزیك بە خۆیانبوون، زۆریان لەو لادێییە نەشارەزایانەبوون کە ئاگایان لە گوندە دوورەکان نەبووە، ڕاپۆرتەکان وادەگەیەنن کە (ئارام پاشا) خۆی سەرکردەیی ئەو هێرشانەی دەکرد بۆسەر گوندی موسوڵمانەکان، ئەمەش ئەگەرێکی لاوازە بەلام هیچ دوریش نییە وابێت، لەوانەیە پەلاماردەرەکان گوتبێتیان کە: ئارام ئاردونی تا وابکەن.ل ١٦ - ٢٠.

٣٠- ژمارەیەکی کەم چوون بۆ ئێران، ڕۆژاوای ئێرانیش لەسەر دەستی ڕووس و ئەرمەندا بوو، بۆیە تەنیا ئەفرادی عەشایرەکان لە ئاسوودەییدا بوون. وەك عادەتی بار و وەزعی ئێران فشەل و ناجێگیر بوو، بەلام ئەرمەن سەلماس و هەندێ ناوچەی تریان بە دەستەوە بوو، لەسەرەتای جەنگەکەدا نەستووریەکان پاش ئەوەی کوردەکان و سەربازەکان شکاندنیان و ڕاویاننان گەیشتنە ئەو ناوە، عەشایرە کوردەکانی ناو ئێران هەرگیز جڵەوگیر نەکراون، جا هەروەك لەبەشی پێشوودا هاتووە ئەم کوردانە بە درێژایی مێژوو بار و ڕەوشی ئەو ناوەیان دەشلەژاند، لە جەنگەکەدا تا ئەوپەڕی بێلایەنبوون، بەلام هەندێکیان بەپێی ئەوەی کام لایان لەسەرکەوتنەوە نێزیکترە دەبوونە تەرەفگیری ڕووسەکان یان عوسمانیەکان.

٣١- Ermeniler Belgeleri . pp ١٣ - ٣١ولاخی بەرزە کەمبوو، سوپا داوای کردبوو کە بیانهێنن.

٣٢- گارا شەمس، ل١٦، جستن مەکارسی:

Muslims and Minorities ( New York University press. 1983 pp 104 - 108: نیویۆرك

٣٣- ئەو سەرچاوەیەی پەراوێزی (٢٩). ل: ١٤، ٢١، ٥٢، ١٤٤

٢٤- Ermeniler Belgeleri . p ٢٤

٣٥- هەندێ لە هەرێمی ڤانەوە هەڵاتنە پەتلیس، بەبەلەم بەناو دەریاچەی ڤاندا، ئەرمەنەکان کە زوربەی زۆری ئەو خاوەن بەلەمانەبوون یا کەشتیە بچووکەکانیان لێ دەخوری، پەنابەرە دەوڵەمەند و پارەدارەکانیان بە پارەیەکی زۆر دەگواستەوە، ئەمە وەك دەردەکەوت ڕێگەیەکی ئاسانبوو بۆ هەڵاتن. بەڵام زوربەیان هەرگیز نەدەگەیشتنە بەری ئەوبەرەوە، ئەوەشی دەگەیی زۆر کەرەت دەکەوتە دەست شەڕکەر و سەربازەکانی ڕووس کە دوایی ڕووەو کەناراوی ڕۆژاوای دەریاچەکە دەبوونەوە، کارا شەمس. ل:٦٢

٣٦- (غیڤاش و هافاسوور) دوو مەڵبەندی سەرەکیبوون کە لێیانەوە پەلامارەکان دەدران بۆسەر گوندی موسوڵمانەکان. بڕوانە:

Documents sur les atrocites . pp 35 Ermeniler Belgeleri . pp 144 - 45

٣٧- سەرچاوەی پێشوو، ل:٢٠ - ٢١ کۆرگانۆڤ لە کتێبی:

La participation des Armeniens a la Gurre mondiale

وەسفی ئەو ناوچەیە وادەکات کە کەوتۆتە ژێر دەستی داگیرکردنی فەیلەقەکانی ئەرمەن و یەکە خۆبەخشەکانیانەوە لە دەڤەرەکەدا.

٣٨- ئەرمەنەکان وایان خەمڵاندبوو کە دەوروبەری ٢٠٠ سواری ڕووس و نزیکەی هەزار ئەرمەن دەهاتنە پێشەوە و نزیکدەبوونەوە. (سەرچاوەی پەراوێزی (٣٦). ل:٣٨

ATASE Arsivi. I. Dunya Harbi Kolleksiyonu. K 2950. D. 14. F 1 - 62

٤٠- بڕوانە ئەو زانیاریە زۆرانەی کە پەیوەندن بە پەلامارەکانی ئەرمەنەوە لە پەتلیس، لە بەڵگەنامەی (١٦٢) لە: Ermeniler Belgeleri

٤١- جووڵە و چالاکیەکانی سوپا و ئەو شەڕە سەخت و ئاڵۆزانەیان لەو ماوەیەدا بەدەرە لە توانای ئەم لێکۆڵینەوەیەی ئێمە، بڕوانە:

ئالن و موراتۆف: Turk Harbi. Pp ٦٨٨ - ٨٧٤
Caucasian BattleFields. Pp 302 - 63
٤٢- سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٣٩): K- ٥٢٤٠ - D ٦. F ١. - ١٤
٤٣- هەر ئەو سەرچاوەیە: K- ٢٩٥٠ F. - D ١. - ٢٩
٤٤- د.ئەشیر An American physican in Turkey. Pp ٢١١ - ١٢

یەك لەسەرچاوە دەگمەنەکانە سەبارەت بەم ڕوداوانە، ئەمیش وەك عادەتی سەرچاوەیەکە جێی باوەڕ نییە، دەڵێ گوایە ٧٠٠٠ هەزار کەس کوژراون، ئەمەش بە پێی پشکنینی ئێسکەکانیان لە دواییدا(!)، وە گوایە ئەرمەنەکان لە بەرزاییەکانەوە خۆیان بەرداوەتەوە و خۆیان و منداڵەکانیان کوشتووە نەك بکەونە دیلی دەستی دوژمن، کە ئەمە زۆر دورە لە باوك بودشێتەوە، هەروا وشەی (ترکەکان) بەرکاردێنێ بۆ دوژمن، لە کاتێکدا هیچ یەکەیەکی سەربازی لەو ناوچەیەدا نەبووە، دەڵێ کە دوای تێپەڕینی نێردراوەکان تەنیا کەسێك نەیتوانیوە لە بارگیری بەولاتر بڕوات، ئەمەش سەلمێنراوە کە ڕاست نییە، موختاریان دەستدرێژیکەرانی وەك خۆیان وەسف کردووە، هیچ شتێکی هەڵەش دەربارەی ئەو ڕێگە و بانانەی لێیەوەی هەڵدەهاتن کە داخرابن ناڵێ. هەرچەندە تەقدیری ئەمیش بۆ ژمارەی کوژراوەکان وا دیارە تا ڕادەیەکی نامەقوول زۆرە: (لە تەنگە و دەربەندە شاخاویەکاندا، لە بارگیری، دەیان هەزار بەدەستی کوردەکان ئیا دەچوون و فەوتان: (موختاریان An Account. P ١٣٦)

هەروا بڕوانە: تیرمیناسیان van ١٩١٥ p .٢٤٢
بۆ دەستخستنی زانیاری لەبارەی ڕاکردنی پەنابەرانەوە.
٤٥- بڕوانە پاشکۆی سێیەم لەم کتێبەدا.
٤٦- ئالن و موراتۆف. ل: ٦٩ — ٥٧ — ٥٢ - ٨٤٢ . کورگانۆف. ل٣١٩ - ٢٣
٤٧- ڕیتشارد. ج.هوفانیسیان:
Armenia on the Road to Indepedence 1918

(university of california press 1967. pp 58- 62

٤٨- وەزيرى كشتوكاڵ: ا.ف. كريفوشاين، كە لێوەى وەرگيراوە، هەر لەو سەرچاوەيەدا. ل٥٨

٤٩- هەر ئەو سەرچاوەيە. ل٦٢ - ٦٤، لە واقيعدا ئەو كوردانەى لە عوسمانيەكان ياخيبوون، نازناوى فەخرى خۆيان دەستكەوت، بڕوانە باسى (چوونە پاڵ ڕووس) لە بەشى حەوتەمى ئەم كتێبە.

٥٠- ا. هولكى سارال ؛

Vatan nasil Kurtarildt Nur Daglari (Amanoslar). Toroslar. Adana. Maras. Gazianatep ve urfada yapilan Kuvayi milliye Savaslari (Turkiye Is Bankasi Kultur Yayinlari 1970. p 210

٥١- عيززەت ئۆراس: The Armenians in history and the Armenian Questio (Documentary poblications ١٩٨٨ pp . ٦٢١ - ٢٣

كورگانۆڤ لە كتێبەكەيدا تەنيا باس لەسەر لەنوێ ڕێكخستنەوەى يەكە ئەرمەنيەكان دەكات و هيچى تر، كێشە و گيروگرفتەكانى ئەم كارە باسناكات.

٥٢- Birinci Dunya Harbnde Turk Harbi. Kafkas Cephesi zuncu ordu Hareka Genelkurmay Basmevi: ١٩٩٣

ئەنكەرە) جزمى دوو. ل ٤٢٨ (ئالن و موراتۆڤ. ل ٤٤٩).

٥٣- وەسفى ئەو سنوورەى كە دەشێ زۆر گۆڕابێ، لە كتێبەكەى (مارسابيديان)ەوە وەرگيراوە:

لە 75 The van - vaspurakani herosamar Administration of Van

كە چاپى (ه.م.بۆغۆسيان، ه.د.بابازيان)ە لە يەريڤان ١٩٩٠ كە (بيرسن كاراكا) وەرى گێڕاوە تايبەت بۆ ئەم لێكۆڵينەوەيە، لاپەڕە: ١١٥ - ٢٦. دەبێ ئەو

ناوچەیەی کە وەسفکراوە بەتەواوی لەژێر دەستی ئەرمەنەکاندا نەبووبێ. (مارسا بیدیان) وردەکاریەکی زۆر دەداتە دەست لە بارەی پێکهاتەی دووەمجاری حوکمەتە ئەرمەنیەکەی ڤان.

٥٤-ریتشارد.ج. هۆڤانیسیان: The Repoblic of Armenia

جزمی دوو (بێرکلی: University of California press ١٩٧١p. ١٦

پێشتر هوفانیسیان نووسیویە کە ١٥٠٠٠٠ هەزار کەس هاتنە ڤان و پەتلیس و ئەرزرۆم و تەرابزونەوە، ئەمە لەگەڵ هاتنی بەهاری ١٩١٧:

Armenia on the Road to Independence. P 79

دیارە ئەم خەملاندنە لەوە دەچێ وردتر و ڕاستتربێت.

٥٥- جزمی دووی، کتێبی: Birinci Dunya Harbnde Turk Harbi

ل: ٤٨٣ - ٤٩١، ٩٢

٥٦- بگەڕێوە سەر باسی (ئامادەکاریە سیاسیەکان بۆ یاخیبوونەکەی ئەرمەن) لە بەشی هەشتەمدا و وە پاشکۆی چوارەمیش تەماشاکە.

٥٧- تا ترکەکان هیچ هیوایەکیان بە گەڕانەوە نەبێت، زۆر زەرووری بوو کە گشت گەڕەککەکانیان تالانکرێن ئینجا وێرانیش کرێن (موختاریان ل: An Account. P ١١٧)

٥٨- هەرەو سەرچاوەیە : ل: ١١٦ - ١٧ . لە چەند ڕۆژێکی ' ەمدا، هەرچی ناو و ناونیشانی حوکمەتی ترکی ستەمکاری پێوە بوو کەوتە بەر سوتاندن و کاولکردن و پاکردنەوە لەژێر پێی گەلی ئەرمەنی تینو بۆ تۆڵەکردنەوە لە سەدان ساڵەوە. (بوهاریان: The Legendery clash in Van. Pp ٢٤ - ٤٤)

٥٩- لێرەدا پێویست بەوە ناکات لیستی دورودرێژ بەناوی گوندەکانەوە بدەین، بۆ نموونە بڕوانە ئەو پەرەگرافانەی کە وەسفیان دەکات، لە کتێبەکەی (کارا شەمس. ل: ٦١، ٦٥، ٦٨

٦٠- بۆ دەستخستنی لیستی دورو درێژ بڕوانە ئەو سەرچاوەیە لاپەڕە: ٦٧ - ٦٨ (پەتلیس. هەروەها:

Documents sur les atrocites . p 24

٦١- عوسمانێکان لەلای خۆیان لیستی دورودرێژیان پاراستووە لەبارەی کاولکردنی بینا و دامەزراوەکانی دەوڵەتەوە لە ناوچە جیاجیاکاندا، هەر وەك نموونە، یەك لە لیستە بچووکەکان:

In Gevas Hacihani. Agdad, perkuri, zive ve Hacizive, pirkal, mirhasanveli ve Arvas in Mukus, In Satak (Catak) Kaza Kurandest, In Van vanzivesi Mollakasim, Vanda Hindibaba, Seyhabdurrahmangazi, seyhgazali, In gevar Kaza Alilan, Yaplan (Ermeniler (Belgeleri. P 11

٦٢- بڕوانە پاشکۆی سێ سەبارەت بە ژمارەی پەنابەرەکان.

٦٣- فایلی ٢٧٦٨/٣٧١ لە ستیفنز بۆ هـ.م وەزیری یەکەمی دەوڵەت بۆ کاروباری دەرەوە، باتووم ٢ کانوونی دوو/ یەنایر ١٩١٦

٦٤- ئەوەی پەیوەندیی بە ڕەوشی کۆماری ئەرمەنستانەوە، لە کتێبەکەی هوڤانیسیانی بۆ بڕوانە:

The Repoblic of Armenia pp 126 - 33

ئەم دەنووسێ: کە ساڵی ١٩١٩ گەیشتە نیوەی ٢٠٪ی دانیشتوانی کۆمارەکە فەوتان. ل٣٠

٦٥- بۆ دەستخستنی زانیاری لەبارەی ئەو کۆمەکە زۆرانەی بۆ ئەرمەن دەهات، بڕوانە: جایمس.ل.بارتون:

Macmillan 1930 نیویۆرك The story of Near East Relief

٦٦- مەکارسی: Muslims and Minorities. Pp ١١٢ – ١٣٢ - ١٥٩

ژمارەی ١٩٤٠٠٠ هەزار ئاماژەیە بۆ تەلەفیاتی بەشەری کە تیاچوون، نەك ئەوانەی مردون. کە ئەمەش ژمارەی موسوڵمانەکانە لە ١٩١٢ بەڵام ژمارەی

موسوڵمانانی ساڵی ۱۹۲۳ی لێ دەرکراوە. کەمترین شتێ کە بگوترێ ئەوەیە کە ئەم ژمارانە لە ژمارەی مردوانی موسوڵمانەکان کەمدەکاتەوە، چونکە ژمارەی ئەو کوردە دەرکراوە کەمانە ناگرێتە خۆ، ئەوانەی کۆماری ئەرمەنستانیان جێهێشت و هاتنە ئەنەدۆڵ. لەوانەیە ئەم ژمارەیە بەر ژمارەکانی ساڵی ۱۹۲۲ بکەوێ، کەوا دەکات تەلەفیاتە بەشەریەکان کەمتر بن لەوەی کە لە ڕاستیدا هەن. بڕوانە: Muslims and Minorities

تا ژمارەی وردو حیساباتی ئەم مەسەلەیەت دەستکەوێ.

٦٧- بڕوانە جەستن مەکارسی: Darwin.۱۹۹٥ Death and ( Exile... بریتستون) ل ۲۲۲-۲۳ بۆ دەستخستنی زانیاری و سەرچاوەی تر، ژمارەی ۸٦۸ و ۹٦۲ تەنیا بە کورتی باسی لێوە کراوە، لە درێژەی ئەو ژمارانەدا بۆمانگی تشرینی یەك/ ئەکتۆبەر ۱۹۱٦ لیژنەی پەنابەران وای تەقدیر کردووە کە ژمارەیان لە هەرێمی ڤان و بەتلیسدا گەیشتۆتە ۲۰۰۰۰۰ هەزار بەڵام ئەوەش دەڵێن کە سەر ژمێریەکە بە ڕێژەی ۲۰٪ کەم کراوەتەوە، بەڵام ئەو ڕێژەیە زۆر زیاتر بووە ٢٠٪.

بۆ زانینی بەدەنگەوە هاتنی عوسمانیەکان بەرامبەر تەنگژەی پەنابەران بڕوانە:

Documents on Ottoman Armenins

کە سێ جزمە (ئەنکەرە بەڕێوەبەرایەتی گشتی سەرۆکایەتی دەوڵەت بۆ ڕۆژنامەوانی و زانیاریەکان ۱۹۸۲، ۸۳، ۸٦ جزمی یەکەم. ل ۱۱۸ - ۲٤

٦٨- ڕاپۆرتەکەی (مایلز و مازرلاند) لە کتێبەکەی جەستن مەکارسی:

American commosion to Anatolia and the Report of Niles and sutherland. Turk Tarih Kurumu 1994. ئەنکەرە Kongresi XI. Ankara 5 - 9 Eylul 1990

٦٩- مەکارسی: Death and Exile. P ۲۱۷

٧٠- هەر بۆ نموونە بڕوانە: Ermeniler Documents sur les Atrocites. Pp51- 52 Blgeleri. P23

٤٠Turcs et Armeniens Devant I histoire. P کارا شەمس:
جەستن مەکارسی خۆی برایم سەرجینی لە دوو بۆنەدا دیوە و لەگەڵی چۆتە گوندی (زیف) کە ئیستە کاولەیەکە و تەنیا مۆنۆمێنتێکی ئەو شەهیدانەی تێدایە، هەرچەندە حەفتا ساڵ بەسەر ئەمەدا ڕابوردوە، بەلاّم یادەوەریەکانی سەرجین ڕون و ئاشکرا دەنوێنن، جگە لەو شایەدیەی لێرەدا داویە شتی زۆرتری باس کردووە، ئەم چیرۆکە تەرجەمەیەکی ئەو شایەدیەی سەرجینە کە چاپ و بلاّوکراوەتەوە بە:

A.suslu.G. Ogun and. T. Serdar. Van. Bitlis. Mus. Mus ve kars taki Ermeni Katliamlari. Van Yuzuncu Yil Universitesi. 1994. pp 34 - 39 ئەنکەرە

٧١- هەندێ کەڕەت، گوندی موسوڵمانانی تر هەبووە چەکدار بوون و مەقاوەمەیان کردووە، بەلاّم دەرفەتی ئەرمەنی ناوخۆ و ئەوانەی لە ڕووسیاوە هاتبوون نەدەهاتن (بۆ نموونە بڕوانەرە:

( Documents sur les atrocites . pp 19 - 20

دەوڵەت هەندێ دەمانچەی بەسەر گوندەکاندا دابەشکردبوو، بە گوێرەی ئەوەی سەرجین دەڵێ حوکمەت وەك یەك چەکی دەدا بە موسوڵمان و ئەرمەنەکان، ئەمە لەبەشی هەشتەمیشدا باسکراوە.

٧٢- ئەو زاراوەیەی لێرەدا بە (بەندکردن) لە esir kaldik وە تەرجەمەکراوە، لە ناوەڕۆکدا مانای کۆیلایەتی دەگەیەنێ.

# بەشی دەیەم
# پوختەی باسەکە

شۆڕشگێران دەیان ساڵی ڕەبەقیان لە خۆئامادەکردندا بەفیڕۆچوو و هاتنە سەر کارەساتێکی تەواو، لەگەڵ ئەمەشدا، لۆمە و گلەیی لە پلانی تەکتیکی و پراکتیزەکردنی ئەو شۆڕشگێڕانە ناکرێ، دەبێ (ئارام مانوکیان) بەیەك لە بلیمەتەکانی شەڕی چەتە گەری دانرێ. بەر لەوەی شۆڕشگێڕانی سەردەم بە ماوەیەکی دوورودرێژ دروشمەکانیان وەك پشت بەستن بە جوتیاران، دەنگباتەوە، مانوکیان دەرکی بەوە کردبوو کە ڕێکخستن لە لادێکاندا دەبێ بەردی بناغەی هەر پرۆژەیەکی یاخیبوونبێ.

چەکدار کردنی جوتیارانی ئەرمەن، مەشق و ڕاهێنان و ڕێکخستنی ڕیزەکانیان بنچینەی سەرەکی سەرکەوتنە. لەوانەیە زەوتکردنی شاری ڤان لە عوسمانێکان ڕوونترین بەلگەبێ بۆ پیرۆزی حیزبی تاشناق، هەرچەندە لەمەدا هیممەتی ئەرمەنی لادێکانبوو کە زیانی گەورەی دەگەیاندە تەقەللا جەنگیەکانی عوسمانێکان، بەمانا تێکۆشانی ئەو لادێییە ئەرمەنانەی چووبوونە ناو ڕێکخراوەکەی نارام مانوکیانەوە.

لەیەکەم جەنگی جیهانیدا ئەرمەن بەتایبەت چی لە توانایاندا بوو بۆ یارمەتیدانی ڕووس لە بەدیهێنانی سەرکەوتندا، کردیان و درێغیان نەکرد، جارەها پێشڕەوی هێزەکانی عوسمانیان پەك دەخست کەژمارەشیان لە هی یاخیبووانی تێدەپەڕاند، گەیاندنەکانی سەربازیان لە کارەخست و سەدان هەزار ئاوارەیان ناچار دەکرد بکەونە سەر ڕێگە و بانەکان تا ببنە ئاستەنگ

لە سەرە ڕێی هاتوچۆ و جووڵەکردنی ئەو لەشکرەدا، دوا جاریش عوسمانیەکانیان وا لێکرد واز لە ستراتیژی ئەوتۆ بێنن کە لەو جەنگەی ڕۆژهەڵاتدا سەرکەوتنیانی زامندەکرد.

بەڵام گرنگترین کێشەی یاخیبوونەکە لەوەدابوو کە پشتی بە لایەنی دەرەکی بەستبوو، خۆ ڕاستە هەر یاخیبوونێ بە بێ یارمەتیدان مەحاڵە سەرکەوێ، ئەرمەنیش کەمینەیەکی زۆر بچووکبون لەو خاکەی دەیانوسیت بیکەنە نیشتیمانی خۆیان، بۆیە پشتیان بە دەستێوەردانی هێزە ئەوروپاییەکان قایمبوو. بەڵام ئەوانیش ڕۆژێ لە ڕۆژان ئامادەنەبوون کە کارێکی وا بکەن بۆ بنیاتنانی دەوڵەتێکی ئەرمەنی لە سەر خاکی عوسمانیدا، ئینگلتەرە و فرانسا ئامادەنەبوون کە گفتوگۆ و پەیمانی ئەوە بدەن تا سەربازێکی زۆر ڕەوانە بکەن بۆ پێکهێنانی ئاوا دەوڵەتێك و مسۆگەرکردنی مانەوەی حوکمێکی کەمینەیی ئەرمەن. دیپلۆماتکاران و سەرکردە سەربازیەکانی ئەو دەوڵەتانە ئەمەیان ڕەتدەکردەوە. دیسان لەمەدا دەوری ڕووس مەحاڵبوو کە چاوی لێ بپۆشرێ. چونکە ڕووس مومکیننەبوو پشتگیری لە هاتنە دی دەوڵەتێکی ئەرمەنی بکات کە پشت بەلایەنە دەرەکیەکانی ئەوروپا ببەستێ، ڕوسیا دەیویست ڕۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵ بۆخۆی بێ بۆیە هەرگیز نەدەپرینگایەوە و دوودڵ نەبوو لەوەی هەر کە نیشی پێیان ئەما لە دواوە بەرخەنجەریاندات یا بە گورگانخواردویانبات.

لەباتی ئەوەی ڕووس یارمەتی ئەرمەن بدات یان هەرنەبێ ڕێگەیان بدات بگەڕێنەوە ڤان تا دەوڵەتە تایبەتەکەیان دامەزرێنن، لە خوارووی قەفقاس بەرەڵڵای کردن تا لە برسا بتلێنەوە. تاشناق و شوێنکەوتوانی بە باشترین شێوە ئەرکی خۆیان بەجێ دەهێنا، بەڵام چونکە متمانە و چارەنووسی خۆیان دابووە دەستی ڕووس شکستیان خوارد و ڕەنجیان بەباچوو.

شۆڕشی ئەرمەن زۆر کەرەت مایەپووچ بووە، یاخیبووان بەشداربوون لە هەرەس پێهێنانی دەوڵەتی عوسمانیدا بەڵام ڕۆژێ نەبووە کە ببنە خاوەنی دەوڵەتێکی تایبەت بە خۆیان، بە پیاچوونەوەیەك بە ڕووداوەکانیاندا دەبوو شۆڕشگێڕان ئەم ڕاستیەیان باش بزانیبا، بەڵام هەستە نەتەوەییەکان هێند گەرموگوڕن کە بە دەگمەن ڕێ بە ئەقڵ و فام دەدەن تا ببنە هاوڕێ.

پاش دەیان ساڵی ئامادەکاری بۆ شۆڕشکردن، ئیتر لە یەکەم جەنگی جیهانیدا چۆن تاشناق بەرهەڵستی عوسمانێکانی نەدەکرد؟ ئەمە مەحاڵ بوو، پیاو ناتوانێ بۆ ئەوەش نەچێ کە چارەنووسی گەلی ئەرمەن لە ڤان، ئەگەر بە لاگیری لە عوسمانێکان بمایەتەوە، باشتر نەدەبوو؟ وە یاخود لە خراپترین حاڵدا وەك موسڵمانانی ڤان بە زیندویی لەژێر دەستی عوسمانی یا ڕووسیدا دەمانەوە، کە ئەمەیان چارەنوسێکی باشتر دەبوو لە چاو ئەوەی شۆڕشگێڕان بەسەر خۆیان هاورد.

تۆ بڵێی عوسمانێکان بیانتوانیایە بەرەنگاری شۆڕشگێڕانی ئەرمەن ببەنەوە و نەهێڵن شاری ڤان کاول بێ؟ ئەوان لە ڕۆژەلاتی ئەنەدۆڵدا بەگژ شتێکدا دەچوونەوە کە ئێستە پێی دەگوترێ (شەڕی چەتەگەری)، جا بۆ حاڵیبوون لە هۆکاری فەشەلی عوسمانیەکان لەو بەگژاچوونەوەیاندا، دەبێ لەو شەڕەیان بکۆڵینەوە دژ بە شۆڕشگێڕان، ئەمەش بە ڕێنمایی و پشتبەستن بە (پێنج هەڵە و تەکتیکە ستراتیژە گەورەکان) ی (ماوتسی تۆنگ) شارەزا لە شەڕی چەتەگەریدا، ئەو هەڵانە پووچەدەکاتەوە کە دەبنە هۆی سەرنەکەوتنی بەرەوڕووبوونەوەی یاخیبوان:

● فریاکەوتن و بەهاناوەچوونێکی لەسەرخۆ و هێمنانە (بە مانای بڵاوکردنەوەی کەمترین ژمارەی سەرباز و کە پێویستیشی کرد بە هانایانەوە بچن) لە باتی ئەمە واباشە تا دەکرێ سەرباز بڵاوبکرێتەوە تا بەشی ئەوە بکا جەنگاوەران لە هێرشێکی یەکلاکەرەوەیاندا ڕاونێن.

●نوقسانی لە هەماهەنگی ستراتیژیدا (بە مانای هەر سەرکردەیە لە سەرکردەکان دوی ستراتیژێکی تایبەت کەوێ و پەیرەوی بکات، لە تەک نەبوونی هاوکاریەکی تەواوی نێوانیان) هەر هەموو هێزەکان دەبێ پەیرەوی پلانێکی مەرکەزی بکەن و گوێرایەڵی دەسەڵاتێکی مەرکەزی بن.

● نەبوونی ئامانجێکی بنەڕەتی لە هێرشبردندا (بە مانای رووبەڕووبوونەوەی یاخیبووان لە یەك کاتدا و لە چەند شوێنێکدا، رێگەشیان پێ بدرێ تا مەرجەکانی شەڕکردن دیاری بکەن) نابێ هێزەکان پەرت و بەشبەش بن و لە چەند لایەکەوە بکەونە شەڕەوە، دەبێ لە یەك شوێندا کۆببنەوە بۆ پەلاماردانێ و ئینجا بچنە سەر شەڕێکی دی.

● نابڵوقەدانی ژمارەیەکی زۆر و لەناوبردنی ژمارەیکی کەم (بە مانای بردنەوەی شەڕەکان بەڵام رێ بە دوژمنیش بدەی کە هەڵبێ) دوژمن دەبێ لەناو ببرێ یان بە دیل بگیرێ نەك بچنە شەڕەکەوە و دوایش رێگە بە دوژمن بدەن هەڵبێ.

● شکستخواردن لە بەدەستهێنانی هەلی ستراتیژی (بە مانی بەدوادا نەچوون و بەردەوامیدان بە سەرکەوتنەکە بەسەریاخیبوواندا) دەبێ دەست بەسەر یاخیبوواندا بەجۆرێ بگیرێ کە نەهێڵرێ جارێکی دی خۆیان گردکەنەوە و ریزەکانیان یەکخەنەوە [١].

(دیسان سەرنجدەرەوە ئەو پێنج خاڵەی سەرەوە کە عەررمان کردن)

عوسمانێکان گشت ئەم رێسایانەیان پشتگوێ خستبوو، زەحمەتیشە وێنای هیچ ئیمکانیەتێکی جیا لەمانەی سەرەوە بکەین کە لە لایان پەیرەو کرابێ، بە هاناچوونی عوسمانێکان لە بەرەنگاربوونەوەکانیاندا پچرپچر بوو و ئەمە جێی گومان نییە، لە هەر شەپۆلێکی تازەی ئاژاوەی ڤاندا، ئەو سەربازانەی لە شاردا بوون بەشی نەدەکرد، لە ١٨٩٦، ١٩٠٨، ١٩١٥ ناچاربوون هاوار بۆ ناردنی هێزی تر بکەن تا بە هانایانەوە بێن، لە ١٨٩٦ سەرباز

ئەوەندە بوو بەشی بەرەورووبوونەوەی دەکرد بەڵام بەشی دەستگیرکردنیانی نەدەکرد یان نەهێڵن کوردەکان تۆڵە بکەنەوە، هەروا لە ۱۹۰۸یشدا، بەڵام لە ۱۹۱۵ لە ڤان نەك سەرباز کەمبوو بەڵکوو ئەوەشی کە بۆی دەنێررا نەیاندەتوانی بگەنە جێی مەبەست، ئەمە لە نەشارەزاییدا نەبوو بەڵکو لە کەمی ژمارەی سەربازەکان بوو.

ئەم دیاردەیە لە (مەکەدۆنیا و دورگەی کریت)یش بەهەمان شێوە دووبارە بۆوە، دەبێ ئەوەش بگوترێ کە سیاسەتەکەی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم لە رووی سەربازیەوە کە پەیڕەوی دەکرد کێشەکەی ئاڵۆزتر و تەنگژاوی تر دەکرد، چونکە سوڵتان بەردەوام لە سوپاکەی خۆی دەترسا و وەك پێویستیش پەرەی پێ نەدەدا، تواناکانی سوڵتانیش جێی گومانبوون. هەتا ئەگەر گشت لیرەکانی ناو خەزنەی دەوڵەتیشی لە سوپادا بە خەرجدایە و گشت گەلی عوسمانیشی بکردبا بە سەرباز بەشی رووبەڕووبوونەوەی دوژمانانی نەدەکرد لەگشت ئەو بەردی شەڕە زۆرانەدا، یان بۆ دانانی پاسەوانان لە سەر ئەو سنوورانەی پاراستنیان کارێکی دژوار و سەختبور.

دەبێ (هەماهەنگی ستراتیژی) بەلای عوسمانیێکانەوە چەمکێکی نامۆ بووبێ، چونکە سیستمی حوکمیان لە هەرێمەکەدا بەتەواوی جیاوازتر بوو، بریتیبوو لە دابەشکردنی دەستەڵات. بە درێژایی سەدەکانی ڕابردوش ئەرکی حوکم و ژەنراڵ فەریق - سەرۆکی دەستەڵاتی دادوەری – قازی ئەعلا - لە گشت هەرێمەکاندا، ئەوەبوو کە یەك بەسەر ئەوی تردەوە چاودێربێ و لە هەڵەی یەکتر بگەڕێن، بەڵام لە دواییەکانی سەدەی نۆزدە، دەستەڵاتی ڤەزایی برستی لێبرا، زۆر جار بڕیاری سەرکردە سەربازیەکان لەگەڵ بڕیاری سەرکردە مەدەنیەکان پێچەوانەی یەکتربوون، حاکم دەیتوانی کۆمەڵێ لایەنگر و هەوادار بۆخۆی لە سوپادا دەستخات، هەروەك چۆن فەریقیش

دەیتوانی بە هەمان دەستوور پشت بە هەندێ بیرۆکرات ببەستێ، ئەم دووانە پشت و پەناشیان لای هاوڕێ و برادەرانیان هەبوو لە قەسر ی(مابین) لە ئەستەموول.

خۆ کە حاکم و ژەنراڵ ئاڵوگۆڕی ڕاوبۆچوونیان دەکرد، ئەوا ڕەوشەکە بەرەو باشی دەچوو، بەڵام ئەم دووانە تەبایی و ڕێکەوتنیان دەگمەنبوو، بەهۆی پێکهاتەی دەستەڵاتەوە لەیەك لە بەشەکانی سوپادا ڕەوشەکە ئاڵۆز بوو: فیرقەی حەمیدییە (سوارەکان) کە لەژێر دەستی یەك لە ژەنراڵەکانی ئەرزڕۆمدا بوو نەك ڤان.

کاتێ بەڵگەی یەکەمی ئەم ناتەباییە دەرکەوت کە عوسمانیەکان بۆیان ساغبۆوە کە نەبوونی یەکبوونی ناو دەستگە نیداری و سەربازیەکان کاریگەری حوکمەکەیان پەکدەخات، لەسەردەمی (عەلی ڕەزا پاشا)دا کار لە کار ترازابوو.

(ئاڕاستەیەکی بنەڕەت لە هێرشکردندا)، لە شەڕەکانی دژ بە یاخیبووان پشت بە ئەرمەن نەدەبەسترا، هێزە عوسمانێکان هەمیشە لە شەڕەکاندا بەشبەشبوون، (ئەم لێکۆڵینەوە تەنیا هەردوو هەرێمی ڤان و پەتلیسی بەرێژمیەکی کەم گرتەخۆ و باسیان دەکات)، بەڵام خۆ هێزەکانی دەوڵەت لە گشت هەرێمەکانی تردا لە شەڕی یاخیبوواندا بوون: ڕۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵ، کیلیکیا، تەرابزون، جارو بار لە ڕۆژاوای ئەنەدۆڵ و ئەستەموولیش.

دەبێ ئەوەش بگوترێ کە عوسمانێکان بە هەق تەنیا یەك شەڕیشیان لەگەڵ یاخیبووندا نەبردۆتەوە. جا ئیتر بە ئاسانی دەتوانین قسە لەسەر ئەوە بکەین کە چی ڕوبدات: دەبوو ئەو هێزە گەورەیەی کە بنکە ئەرمەنیەکەی لە سەڵماس گرت. بچووایە ڕۆژاوای ئێرانیشی بگرتایە، ئەو گوندانەشی بگرتایە کە دەکەوتنە سەرە ڕێگەی قاچاخچیەکانی چەك. بەڵام لێرەدا پرسێك قوتدەبێتەوە: عوسمانێکان لەکوێ هێزێکی ئاوایان بۆ گرد

دەکرایەوە تا سەرکێشیەکی لەم بابەتەی پێوە بکەن؟

عوسمانێکان لە جەنگێکدا لەگەڵ ڕووسیایەکی خاوەن بەرژەوەندیەکی تایبەت لە ڕۆژاوای ئێراندا، کە دەقەومێ چی دەکەن؟ ڕووسیایەك کە قەتاو قەت ڕێگە نادات بە پامالگردنێکی عوسمانی لەو ناوچەیەدا. دیارە ستراتیژیەکی نموونەیی کە شکستی شۆڕشگێرانی تێدابێ دەبێ بەرەیەکی شەڕی لەگەڵ ڕووسدا بۆ بکرێتەوە، بەمە بۆ هەمیشە ئەو دالان و کەنالانەش دادەخرێن کە ئەرمەن لە باشوور و ڕۆژهەلاتەوە لێیانەوە دزەیان دەکرد.

ئەمانە بەلای سەڵتەنەیەکەوە کە لەبەردەم ڕووسیادا شکستی خواردووە و لە سەدەی پێشووشدا (نۆزدە) سێ کەڕەت هاتۆتە خاکەکەیەوە. خەیاڵ پلاون.

بێگومان عوسمانێکان لەچەند شەڕێکدا سەرکەوتن، بەلام لە ڤان دۆڕانیان، لەسالانی ١٨٩٦، ١٩٠٨ شۆڕشگێرانیان بەزاند، لەهەر جاردو لەم جارانەدا دوژمنە ڕاستەقینەکە هەڵدەهات.

دوژمن تەنیا ئەو ژمارە کەمە نەبوو کە سنووری ئێرانیان دەبڕی و دەهاتن بەمدیودا، ئەو شۆڕشگێرانە بوون کە ڕێگەیان پێ دەدرا بمێننەوە، بەتایبەت سەرکردە و کادیرانی تاشناق لەناو ڤاندا، هەر لەو سالانەدا کە گوتمان، بەدواداچوون بۆ ئەو دوو سەرکەوتنە سەربازیە نەکرا و ڕێ و شوێنێکی ئەوتۆ نەگیرایە بەر تا سەرکەوتنەکان تەواو مسۆگەرکات.

دەبوو شەڕی دژ بە شۆڕشگێران ناوخۆیی و سیاسیش بووایە. ڕێگە ناچوغکردن بۆ دوژمن تا پروپاگەندەی خۆی بکا و بەوپەڕی سەربەستیەوە ڕێکخستنێکی سەربازی لەناو وڵاتدا دەمەزرێنێ، ئەمە نیشانەی خۆکوژیەکی سیاسیە. عوسمانێکان تا ئەمابان بۆ شۆڕشگێران دەستەبەرکردبوو، ئەوەی بە بەیاننامە و چاپکراوەکانەوە دەگیرا کە خەریکی بلاوکردنەوەیانبوو، دەبوو

دادگەیی بکرێ و دوایی زیندانی بکرێ. ئەوانەش کە چەکیان هەڵدەگرت هەروا، چونکە ئەگەر لە شەڕێکی سەر سنووردا دەربازبووایە ئەوە جینایەتێکە و دەبوو دادگەیی بکرایا.

دەستێوەردانەکانی ئەوروپا و (لێبووردنی سوڵتانی) دەبوونە هۆی مەردەخەسکردنی کەسانێکی وا کە تاوانباربوون بە ناپاکی نیشتیمانی، بەڵام لەملاتر ئەوانەی بەرپرسبوون لە بەڕێوەبردنی قوتابخانەیەکی سەر بە شۆڕشگێران لە دورگەی (ئەختمار)دا و لەژێر پەردەیەکی ئایینی دا، هیچ سزایەك نەدران و لەگوێ گاڵتریان پێ نەگوترا.

لەوانەیە بەهێزترین هێرشی ڕاستەوخۆ ئەوەبێ کە گشت شۆڕشگێران بکوژرێن، بێگومان (ماو)یش لە کارێکی ئاوا ڕازیە، لە زوربەی ئەو دەوڵەتانەی کە دەستەڵات ویستوویە بزاڤە یاخیبووەکان سەرکوتکات، ئەو شەڕکەرانە دەستگیردەکرێن نیعدام دەکرێن یان بەلانی کەمەوە بەندکردن بۆ ماوەیەکی درێژ لە زیندانێکی سەختدا.

عوسمانێکان بۆ قەلاچۆی حیزبی تاشناقیان نەکرد؟ بۆ هێشتیان یاخیبوویەکی وەك (ئارام مانوکیان) کە هاووڵاتی دەوڵەتێکی نەیار بوو بەوپەڕی ئازادیەوە بە شەقامەکانی ڤاندا بگەڕێ و لە کڵێسای ئەرمەنیشدا پلەیەك وەرگرێ و ساحەکە بۆ شۆڕشکردن تەختکات؟ بەمەرجێ هەموان لە: ئەرمەن، ترك، کورد، کونسوڵە ئەوروپاییەکان و بەرپرسی عوسمانیش دەیانزانی کە پیلان دادەنێ بۆ ڕوخاندنی دەوڵەت. چۆن لێبووردن بۆ (نیشخان) دەرچوو کە یەك لە سەرکردەکانی تاشناق بوو و دەزانرا کە جێگری کاسۆلیکۆس ئەو کوشتوویە، لەپەتی سێدارە ڕزگارکرا؟

بۆ ئارام و نیشخان و کەسانی تریش کە تاوانبار بوون بە کەڵەکەکردن و شاردنەوەی هەزارا پارچە چەك بۆ خۆئامادەکردن بۆ شۆڕش، بەر لێبوردن کەوتن و وەك بەرزەکی بانان بۆی دەرچوون؟

دەتوانین بڵێین مانەوەی سەرانی تاشناق و گەلێ لە سەرکردەی شۆڕشگێران لە ژیاندا بەهۆی شلۆقی و نابووتی حوکمی عوسمانییەوە بوو. جارەهای جار عوسمانییەکان لەسزادانی نەیارانی سیاسی خۆیاندا ناوا سست و شلوشێواوبوون، هەرچەندە رەخنەگرانیان بەکەمی ددانیان بەم ڕاستیەدا ناوە و باسیان لێوەکردووە. بۆ سەلماندنی قسە و دەست دانان لەسەر ئەم واقیعە ئەوە بەسە کە بەراوردێکی تۆمارەکانی ئەم دەوڵەتە بکەین لە ڕووی ئەو سزایانەی کە دراون بەسەر بەرهەڵستکارانا و ئەوانەشی کە بەرهەڵستی حوکمیان کردووە لە وڵاتانی ژێر دەستی ئەوروپاییەکان. وەیان بەو حاڵەتی ئیعدامە سیاسیانەی کە لە گەلێ دەوڵەتانی سەردەمدا دەکرێن:

سەڵتەنەکەدا هەر ئەندامانی تاشناق و هانشاك نەبوون کە لە ئیعدام ڕزگاردەبوون، عەبدولحەمیدی دووەم زۆر کەم فەرمانی ئیعدامکردنی بۆ دوژمنانی خۆی لە گەنجە ترکەکان دەردەکرد بەڵکو پەنای دەبردە بەر کرێی وەلا و ملکەچبوونیان یان دوری دەخستنەوە، جگە لەوەی کە هەر لە ڕۆژانی یەکەمی ئیمپراتۆریەوە ڕێگە دەدرا بە گروپە ئایینیەکان (میلەل) کە جۆرە خود موختاریەکی خۆیان هەبێ. نەریتە جیاوازەکانی ناو ئایینەکان وایان لە عوسمانیان کردبوو کە تا دەکرێ خۆیان نەگەیەنن لە کاروباری میلەلەکان.

جا بۆیە وازیان لەم ئەرمەنانەش هێنابوو تا بە ئازادی کاروبارە تایبەتیەکانی خۆیان بەڕێوەبەرن و تا گەیشتە ئەوەی ببێتە مەترسیەك لەسەریان.

لێبوردەیی ئەمان تەنیا هۆکارێك نەبوو کە ڕێگە بدا بە ئەرمەن کە بە سەربەستیەکی تەواوەوە و بەئاشکرا بجووڵێن. ئەگەر دەستێوەردانی ئەوروپا نەبووایە دەبو چاو لەو نەریت و هەڵس و کەوتە کۆنانەیان بپۆشن و بە سەختی بەگژ پاخیبووآندا بچوونایەتەوە. بەڵام دەیانزانی کە سزادانیان، ئیتر

ئاست و ڕادەی ناپاکیەکەیان هەرچۆنێکبووایە، دەبووە هۆی ناڕەزاییەکی ڕای گشتی لە ئەورووپا و دەوڵەتەکانیشیان ناچار دەبن و بیانوویان دەدرێتە دەست تا سەڵتەنەکە دابەشکەن. وە باش دەیانزانی کە سۆزی ئەورووپا هەرگیز بەلای خۆیاندا نابێ. ڕووماڵکردنی ڕۆژنامەکانی ئەورووپا تەنیا لەبارەی بڵاوکردنەوەی ئەو هەواڵانەوە بوو کە لە پەژارە و ئازارەکانی ئەرمەنەکانەوە دەدوان، بەڵام هی موسوڵمانەکانیان بەتەواوی پشتگوێ خستبوو، بەهۆی ئەو پەردە پۆشکردنەی کە خرابووە سەر دۆزە ڕاستەقینەکان.

کوسۆڵە ئەورووپاییەکان لە ڕۆژهەڵاتی عوسمانیدا بە دورو درێژی دەنگو باسەکانی شۆڕشگێرانیان دەگەیاند، زۆریان زۆر بە وردی وەسفی ئەو کاولکاریانەیان کردووە کە یاخیبووان لەپاش خۆیان بەجێیان هێشت. کە ڕۆژنامەکان هەواڵی شاخداری وایان بڵاودەکردەوە سەبارەت ئێش و ئازاری ئەرمەن یان درۆی هەڵبەستراو لەبابەت هەرێمی ڤانەوە، کونسۆڵەکانیش جارەها دەچوونە سەر باسی ئەو درۆ و دەلەسانە، کەچی هیچ ڕاستکردنەوەیەکیش بۆ ئەو هەواڵە ناڕاستانە لەو ڕۆژنامانەدا بڵاونەدەکرایەوە. کە ئەم زانیاریانە دەگەییە پایتەختە ئەورووپاییەکان شتێکی سەیر دەهاتە گۆڕێ، گوایە هیچ جۆرە یاخیبوونێك لە ئارادا نییە، لە واقیعیشدا باڵیۆزەکان توندوتیژی ناو ڕاپۆرتەکانیان زۆر دەستکاری دەکرد و هێوریان دەکردەوە، ئینجا دەیاننارد بۆ دەوڵەتەکانی خۆیان لە ئەورووپا.

سیاسیەکانیش گشت ئەو ڕاپۆرتانەیان پشتگوێ دەخست، خۆ کە دەنگوباسی یاخیبوونەکەش گەیشتە (پرسکردن لە سەروك وەزیران) یان گۆڤاری (تایمز)، بەدەگمەن باسێکی خراپی ئەرمەنەکانیان دەکرد. دەوری هێزە ئەورووپاییەکان لە کاولکردنی ڤان و ناوچەکانی دی دەڤەرەکە جێی سەرنج و دەلیلی ئاشکرایە بۆ بەرژەوەندی تاکە کەسی و لاگیری ئایینی و دوو ڕوویی سیاسی، ئەو هێزانە ڕاستەوخۆ دەستیان دەخستە ناو سیستمی حوکم

و دادەوەری عوسمانیـەوە، داوای ئیمتیـاز گـەلێکی تایبەتیشـیان دەکـرد بـۆ شۆڕشگێران و زۆریشی نەدەبرد دەستیان دەکەوت.

کـەمترین ئیمتیـازێ (پاراسـتن)بوو کـە ڕووسـەکان هـەیانبوو، چـونکە لەدەرەوەی خاك و وڵاتی خۆیاندا ملکەچی دادگـەیی وڵاتێکـی تـر نـەدەبوون، بۆیە خۆیان لە ڤان شۆڕشیان نایەوە، کارو کردەوەکانی ئەوروپاییەکان دنـەی شۆڕشگێڕەکانیان دەدا کە لەسەر ئەو بۆچـونەیان بـەردەوامبن کـە بەنـد بـوو لەسەر پلانی کوشتارکردن و وروژاندنی دژە کوشـتار لای بەرامبەرەکـەیان تـا دوایـی ببێتـە هـۆی دەسـتێوەردانێکی ئـەوروپایی ئـەوتۆ کـە لـە بەرژەوەنـدی مەسەلەکەیاندا بێ.

لـەبۆ پراکتیـزەکردنـی چاکسـازیەکانیان لـە ڕۆژهەڵاتـی ئەنەدۆڵـدا، عوسمانیـەکان پارەیـان گـەرەکبوو، بـەڵام نـەیانبوو، هـەر ئەمـەش بـوو کـە نوێنەرانی ئەوروپا باسیان دەکرد و ڕاپاندەگـەیان، دیسان دەوری سـوپاش بـۆ چەسپاندنی ئاشتیەکی ناوخۆیی ئەهلی زەرووربوو بەڵام سەربازێکی کەمیش مووچەیەکی شیاویان وەرنـەدەگرت، دەشبوو لـە بـاج و خـەراجی هـەژارانێك ببـوورن کـە نەیانـدەتوانی بیـدەن، پڕۆژەکـانی گەشـەپێدان، هـەتا بچووکەکانیشیان، زەرووورەتێکبوون و دەبـوو بکرانایـە، وەك دابینکردنـی تـۆو بۆ جوتیاران تا هیچ نەبێ خـۆراکی خۆیـان بەرهـەمهێنن، بـەڵام دەوڵـەت بـە جـۆرێ دەسـتکورتبوو کـە هـەتا نەیـدەتوانی کـەمترین بـڕە پارەیـەك لـە بودجەکەی هەرێمدا دانێ بۆ ئەمە.

لەم سونگەیەوە، بەشێکی زۆری هۆکارێکی کێشەکە دەدرێتـە پـاڵ لاوازی توانای ئابووری دەوڵەت خۆی، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کـە بـەهۆی ئیمتیـازاتی بیانیەکانەوە لە ڕۆژهەڵاتدا عوسمانیەکان ڕێبەند دەکران لـە ڕێکخستنی بـاری ئـابووری خۆیـان، وە بـەهۆی ئـەو قانوونـەی تـر کـە لـە بەرژەوەنـدی ئەوروپاییەکاندابوون و لەلایەن هێزی سەربازی ئەوروپاوە جێبەجێ دەکران.

خراپتر لە هەر هۆکارێکی تر لە بۆ ئەو دەستکورتیەی دەوڵەت، کاریگەری ئۆپەراسۆنەکانی ڕووس بوو دژ بە عوسمانیەکان. هەرلە ساڵانی ١٨٠٦، ١٨٢٨، ٥٢، ٧٧ – ٧٨ ئەم دەوڵەتی ڕووسە دەهاتە ناو خاکی عوسمانیەوە و پامالیان دەکرد، کاولکاری و وێرانیان جێدەهێشت، ئالیەی باج و باجگریان لاواز دەکرد و زەوی وەك بولگاریایان لە دەست ئەم دەوڵەتە دەکردەوە، کە بەشێکی کەمی دەرامەتی خۆیانیان تیادا بە خەرجکردن دابوو ، ئەم ڕووسانە ئەوەشیان سەپاندبوو کە دەبێ بە پارە قەرەبووی زیانەکانیان بۆ بکرێتەوە و زۆریشی نەدەخایاند ئەمەیان دەستدەکەوت.

فەشەلهێنان لە ڕەخساندنی هەڵە ستراتیژەکاندا بەزۆری ١٨٩٠دا دەرکەوت، ئەو کات هەلێکی چاك و لەبار بوو بۆ لە کۆڵخۆکردنەوەی شۆڕشگێران، ئەو حەلەی نفوزیان بەسەر دانیشتوانە ئەرمەنەکاندا، بەتایبەت لە لادێکاندا، لاوازبوو، لەناو توێژی بازرگان و لەناو کڵێسادا بەرهەڵستیەکی فرە دەکران.

شۆڕشگێران مەبەستەکانیان ئاشکرابوو، هەق نەبوو بهێڵرێ بگەڕێنەوە ناو شاری ڤان، لەوانەیە کاری دۆزینەوەی چەکەکان لە ١٩٠٨دا هەلبووبێ بۆ بەرهەڵستی نفوزیان کە بەسەر خەڵکە ئەرمەنەکەدا سەپێنرابوو، دیسان سیاسە ڕۆڵێکی گرنگی بینیەوە، ئەمجارە سیاسەی کۆمەڵەی (ئیتیحاد و تەرەقی).

هاوپەیمانیەك لەگەڵ پیاوانێکی سەربازی هەرزە لەکاروباری سیاسەدا و پەیرەوکەرانێکی سیاسەتێکی میسالی دروستبوو، لە یاخیبووەکانی ١٩٠٨ خۆشبوون و ڕێگەشیان بۆ ئاچووغکردن تا چالاکیە ڕێکخستنەکانی خۆیان تەواوکەن، ئەمە لەژێر ئالای دیموکراسی سیاسیدا. لەواقیعدا دەوڵەتە تازەکە دانی نا بە حیزبی (تاشناق)دا وەك نوێنەرێکی گونجاو بۆ ئەرمەنەکانی سەڵتەنە، بەمەش مەڵبەندەکانی ناو نفوزی کۆمەڵی ئەرمەن کە کڵێسا و

وبازرگانانبوون، دابڕێنران و لاخران، بۆ هەمووان ئاشکرابوو کە دەستەلاَت خرایە دەستی حیزبی تاشناقەوە، کۆمەڵەی (ئیتیحاد و تەرەقی)ش ڕەوشەکەی لەبۆ خزمەتی بەرژەوەندیە سیاسیەکانی خۆی قەبوولکرد. هەلگرانی ئیدۆلۆگی لە گەنجانی ترك بڕوایان وابوو کە پەیرەوکردنی خود موختاری ئیتنی لەوانەیە وا لە پاخیبووان بکات مل بۆ خواوستی عوسمانیەکان بدەن، لەمەدا بوودەڵەییان بە ئەندازەی بوودەڵەیی ئەو ئەرمەنانە بوو کە وایاندەزانی ڕووسیا جێی باوەڕ و متمانەیە.

لەوانەیە هەندێ لە شۆڕشگێڕە ئەرمەنکان وایان مەزندە کردبێ کە لە ڕێی هاوکاریکردنیانەوە لەگەڵ کۆمەڵەی (ئیتیحاد و تەرەقی) ئامانجەکانیان حاسڵدەبێ. پێکهێنانی پشکنەریەکانیش لە ڕۆژهەلاَتی ئەنەدۆڵدا ئاماژەی بەوە دەدا کە دەشێ لەمەدا لەسەر هەقیش بووبن، بەلاَم لە عەمبارکردنی چەك و جبەخانەدا هەر بەردەوامیشبوون، کە شەڕیش هەلگیرسا ئەوەیان سەلماند کە ڕۆژێ لە ڕۆژان وەلا و لاگیریان بۆ ئەو سەڵتەنەیە نەبووە.

لە زوربەی کاتدا حوکمدان بەسەر شۆڕشدا لەڕێی ئامانجەکانیەوە دەبێ، شۆڕشی سەرکەوتوو ئەوەیە کە ئەو پاڵەوانانەی نیشتیمانە تازەکەیان هێناوەتە دی، دوایی وەك وبەرگریکارێك لە ئازادی تەرخانیان دەکات. بەلاَم شۆڕشی فاشیل کۆمەڵێ (تیرۆریست) یان (دەستەیە کەسانی فاشیل) دەخاتەوە و لە گیانی خەلکەکەیان بەردەدا، زۆرجار لە لایەن ئەو سیستەمەی کە نەیتوانی بە (ئینقیلاب)ەکەیان تێکی بشکێنن، دەگرێن بە دارا. شۆڕشی ئەرمەنیش جگە لە شکستێکی کەموێنەی وا کە پێشی هەموو شۆڕشە نەزۆکەکانی تری داوەتەوە، شتێکی تر نەبوو.

ئاخری و ئاقیبەت شەڕکەرانی ئەرمەن تەنیا نەبەزێنران بەلکو دانیشتوانە ئەرمەنەکەشیان بە خۆیانەوە لە زێدی باو و باپیرانیان هەلکەند و دوریان خستنەوە. لەباتی ئەوەی دەوڵەتێکی تازە بنیاتنێن، خاکێکیان

بەبێ ئەرمەن بنیاتنا.

دیارە فەشەلیش مانای ئەوە نییە کە شۆڕشگێڕان لە یاخیبوونەکەیاندا هەڵەبوون، چونکە هەڵسەنگاندنی تایبەتمەندی ئەخلاقی هەر شۆڕشێ کارێکی قورسە، سەبارەت بە عوسمانێکان: ئەوە بوو کە یاخیبووان خیانەتیان لە دەوڵەت کرد، هەرچەند بەدەر لە میسالیەت، بە درێژایی سەدان ساڵ ڕێگەی دابوون بەبێ ئەوەی دەستبەرێ بۆ ئازادی ئایینی داب و نەریتیان، لەپاڵیدا بژین. شۆڕشگێران و شوێنکەوتووانیان، دوایی لە رۆژەلآتدا گشت ئەرمەن، دایانە پاڵ دوژمنانی دەوڵەتەکەیان و پەلاماری برا هاونیشتیمانیەکانی خۆیان دەدا وبەچاکیش لە دارمسانی دەوڵەتەکەدا بەشداربوون.

بەڵام سەبارەت بە شۆڕشگێران: مەبەست و غایە دەبنە پاساو و بیانووی گشت ئەم رەفتارانە، دەمێکبوو وایان مەزندە دەکرد، کە ژیانی موسوڵمانان و ئەرمەن و هەتا تاکەکانیشیان قابیلی ئەوەیە کە بەفیڕۆ چێ، بەمەش ئەخلاقی سیاسیان لە تەوەری ئەخلاقیەکی نەتەوەیی ڕادیکاڵدا دەسووڕایەوە.

شۆڕشی ئەرمەن لە سەڵتەنەکەدا مەحاڵە پاساوەکەی لەوە بەولاترچێ کە لە دووتوێی لۆژیکێکی تایبەت بەنەتەوەییەکی ڕادیکاڵانەدابوو. ئەوەی باوەڕی وابێ کە میللەتەکەی شیاوی ئەوەیە حوکمی دەوڵەتێکی تایبەت بەخۆی بکات، ئیتر بە چاوپۆشی لەو میللەتەی لەو خاکەدایە، هەر خۆی دەتوانێ لۆژیکێکی ئاوها بگرێتە خۆ و باوەڕی پێی بێت. بەڵام سەبارەت بەوەی کە ئیدۆلۆژی حوکمی زۆرینە باوەڕیەتی (هەرکەسێك و خاوەنی یەك دەنگی خۆیەتی) کە هەوڵدەدات ویەك لە کەمینەکان بە زەبری هێز ملکەچکات، ناتوانرێ هیچ پاساوێکی بۆ بهێنرێتەوە یا بیانوویەکی بۆ ئەمە بەدەستەوە بێ.

ئەرمەنەكانيش كەمينەيەكبوون لەو كەمينانەى كە لە خاكێكدا دەژيان و ناويانناوبوو (ئەرمينيا). لە و شەش ئەيالەتانەى ئەوان پێيان دەگوت ئەرمينيا ٢٠٪ كەمتريش لە دانيشتوانەكانى بوون، بەلام موسولمانەكان نێزيكەى ٨٠٪ى دانيشتوانەكانيان پێكدەهێنا.

ئەمە ئەوە ناگەيەنێ كە هيچ پاساوێكى ئەخلاقى نەبووە بۆ هەلگيرسانى شۆڕش لەناوەوەى عوسمانيدا. ئيتر بە چاوپۆشين لەهەرچى ئەو مەترسيانەيە كە لە بەرپابوونى شۆڕشێ دەكەونەوە، نەبوونى ديموكراتى بەسە بۆ شۆڕشكردن و هەلگيرسانى. بێگومان ئەمەش بيانووە شياوەكەى شۆڕشى عوسمانى بوو لە ١٩٠٨- ١٩٠٩دا. جا جياوازى لەنێوان ياخيبوونەكەى ١٩٠٨ و ئەو شۆڕشەى ئەرمەن تەخشەيان بۆ كێشابوو، لە ئامانجە كاندابوو. زوربەى شۆڕشگێران لە ١٩٠٨دا سەلتەنەيەكيان گەرەكبوو كە گشت كۆمەلە نەتەى و ڕەگەز و ئايينەكان لەخۆگرێ، هەروا زوربەيان ديموكراتيان گەرەكبوو هەرچەندە نەيشيدەگەيشتنێ.

بەلام شۆڕشگێرانى ئەرمەن دەستەلاتێكى يەكپارچەيى و ديموكراتيان گەرەك نەبوو، هەتا بە لايەنى كەميشەوە ئەو جۆرە ديموكراتيەشيان نەگەرەكبوو كە لەسەر بنەماى (هەركەسێك و خاوەنى يەك دەنگى خۆيێ) بوو.

ياخيبوونى ئەرمەن بەشێكى دانەبڕوا بوو لەو كارەساتە مەزنەى بەسەر دانيشتوانى ڕۆژهەلاتدا هات، سەربڕينى موسولمانان كە هاوكاتبوو لەگەل ياخيبوونەكەى ئەرمەنەدا لە ڤان، بە پلەى يەكەم بووە هۆى وروژاندنى تۆلەكردنەوەى كوردەكان لە ئەرمەنەكان و دوايش ئەو كوشتارە بەرامبەرەى نێوان گشت دانيشتوانى ڕۆژهەلاتى عوسمانى. ياخيبوونى ئەرمەن ئاگرى شەڕێكى تايفى هەلگيرسان، هەردوو تەرەف بۆ مانەوەى خۆيان كەوتنە كوشتنى ئەوەى دەيانتوانى بيكوژن. ئەنجاميش ئەو كارەساتە بێوێنانە بوون. ئەو نموونە مێژووييانەى كە لە ئاست ئەو كوژراوانەى

هەرێمی ڤاندا بن کەمن، هەر بۆ بەرچاوخستن: تەلەڤیاتی هەندێ دمڤدر لە (تاعوونە ڕەشەکە)دا، کوژراوانی ئێران لە هێرشی مەغۆلدا، دانیشتوانە ڕەسەنەکانی ئامریکای سەروو کە پەتاو درمی کوشندە لەناوی بردن، ڕاگواستنی کۆیلەکان لە ئامریکا، زیانە مرۆییەکانی ئاڵمان لە شەڕی ٣٠ ساڵەدا، کوژراوانی رووس لە سەروبەندی شۆڕشەکەیاندا، ئەمانە ناگەن بەو مردن و پەژارانەی بەسەر ڤاندا هاتن.

بەپێی ئەوەی کە لە ئامانجی یاخیبوونەکە هاتە دی و کۆدەبێتەوە لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئەرمەنی و زامنکردنی دادپەروەری و ئازادی بۆ ئەرمەن، ئەوا ئەو یاخیبوونە بەتەواوی شکستی خوارد و فەشەلبوو. بەر لەیەکەم جەنگی جیهانی و ئەم یاخیبوونەی دواییان، ئەرمەنەکان لە ڕۆژهەڵاتی عوسمانیدا چەمکێکبوون لە ژیانێکی سیاسی ئاڵۆز و ئەگەر چی ئاسوودەییەکی سستیان بەخۆوە دی، لە ڕووی ئابووریشەوە لە خەڵکەکەی تر وەزعیان کۆکتر بوو، جگە لەو نفوزە سیاسیە فرەوانەیان، بەڵام لەناو ئیمپراتۆری ڕووسیدا هەندێ ڕێبەندی کردنی سیاسی و دەستخستنە سەر ئازادی شەخسی خرایە سەریان. پاش جەنگیش ڕەوشیان لە هەموو ڕوویەکەوە خراپ بوو، ژمارەی ئەرمەنی ڕۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵ کەمبۆوە، لەوەی باری کرد و ڕۆی، لەوەشی کە کوژرا و تیاچوو.

سۆڤیەتەکان ئەرمەنی ناو کۆماری ئەرمەن و پەنابەرەکانی ئەنەدۆڵیشیان نایە ژێر سانسۆر و چاودێریەکی توندتر و فرەوانترەوە لەوەی کە لەسەردەمی قەیسەر یا سوڵتاندا هەبوو. سەرەڕای سەختی باری ژیان لە ڕۆژهەڵاتی عوسمانیدا، بەڵام وەلا و ملکەچبوون بۆ سەڵتەنەکە باشترین ڕێگەیە بوو بگیرایە بەر.

## پەراوێز

١-ماوتسی تۆنگ، دەربارەی شەڕی درێژخایەن، دەزگەی ژان مالین بۆ پەخش و بلاوکردنەوە.

Strategg for Conguest: Communist Documents in Guerilla war fare

(گوراڵ گابلز، فلۆریدا: زانکۆی مەیامی ١٩٧٠) ل١٠٨ — ١١ ، ڕیزبەندی هەڵەکان گۆڕاون.

# پاشکۆی ژمارەی (١)
# ناوی شوێنەکان

لیستی ئەو ناوانەی کە لەم کتێبەدا هاتوون، بەڵام بەپێی نەخشەکانی ئیستە و بەڵگەنامە و کتێب و نووسینی تازە، هەندێ جیاوازی لە شێوەی نووسینیاندا هەیە:

ئەو ناوانەی کە لە سەدەی نۆزدەوە ماون و نەگۆڕاون لەم لیستەدانین، وەك ڤان و پەتلیس، هەندێ جیاوازی نووسینیش کە بە تایبەت لە نەخشە کۆنەکاندا دەردەکەون لابراون بەڵام بەئاسانی دەناسرێنەوە چونکە زوربەی کەرەت دوو خاڵەکە یا (ئوملاوت) لادەبرێ و ئەم پیتی (H)ی ئیستە دەگۆڕێ بە (KH)ی کۆن، ئەمەش بەپێی رێنووسی عارەبی، زۆر کەرەت ئەم پیتانە لەنێو خۆیاندا دەگۆڕێن: (D.T.B.P) هەروا هەردوو پیتی (C.S) ترکی بەم شێوەیە دەردەکەون:

(CH, SH)، بۆ دموونە لەسەر ئەوەی ئاماژەمان پێدا دەکرێ سەرنج بدرێتە ئەم لیستەی خواردوە:

| ناوەکان | رێنووسێکی جیاواز | ناوە تازەکە* |
|---|---|---|
| دەشتی ئەباك | ئەباك، ئەباغا، ئەباجا | دەشتی چاڵدێران |
| ئەدیلکیڤاز | ئەدیلجیڤاز، ئەدیلجاڤاز | ئەدیلکیڤاز |
| ئەهلات | ئەخلات | ئەهلات |

* لەم ریزەدا هەر ناوێك خرابێتە ناو دوو کەوانەوە، ناوە کوردییەکەیەتی کە لە کتێب و سەرچاوە کوردییەکاندا هاتووە، ئەگین لە دەقە عارەبییەکەیدا نییە. (وەرگێر)

| دورگەی | ئەختامار، ئەك دامار | دورگەی ئەكدمار |
|---|---|---|
| ئەختامار | عمادیە | ئەلعەمادیە (ئامێدی) |
| عەمادییە | بیجبرکالە، بجری، ئەعباك | موردایە (بارگیری) |
| بارجیری | باش گالە | بشکالە |
| بشکالە | بایازید، بیازت | موغبازیت (بایەزید) |
| بایازیت | شاتاك، شاداك، شاتاق، شطاغ | جاتاك |
| جاتاك | هکاری، جولامیرك | هکاری (هەکاری، جۆلە |
| جولیمیریك | شاپور | مێرگ) |
| دیلمان | دایر | (دیلمان) |
| دیر | دیادن | بێرق |
| دیادین | دیاربکر | دیادین |
| دیارباکیر | ئیشمیا دیند | دیارباکیر (دیاربەکر، ئامەد) |
| ئیشمیادزین | ئەتریمید، ئەدریمید | ئیشمیادزین |
| سارمانسویو | ئەرشاك، ئەرشاق، ئەرتشاق، | ئیدریمیت |
| ئیرجیك | ئەرتشیك | ئیرجیك |
| ئیرکیش | ئەردجیش، ئەرجیش، | ئیرکیش |
| ئیریك | ئەرجش | شاخی: ئیریك |
| یریفان | فاراك، فاراق، فارافافنك | ئیریفان (یەریفان) |
| ئیرزانکان | ئیریفان، یریفان | ئیرزنکان (ئەرزنجان) |
| ئەرزرۆم | ئیرزنغان | ئەرضروم (ئەرزڕۆم) |
| یوکسی گوفا | ئەرضوروم؛ ئە رضاوروم | غیفار |
| غیفاش | غافار | غیفاش |
| هکاری | فوستان، فاستان، کافاش | هکاری (هەکاری) |
| هینیس | هیکیاری | هینیس |
| هیزان | خانوس، هینس | هیزان |
| غیزلسو | خیسان، خیزان | هوشاب |
| ئیعدیر | هوشب، گوشب، | ئیغدیر |
| گاغیزمان | خوشب،خووشب | گاغیزمان |

| | | |
|---|---|---|
| کاراکوز | ئیقدیر، ئیغدیر | کارا ئەکیلیز |
| خووی | کاغظمان، کاغسمان | خوی (خووی) |
| کوناك | کاراکیلیز، کاراکیلیسا | کوجانیس |
| بولانیك | هوی، خوا | کوب |
| دورگەی: یاکا | کوتشانس، کوکانس | دورگەی: لیم |
| مالازغیرت | بولانیك، کوب بو لاتیك | مالازغیرت |
| بەد جیساری | — | موکوس (مەکس) |
| ئاکسد جیفان | میلاس غیرد، مانزیکرت | ئاهجیڤان (ئەخشەوان) |
| باغلار | مویکس، موکس، میوکوس | ئیری (ئەهری) |
| باتنوس | ناخیتشوان، ناخیتشفان، | باتنوس |
| سارای | ناخیشفان | سارای (سەرا) |
| ٠٠اسون | نهری | ساسون (ساسۆن) |
| مەهاباد | باتنوتس | سافو دجبولاك (مەهاباد، |
| شمدینان | سیرای، مەحمودیە، مەهمودیە | سابلاخ) |
| سیرت | ساسون، مسون | شمسدینلی (شەمدینان) |
| تاتفان | سوج بولاك، سج بولاك، | سیرت (سیرت) |
| نورمیا | سجبلاك | تاتفان |
| زیتون | شمسدین | نورمیە (ورمێ) |
| | سایرت، سرت | سولیمانلی |
| | تاتفان | |
| | رومیە، رمزائیە | |
| | زایتون | |

## پاشکۆی ژمارە ( ٢ )
## ئەرمەنەکان لە حوکمەتەکەی ڤاندا ١٨٧١

| پلەو ناونیشانی وەزیفەکەی | ناوی کەسەکان |
|---|---|
| ئەنجوومەنی تەمیز (بۆ دادنووس) | گیرگورئاغا و ئاگوب ئاغا |
| ئەنجوومەنی بەڕێوەبردنی ڤان لە | شیران بەگ و ئاگوب ئاغا |
| سنجقدا | میغیردیچ ئاغا و کیفۆرك ئاغا |
| ئەنجوومەنی شارەداری | ئۆهانیس ئاغا و فارتان ئاغا |
| سنووقی مەنفەعە | ئاغوب ئاغا |
| ئەمین سنووقی بەڕێوەبەرێتی | |
| ئەنجوومەنی هەرێمەکە (خەزنەدار) | میغیردیچ ئاغا |
| لە بەرپرسەکانی تۆمارکردنی زەویوزار | هەڤیق ئاغا |
| ئەمین سنووقی قەزای ئیلباك | سیمۆن ئاغا |
| ئەمین سنووقی قەزای جۆلەمێرگ | میغیردیچ ئاغا |
| ئەمین سنووقی قەزای غیفار | ئەڤادیس ئاغا |
| ئەنجوومەنی بەڕێوەبردنی قەزای غیفار | ئۆهانیس ئاغا و یاسف ئاغا |
| ئەندام لە ئەنجوومەنی قەزا لە غیفار | نستووری کیتو ئاغا و کاربت ئاغا |
| ئەندام لە ئەنجوومەنی قەزا لە | نستووری یاسف ئاغا و مەردیرووس |
| مەحموودیە | ئاغا |
| ئەندام لە ئەنجوومەنی قەزا لە | داود ئاغا |
| مەحموودیە | مولکن ئاغا و سیمۆن ئاغا |
| ئەمین سنووقی قەزای ئێرکیش | مانوك ئاغا و ئەڤانوس ئاغا |
| ئەندام لە ئەنجوومەنی قەزا لە ئێرکیش | سیفهر ئاغا |

| | |
|---|---|
| ئەندام لە ئەنجوومەنی قەزا لە | گیرکور ئاغا |
| ئەدیلکیڤاز | گیلوس ئاغا |
| ئەمین سنووقی موکوس | ئەغاس ئاغا |
| ئەندام لە ئەنجوومەنی بەڕێوەبردنی | کارابت ئاغا |
| موکوس | ئارتین ئاغا |
| ئەندام لە ئەنجوومەنی قەزای موکوس | عەزیز ئاغا |
| ئەمین سنووقی غیڤاش | ئارتین ئاغا |
| ئەندام لە ئەنجوومەنی بەڕێوەبردنی | سیمۆن ئاغا |
| غیڤاش | میغیردیچ ئاغا و بانوس ئاغا |
| ئەندام لە ئەنجوومەنی قەزای غیڤاش | |
| ئەمین سنووقی شاتاك (خەزنەدار) | |
| ئەندام لە ئەنجوومەنی قەزا لە شاتاك | |
| ئەمین سنووقی رسومات لە ڤان | |
| ئەندامی دادگەی کاروباری بازرگانی لە | |
| ڤان | |

سەرچاوە:

Salnama-i Vilayet-i Erzrum – 1288 Hicri Senesi (Erzrum: Vilaeti Matbaai 1289) pp 58 - 68, 124, 133

# ١٨٧٦

| پله و ناونیشانی وەزیفەکەی | ناوی کەسەکان |
| --- | --- |
| ئەندامی ئەنجوومەنی بەڕێوەبردنی | ئاگۆب ئاغا |
| سنجقی ڤان | کیفۆرك ئاغا |
| ئەندامی لیژنەی تێهەڵچوونەوەی هەرێم | میغیردیچ ئاغا و کیفۆرك ئاغا |
| ئەندامانی ئەنجوومەنی شارەداری | کارابێت ئەفەندی |
| ئەمین سنووقی نووسینگەی لێپرسینەوە | میغیردیچ ئاغا و کیفۆرك ئاغا و |
| ئەندام لە لیژنەی تۆمارکردنی زەویوزار | کارابێت ئاغا |
| سنووقی مەنفەعە | هایرابیت ئاغا و کارابێت ئاغا |
| ئەندامی دادگەی بازرگانی | بانووس ئاغا و میغیردیچ ئاغا و |
| | یەکێکی تر هەر بە ناوی میغیردیچ |
| ئەمین سنووقی دارایی لە قەزای ئیلباك | ئاغاوە |
| ئەندامی ئەنجوومەنی بەڕێوەبردنی | کیفۆرك ئاغا |
| ئیلباك | بابا ئاغا و ئارتین ئاغا |
| ئەمین سنووقی دارایی لە قەزای جۆلە | ئاگۆب ئاغا |
| مێرگ | بارود ئاغا و بلون ئاغا |
| ئەندامی ئەنجوومەنی بەڕێوەبردنی | یودیس ئاغا و میلیین ئاغا |
| جۆلەمێرگ | داود ئاغا و عیسماست ئاغا |
| ئەندامی ئەنجوومەنی بەڕێوەبردنی | ستران ئاغا و ئاگۆب ئاغا |
| غیڤار | ملیین ئاغا |
| ئەندام لە ئەنجوومەنی قەزانی غیڤار | ئاگۆب ئاغا |
| ئەندامی ئەنجوومەنی بەڕێوەبردنی | ئاگۆب ئاغا و کیرکور ئاغا |
| ئێرکیچ | ئاگۆب ئاغا |
| ئەندام لە ئەنجوومەنی قەزا لە ئێرکیچ | کازر ئاغا و ئیسحاق ئاغا |

| ئەمین سنووقی دارایی لە قەزای مەحموودیە | فارتان ئاغا و کیلۆس ئاغا |
|---|---|
| ئەندامی ئەنجوومەنی بەڕێوەبردنی مەحموودیە | کیلۆس ئاغا |
| ئەمین سنووقی دارایی لە قەزای غیفاش | ئارتین ئاغا و سەرکیس ئاغا |
| ئەندامی ئەنجوومەنی بەڕێوەبردنی غیفاش | ئارتین ئاغا |
| ئەندامی ئەنجوومەنی بەڕێوەبردنی موکوس | |
| ئەندام لە ئەنجوومەنی قەزا لە موکوس | |
| ئەندامی ئەنجوومەنی بەڕێوەبردنی شاتاک | |
| ئەندام لە ئەنجوومەنی قەزای شاتاک | |

سەرچاوە

Salnama-i Vilayet-i Erzrum – 1293 Hicri Senesi (Erzrum Vilaeti Matbasi 1293) pp 101- 108

# ١٨٩٧

| پلە و ناونیشانی وەزیفەکەی | ناوی کەسەکان |
|---|---|
| ئەندامی ئەنجوومەنی بەڕێوەبردنی هەرێمی ڤان | ئەرسن ئەفەندی (نوێنەری بەترەریك) و ئاریتن ئەفەندی و ئەفیدیس ئەفەندی |
| پشکنەری دادوەری لە ڤان و پەتلیس | فیجین ئەفەندی |
| بەڕێوەبەری ڕێژییە | نیکۆلاکی ئەفەندی |
| ئەندازیاری باڵا (باش موهەندیس) | سیستر ئەفەندی |
| یارمەتیدەری تۆمارگر لە نووسینگەی ژمێریاری ولایەتەکە | عەبدە ئەفەندی |
| ئەمین سنووق (خەزنەدار) | ماردیروس ئەفەندی |
| لێپرسراوی باج | عەبدە ئەفەندی |
| لێپرسراوی ڕووپێوکردنی زەوی | کیشیشیان دیکران ئاغا |
| قۆمیسەر (مفەوەز)ی سێیەمی پۆلیس | ئاگوپ ئەفەندی |
| قۆمیسەرەکانی پۆلیس | مانوك ئەفەندی و هگیان ئەفەندی و ئۆهانیس ئەفەندی و تیجان |
| پیتچنی چاپخانەکە | ئەفەندی |
| وەستای ئامێری چاپکردن | ئۆهانیس و ئەرتان ئەفەندی |
| شارەزا لە چاپکردنی بەردین (حجری) | بلوزیان ئۆهانیس ئەفەندی |
| ئەندام لە دەستەی تێهەڵچوونەوەی دادگە | عەبدە ئەفەندی |
| | گبریال ئەفەندی و مرکار ئەفەندی |
| ئەندام لە بەشی تێهەڵچوونەوەی | کیرکور ئەفەندیو بۆغۆس ئەفەندی |

| | |
|---|---|
| جەزایی دادگە | فارتان ئەفەندی |
| نووسەری داواکاری گشتی | باتووس ئەفەندی |
| ئەندام لە دەستەی سوێندخۆراندا | ئاگوب ئەفەندی |
| ئەندامی دەستەی سوێندخۆران بەشی | بۆغۆس ئاغا |
| جەزایی | ئاغوب ئاغا |
| ئەندام لە دادگەی بازرگانی | مارکار ئەفەندی |
| ئەندام لە ئەنجوومەنی شارەداری | عەبدە ئەفەندی |
| پشکنەری شارەداری سەر بە ئەمانەتی | ئاغوب ئاغا |
| گشتی | نیکولای ئەفەندی |
| جێگری سەرۆکی بەش لە بانکی | میغیردیچ ئەفەندی |
| کشتوکاڵی | ئەنتۆفان ئەفەندی |
| ڕاوێژکار لە بانکی کشتوکاڵ | بلافۆ ئەفەندی |
| بەڕێوەبەری نووسینگەی باج و | |
| دەرامەت | |
| ژمێریار | |
| لێپرسراوی گەنجینەکان | |
| پزیشکی گەڕەنتینە (الحجر الصحی) | |

سەرچاوە: (van Matbaa-I ١٣١٥Van Vilayeti Sanamasi.
٤٩ - ١٣٤) pp ١٣١٥Vilayeti.

ئەم خشتانە کە سێ ساڵ ڕومانڵدەکات جگەلەوەی کە ئاماژەیەکە بۆ ژمارەیەکی زۆر گەورەتر لەو ئەرمەنانەی کە لە بوارەکانی وەزیفەی حوکمەت لە هەرێمی ڤان کاربەدەستبوون، بێجگە لەمە خشتەی تریش هەن کە (میسرۆب کریکۆریان) داویە سەبارەت بە فەرمانبەرە ئەرمەنەکانی ناو دەوڵەتی عوسمانی.[1]

هەر بۆ نموونە (مارکوس ئاغا بیکیان) وەك یارمەتیدەری حاکمی ڤان لە ساڵی ١٨٩٦، (دیکران ئەمیر دجانیان)یش لەنێوان ١٨٩٣ - ١٨٩٧ سەرۆکی ئەنجوومەنی پەروەردە بووە لە شاری ڤان، (ئەرمیناك بویادجان) لەنێوان ١٩٠٥ - ١٩٠٦ یاریدەدەری حاکم بووە لە قەزای غیڤاش، وە (فرید یوفهاتیس بویادجیان) پلەی جێگری حاکمی ڤانی لە ١٨٩٦ - ١٩٠٧ هەبووە، (گەرەبێتە فەنی)ش لە ١٩٠٢ - ١٩٠٣ یاریدەدەری حاکمی قەزای جاتاك بووە، لە ١٨٩٦دا (ستیڤان مالیکیان) پلەی یاریدەدەری حاکمی ولایەت بووە لە ڤان، وە لە ١٩٠٨ (نازاریت تشاروخدجیان) چاودێری پۆلیسی ڤان بووە و (فاردانە فەنی)ش لە ١٩٠٢ - ١٩٠٣ پلەی وەزیفەکەی یاریەدەری حاکمی قەزای غیڤاش بووە و .... زۆری دی.

دەبێ ئاماژەش بەوە بدرێ کە خشتەکان زانیاریەکانی ناویان جیاوازن، دوو خشتەکەی سەرەوە بریتیە لە بیرۆکرات و ڕاوێژکاران لە کەرتەکان (مقاطعە)دا، بەڵام زۆر کەسی تر لە مەرکەزی ئیداری ڤان کاریان کردووە، ناگرێتەوە، چوونکە لەوانەیە بەهۆی ئەوەوە بووبێ کە ڤان لە ساڵانی ١٨٧١ - ١٨٧٦ بەشێك بووە لە هەرێمی ئەرزڕۆم، وە خشتەی ساڵی ١٨٩٧ ناوی لێپرسراوانی کەرت (مقاطعە)مکەی تیادا ڕیزبەند نەکراوە.

---

١- میسروب .ك. کریکۆریان؛
Armanians in the Service of the ottoman Empire 1860-1908
لەندەن، رۆتلیدج و کیغان بول ١٩٧٧ ل٢٨

## پاشکۆی ژمارە (٣)
## پەنابەرانی ئەرمەن

پەنابەرانی ئەرمەن لە ڤانەوە بەسێ وەجبەی گەورە گەورە دەردەپەڕینە باشووری قەفقاسیا، سەرەتا ئەوەبوو کە عوسمانییان دەستیان کردە هەڵمەتێکی چڕوپڕ بۆ گرتنی سەرباز لە ئەرمەنەکان، خۆ کە ڕەشبگیری سەڵتەنەکەی گرتەوە ژمارەی پەنابەران و هەڵاتوان زیاتر بوو، ئەو شەپۆلە هەڵاتوانە پیاوانێکی دەگرتەوە لە تەمەنی بوون بە سەربازدا (گەنجی هەرزەکار) بە خاو و خێزانەوە.

شەپۆلی هەڵاتوانی دووەمجار لە تەممووز/یۆلیۆی ١٩١٥دا دەردەپەڕین، کە ڕووسەکان ڤانیان چۆلکرد، بەلایەنی کەمەوە ئەمەیان گشت دانیشتوانی ئەرمەنی هەرێمەکەی گرتەوە. دوایی بێجگە لە ژمارەیەکی کەم نەبێ، ڕێگە نەدرا ئەمانە بگەڕێنەوە ڤان، دوایی کە سوپای ڕووس هەڵوەشا ژماوەرەی ئەم گەڕاوانە زیادی کرد و تا ماوەیەکی کەم هاتنەوە ڤان، بەڵام کە ترکەکان هەرێمەکەیان گرتەوە دیسان ئەمانە هەڵاتنەوە.

سەرژمێری ئەم ئاوارانە زوربەی جار تا ڕادەیەکی زۆر متمانەی پێناکرێ، هاوپەیمانان پشت بەو کۆمەڵە سەرژمێریە دەبەستن کە ڕێزدار (ساربیە) کە قەشەیەکی ئەرمەنە و لە بەریڤان پەیای کردون، ئەم پیاوە وەرگێڕی جێگری کونسوڵ بووە لە ڤان.

ئەو لیستە (ك ١/ دیسامبری ١٩١٥) ١٧٣٠٠٠ هەزار پەنابەری گرتۆتە خۆ کە ٨٠٠٠٤ هەزاریان لە هەرێمی ئەرزڕۆمەوە و ٢٠٠٠٠ هەزاریان لە هەرێمی پەتلیسەوە[١]. سەرچاوەیەکی زۆریش لە تەممووز/یۆلیۆی ١٩١٥ ژمارەی

پەنابەران بە ١٥٠٠٠٠ هەزار دەخەمڵێنن. بەڵام وەك دەزانرێ دوایی ژمارەیەکی زیاتر گەیشتن [٢]، ئەرمەنەکانیش لای خۆیانەوە وایان خەمڵاندووە کە گوایە زیاد لە ١٠٠٠٠٠ هەزار پەنابەر بەتەنیا هەر لە ڤانەوە هەیە[٣]، ئەم خەملاندنانەش وەك دەردەکەون جگە لە مەزندەکردن شتێکی تر نییە و پڕن لە زیادەڕۆیی، چونکە ئەمە ٧٧٪ی دانیشتوانی ڤانە بەر لە جەنگەکە [٤]. ئەم تەقدیرە ئەو ژمارە کەمترە پەنابەرانەش ناگرێتەوە کە ڤانیان جێهێشت و چوونە کۆمەڵگە ئەرمەنیەکانی ئێرانەوە، یان هەرکام لە پەنابەرانی هەردوو هەرێمی پەتلیس و ئەرزرۆم.

وا دەردەکەوێ کەس سەرژمێریەکی ئەو پەنابەرە ئەرمەنانەی باشووری قەفقاسیای نەکردبێ، کە پاش یەکەم جەنگی جیهانی و شەڕی سەربەخۆیی ترکیا ڕایانکرد، دەزگەی هەواڵگری بەریتانیا خشتەیەکی داناوە بۆ ئەم مەبەستە بەڵام ئەویش پشتی بە سەرچاوە ئەرمەنەکان بەستووە، کەچی سەرنجێکی لیوا سەربازیە بەرپرسەکەی لە تەکدایە کە دەڵێ: ئەم سەرژمێریانە زۆر جێی متمانە پێکردن نین. بەهەرحاڵ زانیاریەکان لەلایەن پەنابەران خۆیانەوە نەبووە بەڵکو لەبارەی ئەوانەوەبوون کە ئیحتیجاو موحتیاجی کۆمەك و خۆراکبوون [٥].

سەرچاوەکانی ئەرمەن زۆرجار ژمارەی ئەوانەی لە چاوەڕوانیدا بوون بچنەوە ئەنەدۆڵ لە ١٩١٩دا بە ٢٠٠٠٠٠ هەزار مەزندە دەکەن [٦]، ئەمەش لەوە دەکات کە بە گشتی ئەو ژمارانە ئەو پەنابەرانەی گرتبێتەوە کە لە هەرێمی (قارس) لە رووسیا بووبن و بەشێك نەبووە لەسەڵتەنەی عوسمانی، زۆرجار دیاریکردنی ئەو کەسانەی ئەو خەملاندنانە دەیانگرێتەوە بۆ ژمارەی گشت پەنابەران، دیاریکردنیان مەحاڵە، دەشێ پەنابەرانی قارس لەوانەبن کە لە چاوەڕوانی گەڕانەوەدابوون و ئیتر مەزندەکردنێکی تر نایانگرێتەوە، بەڵام لەهەردوو حاڵەکەدا ڕێگەیە نییە تا بزانرێ ئەو ژمارانە ئەرمەنەکانی قارسیش دەگرێتەوە یاخود لێی دەرکراون.

سەرەڕای نەبوونی سەرچاوە جیاوازەکان وەکو یەك، شیکردنەوەکان ئاماژە دەدەن بە بوونی ۲۰۰۰۰۰ هەزار پەنابەری ئەرمەن لە قەفقاسیا. بەلای کەمەوە.

- ئەرمەن لە قەفقاسیای ڕووسیا لە ۱۹۱۷

| | |
|---|---|
| کۆی گشت دانیشتوان | ۱۷۸۳۰۰۰ |
| دانیشتوانی ناوخۆ (ئەسڵی) | ۱۴۴۴۰۰۰ |
| جیاوازی (پەنابەران) | ۳۳۹۰۰۰ |

- ئەرمەن لە ئەنەدۆڵی عوسمانی لە ۱۹۱۲

| | |
|---|---|
| ئەرزرۆم | ٦۲۰۰۰ |
| ڤان | ۱۳۱۰۰۰ |
| پەتلیس | ۱۹۱۰۰۰ |
| کۆی گشتی | ٤۸٥۰۰۰ |

سەرژمێریەك کە لەساڵی ۱۸۹۷دا ڕووسەکان کردویانە، ئەوەی دابەدەستەوە کە ۱۱٦۱۹۰۹ ئەرمەن وان لەناوچەی قەفقاسدا کە (ئازەربایجان، یەریڤان، جۆرجیا، فارس - ئەردهان و دەڤەرەکانی دەوروبەریان) دەگرێتەوە[7]. دەشێ بە داهاتنی ساڵی ۱۹۱٤ بەشێوەیەکی سروشتی ژمارەی دانیشتوانەکان زۆرتربووبێ و گەیشتبێتە ۱،٤٤٤،۰۰۰ [8].

لەکاتەکانی جەنگدا، ژمارەی ئەرمەن مەحاڵە زۆربووبێ، لەو کاتەدا، زوربەی ئەوانەی بەتەمابوون ببنە باوك، ڕۆیشتبوون، ئەوانەی لەدایك دەبوون بەهەزار حاڵ قەرەبووی مردووەکانیان دەکردەوە. بۆیە دەشێ وای دانێین کە ژمارەی دانیشتووە ئەرمەنەکانی ناوخۆ (ئەسڵی) لە باشووری قەفقاسی ڕووسیا لەساڵی ۱۹۱۷ لە ۱،٤٤٤،۰۰۰ تێ نەپەڕیبێ. (ڕیتشارد هۆڤانیسیان) هەندێ ژمارەی دانیشتوانی ئەرمەنی قەفقاسی لە (سەرچاوەیەکی ڕووسیاییەوە) ساڵی ۱۹۱۷ دەستکەوتووە:

١,٧٨٣,٠٠٠ .[٩] ئەگەر دانیشتوانە ناوخۆییەکان (ئەسڵی) کە ١,٤٤٤٠٠٠ کەسن لە کۆی ١,٧٨٣٠٠٠ی دەرکەین، ئەوا ٣٣٩٠٠٠ هەزار دەمێنێتەوە. کەواتە دەبێ ئەو ٣٣٩٠٠٠ هەزار ئەرمەنە پەنابەر بوو بن و لە رۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵەوە هاتبن.

ئەو ئەرمەنانەی کە (زیادکراون) و ٣٣٩٠٠٠ هەزارن ناشێ پەنابەر بن و لەسەڵتەنەی عوسمانییەوە هاتبن، لەوانەیە هەندێ پەنابەری لە ئێرانەوە خرابێتە سەر و کەمێکیش لەوانەی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا و شوێنانی ترەوە گەڕاونەتەوە تا شانبەشانی رووسەکان بجەنگن. بەڵام کاریگەری ئەو ژمارە کەمەش هەر ئەوە نیە، (هۆڤانیسیان) لە کۆتایی ١٩١٦دا وا مەزندە دەکات کە ٢٠٠٠٠٠ هەزار ئەرمەنی عوسمانی پەنایان بردۆتە بەر باشووری قەفقاسیا و چاردنووسی نیوەی ئەم ژمارەیە مردن و فەوتان بووە، لە برسێتی و بە نەخۆشی و دەرد و پەتا [١٠]. ژمارەیەکی زۆری ئەو پەنابەرانە مردون (وەك لەبەشی نۆدا عەرزمان کردن) بەڵام دوایی پەنابەری زیاتر هاتن.

ئەو پەناوبەرانەی لە ئەنەدۆڵەوەن دەبێ لەسێ هەرێمەوە بن: ئەرزرۆم، ڤان و پەتلیس. کە بەهەمووی ٤٨٥٠٠٠ هەزار ئەرمەنی بەر لە جەنگ بووە کە رۆیشتوون[١١]. ناشکرێ باوەڕ بەوە بکرێ کە ژمارەیەکی زۆری پەنابەر توانیویانە ئەو مەسافەیە ببڕن کە دورترە لەو هەرێمانەوە. ئەگەر ژمارەکانی (هۆڤانیسیان) بۆ ١٩١٧ وردبن، کەواتە ٧٠٪ ی ئەرمەن لە ئەرزرۆم و ڤان و پەتلیسەوە راپانکردۆتە ناو ئیمپراتۆری رووسیاوە، دیارە ژمارەکانیشی لەبارەی خەمڵاندنی دانیشتوانی ئەرمەنەوە بەو جۆرە زیادەڕۆیی پێوەیە. خۆ ئەگەر نیوەی ئەو پەنابەرانەش فەوتبووبن، ئەوا مەزندەکانی ١٩١٧ی لەبارەی گشت دانیشتوانەکەوە نزمترە تا بتوانێ ئاماژە بە ژمارەیەك بدات بکاتە ٣٣٩٠٠٠ [١٢].

# پەراوێزەکان

١- فایلی ٢٧٦٨/٣٧١ لە ستیڤنز بۆ ھ.م وەزیری دەوڵەت بۆ کاروباری دەرەوە، باتووم ٢٩ کانوونی یەك/ دیسامبر ١٩١٦، کە ستیڤنز ئاماژە بە سەرژمێریە ڕووسیەکانی پێشوو دەکات کە بە ١٤٠٠٠٠ ھەزار تۆمارکراوە.

٢- ھەر ئەو سەرچاوەیە، لە ٢ کانوونی دوو/ یەنایر ١٩١٦

٣-ئەناھید تیرمیناسیان، ڤان ١٩١٥، لە کتێبی:
Armenian Van/ Vaspurakan

چاپی: ج. ھۆڤانیسیان (کوستامیسا، کالیفورنیا، خانەی مازدا بۆ بڵاوکردنەوە، ل٢٤)

٤-دەربارەی دانیشتوانە ئەرمەنە عوسمانێکان، بڕوانە: جەستن مەکارسی، موسوڵمانان و کەمینەکان: Muslims and Minorities نیویۆرك/ چاپخانەی زانکۆی نیویۆرك ١٩٨٣ ل٧٠ - ل٧٨. ھەروا: جەستن مەکارسی، دانیشتوانی ئەرمەنی عوسمانی: The population of the ottoman Armenia لە کتێبی (ئەرمەنەکان لە دوا ساڵەکانی عوسمانیاندا، چاپی ئەنکەرە، کۆمەڵەی مێژووی ترکی، پەرلەمانی گەورەی ترك. حیکمەت ئۆزدەمیر و کەمال جیجیك و عومەر توران و ڕەمەزان جالیك و یوسف ھالا جوغلو:

Turk Tarih ئەنکەرە Ermeniler: Surgun Ve GOC
kurumu 2004

جەستن مەکارسی ئەو حسابانەی کردووە کە لەم پاشکۆیەدان. بەڵام حسابەکانی عومەر توران (بەپێی ئەو بەشەی ئۆزدەمیر ئامادەی کردووە et al) بۆ ژمارەیەکی زیاتر دەچێ لە ئەرمەنی پەنابەر و دواجار ڕێژەیەکی کەمتر لەوانەی لێیان مردووە.

٥- لە خشتەکەدا باسی ۱۳۲۸٥٠ پەنابەر دەکات کە پێویستیان بە کۆمەکە تا بگەڕێنەوە ئەرمینیای ترکی، وە ۱۱۸٥٠٠ پەنابەر تا بگەڕێنەوە فارس (بەپێی سەرژمێریە رووسەکان، ئەم ژمارەیە زۆرترە لە ژمارەی ئەو ئەرمەنانەی پێشی جەنگ کە لە فارس بوون) وە ۸۳۷۱٠ پەنابەر تا بگەڕێنەوە شوێنانی تر وە ۲۱۸۷۸٤ ئەرمەنی رووسی کە پێویستیان بە کۆمەکە (فایلی ۷۹/٦٠۸ لە کالسۆرپ بۆ هـ.م وەزیری دەوڵەت بۆ کاروباری دەرەوە، قوستەنتەنیە ۱۹ نیسان /ئەپریل ۱۹۱۹) جا ئیتر خەملاندنەکان زۆر بوون – بەکەمی و بە زۆری- هەمیشەش کە باس دەکران بەبێ ناوهێنانی سەرچاوەکە بوون. بەلام ژەنەراڵ و.هـ.بیتش (هەوالگری ئەفسەران) کە باوەڕی بە خەملاندنی ئەرمەنەکان نیە، خەملاندنی تایبەتی خۆی ها لەلا: (کۆی گشتی ئەوانەی موحتاجی کۆمەکن - بەوانەش کە لە ئەرمینیای رووسەوە نین: دەگاتە ٥٠٠٠٠٠ هەزار لەوانە ۲٠٠٠٠٠ یان ۳٠٠٠٠٠ هەزار وان لە مەترسی لەبرسا مردندا) . ئەو کاتە گەلێ خەملاندنی هەڕەمەکی بلاودەبوونەوە، هەر بۆ نموونە بڕوانە (فایلی ۷۹/٦٠۸ لە دکتۆر ك.د.نوشر ، بانگەشەیە بۆ سەرلەنوێ نیشتەجێکردنەوەی ئەرمەن و A.C.R.N.E کورد، ئەم (نوشر)ە وا ڕاهاتووە کە خەملاندنەکان وا هەڵبەستێ، بەجۆرێ دوربن لە واقیعەوە، بۆ دەستخستنی وەسفێکی تەواوی ئەو خەملاندن و سەرژمێریانەی پەیوەندن بە پەنابەرانی ئەرمەنەوە، بڕوانە ـۆزدەمیر: ET Al

Ermeniler: surgun ve Goc. Pp 89 - 174

٦- بۆغۆس نۆبار پاشا و ئەفێتیس ئەهارونیان کە نوێنەرایەتی بەرژەوەندیە ئەرمەنیەکانی ڕۆژاوایان دەکرد لەناو کۆنگرەی ئاشتیدا، ئەم ژمارەی ۲٠٠٠٠٠ هەزارەیان دابوو (فایلی ۷۹/٦٠۸ ژمارە ۳۹۹۹ پێشنیارێ بۆ ناردنی کۆمەڵێ سەرباز بۆ پاراستنی پەنابەرانی ئەرمەن، لە ۱۱ ئادار /مارسی ۱۹۱۹)

٧- یەریڤان، قارس، تیفلیسی، ئەلیزا فیتول، باکۆ، باتووم، کۆتاییس، داغستان.

٨- بەڕێژەی ٠,٠١٢ سالآنە، بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتر بڕوانە:

مەکارسی: موسوڵمان و کەمایەتییەکان. ل ١٣٦ - ٢٠ ژمارەی دانیشتوان ١,٤٢٥٠٠٠، بەڵام دەبێ ئەو ١٩٠٠٠ هەزار ئەرمەنەی کە لە نێوان ١٨٩٧ و ١٩١٤ لە ئەنەدۆڵەوە ڕەویان کرد، بخەینە سەری، ئەمە جگە لەوانەش کە لەو ماوەیەدا دەشێ لەدایکبووبن، جا ژمارەیان بەو زۆربوونە سروشتیەشەوە بە ڕێژەی ٠,٠١٢ سالآنە حسێب دەکرێ و ڕەوێکی ناخۆش بە ڕێژەی ١٠٠٠ هەزار کەس کە سالآنە ڕەودەکەن. بۆ شرۆڤەکردنی ئەمە بڕوانە مەکارسی: موسوڵمانان و کەمایەتیەکان. ل٧٤ — ل٧٥

٩- ڕیتشارد.ج.هوفانیسیان: ئەرمینیا لە ڕێگەی سەربەخۆییدا (بیرکلی. چاپخانەی زانکۆی کالیفۆرنیا ١٩٦٧) ل١٤ - ل١٥

١٠-هەر ئەو سەرچاوەیە: ل٦٧

١١- هەندێ جار، هەرێمی تەرابزون وا ناودەبرێ کە سەرچاوەی پەنابەرانە، بەڵام هیچ شتێ نییە کە ئەوە پیشان بدات کە ژمارەیەکی زۆری پەنابەر لەوێوە هاتبن، لە ١٩١٢دا تەرابزون ٦٨٠٠٠ هەزار ئەرمەنی تێدابوو، ٤٠٨٠٠ لەمە ڕاگوێزران، ژمارەیەکی نەزانراویان لێ فەوتبوو (مەکارسی... ل١١٢، یوسف هالاجوغلو، ئەو ڕاستیانەی وان لەپشت سەرلەنوێ نیشتەجێکردنەوە، ئەرمەن لە دوا ساڵەکانی عوسمانیدا: Turkkaya Ataov) ئەنکەرە:

Turkish Historical Society (Grand National Assembley of Turky 2001 . pp 131- 32 پەرلەمانی گەورەی ترک

١٢- دەبێ حیساب بۆ دوو شت بکرێ: یەکەم/ ژمارەکانی ساڵی ١٩١٧ لە

بارەی دانیشتووانی ئەرمەنەوە، هەروەك ژمارەكانی دی لەكاتی جەنگدا تۆماركراون. بەزۆری پێیانەوەنراو و زیادەڕۆیی تیا كراوە. دووەم/ دەبێ ئەو دانیشتوانە ئەسڵیە ئەرمەنانەی ناو قەفقاسی ڕووس بەهۆی برسێتی و نەخۆشیەوە لێیان مردبێ بەڵام نەك بەو ڕادە زۆرەی وەك لە پەنابەراندا دەمرن، ئەم دیمەنە تەنیا گریمانەیەكە، بەڵام وردتر و ڕاستترە ئەگەرەكو نوقسانیشە: ١,٤٤٤٠٠٠ (دانیشتوانە ئەسڵیەكان لە ١٩١٤) ١٤٤٠٠٠ای لێ دەركرێت (ئەو خەڵكە ئەسڵیەی بەهۆی برسێتی و نەخۆشی و شەڕەوە لە ١٩١٧ەوە مردوون) وە ٣٤٠٠٠٠ی بخرێتە سەر (كە پەنابەرانی ئەنەدۆڵبوون) و ئەو تەلەفیاتە بەشەریەی ناوپەنابەرانیشی لێ دەركرێ كە ٨٥٠٠٠ كەسبوون و دەكاتە ٢٥٪ ئەوا یەكسانە بە ١,٥٥٥٠٠٠ (بەنزیكەی ژماوردی دانیشتوانی ئەرمەن لە قەفقاسیای ڕووسیای ١٩١٧)

## پاشکۆی ژمارە (٤)

## هەڵبژاردە لە "ڕێنماییەکانی بەرگریکردن لەخۆ"

### گوندەکان:

سێ جۆر گوند هەیە

١- گوندێ کە تەنیا ئەرمەنی تێدایە

٢- گوندێ دەکەوێتە ناوچەی غەیرە ئەرمەن لە ئەرمەن زیاتری تێدا دانانیشێ

٣- تێکەڵ، ئەرمەن و غەیرە ئەرمەنی وا تیا.

لە ڕووی ڕێکخستنەوە، جیاوازی لەنێوان ئەمانەدا نییە، هەر یەك لەمانە دەستەیەکی سەربازی تایبەت ڕێکیان دەخات. ئەو هێزانەش کە هەن بەتەواوی چەك و تفاقیانەوە دەدرێنە پاڵیان. هەر دەستەیە دەبێ بەدوو بەشەوە: هێزی جێگیر، هێزی چالاك. هەرکام لەمانە سەرکردە و یارمەتیدەرێکی دەبێ، لە هەر گوندێك بە ڕاوێژ و تەگبیری هێزی جێگیر و هێزی چالاك سەرکردە و جێگرەکەی لەنێو ئەوانەی شارەزان هەڵدەبژێررێ.

دەستەڵاتی گشتی لە گوندەکەدا بە دەست ئەو سەرکردەیەوە دەبێ، هەر هێزێکیش کە لەوێدایە لەژێر فەرمانیدا دەبێ، هەر لەو کاتەشدا نوێنەری سەرکردەیی ناوچەکەیە و سەرکردەیی ئەرکانیشە. لەناوچەکەدا لەسەر سەرکردەی گوندەکان پێویستە کۆببنەوە و لەناو خۆیاندا لیژنەیەکی کاتی لەسێ ئەندام هەڵبژێرن. ئەم لیژنەیە لە ڕۆژانی شەڕدا، لیژنەکە یان سەرکردەیی ناوچەکە بەپێی لێپرسراوێتی تایبەتی خۆیان، ئەو چەتانەی

خاوەنەکانیان ناتوانن بەکاریان بێنن لێیان وەردەگرن و بدرێن بە کەسانی شارەزاتر.

ئەو گوندانەی پەلامار دەدرێن گورج تەتەریان بنێرن بۆ شوێنە نێزیکەکان و داوای یارمەتی بکەن. بەڵام ئەو ئەرمەنانەی وان لە گوندە تێکەڵاوەکاندا و ناتوانن بچن بەهانای گوندەکانی نێزیکیانەوە، چونکە لە ئاواییەکەدا کەمینەن، دەبێ دەم و دەست بە بارێکی سووکەڵەی پێویستیەکانیانەوە بڕۆن و پەنابەرنە بەر ناوچە ئەرمەن نیشینەکان.

لە گوندە تێکەڵاوەکاندا، کە دوژمن کەمینەیە (Sic) لەچاو ئەمەندا، دەبێ دوژمن وەك بارمتە گل بدرێتەوە، ئەگەر ڕایان کردبێ یان داوای بارکردن بکەن لە گوندەکە، بەپێی ئەو بار و زرووفەی کە پێیان باشە یان ئەوەی کە دەوڵەتەکەیان هەڵوێستی بۆ وەردەگرێ.

لەکاتی شەڕدا دەبێ: درگەی ماڵەکان بە کراوەیی بێت، ئەمە بۆ کارئاسانی جەنگاوەران تا لەدەست سەربازەکانی نیزامی یان پۆلیس هەڵبێن. لەبار و زرووفێکی ئاوهادا ئەوانەی کە چەکدار نین دەبێ لە ماڵەکانی خۆیاندا بمێننەوە. هەر پارچە چەکێك بکەوێتە دەستی دوژمن دەبێ گوندەکە گشتی بەپارە ئەو چەکە بکڕنەوە. بەڵام ئەوانەی لە دوژمن دەگیرێن دەبێتە ماڵی ئەوەی گرتوویە.

## پەلاماردانی گوندەکان

بۆ پەلاماردانی گوندەکان، پێویستە کە:

١- دەبێ شوێن و جێگە قایمکراوەکانی ئەو گوندە نەیارانە بزانرێ و لێی ئاگاداربن.

٢- پێشتر دەبێ ڕێگەی کشانەوە و بڵاوکردنەوەی پاسەوانان دیاری بکرێن.

